محمد بن جرير طبری

# مێژووی تەبەری

بەرگی شەشەم

وەرگێرانی: زانەر محمد

# مێژووی تەبەری

نوسینی: محمد بن جریر طبری
وەرگێڕانی: زانەر محمد

بەرگی شەشەم

چاپی یەکەم

سلێمانی

٢٠١١

## پێڕست

## بەسەرهاتی (شورا) راوێژ کردن

عەمرۆ کوڕی مەیمونی ئەودی دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب بریندار کرا، پێیان وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، چی دەبێت ئەگەر جێگرێك بۆ خۆت دیاری بکەیت؟

وتی: کێ بکەمە جێگری خۆم، ئەگەر باوکی عوبەیدەی جەڕاح زیندوو دەبوو، ئەوم دەکردە جێگر و ئەگەر پەروەدگار لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکردم، دەموت: بیستم پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو ئەو ئەمینی ئۆمەتە، ئەگەر سالیم موالی باوکی حوزەیفە زیندوو دەبوو، ئەوم دەکرد جێگر و ئەگەر پەروەردگار لێی دەپرسیم، دەموت: بیستم پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو، سالم خواوەندی زۆر خۆش دەوێت.

کەسێك وتی: کەسێك بەتۆ دەناسێنم، عەبدوللە کوڕی عومەر.

وتی: خوا بتکوژێت، چوونکە مەبەستت رەزای خواوەند نەبوو، هاوار لەتۆ! چۆن کەسێك بکەمە جێگری خۆم کە ناتەوانە بۆ تەلاقدانی ژنەکەی؟ ئێمە خوازیاری ئەم کارە نین. خوازیاری ئەو کارە نەبووم تا خەلافەتم بۆ یەکێك لەبنەماڵەکەی خۆم بوێت، ئەگەر خێری تیا بێت، بەشی خۆمان وەرگرتووە و ئەگەر شەڕیش بێت، بەهەمان شێوە. لەبنەماڵەی عومەر لێکۆڵینەوە لەکەسێك دەکەن و سەبارەت بەکاری ئۆمەتی محەممەد پرسیاری لێدەکەن. من خۆم خستە رەحمەت و بنەماڵەکەم بێ بەش کرد، ئەگەر سەر بەسەر رزگارم بێت، نەئازارم دەوێت نە پاداشت، بەمشێوەیە بەختەوەر دەبم. ئێستا تێڕادەمێنم: ئەگەر جێگر بۆ خۆم دیاری بکەم، ئەو کەسەی لەمن باشتر بوو، ئەو کارەی کرد و ئەگەر جێگر دیاری نەکەم، ئەوەی لەئێمە باشتر بوو ئەو کارەی نەکرد.

ئەوان ڕۆشتن و گەڕانەوە، وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، چی دەبێت ئەگەر وەسیەت بکەیت؟

وتی: دوای ئەوەی لەگەڵ ئێوە قسەم کرد، بڕیارمدا لێکۆڵینەوە بکەم بۆ ئەوەی کارەکەتان بەپیاوێك بسپێرم باشتر لەهەمووان بێت وئێوە بۆ ڕێگەی راست دەبات — ئاماژەی بەعەلی کوڕی ئەبی تالب کرد— دواتر لەهۆش خۆم چووم و پیاوێکم بینی ڕۆشتە ناو باخێك، لقە زیادەکانیان بڕیبوو، بڕیاریدا بوو ئەوەی تازە و گەییوو بوو،

کۆبکاتـەوە و بیخاتـە ژێرخـۆی، زانـیم خواوەنـد عومـەر دەباتـەوە بـۆ لای خـۆی و فەرمانەکانی خۆی ئەنجام دەدات، نامەوێت لەژیان و مەرگ لێپرسراوی ئەم کارە بم. ئەمە ئێوە و چەند کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) کەهەموویان بەهەشتین و سـەعید کوڕی زەیـد کـوڕی عـەمرۆ کـوڕی نوفـەیل لـەناو ئەواندایـە، بـەڵام ئـەو ناخـەمە ریـزی ئـەوان، تـەنیا ئـەم شـەش کەسـە: عـەلی و عوسمـان کوڕەکـانی عەبدمـەناف، عەبدولرەحمان و سـەعد، خاڵۆکـانی پێغەمبـەر(د.خ)، زوبـەیر کـوڕی عـەوام، هـاوەڵی نزیکـی پێغەمبـەر(د.خ) و کوڕەمـامی ئـەو تەڵحـە کـوڕی عوبەیداللـە تـا یـەکیان لـەناو خۆیان هەڵبژێرن و کاتێك خەلیفەیان دیاری کرد، پشتیوانییان لـێ بکـەن و هاوکـاری بن و ئەگەر کەسێك لەئێوەی کردە ئەمین، رێز لەئەمانەتەکەی بگرن.

هاتنەدەر. عەباس بەعەلی وت: لەگەڵ ئەوان مەڕۆ.

وتی: حەز بەدژایەتی ناکەم.

وتی: کەواتە خراپ دەبینیت.

بەرەبەیانان، عومەر کوڕی خـەتاب، عـەلی و عوسمـان و سـەعد و عەبدولرەحمان و زوبەیر کوڕی عەوامی بانگ کرد، وتی: بەباشم زانـی ئێـوە کەسـەرکردە و سـەروەرانی خەڵکن و ئەم کارە تەنیا لەناو ئێوەدا دەبێت، چوونکە کاتێك پێغەمبـەر(د.خ) کۆچی دوایـی کـرد، لـەئێوە رازی بـوو، ئەگـەر خـۆڕاگر بن لەخـەڵکان بۆ ئێـوە ناترسـم بـەڵام دەترسـم دژایـەتی لـەناو ئێـوەدا دروسـت ببێـت، بەمۆڵـەت وەرگـرتن لەعایـشە بڕۆنـە ماڵەکەی ئەو و راوێژ بکەن و کەسێك لەناو خۆتان وەك خەلیفە دەستنیشان بکەن.

وتـی: مەڕۆنـە ماڵەکـەی عایـشە، لـەم نزیکانـە بمێننـەوە. سـەری خـۆی نایـەوە، خوێنی لـێ دەچۆڕا.

ئـەوان ڕۆشـتن. سـەرەتا بەهێوایـشی قـسەیان دەکـرد، بـەڵام دواتـر دەنگیـان بـەرز کردەوە.

عەبدوللە کوڕی عومەر وتی: سبحان الله، هێشتا سەروەری باوەڕداران نـەمردووە. عومەر کوڕی خەتاب ئەمەی بیست و هەستی پێکرد، وتی: تەواوی کەن، کاتێك مردم بۆ ماوەی سـێ رۆژ راوێژ بکـەن، لـەم مـاوەدا سـۆهەیب پێشنوێژی بـۆ خـەڵکان بکـات، دەبێـت پـێش ئـەوەی رۆژی چـوارەم بێـت، کەسـێکتان وەك خەلیفـە دەستنیـشان

کردبێت، عەبدوللە کوڕی عومەر لەم کارە بەشداری دەکات بەڵام هیچ مافێکی بۆ خەلافەت نییە، تەڵحە لەم کارەدا شەریکی ئێوەیە، ئەگەر لەماوەی ئەو سێ رۆژەدا هات، لەراوێژ کردن ئامادە بێت و ئەگەر نەهات، کۆتایی بەکارەکەی خۆتان بێنن. تەڵحە چی بەسەر دێت؟

سەعد کوڕی ئەبی وەقاس وتی: تەڵحە بەئێمە بسپێرە، بەخواستی خوا دژایەتیمان ناکات.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: هیوادارم دژایەتی ئێوە نەکات، چوونکە گومان دەکەم یەکێك لەم دوو پیاوە، عوسمان و عەلی، خەلافەت دەگرێتە دەست. ئەگەر عوسمان خەلافەت بگرێتەدەست، پیاوێکی لاواز وئەگەر عەلی ئەو ئەرکە بگرێتەدەست، پیاوێکی گاڵتەچی و دەتوانێت رێگەی راستیان نیشان بدات، ئەگەر سەعد بکەنە خەلیفە، شیاوە بۆ خەلافەت و ئەگەر خەلیفە هاوکاری لێوەر بگرێت، من بەهۆی خیانەت یا لاوازی ئەوم لەسەر کار لانەبرد. عەبدولرەحمان کوڕی عەوف کارزان و کارسازە و لەلایەن خواوەندەوە پارێزگاری لێدەکرێت، گوێ لەوتەکانی بگرن.

دواتر بەباوکی تەڵحەی ئەنساری وت: ئەی باوکی تەڵحە، خواوەند لەکۆنەوە هێزی بەئێوە بەخشیوە، پەنجا کەس لەئەنسارییەکان هەڵبژێرە و ئەم شەش کەسە ناچار بکە کەسێك لەناو خۆیان بۆ ئەو کارە دەستنیشان بکەن. بەمیقداد کوڕی ئەسوەدی وت: کاتێك منتان خستە ناو گۆڕ، ئەم شەش کەسە لەژوورێکدا بهێڵەرەوە تا کەسێك لەناو خۆیان هەڵبژێرن.

بەسوهەیبی وت: بۆ ماوەی سێ رۆژ پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکە و عەلی و عوسمان و عەبدولرەحمان و سەعد و زوبەیر و تەڵحە ئەگەر هات، لەیەك شوێن کۆبکەرەوە. عەبدوللە کوڕی عومەریش ئامادە بێت بەڵام هیچ مافێکی بەسەر خەلافەتەوە نییە، لەسەر سەریان بوەستە، ئەگەر پێنج کەسیان هاودەنگ بوون و یەکیان رازی نەبوو، بیکوژە یا بەشمشێر سەری بپەڕێنەوە. ئەگەر چوار کەس بەیەك کەس رازی بوون و دوان نارازی، بیانکوژە، ئەگەر سێ کەس بەکەسێك و سێ کەسەکەی دیکە، بەیەکێکی دیکە رازی بوون، عەبدوللە کوڕی عومەر بکەنە داوەر و لەگەڵ هەردەستەیەك بوو، ئەو وەك خەلیفە هەڵبژێرن. ئەگەر بەداوەری کردنی عەبدوللە کوڕی عومەر رازی نەبوون، لەگەڵ ئەو دەستەبن کە عەبدولرەحمان کوڕی

عەوفیان لەگەڵدایە و ئەوانەی دیکە کەنەیاری دەکەن، بکوژن.

ئەوان ڕۆشتنەدەر. عەلی لەگەڵ دەستەیەك لەمناڵەکانی هاشم بوو، وتی: ئەگەر خەڵکەکەتان، ئەم شێوازە بگرنەبەر، هیچ کات خەلافەت ناگرنەدەست.

عەباس هات و پێی وت: خەلافەتمان دەست نەکەوت.

عەباس وتی: چۆن دەزانیت؟وتی: عوسمانی لەخۆی نزیك دەکردەوە و دەیوت: لەگەڵ زۆرینە بن، ئەگەر دوو کەس بەیەکێك رازی بوون، لەگەڵ ئەو کەسە بن کە عەبدولرەحمان کوڕی عەوفیان لەگەڵدایە. سەعد دژایەتی کوڕە مامەکەی خۆی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف ناکات، عەبدولرەحمان زاوای بنەماڵەی عوسمانە و دژایەتییان ناکات، عەبدولرەحمان خەلافەت بەعوسمان دەسپێرێت. ئەگەر دوو کەسەکەی دیکە لەگەڵ من بن، هیچ سوودێکم پێ ناگەیێنێت لەکاتێکدا تەنیا بەیەك کەسیان هیوادارم.

عەباس وتی: هەرکاتێك شتێکم بەتۆ وت، سەرئەنجام بەهەواڵێکی ناخۆش بۆ لای من گەڕایتەوە. کاتی مردنی پێغەمبەر(د.خ) پێم وتی: لێی بپرسە، خلافەت بەکێ دەسپێرێت و نەتپرسی. دوای کۆچی پێغەمبەر(د.خ) پێم وتی: لەم کارەدا پەلە بکە و نەتکرد. کاتێك عومەر کوڕی خەتاب تۆی لەناو ئەو شەش کەسەدا ناو برد، وتم: مەچۆ ریزی ئەوان و رازی نەبوویت. تەنیا ئەمەم بەقسە بکە، هەرچییان وت بڵێ نە تا ئەو کاتەی تۆ دەکەنە خەلیفە. لەم دەستەیە بترسە چوونکە بەردەوام خەلافەت لەئێمە دوور دەخەنەوە تا کەسێکی دیکە بەو کارە هەستێت.

عەلی وتی: ئەگەر عوسمان بمێنێتەوە، ئەوەی ئەنجامی داوە، بیری دێنمەوە و ئەگەر بمرێت و خەلافەت دەست بەدەست بگێڕن، بەشێوەیەك من دەبینن کەپەسەندی ناکەن. هۆنراوەیەکی وەك نموونە خوێندەوە و سەیری شوێنێکی کرد، باوکی تەڵحەی بینی و ئامادەبوونی ئەوی پێ خۆش نەبوو. باوکی تەڵحە وتی: ئەی باوکی حەسەن نیگەران مەبە.

کاتێك عومەر کوڕی خەتاب کۆچی دوایی کرد، و جەنازەی ئەویان هێنا، عەلی و عوسمان گفتوگۆیان کرد بۆ ئەوەی یەکیان نوێژی لەسەر بخوێنێت. عەبدولرەحمان کوڕی عەوف وتی: هەردووکتان خوازیاری خەلافەتن، بەلام بۆ ئەم کارە هیچ

مافێکتان نییە، ئەمە کاری سۆهەیبە چوونکە سەروەری باوەڕداران ئەوی کردە جێگری خۆی تا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات تا ئەو کاتەی کەسێك وەك خەلیفە هەڵدەبژێرن. سۆهەیب نوێژی لەسەر جەستەی عومەر کوڕی خەتاب خوێند.

کاتێك عومەر کوڕی خەتابیان بەخاك سپارد، میقداد، ئەو شەش کەسەی لەماڵی میسوەر کوڕی مەخریمە و بەوتەیەك لەبیت المال و بەوتەیەك لەماڵەکەی عایشە و بەمۆڵەت وەرگرتن لەو، لەوێ کۆی کردنەوە. پێنج کەس بوون. کوڕی عومەریش هاوڕێیەتی ئەوانی دەکرد. تەڵحە ئامادە نەبوو. بەباوکی تەڵحەیان وت ڕێگە نەدات کەس بڕواتە لایان. عەمرۆ کوڕی عاس و موغەیرە کوڕی شوعبە هاتن و لەبەر دەرگا دانیشتن. سەعد بەردی بۆ هاویشتن، هەستان و وتی: دەتانەوێت بڵێن ئامادە بووین و لەو کەسانە بووین ڕاوێژمان دەکرد.

کەسان بۆ خەلافەت گفتوگۆیان دەستپێکرد. باوکی تەڵحە وتی: من لەوەی هیچ کام بەخەلافەت ڕازی نەبن، زیاتر دەترسام لەوەی کێبڕکێ بۆ بەدەسەت هێنانی ئەو کارە بکەن. سوێند بەو خوایەی عومەر کوڕی خەتابی بردەوە، یەك ڕۆژ بەو سێ ڕۆژە زیاد ناکەن و دوای ئەوە لەماڵەوە دادەنیشم بۆ ئەوەی بزانم چی دەکەن.

عەبدولرەحمان وتی: کێ دەستبەرداری خەلافەت دەبێت و ئەو کارە لەئەستۆ دەگرێت تا دەنگ بەکەسانی لەپێش بدات.

کەس وەڵامی نەدایەوە.

وتی: من دەستبەرداری دەبم.

عوسمان وتی: من زووتر لەهەمووان ڕازی دەبم چوونکە بیستم پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو: لەزەوی ئەمین هەیە و لەئاسمان ئەمین.

کەسانی دیکە وتیان: ئێمەیش ڕازی دەبین. عەلی بێدەنگ بوو.

عەبدولرەحمان وتی: ئەی باوکی حەسەن چی دەڵێیت؟

وتی: بەڵێن بدە، ماف لەپێشی بگریت و نەبیتە شوێنکەوتەی هەوا و هەوەس و خزمەکانی خۆت پێش نەخەیت و خێرخوازی ئەم خەڵکە بیت.

عەبدولرەحمان وتی: بەڵێن بدەن دژی کەسێك کەگۆڕانکاری دروست دەکات، لەگەڵ من بن و هەرکەسێکم هەڵبژارد، ڕازی بن بەو مەرجەی لەپێشگای خواوەند

بەڵێن دەدەم خزمەکانی خۆم پێش نەخەم و خێری ئەم خەڵکەم بوێت. لەوان پەیمانی وەرگرت و پەیمانی پێدان.

بەعەلی وت: تۆ دەڵێی بەهۆی خزمایەتی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) و پێشینە و خزمەتی کاریگەری تۆ لەرێگەی ئیسلام، زیاتر لەهەمووان بۆ خەلافەت شیاوتریت. نەشیاو نییە، بەڵام ئەگەر ئەم کارە بەتۆ نەگات، کام یەك لەم شەش کەسە بۆ خەلافەت بەشیاو دەزانیت.

وتی: عوسمان.

دواتر بەتەنیا لەگەڵ عوسمان دانیشت و وتی: تۆ دەڵێیت، پیرێك لەمناڵەکانی عەبدمەنافم و زاوای پێغەمبەر(د.خ) و ئامۆزای ئەو کەرێز و پێگەم هەیە، وتەکانت نەشیاو نییە، و دەبێت ببیتە خەلیفەی موسوڵمانان. بەڵام ئەگەر ئەم کارە بەتۆ نەدەن، چ کەسێك لەناو ئەم شەش کەسە بۆ خەلافەت بەشیاو دەزانیت؟

وتی: عەلی.

عەبدولرەحمان لەگەڵ زوبەیر بەتەنیا دانیشت و هاوشێوەی ئەو قسانەی بەعەلی و عوسمانی وت، بۆ ئەویشی دووبارە کردەوە و ئەو وتی: عوسمان.

لەگەڵ سەعد بەتەنیا دانیشت و وتی: عوسمان.

عەلی هاتە لای سەعد و وتی: بەماف خزمایەتی ئەم کوڕەم لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) و بەماف خزمایەتی حەمزەی مامم لەگەڵ خۆت، سوێندت دەدەم لەگەڵ عەبدولرەحمان دژی من لەبەرژەوەندی عوسمان، هاودەنگ نەبیت چوونکە ئەوەی من دەتوانم ئەنجامی بدەم، عوسمان ناتوانێت.

عەبدولرەحمان شەوانە دەگەڕا و هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ)و سەرکردەی سوپاکان کەروویان لەمەدینە کردبوو، سەردان و راوێژی لەگەڵ دەکردن. هەمووان لەسەر عوسمان هاودەنگ بوون. ئەو شەوەی بەیانییەکەی ماوەکە کۆتایی پێدەهات، هاتە ماڵەکەی میسوەر کوڕی مەخریمەو ئەوی هەستاند و وتی: تۆ خەوتوویت و بەدرێژایی شەو چاوم نەخستۆتە سەر یەك، بڕۆ زوبەیر و سەعد بانگ بکە. کاتێك ئەوانی بانگ کرد، لەکۆتایی مزگەوتەکە، لەتەنیشت ماڵی مەروان لەزوبەیرەوە دەستی پێکرد و وتی: ئەم کارە بەدوو کوڕەکەی عەبدمەناف بسپێرە.

وتی: ئەو کارە بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب دەسپێرم.

بەسەعدی وت: من و تۆ خزمی نزیکی یەکترین. بەشەکەی خۆت بەمن بسپێرە تا کەسێك هەڵبژێرم.

وتی: ئەگەر خۆت هەڵدەبژێریت رازیم بەڵام ئەگەر عوسمان هەڵدەبژێریت، من عەلی پەسەند دەکەم، ئەی پیاو، لەگەڵ خۆت بەیعەت و ئێمە ئاسوودە و سەرفەرازمان بکە.

وتی: ئەی باوکی ئیسحاق، من خۆم لەو کارە دوور خستۆتەوە تا کەسێك هەڵبژێرم و ئەگەر ئەو کارەم نەدەکرد، بەخەلافەت رازی نەدەبووم چوونکە لەخەودا بەباخێکی سەوزی پڕ گیام بینی کەنێرێك هات و بڕواپێکراوتر لەو نێرەم نەبینیبوو، سەیری ناو باخەکەی کرد و بەجێی هێشت بێ ئەوەی لەرێگە لابدات، دوای ئەو وشترێك بەدوایدا هات و رێگەی ئەوی گرتەبەر و لەباخەکە ڕۆشتەدەر. دواتر نێرێکی بەهێز هات و جڵەوی خۆی رادەکێشا و سەیری چەپ و راستی دەکرد و رێگەی دوو هاورێکەی پێشووی گرتەبەر. دوای ئەوان کەسی چوارەم هات و لەباخەکە لەوەڕا. سوێند بەخوا نابمە چوارەم کەس چوونکە دوای ئەبوبەکر و عومەر کەس شوێنی ئەوان ناگرێتەوە کەخەڵکان لێی رازی بن.

سەعد وتی: دەترسم، لاوازی بەسەر تۆدا زاڵ بووبێت، کۆتایی بەکارەکەی خۆت بێنە، تۆ لەفەرمانەکانی عومەر کوڕی خەتاب ئاگاداریت.

زوبەیر و سەعد ڕۆشتن، میسوەر کوڕی مەخریمە عەلی بانگ کرد و عەبدولرەحمان ماوەیەکی دوور و درێژ لەگەڵی ئاخاوت. عەلی دڵنیا بوو خەلافەت بەو دەگات، هەستا و ڕۆشت. عەبدولرەحمان میسوەر کوڕی مەخریمەی بەشوێن عوسماندا نارد و دووبارە لەگەڵی ئاخاوت. بانگی بەیانی ئەو دووانەی لەیەك جیا کردەوە.

عەمرۆ کوڕی مەیمون دەڵێت: عەبدوللە کوڕی عومەر پێی وتم: ئەی عەمرۆ، هەرکەس بڵێت لەگفتوگۆی ئەو شەوەی نێوان عەبدولرەحمان لەگەڵ عەلی و عوسمان ئاگادارە، درۆ دەکات.

دەڵێت: فەرمانی پەروەردگار بۆ خەلافەتی عوسمان بوو. کاتێك نوێژی بەیانیان خوێند، دەستەیەکی کۆکردەوە و کەسێکی نارد و موهاجیرەکانی مەدینە و

سەرکردەی سوپاکان و ئەنسارییەکانی کۆکردەوە. مزگەوت لێوانلێو بوو لەخەڵکان.
عەبدولرەحمان وتی: ئەی خەڵکینە، کەسەکان دەیانەوێت خەڵکانی ویلایەتەکان رووبکەنە ویلایەتەکەی خۆیان و بزانن کێ خەلیفەیانە.

سەعید کوڕی زەید وتی: ئێمە تۆ بۆ ئەم کارە بەشیاو دەزانین.

وتی: ئامارژە بەکەسێکی دیکە بدەن.

عەمار وتی: ئەگەر دەتەوێت دژایەتی لەنێوان موسوڵمانان دروست نەبێت، بەیعەت لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بکە.

میقداد کوڕی ئەسوەد وتی: عەمار راست، ئەگەر لەگەڵ عەلی بەیعەت بکەیت، ملکەچی فەرمان و شوێنکەوتەی تۆ دەبین.

کوڕی ئەبی سەرح وتی: ئەگەر دەتەوێت دژایەتی لەنێوان قورەیشییەکان دروست نەبێت، لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان بەیعەت ببەستە.

عەبدوللە کوڕی ئەبی رەبیعە وتی: راست دەکات، ئەگەر لەگەڵ عوسمان بەیعەت بکەیت، ملکەچی فەرمان و شوێنکەوتەی تۆ دەبین.

عەمار جوێنی بەباوکی ئەبی سەرحدا و وتی: لەکەیەوە بوویتە ئامۆژیاری موسوڵمانان؟

منداڵەکانی هاشم ئومەییە گفتوگۆیان کرد.

عەمار وتی: ئەی خەڵکینە، خواوەند بەپێغەمبەرەکەی خۆی و بەم دینە رێزی گرتین، بۆ ئەم کارە بەکەسێك دوور لەبنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) دەسپێرن؟

یەکێك لەمنداڵەکانی مەخزوم وتی: ئەی کوڕی سومەییە، سنوورەکانی خۆت دەبەزێنیت، تۆ کارت بەوە چییە قورەیش چ کەسێك وەك سەرکردەی خۆی دەستنیشان دەکات.

سەعد کوڕی ئەبی وەقاس وتی: ئەی عەبدولرەحمان، پێش ئەوەی خەڵکان گرفتاری فیتنە بن، کۆتای بەم کارە بێنە.

عەبدولرەحمان وتی: قسە و راوێژم کردووە، ئەی خەڵکینە، بەد گومان مەبن.

عەلی کوڕی تالیبی بانگ کرد و وتی: پەیمان بەخوا دەدەیت شوێنکەوتەی کتێبی خواوەند و سونەتی پێغەمبەر(د.خ) و دوو خەلیفەکەی پێش خۆت بیت؟

وتی: هیوادارم ئەو کارە بکەم و بەئەندازەی توانایی و زانستی خۆم، کارەکان ئەنجام بدەم.

عوسمان کوڕی عەفانی بانگ کرد و وتەکانی دووبارە کردەوە.

وتی: بەڵێ.

عەبدولرەحمان بەیعەتی لەگەڵ کرد.

عەلی وتی: بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ ئەم کارەت بەو سپارد. ئەمە یەکەم ڕۆژ نییە دژی ئێمە یەکتان گرت، پێویستە خۆڕاگر بین و لەوەی باسی دەکەیت، داوای هاوکاری لەخواوەند بکەین، سوێند بەخوا عوسمانت کردە خەلیفە تا خەفلافەت دواتر بەتۆ بسپێرێت بەڵام سوێند بەخوا، فەرمانەکانی خواوەند ڕۆژانە دەگۆڕێت.

عەبدولرەحمان وتی: ئەی باوکی حەسەن، بەد گومان مەبە، لەگەڵ خەڵکان قسە و راوێژم کردووە، جگە لەعوسمان کەس پەسەند ناکەن.

عەلی ڕۆشت و دەیوت: ئەم نامەیە کۆتایی پێدێت..

میقداد وتی: ئەی عەبدولرەحمان، بەخوا خەلافەتت لەوکەسەی بەراستی دادپەروەر و دادپەروەری دەکاتە پیشە، وەرگرتەوە.

وتی: ئەی میقیداد بۆ موسوڵمانان هەوڵی زۆرمدا.

میقداد وتی: ئەگەر لەم کارەت مەبەستت ڕەزامەندی خواوەند بووە، هیوادارم پاداشتی چاکەکارانت دەستکەوێت.

میقداد وتی: سوێند بەخوا هەرگیز ڕووداوەی هاوشێوەی ئەوەی دوای مەرگی پێغەمبەر(د.خ) بەسەر ئەم بنەماڵەیە هات، نەبینیوە، لەقورەیشییەکان سەرمسوڕماوە، پیاوێکیان پشتگوێ خست بێ ئەوەی باسی بکرێت، کەس لەو زاناتر و بیرمەندتر نییە. سوێند بەخوا ئەگەر دژی ئەوان خەڵکانم بۆ کۆدەبوویەوە.....

عەبدولرەحمان وتی: ئەی میقداد بێدەنگ بە، دەترسم گرفتاری ئاژاوە ببیت.

کەسێك بەمیقدادی وت: خوا لێت خۆش بێت، ئەو بنەماڵەیە کێن؟ ئەو پیاوە کێیە؟

وتی: بنەماڵەی منداڵەکانی عەبدولموتەلیب و ئەو پیاوە، عەلی کوڕی ئەبی تالیبە.

عەلی وتی: خەڵکان سەیری قورەیش دەکەن و قورەیشییەکان سەیری یەکتر و

دەڵێن ئەگەر منداڵەکانی هاشم خەلافەت بگرنە دەست، هەرگیز لەدەستی ئەوان ناڕواتەدەر و ئەگەر لەناو کەسانی دیکەی قوڕیشدا بێت، لەناو خۆتاندا دەست بەدەست دەیگێڕن.

ئەو ڕۆژەی لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان بەیعەتیان بەست، تەڵحە هات و پێیان وت: لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان بەیعەتیان بەست.

وتی: هەموو قوڕەیشییەکان ڕازی بوون.

وتیان: بەڵێ.

تەڵحە ڕۆشتە لای عوسمان، عوسمان وتی: هێشتا دەسەڵات لەدەستی تۆدایە، ئەگەر ڕازی نەبیت، خەلافەت وەرناگرم.

وتی: بەراستی بەخەلافەت ڕازی نابیت؟

وتی: بەڵێ.

وتی: هەموو خەڵك بەیعەتیان لەگەڵ بەستوویت؟

وتی: بەڵێ.

وتی: منیش ڕازی دەبم و لەوەی خەڵکان لەسەری ڕێککەوتوون، لانەدەم.

موغەیرە کوڕی شوعبە بە عەبدولرەحمانی وت: باوکی محەممەد کارێکی باشت کرد لەگەڵ عوسمان بەیعەتت کرد.

هەروەها بەعوسمانی وت: ئەگەر عەبدولرەحمان لەگەڵ کەسێکی دیکە بەیعەتی دەبەست، ڕازی نەدەبووین.

عەبدولرەحمان وتی: ئەی یەك چاو، درۆ دەکەیت، ئەگەر لەگەڵ کەسێکی دیکە بەیعەتم دەکرد، تۆیش بەیعەتت لەگەڵ دەکرد و ئەم قسانەت دووبارە دەکردەوە.

فەرزدق هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە هەیە:

((سۆهەیب سێ ڕۆژ پێشنوێژی کرد

دواتر ئەو کارەی بەعوسمان سپارد

پاشایەتی بێ کەم و کوڕ بوو

خەلافەتێك بوو ئەبوبەکر بەهاوڕێکەی خۆی سپارد

هاوڕێیانێك بوون دەبوونە ڕێبەر

و یا لێپرسراو بوون.))

میسوەر کوڕی مەخریمە دەڵێت: کەسم نەبیوە زیاتر لە عەبدولرەحمان کوڕی عەوف بۆ کاروباری خەڵکەکەی زاڵ بێت.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: پاشماوەی گێڕانەوەکەی میسوەر کوڕی مەخریمە کەدایکی عاتیکە کچی عەوفە و لەسەرەتای هەواڵی کوژرانی عومەر کوڕی خەتاب باسمان کرد، بەمشێوەیە، دەڵێت: پێنج کەسەکە ڕۆشتنە ناو گۆڕەکەی عومەر کوڕی خەتاب، دواتر هاتنەدەر و بەرەو ماڵەکانی خۆیان گەڕانەوە، بەڵام عەبدولرەحمان هاواری کرد: بۆ کوێ دەڕۆن، وەرن. ئەوان بەدوایدا ڕۆشتن تا ڕۆشتنە ناو ماڵی فاتیمە کچی قەیسی فیهری کەخوشکی زوحاك کوڕی قەیسی فیهرییە.

دەستەیەك لەمێژوونووسان وتوویانە، ژنی زوحاك کوڕی قەیس و ژنێکی بیرمەند و فرەزان بوو.

دەڵێت: عەبدولرەحمان دەستی بەقسە کردن کرد و وتی: لەم کارەدا بۆچوونێکم هەیە و ئێوە بۆچوونێك، ببیستن و بزانن، وەڵام بدەنەوە و تێبگەن، ئێوە پێشەوان و داوای ڕێنوێنی لەئێوە دەکەن و بیرمەندان و خەڵکان لەدەوری ئێوە کۆدەبنەوە، کاتەکانی خۆتان بەبێ هۆ بەفیرۆ مەدەن و شمشێرەکانتان بۆ دوژمن مەخەنە کالآن چوونکە بەوشێوەیە کەمتەرخەمی لەتۆڵە سەندنەوە دەکەن و کارەکەتان بەرەو فیرۆیی دەڕوات. هەر ماوەیەك نووسراوێکی هەیە و هەر ماڵێك پێشەوایەك کەبەفەرمانی ئەو ئەرکەکان رادەپەڕێنن و لەخراپە خۆیان دوور دەخەنەوە، کارەکەتان بەکەسێك بەسپێرن و ئارام ڕێگە ببڕن و بگەنە شوێنی مەبەست. ئەگەر فیتنەی کوێر و گومڕایی سەرسوڕهێنەر نەدەبوو کەخەڵکان بەدڵخوازی خۆیان بیەیڤن و گرفتاری زیان و بەڵاکان بن، مەبەستی ئێوە لەزانستەکەتان پێش نەدەکەوت و کردەوەکانتان پێش مەبەستەکانتان نەدەکەوت. لەئامۆژگاری هەوەس و زیانی دوو بەرەکی خۆتان بەدوور بگرن چوونکە فێڵ لەوتار باشتر لەشمشێر بریندار دەکات. ئەم کارە بەدەست کراوەی ئەمین بسپێرن کەجێی ڕەزامەندی هەمووان بێت و هەمووتان جێگەی ڕەزامەندین، ئەوکەسەی وشیار بێت و هەمووتان وشیارن، شوێنکەوتەی لەرێدەرچووی گومڕا مەبن و دژایەتی ڕێبەری فرەزانی خۆتان مەکەن. ئەم قسەیە بەئێوە دەڵێم و بۆ ئێوە و خۆم لەخواوەندی گەورە، داوای لێخۆش بوون دەکەم.

عوسمان قسەی کرد و وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی محەممەدی وەك پێغەمبەر(د.خ) هەڵبژارد و وەك رەسووڵ رەوانەی کرد و بەڵێن و مەبەستەکانی خۆی لەسەر دەستی ئەو هێنایەدی. ئەوی کردە پێشەوای کەسانی دوور و نزیك، خواوەند ئێمە بکاتە شوێنکەوتەی ئەو و بۆ رێگەی راست رێنوێنیمان بکات چوونکە نووری ئێمەیە و لەکاتی دووبەرەکی هەوەسەکان و شەڕ لەگەڵ نەیاران، پشت بەفەرمان و فەرموودەکانی ئەو دەبەستین.

خواوەند بەرێزی خۆی ئێمەی کردۆتە پێشەوای خەڵکان و بەهۆی شوێنکەوتنی ئەو، بووینە ئەمیری خەڵکان تا ئەم کارە لەناو خۆماندا بمێنێتەوە و بێگانە دەستی بەسەردا نەگرێت مەگەر ئەو کەسەی راستییەکان پشتگوێ و لەدادپەروەری دوور بکەوێتەوە کەشیاوە ئەی کوڕی عەوف چاوی لێ بپۆشن و شیاوە بەو شێوە بێت. ئەگەر دژایەتی کارەکەی تۆیان کرد و وەڵامی بانگێشتەکەی تۆیان نەدایەوە، من یەکەم کەسم وەڵامی تۆ دەدەمەوە و وتەکانت پشتڕاست دەکەمەوە و بەڵێن دەدەم و لەخواوەند بۆ ئێوە و خۆم داوای بەخشین دەکەم.

زوبەیر کوڕی عەوام قسەی کرد و وتی: لەکاتی دووبەرەکی هەوەسەکان و سەرکێشی کردن، خواوەند نەناسراو نامێنێتەوە و شوێنکەوتەی ئەو ریسوا و زەلیل نابێت. هەرکەس کەمتەرخەمی لەوتەکەی تۆ بکات، گومڕا دەبێت و هەرکەس وەڵامی بانگێشتەکەی تۆ نەداتەوە، بەدبەخت دەبێت. ئەگەر سنوورەکانی خوا و ئەرکە پێویستەکانی خواوەند نەدەبوو، مەرگ رزگاری بوو لەپاشایەتی و هەڵاتن لەم دیارە پارێزگاری کردن بەڵام ئەرکی خواییمان لەسەر شانە و دەبێت ئەنجامیان بدەین و سوونەتەکان ئاشکرا بکەین بۆ ئەوەی گومڕا نەبین و گرفتاری کوێری نەزانی نەبین. من وەڵامی بانگێشتەکەی تۆ دەدەمەوە و سەبارەت بەوەی باست کرد، هاوڕای تۆم، هێز و توانایی بەهاوکاری خواوەندە و بۆ خۆم و ئێوە داوای بەخشین دەکەم.

سەعد کوڕی وەقاس قسەی کرد و وتی: سوپاس بۆ خوای سەرەتا و خواوەندی ئەنجام، سوپاسی دەکەم چوونکە لەگومڕایی و تاریکی رزگاری کردم و رێگەی راستی نیشاندام. هەرکەس رزگاری بوو، رزگاری لەخواوەندەوە دەستکەوت و هەرکەس پاك بوویەوە، بەهۆی بەزەییەکانی خواوەند، سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

بەبەرەکەتی محەممەد کوڕی عەبدوللە ڕێگەکان ڕووناك و ڕێڕەوەکان بەهێز و ئارام و ڕاستییەکان دەرکەوت و خراپەکان لەناچوون، ئەی خەڵکینە، لەوتاری ناڕاست و ئارەزووی کەسانی لەخۆبایی خۆبەدوور بگرن چوونکە نەتەوەیەك پێش ئێوە، ئەوەی ئێوە لەدەستتان گرتووە، لەدەستیان گرت و بەوەی گەیشتوون، گەیشتن بەلاّم ئارەزووە ناڕەواکانیان هەموی بەفیڕۆدا و خواوەند بوو بەدوژمنیان و بەنەحلەتی کردن. خواوەند دەفەرمێت:

((لعن الذين كفروا من بنى اسرائيل على لسان داود و عيسى بن مريم ذلك بماعسوا و كانوا يعتدون. كانوا لا يتناهون عن منكر فعلوه لبئس ما كانوا يفعلون.

واتاکەی: ئەو کەسانە لەمناڵەکانی ئیسرائیل کە ڕوویان کردۆتە کوفر، لەسەر زمانی داوود و عیسا کوڕی مریەم بەنەحلەت کران بۆ ئەوەی یاخیگەری و گوناحیان کردە پیشە و دەستدرێژییان کرد و لە کارە قێزەونەکانی خۆیان دەستیان هەڵنەدەگرت و چەندە خراپ بوو ئەو کردەوانەی ئەنجامیان دەدا.))

بۆ تەڵحە کوڕی عوبەیدالله، ئەوەی سەبارەت بەخۆم وتم، لەجیاتی ئەویش دووبارەی دەکەمەوە و دەستەبەری وتارەکەی ئەو و خۆمم و بەو بەڵێنەی لەلایەن تەڵحەوە دەیدەم، پێبەند.

ئەی کوڕی عەوف ئەم کارە لەدەستی تۆدا بێت، بەگیان و دڵ هەوڵ بدە و خێرخوازی خەڵکان بە و خواوەند شایەتە تا ڕێگەی دادپەروەری بگریتەبەر و گەڕانەوە بۆ لای خواوەندە.. بۆ خۆم وئێوە داوای بەخشین دەکەم و لەدژایەتی کردنی ئێوە پەنا بۆ خواوەند دەبەم.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب قسەی کرد و وتی:

سوپاس بۆ خواوەند کە محەممەدی وەك پێغەمبەر(د.خ) لەناو ئێمەدا هەڵبژارد و وەك پێغەمبەر(د.خ) بۆ لای خەڵکانی نارد. ئێمە لەبنەماڵەی پێغەمبەرین و کانی زانست و ئەمانی خەڵکانی سەر زەوی و هۆکاری ڕزگاری ڕزگاری خوازەکان. ئێمە مافێکمان هەیە ئەگەر بۆمان بگەڕێننەوە، وەریدەگرین و ئەگەر نەیدەن، سوار پشتی وشترەکان دەبین، هەرچەندە ڕێگە درێژ بێت.

ئەگەر پێغەمبەر(د.خ) فەرمانێکی بەئێمەدەدا، ئەنجاممان دەدا و ئەگەر وتەیەکی دەهێنایە سەرزمان، تا گیان بەخشین بەرگریمان لێدەکرد، کەس بۆ وەلاّمدانەوەی

بانگەوازی راستی و رێز گرتن لەپەیوەندی خزمایەتی، پێش من نەکەوتووە و هەموو هێز و توانایییەك لەخواوەندەوە سەرچاوە دەگرێت.

وتەکانی من ببیستن و لەوتارەکەم تێبگەن، ئەگەری هەیە دوای ئەم کۆبوونەوەیە ببینن کەسەبارەت بەم کارە شمشێرەکان لەکالان دەردەکێشرێن و پەیمانەکان دەشکێندرێن تا کۆببنەوە و دەستەیەك لەپێشەواکانتان شوێنکەوتەی گومڕایی و نەزانین.

عەبدولرەحمان وتی: کێتان بەرەزامەندی واز لەم کارە دەهێنێت و بەکەسێکی دیکەی دەسپێرێت.

دەڵێت: کەس وەلامی نەدایەوە و وتی: من خۆم و کوڕە مامەکەم، لەم کارە دوور دەکەوینەوە.

ئەوان، کارەکەیان خستە ئەستۆی ئەو، لای مینبەر سوێندیدان و سوێندی خوارد بۆ ئەوەی لەگەڵ هەر کەسێك بەیعەت بکات، بەیعەت بکەن ئەگەر تەنانەت بەدەستێکی لەگەڵ دەستەکەی دیکەی بەیعەت بکات.

عەبدولرەحمان سێ رۆژ لەماڵەکەی مایەوە. ماڵەکەی لەنزیك مزگەوت و هەنووکە بەگۆڕەپانی داد ناوی دەبەن و لەبەر ئەم کارە ئەو ناوەی پێبڕا. لەم کاتەدا سۆهەیب لەگەڵ خەڵکان پێشنوێژی دەکرد.

دەڵێت: عەبدولرەحمان کەسی بەدوای عەلیدا نارد و پێی وت: ئەگەر بەیعەت لەگەڵ تۆ نەکەم، کێ پەسەند دەکەیت؟

وتی: عوسمان.

دواتر کەسی بەدوای عوسماندا نارد و پێی وت: ئەگەر لەگەڵ تۆ بەیعەت نەکەم، کێ پەسەند دەکەیت؟

وتی: عەلی.

پێی وتن: برۆن.

زوبەیری بانگ کرد و وتی: ئەگەر بەیعەت لەگەڵ تۆ نەکەم، کێ پەسەند دەکەیت؟

وتی: عوسمان.

سەعدی بانگ کرد و وتی: تۆ کێ پەسەند دەکەیت؟ من تۆ خوازیاری خەلافەت

نین، کێ هەڵدەبژێریت؟

وتی: عوسمان.

بۆ شەوی سێیەم وتی: ئەی میسوەر.

وتی: ئامادەم.

وتی: تۆ خەوتوویت، سوێند بەخوا سێ شەوە خەو لەچاوم نەکەوتووە، بڕۆ و عوسمان و عەلی بانگ بکە.

دەڵێت: وتم: خاڵۆ گیان، لەکامیانەوە دەست پێبکەم؟

وتی: لەهەر کام دەخوازیت؟

دەڵێت: ڕۆشتمە لای عەلی، دڵم لەگەڵ ئەو بوو، وتم: وەرە بۆ لای خاڵۆم.

وتی: تۆی بەدوای کەسێکی دیکەیش نارد؟

وتم: بەڵێ.

وتی: کێ؟

وتم: عوسمان.

وتی: پێی وتیت سەرەتا کاممان بانگ بکەیت؟

وتی: لێم پرسی، وتی: هەرکامیان کەدەخوازیت.

دەڵێت: عەلی هاوڕێ لەگەڵ من هات تا گەیشتینە شوێنی نشینگەکان، لەوێ دانیشت و من ڕۆشتم بەدوای عوسماندا، بینیم سەرقاڵی نوێژ کردن بوو.

وتم: وەرە بۆ لای خاڵۆم.

وتی: تۆ بەدوای کەسی دیکەدا نارد؟

وتم: بەڵێ.

وتی: کێ؟

وتم: عەلی.

وتی: پێی وتیت لەکاممانەوە دەستپێبکەیت؟

وتم: پرسیم، وتی: لەهەرکامیان دەخوازیت و هەنووکە عەلی لەشوێنی نشینگەکان چاوەڕێیە.

عوسمان لەگەڵ من هات، هەر سێکمان ڕۆشتینە لای خاڵۆم، ڕووەو قیبلە وەستا بوو و سەرقاڵی نوێژ خوێندن بوو. سلاوی نوێژەکەی دایەوە، ڕووی کردە عەلی و

عوسمان و وتی: سەبارەت بەئێوە و کەسانی دیکە پرسیارم کرد، خەڵکان کەس بەبەرابەر لەگەڵ ئێوە نازانن، ئەی عەلی، ئایا لەسەر بنەمای کتێبی خواوەند و سوونەتی پێغەمبەر(د.خ) و کردەوەکانی ئەبوبەکر و عومەر بەیعەت لەگەڵ من دەکەیت؟

وتی: بەلاّم بەئەندازەی توانای خۆم.؟

رووی کردە عوسمان و وتی: ئایا لەسەر بنەمای کتێبی خواوەند و سوونەتی پێغەمبەر(د.خ) و کردەوەی ئەبوبەکر و عومەر بەیعەت لەگەڵ من دەکەیت؟

وتی: بەڵێ. عەبدولرەحمان دەستی لەشانیدا و وتی: بەو شێوەیە دەخوازن.

دەڵێت: ڕۆشتینە ناو مزگەوت، بانگیان فەرموو.

عوسمان دەڵێت: لەشەرما کشامە دواوە، بینیم سەیری عەلی دەکرد، لەکۆتایی مزگەوتەکەدا بووم.

دەڵێت: عەبدولرەحمان کوڕی عەوف ئەو دەستارەی پێغەمبەر(د.خ) لەسەری بەستبوو، لەسەری بەستبوو، شمشێرەکەی دەرکێشا، ڕۆشت و لەسەر مینبەر دانیشت. ماوەیەکی زۆر وەستا. دۆعایەکی خوێندەوە کەخەڵکان نەیانبیست، دەستی بەقسە کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، من لەئێوە بەنهێنی و ئاشکرا پرسیارم کرد و بینیم کەس لەگەڵ ئەم دوو پیاوە بەرابەری ناکات: یا عەلی، یا عوسمان، ئەی عەلی وەرە بۆ لای من.

دەڵێت: عەلی هەستا و لای مینبەرەکە وەستا. عەبدولرەحمان دەستی ئەوی گرت و وتی: ئایا لەسەر بنەمای کتێبی خواوەند و سونەتی ئەبوبەکر و عومەر بەیعەت لەگەڵ من دەکەیت؟

وتی: نا، بەلاّم بەئەندازەی هەوڵ و توانایی خۆم.

دەڵێت: دەستی عەلی بەردا و وتی: ئەی عوسمان وەرە پێش. دەستی ئەوی گرت، لەشوێنەکەی عەلیدا وەستابوو، وتی: ئایا لەسەر بنەمای کتێبی خواوەند و سوونەتی پێغەمبەر(د.خ) و کردەوەی ئەبوبەکر و عومەر بەیعەت لەگەڵ من دەکەیت؟

وتی: بەڵێ.

دەڵێت: عەبدولرەحمان بەهەمان شێوە کەدەستی عوسمانی لەدەستا بوو، سەری

بۆ تاقی مزگەوتەکە بەرز کردەوە و وتی: خواوەندا ببیستە و شایەت بە، ئەوەی لەئەستۆی مندا بوو، خستمە ئەستۆی عوسمان.

دەڵێت: خەڵکان کۆبوونەوە و لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان بەیعەتیان بەست بەشێوەیەك لەدەوری مینبەرەکە گەمارۆیان دابوو.

عەبدولرەحمان لەسەر جێگەکەی پێغەمبەر(د.خ) دانیشت و عوسمان لەخوار ئەو جێگەی گرت. خەڵکان لەبەیعەت کردن بەردەوام بوون.

دەڵێت: عەلی گەڕایەوە و عەبدولرەحمان ئەم ئایەی خوێندەوە:

((ومن نکث فانما ینکث علی نفسه و من اوفی بماعاهد علیه الله فسیؤتیه اجرا عظیما.

واتاکەی: هەرکەس پەیمانەکەی بشکێنێت، لەزیانی خۆی ئەو کارە دەکات و هەرکەس رێز لەپەیمانەکەی بگرێت، پاداشتێکی گەورەی دەست دەکەوێت.))

عەلی گەڕایەوە و پاڵی بەخەڵکانەوە دەنا و بەیعەتی لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان بەست و دەیوت: فریو، چ فریوێك؟

عەبدولعەزیز دەڵێت: هۆکاری ئەوەی عەلی دەیوت فریو، ئەوە بوو عەمرۆ عاس لەیەکێك لەشەوەکانی راوێژ کردن، عەلی بینی و وتی: عەبدولرەحمان پیاوێکی زانایە و ئەگەر بڕیارێکی بەبڕشت بدەیت، ئارەزووی بۆ تۆ نامێنێت، باسی هەوڵ و توانایی بکە تا تۆ هەڵبژێرێت.

دەڵێت: دواتر عوسمانی بینی و وتی: عەبدولرەحمان پیاوێکی زانایە، تەنیا بەبڕیاری بەبڕشت بەیعەت لەگەڵ تۆ دەکات. ئەو، ئەو کارەی کرد و لەبەر ئەمە عەلی دەیوت: فریو.

دەڵێت: عوسمانی بۆ ماڵی فاتیمە کچی قەیس برد و دانیشت، خەڵکانیش هاورێیەتیان دەکرد. موغەیرە کوڕی شوعبە قسەی کرد و وتی: ئەی باوکی محەممەد، سوپاس بۆ خوا کەسەرکەوتنی پێ بەخشیت چوونکە کەس جگە لەعوسمان بۆ خەلافەت شیاو نەبوو. عەلی لەوێ دانیشتبوو.

عەبدولرەحمان وتی: ئەی کوڕی دەباغ، تۆ کارت بەم کارانە چییە، سوێند بەخوا لەگەڵ هەرکەس بەیعەتم دەکرد، ئەم قسانەت دووبارە دەکردەوە.

دەڵێت: عوسمان لای مزگەوتەکە دانیشت و داوای عوبەیدالله کوڕی عومەری کرد. ئەو لەماڵی سەعد کوڕی وەقاس زیندانی بوو. ئەو بوو دوای ئەوەی عوبەیدالله

جوفەینە و هورموزان و کچی باوکی لۆلۆی گرت، شمشێرەکەی لەدەست دەرهێنا. عوبەیداللە وتبووی: سوێند بەخوا ئەو کەسانەی لەکوشتنی باوکم بەشدار بوون، دەکوژم. بەم قسەی ئاماژەی بۆ موهاجیر و ئەنسارەکان دەکرد. سەعد ڕۆشت و شمشێرەکەی لێسەند و قژی راکێشا تا کەوتە سەر زەوی و لەماڵەکەی خۆی زیندانی کرد تا ئەو کاتەی عوسمان ئەوی ئازاد کرد.

عوسمان بەدەستەیەك لەموهاجیر و ئەنسارەکانی وت: سەبارەت بەم پیاوە کە ئەم پێشهاتەی لەئیسلامدا دروست کرد، بۆچوونتان چییە؟

عەلی وتی: بۆچوونی من ئەوەیە بیکوژێت.

یەکێك لەموهاجیرەکان وتی: دوێنێکە عومەر کوڕی خەتابیان کوشت و ئەمڕۆ کوڕەکەی بکوژن.

عەمرۆ کوڕی عاس وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، خواوەند تۆی لەم کارە بەخشیوە چوونکە ڕووداوەکە لەسەردەمی خەلافەتی تۆ ڕووی نەداوە. ئەم پێشهاتە کاتێك ڕوویدا هێشتا خەلافەتت نەگرتبووە دەست.

عوسمان وتی: بەڵام سەرپەرەستی ئەوانم، دییەیان پێدەدەم و لەسامانی خۆم دەیبەخشم.

دەڵێت: زیاد کوڕی لوبەیدی بەیازی یەکێك لەئەنسارییەکان، کاتێك عوبەیداللە کوڕی عومەری دەبینی، هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەی عوبەیداللە

کوڕی ئەروی (عوسمان کوڕی عەفان چوونکە دایکی ناوی ئەروی بوو) پەناگە و شوێنی هەڵاتنی تۆ نییە

سوێند بەخوا بەناڕەوا خوێنێکت ڕشت

کوشتنی هورموزانیش گرنگ بوو

بەبێ هۆ تەنیا لەبەر وتەی کەسێك.

ئایا هورموزان بۆ کوشتنی عومەر کوڕی خەتاب تاوانبار دەکەن؟

کەسێکی بێ ئاوز وتی: بەڵێ، تاوانباری دەکەم.

دەڵێت: عوبەیداللە کوڕی عومەر لەزیاد کوڕی لوبەید و هۆنراوەکەی سکاڵای بردە

لای عوسمان. عوسمان ڕێگەی ئەو کارەی لێگرت و زیاد هۆنراوەیەکی لەبارەی عوسمان هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

((ئەی باوکی عەمرۆ دوودڵ مەبە چوونکە

عوبەیداللە بەشدار لەکوشتنی هورموزان

و تۆ گوناحەکەی ئەوت بەناڕەوا بەخشی

گوناحەکەی ئەو ئاشکرایە.))

عوسمان زیاد کوڕی لوبەیدی بانگ کرد و لەو دیارە دووری خستەوە.

سەعید کوڕی موسەییب دەڵێت: بەرەبەیانی ئەو ڕۆژەی عومەر کوڕی خەتاب بریندار کرا، عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر وتی: دوێشەو لای باوکی لۆلۆ تێپەڕیم، جوفەینە و هورموزانی لەگەڵدا بوون. کاتێک لەناکاو منیان بینی، شڵەژان و خەنجەرێك کەوتە خوار. دوو سەری بوو و دەسکەکەی لەناوەڕاست، بزانن سەروەری باوەڕداران بەچ شمشێرێك کوژراوە.

باوکی لۆلۆ چەند کەسێکی دیکەی لەناو مزگەوتەکە بریندار کرد و کاتێك لەعومەر کوڕی خەتاب جیابوویەوە، یەکێك لەمناڵەکانی تەمیم شوێنی کەوت و کوشتی و کاتێك گەڕایەوە و خەنجەرەکەی لەگەڵ خۆی هێنا، عوبەیداللە کوڕی عومەر ئەمەی بیست و چاوەڕوان بوو تا باوکی مرد. دواتر شمشێرەکەی هەڵگرت و ڕۆشتە لای هورموزان و ئەوی کوشت. کاتێك شمشێرەکەی لەجەستەی چەقاند، وتی: لا الە الا اللە. دواتر بۆ کوشتنی جوفەینە بەڕێکەوت. ئەو، مەسیحی و لەخەڵکانی حیرە و باوکی شیری سەعد کوڕی مالك و ئەوی لەبەر ئاشتی نێوان خۆی و مەسیحییەکان هێنابوویە مەدینە تا نووسین فێری خەڵکان بکات و کاتێك عوبەیداللە شمشێری لێدا، خاچی بەناوچاوی خۆیدا کێشا. سوهەیب لەم کارە ئاگادار بوویەوە و عەمرۆ کوڕی عاسی نارد و گفتوگۆی لەگەڵ کرد. سەعد دەیوت: دایك و باوکم قوربانت بن، شمشێرەکە بدە بەمن، کاتێك ششمێرەکەی دانا، سەعد پەلاماریدا و قژی گرت و بەراکێشان بردیە لای سوهەیب.

## ساڵی بیست و چوارەم دەستی پێکرد

## کارگوزارانی عومەر کوڕی خەتاب لەویلایەتەکان

لەو ساڵەی عومەر کوڕی خەتاب کوژرا، یانی ساڵی بیست و سێیەم، کارگوزاری عومەر کوڕی خەتاب لەمەککە، نافیع کوڕی عەبدولحارسی خوزاعی بوو، کارگوزاری تاییف، سوفیان کوڕی عەبدوللەی سەقەفی، کارگوزاری سەنعا یەعلی کوڕی مونەبە هاوپەیمانی مناڵەکانی نەوفل کوڕی عەبدمەناف، کارگوزاری جوند عەبدوللە کوڕی ئەبی رەبیعە، کارکوزاری کوفە، موغەیرە کوڕی شوعبە، کارگوزاری بەسرە، باوکی موسای ئەشعەری، کارگوزاری حمس عومەیر کوڕی سەعد، کارگوزاری دیمەشق معاویە کوڕی ئەبوسوفیان، کارگوزاری بەحرەین و سەرزەمینەکانی دەوروبەر، عوسمان کوڕی ئەبی عاسی سەقەفی بوو.

لەم ساڵەدا یانی ساڵی بیست و سێیەم، بەوتەی واقدی، قتادە کوڕی نەعمان کۆچی دوایی کرد و عومەر کوڕی خەتاب نوێژی لەسەر خوێند.

هەروەها لەم ساڵەدا معاویە، لەهاویندا جەنگا و تا عەمورییە پێشڕەوی کرد. لەئەسحابەکانی پێغەمبەر(د.خ)، عوبادە کوڕی سامت و باوکی ئەییووب، خالید کوڕی زەید و ئەبوزەر و شەداد کوڕی ئەوس، هاورێیەتیان دەکرد.

هەروەها لەم ساڵەدا معاویە دەستی بەسەر عەسقەلاندا گرت.

دەڵێن: لەو ساڵەی عومەر کوڕی خەتاب کۆچی دوایی کرد، سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە، شورەیح و سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی بەسرە، کەعب کوڕی سور بوو. بەڵام وەك لەگێڕانەوەی مەسعەب کوڕی عەبدوللە لەکوڕی شەهابی زوهری دەگێڕنەوە، ئەبوبەکر و عومەر، داوەریان نەبوو.

## ڕووداوە گرنگەکانی ساڵی بیست و چوار

لەم ساڵەدا وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان بەست. لەکاتی بەیعەتەکە بۆچوونەکان جیاوازە. دەستەیەك وەك لەگێڕانەوە یەعقوب کوڕی زەید ئاماژەی پێدراوە، دەڵێن: بەیعەتی عوسمان لەڕۆژی دووشەممە یەك ڕۆژ بۆ کۆتایی زیحەججەی ساڵی بیست و سێیەم و موحەڕەمی ساڵی بیست و چوار خەلافەتی ئەو دەستی پێکرد.

دەستەیەکی دیکە وەك لەگێڕانەوەی باوکی مەعشەر ئاماژەی پێدراوە، وتوویانە بەیعەتی عوسمان عام الرعاف یانی ساڵی بیست و چوارەم بوو. ئەم ساڵەیان بەعام الرعاف ناو بردووە لەبەر ئەوەی لەسەرەتای ساڵ ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان گیرۆدەی خوێنبەر بوونی لووت بوون و ڕعاف بەمانای خوێنبەر بوونی لووتە.

دەستەیەکی دیکە وەك لەگێڕانەوەی موجالید و کەسانی دیکە هاتووە، دەڵێن: سێ ڕۆژ لەموحەڕەمی ساڵی بیست و چوار تێپەڕی و عوسمان خەلافەتی گرتەدەست و هاتەدەر و لەگەڵ خەڵکان نوێژی خوێند و مانگانەی زیاد و نێردراوانی ڕەوانە کرد. ئەمە کارە بوو بەنەریت.

شەعبی دەڵێت: شەش کەسەکە ڕۆژی سێیەمی موحەڕەم سەبارەت بەخەلافەتی عوسمان بڕیاریاندا، ئێواری بوو، بانگدەری سوهەیب بانگی دا و خەڵکان کۆببوونەوە. لەو کاتەدا عوسمان هات و لەگەڵ خەڵکان نوێژی خوێند. سەد درەمی بەمانگانەی خەڵکان زیاد کرد و خەڵکی ویلایەتەکانی ڕەوانە کردەوە. یەکەم کەس بوو ئەو کارەی کرد.

دەستەیەکی دیکە وەك لەگێڕانەوەی واقدی ئاماژەی پێدراوە، دەڵێن: بەیعەت بەستن لەگەڵ عوسمان لەدەی موحەڕەم سێ ڕۆژ دوای کوژارنی عومەر کوڕی خەتاب ئەنجام درا.

## وتاری عوسمان و کوژرانی هورموزان بەدەستی عوبەیدالله کوڕی عومەر

بەدر کوڕی عوسمان لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێک بۆ خەلافەتی عوسمان بڕیاریاندا، لەهەموویان خەمبارتر بوو، هات و لەسەر مینبەری پێغەمبەر(د.خ) دانیشت، سوپاسی خوای کرد و وتی:

((ئێوە لەماڵێکی تێپەڕدا ژیان بەسەر دەبەن و لەپاشماوەی تەمەنتان، پێش ئەوەی بەکۆتایی بگات، تا دەتوانن چاکە بکەن چوونکە بەرەبەیان یا ئێواریٚ ئەگەری هەیە مەرگتان بگات. بزانن تەماحی دنیا غرورە، ژیانی دنیا مەغروورتان نەکات، وانە لەپێشینان وەربگرن و گرفتاری بیٚ ئاگایی مەبن چوونکە خواوەند لەئێوە بیٚ ئاگا نابێت. منداڵ و براکانی دنیا کەسەرقاڵی ئاوەدان کردنەوەی دنیا بوون و ماوەیەکی دوورو درێژ سوودیان لیٚ وەرگرت، چییان بەسەر هات؟ مەگەر دنیا ئەوانی لەناو نەبرد؟ دنیا بەشێوەیەك پشتگویٚ بخەن کەخواوەند پشتگوێی خستووە و بەدوای ئەو دنیاوە بن چوونکە خواوەند سەبارەت بەو دنیا نموونەیەکی باشی هەیە و دەفەرمێت: ((واضرب لهم مثل الحیوة الدنیا کماء انزلناه من السماء فاختلط به نبات الارض فاصبح هشیما تذروه الریاح و کان الله علی کل شیی مقتدرا. المال و البنون زینة الحیوة الدنیا، و الباقیات الصالحات خیر عندربك ثوابا و خیر املا.

واتاکەی: بۆ ئەوان نموونەی ئەم دنیایە باس بکە، هاوشێوەی ئاوێکە کە لەئاسمانەوە ڕەوانەمان کرد و بەهۆیەوە گیاکانی زەوی بەردەوام دەبێت و وشك دەبن و با بلاٚوەیان پێدەکات و خواوەند بۆ هەموو شتێك بەتوانایە. ماڵ و منداڵەکان هۆکاری ڕازاندنەوەی ژیانە و کارە شیاوەکان لای پەروەردگار دەمێنێتەوە و پاداشتی باشتر و هیوای زیاتریان لێدەکرێت.))

خەڵکان هاتن و بەیعەتیان لەگەڵ کرد.

باوکی مەنسور دەڵێت: بیستم قومازبان سەبارەت بەکوژرانی باوکی دەیوت: عەجەمەکانی مەدینە هاتوچۆی یەکیان دەکرد، فیروز لای باوکم تێپەڕی و خەنجەرێکی دوو سەری پێبوو. باوکم خەنجەرەکەی بەدەستەوە گرت و وتی: لەم سەرزەمینە ئەم خەنجەرەت بۆ چییە؟

وتی: کەسانێکی پێ دەکوژم.

کەسێك ئەمەی بینی و کاتێك عومەر کوڕی خەتاب کوژرا، وتی: ئەم خەنجەرەم بەدەستی هورموزانەوە بینی و دای بەفیروز. عوبەیدالله هات وهورموزانی کوشت. کاتێك عوسمان خەلافەتی گرتەدەست، منی بانگ کرد و عوبەیداللەی تەسلیم کرد، وتی: کوڕم، ئەمە بکوژی باوکی تۆیە، و گیانی لەدەستی تۆدایە، بڕۆ و بیکوژە.

دەڵێت: ئەوم برد. دەستەیەکی زۆر لەخەڵکان بەدواما هاتن و دەیانویست بیکوژن.

وتم: کوشتنی ئەو لەدەستی مندایە.

وتیان: بەڵێ و جوێنیان بەعوبەیدالله دەدا.

وتم: دەتانەوێت پشتیوانی لێ بکەن؟

وتیان: نە و دووبارە جوێنیان پێدا.

من لەبەر خوا ئەوم بەخشی. منیان خستە سەر دەست و لەسەر دەستی خەڵك گەڕامەوە بۆ ماڵەکەی خۆم.

## فەرمانڕەوایەتی سەعد کوڕی ئەبی وەقاس لەکوفە

لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی عەفان موغەیرە کوڕی شوعبەی لەکوفە لابرد و وەك لەگێڕانەوەی شەعبیدا ئاماژەی پێدراوە، سەعد کوڕی وەقاسی لەجێگەی ئەودانا.

دەڵێت: عومەر وتی: پێشنیار بەخەلیفەی دوای خۆم دەکەم، لەتواناییەکانی سەعد کوڕی ئەبی وەقاس کەڵك وەربگرێت چوونکە من ئەوم لەبەر خیانەت یا خراپەکاری لەسەر کار لانەبرد و دەترسم بەمشێوەیە گرفتاری ئازاب و ڕەنج ببێت. یەکەم کارگوزار بوو عوسمان دیاریکرد. ئەوی بۆ کوفە نارد و موغەیرە کوڕی شوعبەی لەسەر کار لابرد. لەو کاتەدا موغەیرە لەمەدینە بوو. سەعد یەك ساڵ و بەشێك لەساڵێکی دیکە لەکوفە مایەوە بەلام باوکی موسا بۆچەندین ساڵ لەشوێن و پێگەی خۆیدا بوو.

زەید کوڕی ئەسلەم لەباوکی دەگێڕێتەوە: عومەر کوڕی خەتاب پێشنیاری کردبوو کارگوزارانی ئەو بۆ ماوەی یەك ساڵ بهێڵنەوە و کاتێك عوسمان هاتە سەر کار، بۆ

ماوەی یەك ساڵ موغەیرەی لەكوفە هێشتەوە و دواتر ئەوی لابرد و وەلید كوڕی عوقبەی كردە فەرمانڕەوای كوفە.

ئەگەر ئەم حەدیسە راست بێت، سەعد كوڕی ئەبی وەقاس لەساڵی بیست و پێنج بەنوێنەرایەتی عوسمان كاروبارەكانی كوفەی گرتۆتەدەست.

## نامەكانی عوسمان كوڕی عەففان بۆ كارگوزاران و فەرمانڕەواكان و خەڵكان بەگشتی

تەڵحە دەڵێت: كاتێك عوسمان كوڕی عەفان خەلافەتی گرتەدەست، عەبدوللە كوڕی عامری بۆ كابول نارد كەبەشێك لەسیستان بوو. ئەو، گەیشتە كابول و دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت. سنووری سیستان لەخوراسان زیاتر و كاتێك معاویە مرد، خەڵكانی كابول ئاڵای شۆڕشیان بەرز كردەوە.

دەڵێت: یەكەم نامەی عوسمان كە بۆ كارگوزارانی خۆی نووسی بەمشێوە بوو:

((بەلأم دواتر، خواوەند فەرمانی بەپێشەواكان داوە، پشتیوان بن نەك خەراج وەرگر، پێشەواكانی ئەم ئۆمەتە پشتیوان بوون نەك خەراج وەرگر. زۆری نەماوە پێشەواكانی ئێوە ببنە خەراج وەرگر و چیتر بۆ خەڵكان پشتیوان نەبن. ئەگەر ئەمە رووبدات، شەرمە و ئەمانەت و ئەمەكداری نامێنێتەوە. بزانن دادپەروەرانەترین كردار ئەوەیە لێكۆڵینەوە لەكاروباری موسوڵمانان و ماف و ئەركەكانی ئەوان بكەن: ئەوانەی مافیان هەیە، بۆیان بگێڕنەوە و ئەوەی دەبێت بیدەن، لێیان وەربگرن. دواتر كاروباری ئەو كەسانەی جەزیە (ئەهلی زەممە) دەدەن، سامان بدەن و مافیان بۆ بگێڕنەوە و ڕێز لەپەیمانەكانیان بگرن و بەهۆی ڕێزگرتن لەپەیمانەكانتان سەركەوتن بەسەر دوژمناندا بەدەست بێنین))

دەڵێت: یەكەم نامەی كە بۆ سەركردەی سوپاكانی نیشتەجێ لەسنوورەكان ڕەوانەی كرد، بەمشێوە بوو:

((بەلأم دواتر، ئێوە پارێزەران و بەرگریكارانی ئیسلامن و عومەر كوڕی خەتاب چەندین ئەركی بەئێوە سپارد و ئێمە لێی بێ ئاگا نەبووین و بەراوێژ كردن لەگەڵ ئێمە كارەكانی ئەنجام دەدا. نەبیستم كەس لەئێوە گۆڕانكاری لەكارەكانی دروست

بکات چوونکە خواوەند بارودۆختان دەگۆڕێت و کەسانی دیکە دەهێنێتە جێگەی ئێوە. لێکۆڵینەوە لەخۆتان و بارودۆخی خۆتان بکەن چوونکە من بۆ ئەو ئەرکەی خواوەند پێی سپاردووم، لێکۆڵینەوە دەکەم.))

دەڵێت: یەکەم نامە کە بۆ لێپرسراوانی کۆکردنەوەی باج، ڕەوانەی کرد، بەمشێوە بوو:

((خواوەند ئافرێنراوەکانی بەراستی ئافراند و تەنیا بەراستی رازی دەبێت. لەبەر خوا، ماف بستێنن و ماف بدەن. ئەمانەتدار بن، ڕێز لەئەمانەتییەکان بگرن. لەدەستەی یەکەم کەسان مەبن کەخیانەت لەئەمانەت دەکەن. لەکردەوەکانی خۆتان بیر لەئەخلاق بکەنەوە. ڕێز لەپەیمانەکانتان بگرن. ستەم لەهەتیو و پەیماندارەکان مەکەن چوونکە خواوەند دوژمنی کەسانێکە ستەم لەوان دەکەن.))

دەڵێت: نامەی بۆ خەڵکان بەگشتی نووسی:

((بەلاّم دواتر، ئێوە بەهۆی شوێنکەوتنی خواوەند گەشتوونەتە ئێرە، دنیا گومڕاتان نەکات چوونکە کاروباری ئەم ئۆمەتە تەنیا بەسێ شت کۆدەبێتەوە و ڕوو لەتازەگەری دەکات: تەواو بوونی نیعمەت و بەدەست هێنانی ئەسیرەکان لەلایەن منداڵەکانتانەوە و قورئان خوێندنی سارانشینەکان و عەجەمەکان کە پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کوفر لەنەزانیدایە و ئەگەر کارێك نەزانێت، ئەرکەکان لەسەر شانی خۆی لادەبات و تازەگەری دەکات.))

شەعبی دەڵێت: یەکەم خەلیفە سەد درەمی بەمانگانەی خەڵکان زیاد کرد، عوسمان کوڕی عەفان بوو. عومەر کوڕی خەتاب بۆ منداڵی ئەو کەسانەی مانگانەیان وەردەگرت، لەمانگی ڕەمەزان ڕۆژی یەك درەمی زیاد کردبوو، پێیان وت: چی دەبێت ئەگەر خواردنێکی زۆر ئامادە بکەیت و هەموویان کۆبکەیتەوە.

وتی: دەبێت خەڵکان لەماڵی خۆیان تێر بن.

دەڵێت: عوسمان درێژەی بەمشێوازەی عومەر کوڕی خەتابدا و پێی زیاد کرد. بۆ ئەو خواپەرەستەی لەمزگەوت دەمایەوە و بۆ هەژارەکان، خواردنی مانگی ڕەمەزانی ئامادە دەکرد.

لەم ساڵەدا یانی ساڵی بیست و چوارەم، بەوتەی باوکی مێحنەف وەلید کوڕی عوقبە بۆ جەنگی ئازەربایەجان و ڕۆمییە بەرێکەوت چوونکە خەڵکەکەی ئەو برە

پارەی لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب بڕیاریاندا بوو، بیدەن، نەیاندا. بەلاَم لەگێڕانەوەیەکی دیکە، ئەم جەنگە لەساڵی بیست و شەشەم روویدا.

## جەنگی ئازەربایەجان و کاری موسوڵمانان لەکاتی جەنگەکە

فەروە کوڕی لەقیتی ئەزدی غامدی دەڵێت: جەنگەکانی دانیشتووانی کوفە لەرەی و ئازەربایەجان بوو. لەم دوو سنووورە زیاتر لەدە هەزار شەڕکەر لەخەڵکانی کوفە ئامادە بوون: شەش هەزار کەس لەئازەربایەجان و چوار هەزار کەس لەرەی. لەوکاتەدا کوفە چل هەزار شەڕکەری بوو و هەر ساڵە دەهەزار کەسیان بۆ جەنگی ئەم دوو سنووورە بەرێدەکەوتن و هەر چوار ساڵ یەك جار شەڕکەرانی دەرفەتی جەنگیان دەست دەکەوت.

وەلید کوڕی عوقەبە لەرۆژگاری خەلافەتی عوسمان کوڕی عەفان، فەرمانڕەوای کوفە و بۆ جەنگی ئازەربایەجان و ئەرمەنییە بەرێکەوت. سەلمان کوڕی رەبیعەی باهلی وەك پێشەنگی خۆی ڕەوانە کرد. دواتر وەلید لەگەڵ سوپاکە بەرێکەوت. دەیەویست لەسەرزەمینی ئەرمەنییە پێشڕەوی بکات، بەرێکەوت تا گەیشتە ئازەربایەجان و عەبدوللە کوڕی شەبیل کوڕی عەوف ئەحمەسی لەگەڵ چوار هەزار کەس ڕەوانە کرد کەهێرشیان کردە سەر خەڵکانی موقان و بەبر و تیلسان و دەستی بەسەر سامانی ئەواندا گرت و تالاَنی زۆری کۆکردەوە و خەڵکان لەبەرابەر ئەو هەلاَتن. ژمارەیەکی کەمی ئەسیر کرد و بۆ لای وەلید کوڕی عوقەبە گەڕایەوە.

وەلید لەسەر وەرگرتنی هەشسەد هەزار درەم پەیمانی ئاشتی لەگەڵ خەڵکانی ئازەربایەجان مۆر کرد. لەساڵی بیست و دووەم، یەکساڵ دوای جەنگی نەهاوەند، بەمشێوەیە لەگەڵ حوزەیفە کوڕی یەمان پەیمانی ئاشتییان بەستبوو بەلاَم لەکاتی مردنی عومەر کوڕی خەتاب، بەڵێنەکەیان نەبردەسەر. کاتێك عوسمان کوڕی عەفان خەلافەتی گرتەدەست، وەلید کوڕی عوقەبەی وەك فەرمانڕەوای کوفە دەستنیشان کرد و لەگەڵ سوپاکەی هێرشی کردە سەر ئەو سەرزەمینە. کاتێك ئاگادار بوونەوە، ملکەچی خۆیان نیشاندا و داویان لێکرد پەیمانەکەی پێشوو زیندوو بکەنەوە. وەلید ئەو کارەی کرد و سامانەکەی لێوەرگرتن و کەسانێکی نارد تا لەسەرزەمینەکانی

دەوروبەر، هێرش بکەنە سەر دوژمنی موسوڵمانان.

کاتێک عەبدوللە کوڕی شەبیلی ئەحمەسی لەهێرشەکەی خۆی تەندروست گەڕایەوە و تالآنی فراوانی لەگەڵ خۆی هێنابوو، لەساڵی بیست و چوار وەلید، سلێمان کوڕی ڕەبیعەی باهلی لەگەڵ دوانزە هەزار کەس بۆ ئەرمەنییە نارد. سلێمان گەیشتە ئەو سەرزەمینەو دەستی بەکوشتاری خەڵکان کرد و تالآنی زۆری کۆکردەوە و بەدەستی پڕ گەڕایەوە بۆ لای وەلید کوڕی عوقبە.

## کۆبوونەوەی ڕۆمییەکان دژی موسوڵمانان

داوای هاوکاری کردنی موسوڵمانان لەدانیشتووانی کوفە

لەم ساڵەدا، بەوتەی باوکی مێحنەف، ڕۆمییەکان کەوتنە جموجۆڵ و سوپای موسوڵمانان لەشام داوای هاوکارییان لەعوسمان کوڕی عەفان کرد.

دەڵێت: کاتێک وەلید لەجەنگی ساڵی بیست و چوار بەمەبەستەکەی خۆی گەیشت و ڕۆشتە ناو موسڵ و لەمەدینە نیشتەجێ بوو، نامەی عوسمانی پێ گەیشت بەم ناوەڕۆکە:

((بەلآم دواتر، معاویە کوڕی ئەبوسوفیان نامەی بۆ نووسیوم کەڕۆمییەکان سوپایەکی گەورەیان دژی موسوڵمانان کۆکردۆتەوە، کاتێک نامەکەی من بەدەستی تۆ بگات، لەهەمان شوێن کەنێردراو دەگاتە لای تۆ، کەسێک کەبڕوات بەئازایەتی و بوێری ئەو هەیە لەگەڵ هەشت هەزار کەس یا نۆ هەزار یا دەهەزار کەس بۆ هاوکاری ئەوان ڕەوانە بکە. والسلام.))

وەلید لەناو خەڵکان دەرکەوت، سپاسی خوای کرد و وتی:

((بەلآم دواتر، ئەی خەڵکینە! خواوەند لەم قۆڵەوە ئەزموونێکی چاکەی لەگەڵ موسوڵمانان نواند و ئەو شارانەی کافر ببوون، دووبارە موسوڵمان بوونەوە و ئەو شارانەی دەستیان بەسەردا نەگیرابوو، دەستیان بەسەردا گیرا و موسوڵمانان لەگەڵ تالآنی و سەرکەوتنەکان ژیان بەسەر دەبەن و شیاوە سوپاسی پەروەردگاری جیهانیان بکەین. سەروەری باوەڕداران فەرمانی پێداوم دەهەزار یا هەشت هەزار کەس لەئێوە ڕەوانە بکەم تا هاوکاری برا موسوڵمانەکانتان لەشام بکەن چوونکە

ڕۆمییەکان دژی ئەوان سوپایەکی گەورەیان کۆکردۆتەوە. لەم کارەدا پاداشتێکی گەورە چاوەڕوانتان دەکات، خوا لێتان خۆش بێت، لەگەڵ سەلمان کوڕی ڕەبیعەی باهلی بەرێکەون.))

دەڵێت: خەڵکان بەرێکەوتن و سێ ڕۆژی نەخایاند هەشت هەزار کەس لەخەڵکانی کوفە بەرێکەوتن و لەگەڵ خەڵکانی شام ڕۆشتنە سەرزەمینی ڕۆمییەکان. سەرکردەی سوپاکەی شام، حەبیب کوڕی موسلیمەی فیهری و سەرکردەی خەڵکانی کوفە، سەلمان کوڕی ڕەبیعەی باهلی بوو. لەسەرزەمینی ڕۆم جەنگان و تا ئەو جێگەی دەیانخواست تالآنی و ئەسیریان کۆکردەوە و دەستیان بەسەر چەندین قەلآدا گرت.

بەوتەی واقدی ئەو کەسەی سەلمان کوڕی ڕەبیعەی باهلی بۆ هاوکاری حەبیب کوڕی موسلیمە نارد، سەعید کوڕی عاس بوو. بەسەرهاتەکەی بەمشێوەیە: عوسمان نامەی بۆ معاویە نووسی تا حەبیب کوڕی موسلیمەی فیهری لەگەڵ سوپایەك بۆ جەنگی ئەرمەنییە ڕەوانە بکات. معاویە ئەوی ڕەوانە کرد. حەبیب ئاگادار بوویەوە کەموریانی ڕۆمی لەگەڵ هەشتا هەزار جەنگاوەری ڕۆمی و تورك، مەبەستی هێرش کردنی هەیە. ئەم بابەتەی بۆ معاویە نووسی و معاویە عوسمان کوڕی عەفانی ئاگادار کردەوە. عوسمان کوڕی عەفان نامەی بۆ سەعید نووسی و فەرمانی پێدا سوپایەك بۆ هاوکاری حەبیب کوڕی موسلیمە ڕەوانە بکات. ئەو، سەلمان کوڕی ڕەبیعەی لەگەڵ شەش هەزار شەرکەر ڕەوانە کرد.

دەڵێت: حەبیب پیاوێکی کارزان و بەبڕشت بوو. بڕیاریدا بەشێوەیەکی لەناکاو و شەوانە هێرش بکاتە سەر موریان. ژنەکەی دایکی عەبدوڵڵەی کەلبی کچی یەزید ئەمەی بیست و وتی: شوێنی بەڵێن دراوی تۆ کوێیە؟

وتی: یا خێوەتەکەی موریان یا بەهەشت.

بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی برد و هەر کەس هاتە سەر ڕێگەی کوژرا و گەیشتە خێوەتەکەی موریان و بینی ژنەکەی پێش خۆی گەیشتووە. یەکەم ژنی عەرەب بوو خێوەتیان بۆ هەڵدا.

کاتێك حەبیب مرد، زوحاك دایکی قەیسی فیهری دایکی عەبدوڵڵەی کردە هاوسەری خۆی و منداڵەکانی زوحاك لەو ژنەن.

سەبارەت بەوکەسەی لەم ساڵەدا حەجی لەگەڵ خەڵکان کرد، بیروبۆچوونەکان جیاوازە، دەستەیەك وتوویانە عەبدولرەحمان کوڕی عەوف بەفەرمانی سەروەری باوەڕداران، حەجی لەگەڵ خەڵکان کرد.

باوکی مەعشەر و واقدی و کەسانی دیکە وتوویانە: عوسمان کوڕی عەفان لەم ساڵەدا حەجی لەگەڵ خەڵکان کرد.

جیاوازی سەبارەت بەگرتنی چەندین ناوچە کەدەستەیەك وتوویانە لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب بەدەست هاتوون و دەستەیەکی دیکە بۆ سەردەمی عوسمان کوڕی عەفانی دەگێڕنەوە، پێشتر باسمان کرد.

## ساڵی بیست و پێنج دەستی پێکرد

## ڕووداوە گرنگەکانی ساڵی بیست و پێنجەم

باوکی مەعشەر، وەك لەحەدیسی ئیسحاق کوڕی عیسا ئاماژەی پێدراوە، دەڵێت: ڕووداوی ئەسکەندەرییە لەساڵی بیست و پێنجەم ڕوویدا.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا ئەسکەندەرییە پەیمانەکەی خۆی شکاند و عەمرۆ کوڕی عاس بۆ جەنگ ڕووی لەو سەرزەمینە کرد و خەڵکانی کوشت. پێشتر ئاماژەمان بەم بابەتە داوە و بۆچوونە جیاوازەکان لەگەڵ گێڕانەوەی باوکی مەعشەرمان باس کرد.

بەوتەی واقدی لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی ئەبی سەرح سوپایەکی بۆ مەغریب ڕەوانە کرد.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس پێشتریش دەستەیەکی بۆ مەغریب ناردبوو و تاڵانی زۆریان لەگەڵ خۆیان هێنایەوە. عەبدوللە نامەی بۆ نووسی وبۆ جەنگی ئەفریقییە داوای مۆڵەتی لێکرد و مۆڵەتی پێدا.

دەڵێت: لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی عەفان لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد و کەسێکی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا.

دەڵێت: لەم ساڵەدا چەندین قەڵا دەستیان بەسەردا گیرا و سەرکردەی شەڕکەران معاویە کوڕی ئەبوسوفیان بوو.

دەڵێت: لەم ساڵەدا یەزید کوڕی معاویە چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

دەڵێت: لەم ساڵەدا بۆیەکەم جار شاپوور دەستی بەسەردا گیرا.

## ساڵی بیست و شەشەم دەستی پێکرد

## ڕووداوە گرنگەکانی ساڵی بیست و شەشەم

بەوتەی باوکی مەعشەر و واقدی، گرتنی شاپوور لەم ساڵەدا بوو. پێشتر ئاماژەمان بەگێڕانەوە جیاوازەکاندا.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا سەروەری باوەڕداران فەرمانیدا نیشانەکانی حەرەم تازە بکەنەوە.

دەڵێت: لەم ساڵەدا عوسمان مسجد الحرامی فراوان کرد و بەشێك لەماڵەکانی کڕییەوە و ئەوانەی نەیانفرۆشت، عوسمان ماڵەکانی وێران و بەهای ئەوانی لەبیت المالدا. ئەوان بەسەر عوسماندا قیژاندیان و ئەو، فەرمانی زیندانی کردنی ئەوانی دەرکرد و وتی: دەزانی بۆ لەبەرابەر من بوێر بوون؟ خۆڕاگری من بۆتە ئەم کارەی ئێوە. عومەر کوڕی خەتاب ئەو کارەی لەگەڵ ئێوە کرد بەڵام لەبەرابەر ئەو هیچتان نەوت.

دواتر عەبدوڵلە کوڕی خالید کوڕی ئەسید سەبارەت بەو زیندانییانە لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان قسەی کرد و ئازاد کران.

بەوتەی واقدی لەم ساڵەدا عوسمان سەعدی لەکوفە لابرد و وەلید کوڕی عوقبەی لەجێگەی ئەودانا. بەڵام بەوتەی سەیف، لابردنی سەعد لەکوفە و دانانی وەلید کوڕی عوقبە لەساڵی بیست و پێنجەم بوو کەبەگومانی ئەو لەکاتی مردنی عومەر کوڕی خەتاب موغەیرە کوڕی شوعبەی لەکوفە لابرد و سەعدی کردە کارگوزاری ئەو شارە و بۆ ماوەی یەك ساڵ و چەند مانگ لەوێ مایەوە.

## وتار سەبارەت بەوەی بۆ عوسمان کوڕی عەففان سەعدی لەکوفە لابرد و وەلیدی لەجێگەی ئەو دانا

شەعبی دەڵێت: یەکەم گەندەڵی لەناو خەڵکانی کوفە دەرکەوت - کوفە یەکەم شار بوو لەدەورانی ئیسلام. شەیتان لەناو خەڵکەکەی گەندەڵی و فسادی دروست کرد—ئەوە بوو سەعد کوڕی ئەبی وەقاس بەشێك لەسامانی بیت المالی لە عەبدوللە کوڕی مەسعود بەقەرز وەرگرت و کاتێك داوای قەرزەکەی خۆی کردەوە، بۆی کۆنەکرایەوە. دەمەقاڵێ لەنێوان ئەواندا دروست بوو: عەبدوللە داوای هاوکاری لەچەند کەسێك کرد تا سامانەکە وەربگرێتەوە و سەعد داوای لەچەند کەسێك کرد تا مۆڵەتی زیاتری بۆ وەربگرن. دووبەرەکی هاتە کایەوەو یەکتریان سەرکۆنە کرد. دەستەیەك سەرکۆنەی سەعد و دەستەیەك سەرکۆنەی عەبدوللەیان دەکرد.

قەیس کوڕی ئەبی حازم دەڵێت: لای سەعد دانیشتبووم، هاشم کوڕی عوتبەی برازای ئامادە بوو. کوڕی مەسعود هاتە لای سەعد و وتی: سامانەکەی بیت المالْ بگەڕێنەرەوە.

سەعد وتی: خراپ دەبینی، مەگەر تۆ کوڕی مەسعود نیت کەبەندەی منداڵەکانی هوزەیل بووﺟ

وتی: بۆنا، من کوڕی مەسعود و تۆیش کوڕی حومەینەی.

هاشم وتی: بەڵێ و هەردووکتان لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بوون و لەئێوە رازی.

سەعد دارێکی بەدستەوە بوو، فڕیدا— ئەو پیاوێکی توند و تیژ بوو—دەستی بەرز کردەوە و وتی: ئەی خواوەندی ئاسمانەکان و زەوی....

عەبدوللە وتی: هاوار لەتۆ چاکە بێنەرە سەرزمان و نەحلەت مەکە.

لەم کاتەدا سەعد وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ترسی خواوەند نەدەبوو، دۆعایەکم دەهێنایە سەرزمان، کەخواوەند گیرای دەکرد.

عەبدوللە بەخێرایی ڕۆشتەدەر.

عەبدوللە کوڕی عەکی دەڵێت: کاتێك لەنێوان کوڕی مەسعود و سەعد سەبارەت بەو قەرزەی عەبدوللە بەسەعدیدابوو، دەمەقاڵە هاتە ئاراوە، چوونکە سەعد توانای دانەوەی نەبوو، عوسمان کوڕی عەفان تورە و ویلایەتی کوفەی لەسەعد وەرگرتەوە.

لە عەبدوللەیش تورە بوو بەلاّم ئەوی بەخشی. وەلیدی کردە کارگوزاری کوفە. ئەو، لەلایەن عومەر کوڕی خەتابەوە وەك کارگوزاری خەڵکی رەبیعە و جەزیرە دەستنیشان کرابوو، هاتە کوفە. ماڵەکەی دەرگای نەبوو تا ئەو کاتەی شارەکەی بەجێهێشت.

تەڵحە دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان لەرووداوەکەی نێوان سەعد و عەبدوللە ئاگادار بوویەوە، تووڕە و مەبەستی لابردنی هەردووکیانی کرد. دواتر لەم مەبەستەی چاوی پۆشی، سەعدی لەسەر کار لابرد و عەبدوللەی هێشتەوە و پەیامی بۆ نارد. لەجیاتی سەعد، وەلید کوڕی عوتەبەی کردە فەرمانڕەوای کوفە کەعومەر کوڕی خەتاب وەك کارگوزاری عەرەبەکانی جەزیرە دەستنیشانی کردبوو. وەلید لەساڵی دووەمی خەلافەتی عوسمان هاتە کوفە. سەعد یەك ساڵ و چەند مانگ کارگوزاری کوفە بوو. کاتێك وەلید هاتە کوفە، لای خەڵکان خۆشەویست و بەشێوەیەکی شیاو، هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەوان دەکرد. پێنج ساڵ لەو شارە مایەوە بێ ئەوەی ماڵەکەی دەرگای هەبێت.

## ساڵی بیست و حەوتەم دەستی پێکرد

### ڕووداوە گرنگەکانی ساڵی بیست و حەوت

یەکێك لەڕووداوە گرنگەکانی ئەم ساڵە گرتنی ئەفریقییە لەسەر دەستی عەبدوڵڵە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح بوو. ئەم حەدیسەیان لەباوکی مەعشەر گێڕاوەتەوە. واقدیش گێڕانەوەیەکی هاوشێوەی هەیە.

## گرتنی ئەفریقییە و فەرمانڕەوایەتی عەبدوڵڵە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح

### لەمیسر و لەسەرکار لابردنی عەمرۆ کوڕی عاس

تەڵحە دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب کۆچی دوایی کرد، عەمرۆ کوڕی عاس فەرمانڕەوایی میسر و خاریجە کوڕی فلان سەرپەرەستی دامەزراوەی داد بوو. عوسمان کوڕی عەفان تا دوو ساڵ لەخەلافەتی خۆی ئەوانی لەپێگەکەی خۆیاندا هێشتەوە، دواتر عەمرۆی لەسەر کار لابرد و عەبدوڵڵە کوڕی ئەبی سەرحی وەك کارگوزاری خۆی دەستنیشان کرد.

باوکی عوسمان دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان خەلافەتی گرتەدەست، عەمرۆعاسی وەك کارگوزاری میسر هێشتەوە چوونکە ئەو بێ سکالا و گازندە کەسی لەسەر کار لانەدەبرد. عەبدوڵڵە کوڕی سەعد یەکێك لەسوپاییەکانی میسر بوو. عوسمان کوڕی عەفان ئەوی کردە سەرکردەی سوپا و چەندین کەسی بۆ هاوکاری ئەونارد و ڕەوانەی ئەفریقییەی کرد، عەبدوڵڵە کوڕی نافیع کوڕی عەبدولقەیس و عەبدوڵڵە کوڕی نافیع کوڕی حەسینی کردە هاوڕێی عەبدوڵڵە کوڕی سەعد و پێی وت: ئەگەر خواوەند ئەفریقییەی لەسەر دەستی تۆ گرت، یەك لەسەر پێنجی ئەو تالانییەی خواوەند بە موسوڵمانانی بەخشیوە، بەتۆ دەبەخشرێت. دوو عەبدوڵڵەکەی کردە سالار و شەڕکەرانی بۆ هاوکاری ئەوان ڕەوانە کرد. بەرەو ئەندولۆس بەڕێکەوتن و بەوان و عەبدوڵڵە کوڕی سەعد فەرمانیدا دژی ئەجەل کۆببنەوە. دواتر عەبدوڵڵە لەشوێنی خۆی بمێنێتەوە و ئەوانی دیکە بۆ شوێنی کارەکانی خۆیان

بەرێبکەون.

ئەوان بەرێکەوتن و رێگەی میسریان بڕی و کاتێک لەسەرزەمینی ئەفریقییە پێشڕەوییان کرد و رووبەرووی ئەجەل بوونەوە کەچەندین هۆز هاورێیەتیان دەکرد، شەڕیان دەسپێکرد و ئەجەل کوژرا. عەبدوللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح ئەوی کوشت و دەستی بەسەر هەموو دەشت و کێوەکانی ئەفریقییەدا گرت و دانیشتووانەکەی بەگشتی باوەڕیان بەئیسلام هێنا. عەبدوللە تالآنییەکانی بەسەر موسوڵمانان دابەش کرد و یەک لەسەر پێنجی هەڵگرت و چواریەکی بەکوڕی وەسیمەی نەسری بۆ عوسمان کوڕی عەفان نارد و لەشوێنی قیروان خێوەتێکی هەڵدا و دەستەیەکی وەک وەفدی نوێنەرایەتی رەوانە مەدینە کرد. ئەو کەسانە سەبارەت بەوەی عەبدوللە هەڵیگرتبوو، سکاڵایان لێکرد.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: من پێم بەخشیوە و دەبێت ئەو کارە بکات چوونکە فەرمانی منی ئەنجام داوە، ئێستا لەدەستی ئێوەدایە، ئەگەر رازین، بۆ ئەو دەبێت و ئەگەر رازی نەبن، لێی وەردەگرینەوە.

وتیان: رازی نین.

عوسمان کوڕی عەفان بۆ عەبدوللەی نووسی تا تالآنییەکان بگەڕێنێتەوە.

وتیان: ئەو لەسەر کار لابەرە چوونکە ناخوازین دوای ئەم رووداوە چیتر ئەو سەرکردەمان بێت.

عوسمان کوڕی عەفان نامەی بۆ عەبدوللە نووسی: کەسێک کەجێگەی رەزامەندی تۆ و ئەوان بێت، وەک جێگری خۆت لەئەفریقییە دەستنیشان بکە و ئەو یەک لەسەر پێنجەی لەرێگەی خواوەند بەتۆم بەخشی، لەناو سوپاییەکان دابەش بکە چوونکە بەم بەخششە رازی نین.

عەبدوللە کەدەستی بەسەر ئەفریقییەدا گرت و ئەجەلی کوشت، فەرمانەکانی ئەنجامدا و بۆ میسر گەڕایەوە.

دەڵێت: خەڵکانی ئەفریقییە تارۆژگاری هوشام کوڕی عەبدولمەلیک بەردەوام گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانەکان بوون و بەئارامی و ئاسایش ژیانیان بەسەر دەبرد تا ئەوی پێی خەڵکانی عێراق گەیشتە ئەو سەرزەمینە و کاتێک بانگەوازکەرانی عێراق رۆشتنە ئەفریقییە و ئەوانیان هاندا، ئاڵای شۆڕش و یاخی بوونیان بەرز

کردەوە و دوو بەرەکی لەناو ئەوان هاتە ئاراوە و تا ئێستا بەردەامە.

هۆکاری دووبەرەکی ئەمە بوو کەئەوان بەبانگەوازکەرانی نەیاریان دەوت: ئێمە بەهۆی کردەوەی سەرکردەکانمان دژایەتی پێشەوا ناکەین و قورسایی ئەم تاوانە ناخەینە ئەستۆی ئەوان.

وتیان: سەرکردەکان بەفەرمانی پێشەواکان دەجوولێنەوە.

وتیان: رازی نابین تا خۆمان لێکۆڵینەوە بکەین.

ئەوسا مەیسرە و چەند کەسێك بەرێکەوتن و رۆیشتنە لای هوشام و داوای مۆڵەتیان کرد بەڵام پێیان نەدرا. رۆشتنە لای فەرمانڕەوا و وتیان: بە سەروەری باوەڕداران بڵێ سەرکردەکەمان سوپاکەی خۆی بۆ جەنگ دەبات و کاتێك تالآنییان دەست دەکەوێت، بەوان دەدات و بەئێمە نادات و دەڵێت: ئەوان شیاوترن.

ئێمە دەڵێین: جیهاد و جەنگی ئێمە لەرێگەی خوادایە و هیچی لێ وەرناگرین، ئەگەر مافی خۆمانە، حەلآڵیان بێت و ئەگەر مافی ئێمە نییە، نامانەوێت.

هەروەها وتیان: کاتێك گەمارۆ دەخەینە سەر شارێك، دەڵێت: پێش کەون و سوپاکەی خۆی دوای ئێمە دەهێنێت.

ئێمە دەڵێین: پێشڕەوی بکەن تا پاداشتی زیاترتان پێببڕێت و کەسانی هاوشێوەی ئێوە، قورسایی باری براکانی خۆتان بخەنە سەر شان. خۆمان دەکەینە قەڵغانی ئەوان و دەجەنگین.

هەروەها دەکەونە ناو ڕانە مەڕەکانی ئێمە و لەناویان دەبەن، کاژۆڵەکان دەردێنن و بۆ سەروەری باوەڕداران بەدوای سپی پێست دەگەڕێن، هەزار سەر مەڕ بۆ دۆزینەوەی یەك مەڕ دەکوژن و دەڵێین: ئەمە لەبەر سەروەری باوەڕداران کێشە نییە. خۆڕاگری دەکەین و نابینە رێگر لێیان. بەلآیەکی دیکە ئەوەی کە کچە جوانەکانی ئێمە دەگرن. دەڵێین: ئەمە نە لەکتێبی خوادا هەیە و نە لەسوونەت، ئێمە موسوڵمانین.

دەمانەوێت بزانین ئەم کارانە بەفەرمانی سەروەری باوەڕداران ئەنجام دەدرێت یا نە؟

وتی: ئەو کارەتان بۆ دەکەم.

کاتێك ماوەیەکی زۆر مانەوە و درەمەکانی خۆیان خەرج کرد، نامەکانی خۆیان نووسی و تەسلیمی وەزیرەکانیان کرد و وتیان: ئەمە ناو و ڕەچەڵەکی ئێمەیە، ئەگەر سەروەری باوەڕداران، هەواڵی ئێمەی پرسی، ئاگاداری بکەنەوە.

دواتر بەرەو ئەفریقییە گەڕانەوە و دژی کارگوزارەکەی هوشام راپەڕین و کوشتیان و دەستیان بەسەر ئەفریقییەدا گرت. هوشام ئاگادار بوویەوە و بەدوای ئەو چەند کەسەدا گەڕا و ئەویان لەناو و نیشانی ئەوان ئاگادار کردەوە.

تەڵحە دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان، عەبدوڵلە کوڕی نافیع کوڕی حەسین و عەبدوللە کوڕی نافیع کوڕی عەبدولقەیسی دوای گرتنی ئەفریقییە بۆ ئاندۆلۆس نارد و لەڕێگەی دەریاوە گەیشتنە ئەو سەرزەمینە. عوسمان کوڕی عەفان بۆ ئەو کەسانەی روویان لەو سەرزەمینە کرد، نووسی: بەڵام دواتر، قوستەنتینە لەلای ئاندۆلۆسەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت، ئێوە ئەگەر دەستتان بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت، لەپاداشتی ئەو کەسانەی دەست بەسەر قوستەنتەنییەدا دەگرن، هاوپشکن. والسلام.

کەعب الاخبار وتی: کاتێك نەتەوەیەك لەڕێگەی دەریاوە رووبکەنە ئاندۆلۆس و دەستی بەسەردا بگرن، لەرۆژی هەستانەوە رووناکی ئەوان دیار دەبێت.

دەڵێت: موسوڵمانان بەرێکەوتن وبەربەرەکانیش هاورێیەتیان دەکردن و لەدەشت و کێو و دەریاوە هێرشیان کردە سەر ئەو سەرزەمینە. خواوەند ئەوسەرزەمینە و فەرەنگانی بەموسوڵمانان بەخشی و سنوورێکی هاوشێوەی ئەفریقییە بەسنووری موسوڵمانان زیاد کرا. کاتێك عوسمان کوڕی عەفان عەبدوللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرحی لەسەر کار لابرد، کارەکەی ئەو بە عەبدوللە کوڕی نافیع کوڕی عەبدولقەیس سپارد کەلەوێ بوو و عەبدوللە کوڕی سەعد بۆ میسر گەڕایەوە. بارودۆخی ئاندۆلۆس هاوشێوەی بارودۆخی ئەفریقییە بوو تا ئەوەی لەرۆژگاری هوشام، زەوی بەربەرەکانی گرت بەڵام خەڵکانی ئاندۆلۆس وەك خۆیان مانەوە.

واقدی لەزمانی کەریب دەگێڕێتەوە: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان عەمرۆ کوڕی عاسی لەسەر میسر لابرد، ئەو، تورە و ڕق و کینەی عوسمانی لەدڵ گرت. عوسمان کوڕی عەفان، عەبدوللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرحی ڕەوانە و فەرمانی پێدا روو لەئەفریقییە بکات و پێشنیاری هێرش کردنە سەر ئەفریقییە بەشەڕکەران بدات. دە

هەزار کەس لەقورەیش و ئەنسار و موهاجیرەکان خۆیان ئامادە کرد.

واقدی لە کوڕی کەعب دەگێڕێتەوە: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان عەبدوللە کوڕی سەعدی بۆ ئەفریقییە نارد، جەرجیر، بەتریقی ئەفریقییە سەبارەت بەو سەرزەمینە بەدوو هەزار هەزار دینار و پێنسەد هەزار دینار و بیست هەزار دینار، پەیمانی ئاشتی لەگەڵ واژۆ کردن.

دوای ئەوە پاشای رۆم کەسی نارد و فەرمانیدا سێسەد کێشی زێر لەوان بستێنێت بەهەمان شێوە کەعەبدوللە کوڕی سەعد لەوانی وەرگرتبوو. ئەو، سەرکردەکانی ئەفریقییەی کۆکردەوە و وتی: پاشا فەرمانی بەمن داوە ئەو برە زێرە لەئێوە وەربگرم بەهەمان شێوە کە عەبدوللە کوڕی سەعد لەئێوەی وەرگرت.

وتیان: هیچمان نییە بیدەین، ئەوەی بوومان، بۆ بەهای ئازادی خۆمان و گیانی خۆمان، تەسلیمی موسوڵمانانمان کرد، پاشا سەروەری ئێمەیە، بەوەی ساڵانە لەئێمەی وەردەگرت، بەسەندە بکات.

نێردراو کاتێك وەڵامەکەی ئەوانی بیست، فەرمانی زیندانی کردنی ئەوانیدا و ئەوان کەسیان بۆ لای هاوەڵانی خۆیان نارد کەهاتن و زیندانەکانیان شکاند و ئازادیان کردن.

عەبدوللە کوڕی سەعد لەگەڵ خەڵکانی ئەفریقییە لەسەر سێسەد کێشی زێر پەیمانی ئاشتی بەست و عوسمان کوڕی عەفان بەبنەماڵەی حەکەمی بەخشی.

دەڵێت: وتم: یا بنەماڵەی مەروان.

وتی: نازانم.

یەزید کوڕی باوکی حەبیب دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان، عەمرۆ کوڕی عاسی لەکۆکردنەوەی خەراجی میسر لابرد و عەبدوللە کوڕی سەعدی بۆ ئەو کارە راسپارد. دژایەتی لەنێوان ئەوان دروست بوو، عەبدوللە کوڕی سەعد نامەی بۆ عوسمان کوڕی عەفان نووسی کەعەمرۆ خەراجی کەم کردۆتەوە و عەمرۆ نووسی کە عەبدوللە کاروباری تایبەت بەجەنگی پەرێشان کردووە.

عوسمان کوڕی عەفان فەرمانی گەڕانەوەی بۆ عەمرۆ نووسی و عەبدوللە کوڕی سەعد وەك لێپرساوی کۆکردنەوەی خەراج هێشتەوە. عەمرۆ کوڕی عاس تووڕە

گەڕایەوە بۆ لای عوسمان کوڕی عەفان. عابایەکی یەمەنی پڕ لۆکەی لەبەر کردبوو.

عوسمان پێی وت: چی لەناو عاباکەتدایە؟

وتی: عەمرۆ.

وتی: دەزانم، لەبەری عەمرۆدایە، سەبارەت بەوە پرسیارم نەکرد، پرسیم ئایا لۆکەیە یا شتی دیکە؟

واقدی دەڵێت: عەبدوللە کوڕی سەعد ئەو سامانەی لەمیسر کۆی کردبوویەوە، بۆ عوسمان کوڕی عەفانی نارد.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: ئەی عەمرۆ، دوای تۆ شیردەر، شیری زیاتر دەدات.

وتی: بێچووەکەی لەناو چووە.

لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی عەفان سەرپەرەستی حەج و حاجییەکان بوو.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا بۆ دووەم جار ئیستەخر لەسەر دەستی عوسمان کوڕی ئەبی عاس دەستی بەسەردا گیرا.

دەڵێت: لەم ساڵەدا معاویە لەقێنسرین جەنگی کرد.

ساڵی بیست و هەشت دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی بیست و هەشت

بەوتەی واقدی لەم ساڵەدا قیبرێس لەسەر دەستی معاویە دەستی بەسەردا گیرا. معاویە بەفەرمانی عوسمان کوڕی عەففان بۆ جەنگی ئەو سەرزەمینە بەرێکەوت. بەڵام باوکی مەعشەر دەڵێت: گرتنی قیبرێس لەساڵی سی و سێیەم ڕوویدا. ئیسحاق کوڕی عیسا ئەم حەدیسەی لەو گێڕاوەتەوە.

دەستەیەك وتوویانە گرتنی قیبرێس لەساڵی بیست و حەوتەم بوو. وەك دەڵێن: دەستەیەك لەئەسحابەکانی پێغەمبەر(د.خ) و لەناویان ئەبوزەر وعوبادە کوڕی سامت هاوریٚ لەگەڵ ژنەکەی خودام حەرام و میقداد و باوکی دەردا و شەداد کوڕی ئەوس لەو جەنگەدا بەشدار بوون.

## جەنگی قیبرێس لەسەر دەستی معاویە

خالید دەڵێت: معاویە لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب پێداگری دەکرد تا لەدەریا بجەنگێت. باسی نزیکی رۆمییەکانی لەحمس دەکرد و دەیوت: لەیەکێك لەگوندەکانی حمس دەنگی وەڕینی سەگەکان و بانگی مەلەکانی ئەوان دەبیستریٚت. زۆری نەمابوو عومەر کوڕی خەتاب بەم کارە رازی ببێت. نامەی بۆ عەمرۆ کوڕی عاس نووسی تا دەریا و کەشتییەکانی بۆ وەسف بکات بۆ ئەوەی شارەزا و ئاگادار ببێتەوە.

دەڵێت: هۆکارەکەی ئەوە بوو معاویە لەسوودەکانی جەنگی دەریا بۆ موسوڵمانان و زیانی ناباوەڕان، دەئاخاوت.

عەمرۆ لەوەڵامدا نووسی: ئافرێنراوێکی گەورەم بینی کەدەستەیەك ئافرێنراوی بچووك سواری دەبن، ئەگەر بمێنێتەوە، دڵەکان لەت دەکات وئەگەر بڕوات، ئاوزەکان سەریان سووڕدەمێنێت، دڵنیایی نامێنێت و گومان و دوودڵی زیاد دەکات. کەسان لەناویدا هاوشێوەی کرمێکن لەسەر دارێك کەئەگەر خوار ببێت نوقم دەبێت و ئەگەر تەندروست بمێنێتەوە، دەتوانێت ڕێگەیەکی دوور ببڕێت.

کاتێك عومەر کوڕی خەتاب ئەمەی خوێندەوە، نامەی بۆ معاویە نووسی: نا، سوێند بەو خوایەی بەراستی محەممەدی ڕەوانە کرد، هەرگیز ڕێگە نادەم هیچ

موسوڵمانێك سوار كەشتی بێت.

جونادە كوڕی باوكی ئومەییەی ئەزدی دەڵێت: معاویە سەبارەت بەجەنگی دەریا نامەی بۆ عومەر كوڕی خەتاب نووسی و بۆ ئەو كارە هانیدا، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەشام گوندێكی لێیە كەخەڵكەكەی دەنگی وەڕینی سەگی ڕۆمییەكان و دەنگی كەڵەشێرەكانیان دەبیستن، ئەوان لەبەرابەر یەكێك لەكەنارەكانی حمس نیشتەجێن.

عومەر لەوتەكانی ئەو دڵنیا نەبوو، نامەی بۆ عەمرۆ نووسی تا وەسفی دەریای بۆ بكات و ئاگاداری بكاتەوە.

دەڵێت: عەمرۆ لەوەڵامدا نووسی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئافرێنراوێكی گەورەم بینی دەستەیەك ئافرێنراوی بچوك سواری دەبن، تەنیا ئاو و ئاسمان هەیە و هاوشێوەی كرمێكن لەسەر دارێك كەئەگەر خوار ببێت، نوقم دەبن و ئەگەر تەندروست بمێنێتەوە، دەتوانێت مەودایەكی زۆر ببڕێت.

باوكی موجالید دەڵێت: عومەر كوڕی خەتاب نامەی بۆ معاویە نووسی: بیستوومە دەریای شام بەشێكی گەورە و دوور و درێژ لەزەوی دەگرێتەوە و هەموو شەو و ڕۆژێك داوای مۆڵەت لەخوا دەكات تا بڕژێتە سەرزەوی و نوقمی بكات، من چۆن سوپای موسوڵمانان تەسلیمی ئەم كافرە سەرسەختە بكەم. سوێند بەخوا یەك موسوڵمانم لەهەموو سامانەكانی ڕۆم خۆشتر دەوێت، هیچ كات لەو بارەوە نامە بۆ من مەنێرە، پێشتر ئاگادارم كردوویتەوە و دەزانی چ بەڵایەكەم بەسەر عەلا كوڕی حەزرەمی هێنا لەكاتێكدا پێشتر هیچ فەرمانێكم بۆ ڕەوانە نەكردبوو.

دەڵێت: پاشای ڕۆم دەستی لەجەنگ هەڵگرت و بەمەبەستی خۆ نزیك كردنەوە نامەی بۆ عومەر كوڕی خەتاب نووسی و لەو، سەبارەت بەوشەیەك كەهەموو زانستەكان كۆدەكاتەوە، پرسیاری كرد. عومەر كوڕی خەتاب وەڵامی دایەوە: ئەوەی بۆ خۆتی دەخوازیت، بۆ خەڵكانیشت بوێت و ئەوەی بۆ خۆتی بەڕەوا نازانیت، بۆ ئەوانیش بەڕەوای مەزانە، بەمشێوەیە هەموو زانستەكان لای تۆ كۆ دەبێتەوە. لەبارودۆخی دراوسێكانت وانە وەربگرە و هەموو مەعریفەكان لای تۆ كۆدەبێتەوە.

دوای ئەوە پاشای ڕۆم نامەی نووسی و دەفرێكی نارد و وتی: ئەم دەفرە لەهەموو شتێك پڕ بكە.

عومەر کوڕی خەتاب دەفرەکەی پڕ کرد لەئاو و وتی: ئەمە هەموو شتێکی دنیایە.

پاشای رۆم نووسی: دووری نێوان راستی و ناراستی چییە؟

عومەر وەڵامی دایەوە: چوار پەنجەیە. راستی ئەوەیە بەچاو دەبینرێت و ناراستی زۆربەی ئەو شتانەیە دەبیسترێت و نابینرێت.

پاشای رۆم نووسی: دووری نێوان ئاسمان و زەوی چەندە؟

عومەر وەڵامی دایەوە: پێنسەد ساڵ رێگە بۆ رێبوارێك، ئەگەر رێگەیەك بوونی دەبوو.

دەڵێت: دایکی کولسوم کچی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، دیارییەکی لەبۆنی خۆش و کەل و پەلی ژنانە بۆ شاژنی رۆم رەوانە و تەسلیمی نێردراوی کرد. نێردراو دیارییەکانی تەسلیمی شاژنی رۆم کرد.

ژنی هێرقل ژنانی دەوروبەری خۆی کۆکردەوە و وتی: ئەمە دیاری ژنی پاشای عەرەب و کچی پێغەمبەرەکەیانە. نامەی نووسی و چەندین دیاری بۆ ناردەوە. یەکێك لەدیارییەکان گەردنبەندێکی گرانبایی بوو.

کاتێك نێردراو گەردنبەندەکەی بردە لای عومەر کوڕی خەتاب، فەرمانیدا لای خۆی رایبگرێت و خەڵکانی بۆ نوێژی جەماعەت کۆکردەوە. خەڵکان کۆبوونەوە، نوێژی لەگەڵ خوێندن و وتی: هەر کام لەکارەکانی من ئەگەر بێ راوێژ کردن لەگەڵ ئێوە ئەنجام بدرێت، ئەنجامی چاکەی نییە. سەبارەت بەو دیارییەی دایکی کولسوم بۆ شاژنی رۆمی ناردووە و شاژنی رۆمیش دیاری بۆ ناردۆتەوە، بۆچوونتان چییە؟

دەستەیەك وتیان: دیارییەکان تایبەتە بەخۆی، لەبری ئەو شتەی بۆ شاژنی رۆمی ناردووە و ئەو لەژێر فەرمانی تۆدا نییە تا لەتۆ بترسێت.

دەستەیەکی دیکە وتیان: ئێمە جل و بەرگمان بەدیاری دەدا تا دیاری وەربگرین و دەمانفرۆشت و بەهاکەیمان وەردەگرت.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: بەڵام، نێردراو، نێردراوی موسوڵمانانە و رەوانە کراو، رەوانە کراوی ئەوانە و پێگەی دایکی کولسوم لای شاژنی رۆمییەکان، بەهۆی موسوڵمانانەوەیە.

دواتر فەرمانیدا گەردنبەندەکەیان تەسلیمی بیت المال کرد و بەئەندازەی خەرجی دایکی کولسوم، درەمی پێبەخشی.

خالید کوڕی مەعدان دەڵێت: یەکەم کەس لەدەریا جەنگی کرد، معاویە کوڕی ئەبو

سوفیان بوو و لەرۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان. پێشتر داوای مۆڵەتی لەعومەر کوڕی خەتاب کرد و پێی نەدرا و کاتێك عوسمان کوڕی عەفان خەلافەتی گرتەدەست، معاویە پێدارگی کرد تا ئەوەی عوسمان کوڕی عەفان بۆ ئەم کارە بڕیاریدا و وتی: کەسان هەڵمەبژێرە و باشترینی ئەوان دەستنیشان مەکە، هەرکەس بەدڵخواز ئامادەیی لەخۆی نیشاندا، لەگەڵ خۆتی ببە.

معاویە ئەو کارەی کرد، عەبدوللە کوڕی قەیسی حارسی هاوپەیمانی مناڵەکانی فەزارەی بۆ کاروبارەکانی تایبەت بەدەریا راسپارد. ئەو لەدەریا پەنجاجار لەزستان و هاوین شەڕی کرد بێ ئەوەی کەس بخنکێت و کەس گرفتاری تۆفانی دەریا بێت. ئەو، لەخوا دەپاڕایەوە تاسوپاکەی بەتەندروستی بهێڵێتەوە و کەسیان لەناو نەچێت. بەمشێوە بوو تا ئەو کاتەی خواوەند بڕیاری لەناو بردنی ئەویدا. بەبەلەمێك پێشڕەوی کرد و گەیشتە لەنگەرگەی سەرزەمینی رۆم، چەند سواڵکەرێك لەوێ بۆ بەدەست هێنانی بژێوی سواڵیان دەکرد. چەند دینارێکی بەواندا.

یەکێك لەژنە سواڵکەرەکان گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆی و بەپیاوەکانی وت: دەتانەوێت عەبدوللە کوڕی قەیس بگرن؟

وتیان: لەکوێیە؟

وتی: لەنگەرگە.

وتیان: ئەی دوژمنی خواوەند، عەبدوللە کوڕی قەیس چۆن دەناسیت؟

ژن سەرکۆنەی کردن و وتی: ئێوە ریسواتر لەوەن کە عەبدوللە کوڕی قەیس خۆی لەئێوە بشارێتەوە.

پیاوەکان هێرشیان کردە سەر عەبدوللە و شەڕیان لەگەڵ کرد. عەبدوللە جەنگا و بەتەنیایی کوژرا. بەلەمەوانەکەی گیانی دەربرد و بۆ لای هاوەڵانی گەڕایەوە. موسوڵمانان روویان لەلەنگەرگەکە کرد، جێگری عەبدوللە، سوفیان کوڕی عەوف ئەزدی بوو. شەڕی لەگەڵ رۆمییەکان دەستپێکرد بەڵام گرفتار بوو. بڕیاریدا جوێن بەهاوەڵانی خۆی بدات، کەنیزەکەی عەبدوللە وتی: ئەی هاوار لە عەبدوللە، ئەو لەکاتی جەنگ، ئەم قسانەی نەدەهێنایە سەرزمان.

سوفیان وتی: چی دەوت؟

وتی: دەیوت: سەختی و گرفتارییە، بەزوویی کۆتایی پێدێت.

سوفیان وازی لەقسەکانی خۆی هێنا و قسەکانی عەبدوللەی هێنایە سەرزمان.

لەم جەنگەدا دەستەیەك لەموسوڵمانان كوژران و ئەمە كۆتایی ژیانی عەبدوڵلە كوڕی قەیسی حارسی بوو.

دواتر بەو ژنەیان وت: چۆن عەبدوڵلەت ناسییەوە؟

وتی: لەخێر كردنەكەی، چوونكە وەك پاشاكان دەست كراوە بوو و هاوشێوەی بازرگانەكان، رەزیلی لەخۆی نیشان نەدەدا.

باوكی عوسمان دەڵێت: بەو ژنەیان وت كەرۆمییەكانی دژی عەبدوڵلە هاندا: چۆن ئەوت ناسییەوە؟

وتی: هاوشێوەی بازرگانان بوو، بەڵام كاتێك داوای بەخششم لێكرد وەك پاشاكان دەستی كراوە بوو، زانیم عەبدوڵلە كوڕی قەیسە.

عوسمان كوڕی عەفان بۆ معاویە و كارگوزارانی دیكەی نووسی:

((بەڵام دواتر، لەهەمان شێوە و پێگەدا بمێننەوە كەلەعومەر كوڕی خەتاب جیابوونەوە و گۆڕانكاری دروست مەكەن، ئەوەی لای ئێوە كێشە بوو، بۆ ئێمەی بنێرن تا هاودەنگی خەڵكانی لەسەر بەدەست بێنین و بۆ ئێوەی بگەڕێنینەوە. ئاگادارین گۆڕانكاری نەهێننە ئاراوە چوونكە تەنیا بەوەی عومەر كوڕی خەتاب لێتان رازی دەبوو، رازی دەبم)).

لەنێوان ئاشتی عومەر كوڕی خەتاب و خەلافەتی عوسمان كوڕی عەفان، ناوچەیەك پەیمانەكەی دەشكاند و كەسی دەنارد و خواوەند ئەو ناوچەی لەسەر دەستی ئەو كەسە دەگرتەوە بەڵام گرتنەكان بەناوی ئەو كەسانەوە بوو كەیەكەم جار دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینانەدا دەگرت.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: كاتێك معاویە قیبرێسی گرت و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ خەڵكەكەی بەست، وەك لەگێڕانەوەی لەیس كوڕی سەعد یەكێك لەپیرەكانی كەنارەكانی دیمەشق هاتووە، پەیمانی ئاشتی لەسەر بنەمای باجی حەوت هەزار دینار بوو كە ساڵانە بەموسوڵمانانی بدەن، هاوشێوەی ئەو بڕە پارەیشیان بەرۆمییەكان دەدا و موسوڵمانان بەڵێنیاندا رێگر نەبن لەدانی ئەو بڕە پارەیە بەرۆمییەكان بەو مەرجەی موسوڵمانان لەگەڵ ئەوان نەجەنگن و لەگەڵ ئەو كەسانەی لەشوێنەكانی دیكەوە هێرشیان دەكەنەسەر، رووبەروو نەبنەوە و رۆمییەكانی قیبرێس موسوڵمانان لەجووڵەی رۆمییە دوژمنەكان ئاگادار بكەنەوە و ئەو پێشەوایەی موسوڵمانان بۆ ئەوانی دیاری

دەکەن، لەخۆیان بێت.

واقدی دەڵێت: معاویە لەساڵی بیست و هەشت بۆ جەنگی قیبرێس بەرێکەوت و خەڵکانی میسریش بەسەرکردایەتی عەبدوللە کوڕی ئەبی سەرح بۆ جەنگی ئەو سەرزەمینە بەرێکەوتن و کاتێك پەیوەستی معاویە بوون، سەرکردایەتی ئەوانیشی گرتەدەست.

جوبەیر کوڕی نوفەیر دەڵێت: کاتێك خەڵکانی قیبرێسمان ئەسیر کرد، باوکی دەردام بینی کەدەگریا، وتم: بۆ لەکاتێکدا خواوەند ڕێز و پێگەی بە موسوڵمانان بەخشیوە، دەگریت؟

دەڵێت: دەستی خستە سەر شانی من و وتی: دایکت لەپرسەتا دانیشێت، ئافرێنراو ئەگەر پشت بکاتە فەرمانەکانی خواوەند، لای خواوەند بەهای نامێنێت و کاتێك نەتەوەیەك سەرکەوتن بەدەست بێنێت و بەسەر خەڵکاندا زاڵ بن و پاشایەتی لەوان بێت و پشت بکاتە فەرمانەکانی خواوەند، بەوشێوە دەبێت کەدەبینی و خواوەند ئەسیر بوون دەکاتە بەشی ئەوان و کاتێك نەتەوەیەك گرفتاری ئەم بەلآیە بوون، چیتر خواوەند لێیان ناپرسێتەوە.

واقدی لەحەدیسەکەی باوکی سەعید دەڵێت: معاویە لەڕۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان لەگەڵ خەڵکانی قیبرێس پەیمانی ئاشتی واژۆ کرد، ئەو، یەکەم کەس بوو بۆ جەنگی ڕۆمییەکان بەرێکەوت و لەپەیمانێك کە لەنێوان ئەو و ئەوان واژۆ کرا، بڕیاردرا، لەدوژمنانی ڕۆمی تەنیا بەمۆڵەتی ئێمە، هاوسەر بگرن.

دەڵێت: لەم ساڵەدا حەبیب کوڕی موسلیمە بۆ جەنگ لەسورییە بەرێکەوت کەتایبەت بوو بەسەرزەمینی ڕۆم.

هەروەها لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی عەفان نائیلە کچی قەرافسەی کردە هاوسەر. ئەو مەسیحی بوو و پێش ئەوەی بڕواتە ماڵی عوسمان کوڕی عەفان، باوەڕی بەئیسلام هێنا.

دەڵێت: لەم ساڵەدا یەکەم گرتنی فارس و دووەمین گرتنی ئیستەخر ڕوویدا و سەرکردەی جەنگەکە، هوشام بوو.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان لەم ساڵەدا لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد.

سالْی بیست و نۆ دەستی پێکرد.

## ڕووداوە گرنگەکانی سالْی بیست و نۆیەم

لەم سالْەدا عوسمان کوڕی عەففان، باوکی موسای ئەشعەری کەشەش مانگ کارگوزاری بەسرە بوو، لەسەر کار لایبرد و عەبدوللە کوڕی عامر کوڕی کورەیزی (گەنجێکی بیست و پێنج سالْە) وەك کارگوزاری بەسرە دەستنیشان کرد.

بەوتەیەك باوکی موسا سێ سالْ لەبەسرە کارگوزاری عوسمان کوڕی عەففان بوو.

عەوف ئەعرابی دەلْێت: غەیلان کوڕی خەرەشەی زەببی ڕۆشتە لای عوسمان کوڕی عەففان و وتی: مەگەر هەتیوێکتان نییە گەنج بنوێنێت و بیکەنە کارگوزاری بەسرە؟ تا کەی ئەم پیرە پیاوە، باوکی موسا، دەبێت کارگوزاری بەسرە بێت؟

دەلْێت: عوسمان کوڕی عەففان باوکی موسای لەسەر کار لابرد و عەبدوللە کوڕی عامر کوڕی کورەیزی (کوڕی کوڕی عەبدشەمس)، وەك کارگوزاری بەسرە دەستنیشان کرد. دایکی عەبدوللە دەجاجە کچی ئەسما سولەمی و کوڕە پووری عوسمان کوڕی عەففان بوو.

موسلیمە دەلْێت: کاتێك عەبدوللە وەك کارگوزار هاتە بەسرە، تەمەنی بیست و پێنج سالْ بوو. ئەم ڕووداوە لەسالْی بیست و نۆیەم ڕوویدا.

## هۆکاری ئەوەی عوسمان کوڕی عەففان باوکی موسای لەبەسرە لابرد

تەلْحە دەلْێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەففان خەلافەتی گرتەدەست، باوکی موسای بۆ ماوەی سێ سالْ لەبەسرە هێشتەوە و لەسالْی چوارەم ئەوی لەسەر کار لابرد. سەرکردایەتی خوراسانی بەعومەیر کوڕی عوسمان کوڕی سەعد سپارد، سەرکردایەتی سیستان بە عەبدوللە کوڕی عومەیری لەیسی لەخەلْکانی سەعلەبە سپارد کە تاکابول پێشڕەوی کرد، عومەیر لەخوراسان تا فەرغانە پێشڕەوی و هەموو ویلایەتەکانی ئەو سەرزەمینە پەیمانی ئاشتییان بەست. عوبەیدالله کوڕی مەعمەری تیمی بۆ مەکران نارد کەتا ڕووبار ڕۆشتە پێش. عەبدولرەحمان کوڕی غەبیسی بۆ کرمان نارد و کەسانێکی دیکەی بۆ فارس و ئەهواز ڕەوانە کرد و دەوروبەری بەسرەی بەحەسین کوڕی ئەبی بەحر سپارد، دواتر عەبدوللە کوڕی

عومەیری لەسەر کار لابرد و عەبدوللە کوڕی عامری لەجێگەی ئەو دانا و یەك ساڵ مایەوە و ئەوی لەسەر کار لابرد و عاسم کوڕی عەمرۆ بۆ راپەڕاندنی کارەکانی ئەو دیاری کرد. دواتر عەبدولرەحمان کوڕی غەبیس و عودەی کوڕی سوهەیل کوڕی عەمرۆی گەڕاندەوە. لەساڵی سێیەم خەڵکانی ئیزە و کوردەکان دووبارە ناباوەڕ و ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە و باوکی موسا لەناو خەڵکان جاڕیدا و هانیدان و پێشنیاری رووبەروبوونەوەی دوژمنانی پێکردن. باسی لەپێشی و پاداشتەکانی جیهادی کرد تا ئەو رادەی خەڵکان باریان دەخستە سەر پشتی چوارپێکان و بڕیاریاندا بەپێی رووبکەنە گۆڕەپانی جەنگ. دەستەیەکی دیکە وتیان: سوێند بەخوا هەڵپەهەڵپ ناکەین تا کردەوەکانی ئەومان بۆ ئاشکرا ببێت، ئەگەر کرداری هاوشێوەی وتاری بوو، ئەو کارە دەکەین کەهاوەڵانی ئێمە کردیان.

کاتێك رۆژی بەرێکەوتن باوکی موسا دەرکەوت و بارەکانی خۆی لەمیسرەوە لەسەر چل ئێستر هێنایەدەر، جڵەوی ئەسپەکەیان گرت و وتیان: ئێمە سوار چوارپێ زیادەکانی خۆت بکە و بۆ رێگە بڕین بەپێ کەئێمەت هاندەدا، حەز و تامەزرۆیی لەخۆت نیشان بدە. باوکی موسا توانی رازیان بکات واز لەچوارپێکانی بێنن. باوکی موسا بەرێکەوت و ئەوان ڕوویان لەمەدینە و عوسمان کوڕی عەفان کرد و داوای لەسەر کار لابرانی ئەویان کرد، وتیان: نامانەوێت هەموو ئەوشتانەی دەیزانین، باسی بکەین، جێگەی ئەو بەکەسێکی دیکە پڕبکەرەوە.

وتی: کێتان دەوێت؟

غەیلان کوڕی خەرەشە وتی: هەرکەس بێت لەم بەندەیە کەزەوی ئێمە دەخوات و سوونەتەکانی جاهلیەت لەنێوان ئێمەدا زیندوو دەکاتەوە باشترە لەو ئەشعەرییە کەپێگە بەحکومەتی ئەشعەرییەکان دەدات و حکومەتی بەسرە بەکەم بایی دەزانێت. پێمان باشە لەو جیا ببینەوە ئەگەر تەنانەت هەتیوێك بکەیتە ئەمیری ئێمە یا گەورەیەك وەك سەرکردەی ئێمە دەستنیشان بکەیت و لەنێوان بچوك و گەورە هەر کەسێك بێت، باشترە.

عوسمان کوڕی عەفان، عەبدوللە کوڕی عامری وەك کارگوزاری بەسرە دەستنیشان کرد و عوبەیداللە کوڕی مەعمەری بۆ فارس نارد و کارەکەی ئەوی بەعومەیر کوڕی عوسمان سپارد. لەساڵی چوارەم ئەمین کوڕی ئەحمەری یەشکوری

وەك كـارگوزاری خوراسـان و هـەروەها لەسـاڵی چـوارەم عیمـران كـوڕی فـوزەیلی بەرجـەمی وەك كـارگوزاری سیـستان ڕەوانـە كـرد. عاسـم كـوڕی عـەمرۆ كـارگوزاری كرمان و لەو شارە مرد. فارس ئاڵای شۆڕشی بەرز كردەوە و دژی عوبەیداللە كوڕی عـەمرۆ ڕاپـەڕین و خـەڵكانی ئیـستەخر دژی ئـەو كۆبوونـەوە و عەبدوللـە كـوژرا و سوپاكەی شكستی خوارد. ئەم هەواڵە بە عەبدوللە كوڕی عامر گەیشت و پێشنیاری بەرێكـەوتنی بەخـەڵكانی بەسـەردا و خـەڵكان بەرێكـەوتن. فەرمانـدەی پێـشەنگی سـوپاكەی عوسمـان كـوڕی ئـەبی عـاس بـوو. لەئیـستەخر لەگـەڵ خـەڵكان جـەنگان و ژمارەیـەكی زۆر لەخـەڵكی شـارەكە كـوژران كەهێـشتا لەدەرئەنجامـەكانی ئـەو جەنگـە بەریسوایی ژیان بەسەر دەبەن. ئەم هەواڵەی بۆ عوسمان كوڕی عـەفان نووسـی و ئـەو وەڵامـی دایـەوە كـەهیرەم كـوڕی حسامی یەشكوری و هیرەم كـوڕی حـەییانی عەبدی لەخـەڵكانی عەبدقـەیس و خـەریت كـوڕی راشـید لەمناڵـەكانی سـامە (ناجییـە؟) و مینجاب كوڕی راشید و تەرجومانی هوجەیمی بكاتە ئەمیری ویلایەتەكانی فارس. خوراسانی بەشەش كەس سپارد: ئەحنەف بوو بەئەمیری دوو مەرو، حەبیب كوڕی قورەی یەربوعی ئەمیری بەلْخ كە لەسـەر دەستی خەڵكانی كوفە گیرا، خالید كوڕی عەبدوللـە كـوڕی زوهـەیر ئـەمیری هـەرات، ئـەمیر كـوڕی ئەحمـەری یەشـكوری ئـەمیری تـوس، قـەیس كـوڕی هوبـەیرەی سـولەمی ئـەمیری نەیشابور، ئـەو یەكـەم كـەس بـوو لەگـەڵ عەبدوللـە كـوڕی خـازمی كـوڕە مـامی بەرێكـەوت، عوسمـان پـێش مـەرگ فەرمانڕەوایەتی هەموو خوراسانی بەقەیس سپارد و لەكاتی كوژرانی عوسمان كوڕی عـەفان ئـەو، ئـەمیری خوراسـان بـوو. ئـەمین كـوڕی ئەحمـەری كـردە ئـەمیری سیـستان، دوای ئەو، عەبدولرەحمان كوڕی سـەمورەی لەبنەماڵـەی حـەبیب كـوڕی عەبدشەمسی لەو ناوچەیە دانا و لەكاتی كوژرانی عوسمان كوڕی عەفان، ئەمیری سیستان بوو.

هەروەها لەكاتی كوژرانی عوسمان كوڕی عەفان، عیمران ئەمیری كرمان و عومـەیر كـوڕی عوسمـان كـوڕی سـەعد ئـەمیری فـارس و كـوڕی كەنـدیری قوشـەیری ئـەمیری مەكران بوو.

عەلی كوڕی موجاهید لەشێخەكانی خۆی دەگێڕێتەوە: غـەیلان كـوڕی خەرەشـە بـە عوسمان كوڕی عـەفانی وت: ئایا كەسێكی ڕیسواتان نییـە پێگـەی بـەرز بكەنـەوە یـا

کەسێکی هەژار تا سامان بەدەست بێنێت؟ ئەی قوڕەیشییەکان تا کەی ئەم پیرە ئەشعەرییە ئەو ویلایەتە بخوات؟ و پیر لەسەر کار لابرا و بەسرەیان بە عەبدوللە کوڕی عامر سپارد.

ئەبوبەکری هوزەلی دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان، کوڕی عامری کردە کارگوزاری بەسرە و حەسەن وتی: باوکی موسا دەڵێت: گەنجێك دەبێتە فەرمانڕەوای ئێوە کەکارزانە و شارەزا، دایەگەورێکان و پوورەکانی خاوەن پێگەن و فەرمانڕەوایەتی هەر دوو ویلایەتەکە بەو دەسپێرن.

دەڵێت: کوڕی عامر هات و ویلایەتی باوکی موسا و ویلایەتی عوسمان کوڕی ئەبی عاسی سەقەفییان بەو سپارد. عوسمان کوڕی ئەبی عاس لەو کەسانە بوو لەعەممان و بەحرەین تێپەڕین.

تەڵحە دەڵێت: لەرۆژگاری خەلافەتی عوسمان کوڕی عەفان ، قەیس کوڕی هوبەیرە عەبدوللە کوڕی خازمی بۆ لای عەبدوللە کوڕی عامر نارد. عەبدوللە کوڕی خازم لای عەبدوللە کوڕی عامر پێگە و رێزێکی تایبەتی بوو، پێی وت: فەرمانێك بنووسە ئەگەر قەیس کوڕی هوبەیرە لەو سەرزەمینە ڕۆشت، من فەرمانڕەوا بم. عەبدوللە کوڕی عامر ئەو فەرمانەی بۆ نووسی.

عەبدوللە کوڕی خازم گەڕایەوە بۆ خوراسان و کاتێك عوسمان کوڕی عەفان کوژرا و خەڵکان ئاگادار بوونەوە و دوژمن ئالأی شۆڕشی بەرز کردەوە، قەیس وتی: ئەی عەبدوللە، بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: بۆچوونی من ئەوەیە بمکەیتە جێگری خۆت و لەبەرێکەوتن دوا نەکەویت و بەوردی لێکۆڵینەوە لەکارەکان بکەیت. قەیس ئەو کارەی کرد و عەبدوللە کوڕی خازمی وەك جێگری خۆی ناساند. عەبدوللە فەرمانی جێنشینی خۆی نیشاندا و لەخوراسان مایەوە تا ئەو کاتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب خەلافەتی گرتەدەست.

دایکی عەبدوللە لەتایەفەی منداڵەکانی عیجل بوو. قەیس وتی: من لە عەبدوللە زیاتر شیاو بووم کوڕی دایکێکی عێجلی بم. لەکارەکەی عەبدوللە توڕە بوو.

لەم ساڵەدا بەوتەی واقدی و باوکی مەعشەر، کوڕی عامر دەستی بەسەر فارسدا گرت. پێشتر ئامارژەمان بەگێڕانەوەی سەیفدا.

لەم ساڵەدا، یانی ساڵی بیست و نۆیەم، عوسمان کوڕی عەفان مزگەوتی

پێغەمبەری فراوان و لەمانگی رەبیع کاری بینا کردنی دەست پێکرد. گەچیان لەدۆڵی نەخلەوە دەهێنا. مزگەوتەکەی بەبەرد رازاندەوە و ستوونەکانی لەو بەردانە دروست کرد کەبەسورب ناوەکەیان پڕ کرابوویەوە. تاقەکەی لەداری ساج بوو. درێژی مزگەوتەکەی بۆ سەد و شەست زەراع و پانایییەکەی بۆ سەد و پەنجا زەراع فراوان کرد. شەش دەرگای بۆ دانا.

لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی عەفان سەرپەرەستی حاجییەکان بوو و لەمەنی خێوەتی هەڵدا و یەکەم خێوەت بوو لەمەنی هەڵدرا و لەمەنی و عەرەفە نوێژی تەواوی خوێند.

کوڕی عەباس دەڵێت: یەکەم جار کەخەڵکان بەئاشکرا سەبارەت بەکار و کردەوەکانی عوسمان کوڕی عەفان قسەیان کرد ئەوە بوو لەکاتی خەلافەتی خۆی لەمەنی لەگەڵ خەڵکان دوو رەکعەت نوێژی دەخوێند و دوای ساڵی شەشەم، نوێژی تەواوی دەخوێند. زۆر لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بۆ ئەم کارە رەخنەیان لێگرت و ئەو کەسانەی دەیانویست زمان بۆ سەرکۆنە کردنی ئەو بکەنەوە، ئەم بابەتەیان کردە بیانو تا ئەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و دەستەیەك لەگەورەکان ڕۆشتنە لای و وتی: سوێند بەخوا هیچ پێشهاتێك روونەداوە و هیچ پێشینەیەك لەئارادا نییە و تۆ دەزانی پێغەمبەر(د.خ) دوو رەکعەت نوێژی دەخوێند. دوای پێغەمبەر(د.خ)، ئەبوبەکری راستگۆ و عومەر کوڕی خەتابیش دوو رەکعەت و تۆیش لەساڵەکانی سەرەتای خەلافەت، رێچکەی ئەوانت گرتبووە بەر.

کاتێك نەیزانی چۆن وەڵام بداتەوە، وتی: ئەمە بۆچوونی منە.

عەمرۆ کوڕی ئەبوسوفیانی سەقەفی دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان لەمەنی چوار رەکعەت نوێژی لەگەڵ خەڵکان خوێند. کەسێك ڕۆشتە لای عەبدولرەحمان کوڕی عەوف و وتی: دەبینی، براکەت چوار رەکعەت نوێژی خوێند؟

عەبدولرەحمان لەگەڵ هاوەڵانی خۆی نوێژی خوێند (دو رەکعەتی خوێند). دواتر ڕۆشتە لای عوسمان کوڕی عەفان و وتی: مەگەر لەم شوێنە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) دوو رەکعەت نوێژت نەخوێند؟

وتی: بۆنا.

وتی: مەگەر لەگەڵ ئەبوبەکر دوو ڕەکعەت نوێژت نەخوێند؟

وتی: بۆنا.

وتی: مەگەر لەگەڵ عومەر کوڕی خەتاب، دوو ڕەکعەت نوێژت نەخوێند؟

وتی: بۆنا.

وتی: مەگەر لەساڵەکانی سەرەتای خەلافەتی خۆت، دوو ڕەکعەت نوێژت نەدەخوێند؟

وتی: بۆنا.

وتی: ئەی باوکی محەممەد، گوێ لەوتەکانی من بگرە، بیستوومە ساڵی پێش دەستەیەك لەخەڵکانی یەمەن کە بۆحەج هاتبوون و دەستەیەك خەڵکی بێ سەروپێ وتوویانە نوێژی کەسانی نیشتەجێ دوو ڕەکعەتە. ئێستا پێشەواکەی ئێوە دوو ڕەکعەت نوێژ دەخوێنێت. من لەمەککە بنەماڵەم هەیە و بەباشم زانی چوار ڕەکعەت بخوێنم چوونکە لەهەڵە و تاوانی خەڵکان دەترسم و بابەتێکی دیکە ئەوەی کەلەوێ ژنم هێناوە و لەتاییف ماڵ و مڵکم هەیە و دەبێت دوای حەج بڕۆم و ماوەیەك لەوێ بمێنمەوە.

عەبدولرەحمان کوڕی عەوف وتی: هیچ کام لەمانە پاساوێکی شیاو نین. ئەوەی دەڵێی ژن و بنەماڵەکەت نیشتەجێی مەککەن، هەرکات بخوازیت ئەوان دەهێنیت و هەرکات بخوازیت، دەیانبەیتەوە.

بەڵام ئەوەی دەڵێی سامان و مڵك و ماڵت لەتاییف هەیە، لەنێوان تۆ و تاییف سێ مەنزڵ ڕێگەیە و تۆ یەکێك لەدانیشتووانی تاییف نیت.

بەڵام ئەوەی دەڵێی کەسانێك لەحاجییەکانی یەمەن و کەسانی دیکە دەگەڕێنەوە و دەڵێن: ئێستا کەپێشەوای ئێوە عوسمان کوڕی عەفان و نیشتەجێیە، دوو ڕەکعەت نوێژ دەخوێنێت، پێغەمبەر(د.خ) کەوەحی بۆ دەهاتە خوار و کاتێك لەئیسلامدا هێزی نەبوو، ئەو کارەی دەکرد، دوای ئەویش ئەبوبەکر، درێژەی بەرێگەی ئەودا. دواتر ئیسلام بەهێز و عومەر تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کرد، دوو ڕەکعەت نوێژی خوێند.

وتی: ئەمە بۆچوونی منە.

دەڵێت: عەبدولرەحمان کوڕی عەوف ڕۆشتەدەر و کوڕی مەسعودی بینی

کەدەیوت:

ئەی باوکی محەممەد، هەواڵێکی دیکەت پێیە؟

وتی: نە.

وتی: من چیبکەم؟

وتی: بەپێی زانستەکەی خۆت.

وتی: دووبەرەکی هۆکارێکە بۆ شەڕ و ئاژاوە، ئاگادار بوومەوە کە عوسمان کوڕی عەففان چوار رەکعەت نوێژی خوێندووە، منیش لەگەڵ هاوەڵانم چوار رەکعەت نوێژم خوێند.

عەبدولرەحمان کوڕی عەوف وتی: منیش بیستم کەئەو، چوار رەکعەت نوێژی خوێندووە و لەگەڵ هاوەڵانی خۆم دوو رەکعەتم خوێند، بەڵام ئەگەری هەیە بۆچوونەکەی تۆ راست بێت، یانی وەك ئەو چوار رەکعەت بخوێنین.

سالّی سی دەستی پێکرد.

## ڕووداوە گرنگەکانی سالّی سی

بەوتـەی بـاوکی مەعـشەر و واقـدی و عـەلی کـوڕی محەممـەدی مـەداینی یـەکێك لـەڕووداوە گرنگـەکانی ئـەم سـالّە، جـەنگی تەبەرسـتان بـوو لەسـەر دەسـتی سـەعید کـوڕی عـاس. بـەلاّم بەوتـەی سـەیف کـوڕی عـەمرۆ سـوپا سـالاری تەبەرسـتان لەگـەلّ سـوەید کـوڕی مـوقرین پـەیمانی ئاشـتی بەسـت تـا لـەو سـەرزەمینە نەجـەنگێت و سامانی پێدان و پێشتر لەکاتی باس کردنی ڕووداوەکانی ڕۆژگاری خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب، باسمان کرد.

بەلاّم بەوتەی مەداینی، کەس لەتەبەرستان نەجەنگا تا ئەو کاتەی عوسمان کوڕی عەفان خەلافەتی گرتەدەست و لەسالّی سی کۆچ، سەعید کوڕی عاس، بۆ شەڕی ئەو سەرزەمینە بەڕێکەوت.

## جەنگی تەبەرستان لەسەر دەستی سەعید کوڕی عاس

حـەنش کـوڕی مالـك دەلّێـت: سـەعید کـوڕی عـاس لەسـالّی سـییەم لەکوفـەوە بەمەبەسـتی جـەنگ ڕووی لەخوراسـان کـرد. حوزەیفـە کـوڕی یـەمان و ژمارەیـەك لەئەسحابەکانی پێغەمبەر(د.خ) هاورێیـەتیان دەکرد. حەسـەن و حسـەین و عەبدوللـە کـوڕی عـەباس و عەبدوللـە کـوڕی عومـەر و عـەمرۆ کـوڕی عـاس و عەبدوللـە کـوڕی زوبـەیر لەگەلّیـدا بـوون. عەبدوللـە کـوڕی عـامریش بەمەبەسـتی جـەنگ لەخوراسـان، لەبەسرەوە بەڕێکەوت و پێش سەعید کەوتەوە و لەئەبەر شار، مەنزلّی گرت.

هـەوالّی ئـوردوو لێـدانی ئـەو لەئەبـەر شـار بەسـەعید گەیـشت. ئـەویش لـەقومس ئـوردووی لێـدا کەخەلّکەکـەی پـەیمانی ئاشـتییان واژۆ کردبـوو. حوزەیفـە دوای نەهاوەند پەیمانی ئاشتی لەگەلّ خەلّکەکەی بەستبوو. لەوێوە ڕووی کردە گورگان و لەسەر بنەمای وەرگرتنی دووسەد هەزار پەیمانی ئاشتی لەگەلّ خەلّکەکەی بەست. ڕووی کردە تەمیسە کەشارێکە لەکەنار دەریا و بەتـەواوی لەسنووری تەبەرستاندا و نزیك گورگان بوو. خەلّکەکەی بەجەنگ ڕووبەڕووی بوونەوە بەشێوەیەك موسولّمانان ناچار بوون نوێـژی تـرس بخوێنن. سەعید بەحوزەیفەی وت: پێغەمبـەر(د.خ) چۆن

نوێژی ترسی دەخوێند؟

حوزەیفە ئاگاداری کردەوە و لەکاتێکدا سوپاکە سەرقاڵی جەنگ بوون، نوێژی ترسی خوێند.

لەو رۆژەدا سەعید بەشمشێر لەشانی یەکێك لەناباوەڕانیدا. گەمارۆیان خستە سەر دوژمن وداوای ئەمانیان کرد و ئەمانی پێبەخشین و خۆیان تەسلیم کرد بەو مەرجەی یەك کەسیان نەکوژێت، بەلاّم کاتێك دەرگای قەلاّکەیان بۆ کردەوە، هەموویانی کوشت جگە لەیەك کەس. سامانی قەلاّکەی تالاّن کرد.

یەکێك لەمناڵەکانی نەهد سنوقێکی دەستکەوت کەقوفڵی لێدرابوو. گومانی کرد جەواهیرە. سەعید ئاگادار بوویەوە و کەسی بۆ لای پیاوی نەهدی نارد تا سنووقەکە بێنێت. قوفڵەکەیان شکاند و سنووقێکی دیکەیان بینی. کردیانەوە، پەڕۆیەکی ڕەشی خەتداری تیا بوو، کاتێك پەڕۆکەیان کردەوە، پەڕۆیەکی سووری تیا بوو. ئەویشیان کردەوە و پەڕۆیەکی زەردیان بینی، شەرمی دووپیاوی تیا بوو کەڕەش ببوونەوە لەگەڵ چەند لق گوڵێك. شاعیرێك بۆ سەرکۆنە کردنی مناڵەکانی نەهد هۆنراوەیەکی نووسی بەم ناوەرۆکە:

((پیاوە رێزدارەکان، ئەسیرەکانیان کردە تالاّنی
و مناڵەکانی نەهد دوو... کێریان لەسنووقێکدا دەستکەوت
کەڕەش بوو لەگەڵ چەند چڵ گوڵێك
گومانیان کرد تالاّنییە و چ هەڵەیەکی کوشندەیان کرد.))

سەعید کوڕی عاس دەستی بەسەر نامیەدا گرت. نامیە شار نییە بەڵکو سارایە.

حەنش کوڕی مالکی تەغلەبی دەڵێت: سەعید لەساڵی سی کۆچ مەبەستی جەنگی کرد و رووی کردە گورگان و تەبەرستان. عەبدوللە کوڕی عەباس و عەبدوللە کوڕی عومەر کوڕی خەتاب و کوڕی زوبەیر و عەبدوللە کوڕی عەمرۆ کوڕی عاس هاورێیەتیان دەکرد. کافرێك کەخزمەتی ئەوانی کردبوو، بەمنی وت: سفرەم لەبەردەم ئەوان ڕادەخست و کاتێك دەیانخوارد، فەرمانیان دەدا بیتەکێنم و هەڵیواسم و لەکاتی شەو بەرماوەکەی خۆیان دەدا بەمن.

دەڵێت: محەممەد کوڕی حەکەم کوڕی ئەبی عەقیلی سەقەفی باوەگەورێی یوسف

کوڕی عەمرۆ کەهاوڕێی سەعید کوڕی عاس بوو، کوژرا و یوسف بەقەحدەمی وت: قەحدەم! دەزانی محەممەد کوڕی حەکەم لەکوێ کوژرا.

وتی: بەڵێ، لەگەڵ سەعید کوڕی عاس لەتەبەرستان کوژرا.

وتی: نا، هاوڕێی سەعید بوو و لەوێ مرد. سەعید گەڕایەوە بۆ کوفە وکەعب کوڕی جوعەیل بۆ وەسفی ئەو هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

((گەنجێکی جوان روخسار بوو کەگیلان لەبەرابەر ئەو ئەسپی غاردا

کاتێك لەدەستبی و ئەبهەرەوە سەرەوخوار بوونەوە

بزانە ئەی سەعید، چوارپێکەی من

کاتێك سەرەو خوار بوویەوە، دەترسام دەست و قاچی بشکێت

دەڵێی تۆ لەرۆژی دۆڵ، شێرێکی نهێنی بوویت

کەلەشێری دارستان جیا ببوویتەوە و رووت کردبووە سارا

دەستەیەکت لەگەڵ خۆتا دەبرد کەکەس پێشتر بەو رێگەدا نەڕۆشتبوو

هەشتا هەزار زرێپۆش و بێ زرێ لەوێ بوون.))

کەلیب کوڕی خەلف دەڵێت: سەعید کوڕی عاس لەگەڵ خەڵکانی گورگان ئاشتی کرد. دواتر خۆڕاگرییان کردە پیشە و ناباوەڕ بوون و دوای سەعید کەس رووی لەگورگان نەکرد چوونکە رێگەیان بەستبوو و هەرکەس لەسنوورەکانی قومسەوە رووی دەکردە رێگەی خوراسان، لەخەڵکی گورگان دەترسا و رێگەی خوراسان لەفارسەوە بۆ کرمان بوو. یەکەم کەس رێگەی بۆ لای قومس سووڕاند، قوتەیبە کوڕی موسلیم بوو لەو کاتەی فەرمانڕەوایەتی خوراسانی گرتەدەست.

ئیدریس کوڕی حەنزەلەی عەممی دەڵێت: سەعید کوڕی عاس لەگەڵ خەڵکانی گورگان پەیمانی ئاشتی بەست. هەندێ کات سەد هەزاریان دەدا و دەیانوت، مەرجی پەیمانی ئاشتی ئێمە ئەمەیە وهەندێ کات دووسەد هەزاریان دەدا و هەندێ کات سێسەد هەزار و هەندێ کات هیچیان نەدەدا. دوای ئەوە ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و ناباوەڕ بوون تا ئەوەی یەزید کوڕی موهەلیب بۆ جەنگی ئەوان بەرێکەوت و کاتێك گەیشت، کەس رووبەرووی نەبوویەوە و کاتێك لەگەڵ سول پەیمانی ئاشتی واژۆ کرد و دەستی بەسەر دەریاچە و دێهستاندا گرت، هاوشێوەی پەیمانەکەی سەعید کوڕی عاس، پەیمانی ئاشتی لەگەڵ دانیشتووانی گورگان مۆر کرد.

بەوتەی سەیف کوڕی عومەر لەم ساڵەدا، یانی ساڵی سی، عوسمان کوڕی عەفان وەلید کوڕی عوقبەی لەکوفە لابرد و سەعید کوڕی عاسی وەك فەرمانڕەوای ئەو شارە دەستنیشان کرد.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەوەی بۆ عوسمان کوڕی عەفان وەلیدی لەکوفە لابردو سەعید کوڕی عاسی لەجێگەی ئەو دانا

تەڵحە دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان لەپێشهاتەکەی نێوان عەبدوللە و سەعد ئاگادار بوویەوە، لەهەر دووکیان توڕە و مەبەستی لەسەر کار لابردنی ئەوانی کرد. دواتر لەبڕیارەکەی پەشیمان بوویەوە. سەعدی لەسەر کار لابرد و هەموو شتەکانی لێ وەرگرتەوە و عەبدوللە لەجێگەکەی خۆی هێشتەوە و وەلید کوڕی عوقبەی لەجێگەی سەعددانا. وەلید کە بەنوێنەرایەتی عومەر کوڕی خەتاب کارگوزاری عەرەبەکانی جەزیرە بوو، لەساڵی دووەم خەلافەتی عوسمان کوڕی عەفان رووی لەکوفە کرد. سەعد یەك ساڵ و چەند مانگ کارگوزاری کوفە بوو. کاتێك وەلید هات، خۆشەویستی خەڵکان و بەشێوەیەکی نەرم و نیان مامڵەی لەگەڵ دانیشتووانی ئەو شارە کرد. شەش ساڵ لەوێ بوو بێ ئەوەی ماڵەکەی دەرگای هەبێت.

دواتر چەند گەنجێکی شاری کوفە لەژێر زەوییەوە تونێلێکیان بۆ ماڵەکەی کوڕی حەیسەمان لێدا و هێرشیان کردە سەر. ئەو، رووبەروویان بوویەوە و بەشمشێر پەلاماریدان بەڵام کاتێك زۆری ئەوانی بینی، هاواری کرد. پێیان وت: بێدەنگ بە، تەنیا یەك گورزە وتۆ لەترسی ئەم شەوە ئاسوودە دەکەین.

باوکی شورەیحی خوزاعی کە لەسەرەوە بینەری رووداوەکە بوو، هاواری کرد بەڵام لەکوڕی حەیسەمانیاندا و کوشتیان. خەڵك ئەوانیان گرت. زوهەیر کوڕی جوندەبی ئەزدی و مورع کوڕی ئەبی مورەعی ئەسەدی و شەبیل کوڕی ئەبی ئەزدی و کەسانێکی دیکە بوون. باوکی شورەیح و کوڕەکەی شایەتییاندا کەئەوان هێرشیان کردۆتە سەر کوڕی حەیسەمان و دەستەیەکیان رێگری کوشتنی ئەو بوون و دەستەیەکیان ئەویان کوشت و سەبارەت بەوان نامەی بۆ عوسمان کوڕی عەفان نووسی. عوسمان کوڕی عەفان فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکرد و لەبەر دەرگای

کۆشک و لەناو گۆڕەپانەکە ئەوانیان کوشتەوە. عەمرۆ کوڕی عاسمی تەمیمی لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەی خەڵکی ڕووداوخواز

لەحکومەتی عوسمان کوڕی عەفان لەگەڵ دراوسێکانی خۆت

بەشێوەیەکی ناڕەوا مەجووڵێنەوە

کوڕی عەفان ئەوتان تاقی کرۆدتەوە

دزەکان بەحوکمی فەرقانی حەکیم سەرکوت دەکات

بەردەوام پشت بەکتێبی خواوەند دەبەستێت

و بەسەر ئەواندا زاڵە))

باوکی سەعید دەڵێت: باوکی شورەیحی خوزاعی یەکێك لەئەسحابەکانی پێغەمبەر(د.خ) بوو. لەمەدینەوە ڕووی کردە کوفە تا لەجەنگەکان نزیك بێت. شەوێك کە لەسەر بانی ماڵەکەی بوو، دراوسێکەی داوای هاوکاری کرد. لەسەرەوە سەیری کرد و دەستەیەك لەگەنجەکانی کوفەی بینی کەشەوانە هێرشیان کردبووە سەر ماڵی دراوسێکەی و دەیانوت: هاوار مەکە، تەنیا یەك زەربەیە و ئاسوودەت دەکەین. ئەویان کوشت. ئەو، ڕووی کردە مەدینە و ڕۆشتە لای عوسمان کوڕی عەفان و کەسەکانی خۆیشی بردەوە.

بەهۆی ئەو ڕووداوە کەگفتوگۆی زۆری لەبارەوە کرا، بڕیاری سوێند خواردن (قسامە) پێویست کرا و سەبارەت بەکوشتن، وتاری سەرپەرەستی کوژراو، بڕواپێکراو هەژمار کرا، بۆ ئەوەی ڕێگەی کوشتن لەخەڵکان بگرێت. لەو کاتەدا زۆرینەی خەڵکان بەم بڕیارە ڕازی بوون.

نافیع کوڕی جوبەیر دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان وتی: سوێند خوارد لەئەستۆی سەرپەرەستی کوژراو و کەسەکانی ئەودایە، ئەگەر شایەت نەبێت، پەنجا کەس لەوان سوێند بخۆن و ئەگەر ژمارەیان کەم بێت، یا یەك کەسیان سوێند نەخوارد، سوێندەکەیان گرنگی پێنادرێت، بەڵام ئەگەر پەنجا کەس لەوان سوێندیان خوارد، مافیان بەدەستەوەیە.

عەبدوللە دەڵێت: لەو دیاردانەی عوسمان کوڕی عەفان لەکوفە هێنایە ئاراوە، ئەوە بوو کەبیستی کاتێك هەڵگرانی خواردەمەنی دەهاتن، جارچی باوکی سەماڵی

ئەسەدی و کەسانێك لەخەڵکانی کوفە جاڕیان دەدا هەر کەس لەمناڵەکانی کەلب یا مناڵەکانی فلان کەس لێرەیە و خەڵکەکەی مەنزڵی نەبێت، لای باوکی فلان کەس مەنزڵ بگرێت. عوسمان کوڕی عەفان شوێنی ماڵی عەقیل و شوێنی ماڵی کوڕی هوباری کردە میوانخانە. ماڵی عەبدوڵلە کوڕی مەسعود لەگەڕەکی هوزەیل ماڵی رەمادەت بوو. ئەو شوێنەی چۆڵ و ماڵەکەی خۆی کردە میوانخانە و ئەگەر لەدەوروبەری مزگەوت جێگەی پێویست بۆ میوانەکان دابین نەدەکرا، لەگەڕەکی هوزەیل و لەماڵەکەی ئەو مەنزڵیان دەگرت.

موغەیرە کوڕی موقسیم لەزمانی دەستەیەك لەشارەزایانی کوفە کەئەوانی بینینیبوو، دەڵێت: جاڕچی باوکی سەمال لەبازار و کەناسە هاواری دەکرد هەرکەس لەمناڵەکانی فلان و فلان کەس لێرەیە، یانی ئەوانەی لەکوفەماڵیان نەبوو، لای باوکی سەمال دابەزن. عوسمان کوڕی عەفان بۆ میوانەکان ماڵەکانی دیاری کرد.

تەڵحە دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب وەلید کوڕی عوقبەی وەك کارگوزاری جەزیرە دەستنیشان کردبوو. ئەو، لەناو مناڵەکانی تەغلەب دابەزی. باوکی زوبەید لەجاهلیەت و ئیسلام لەگەڵ مناڵەکانی تەغلەب بوو تا ئەو کاتەی باوەڕی بەئیسلام هێنا. مناڵەکانی تەغلەب کەخاڵوانی بوون، سەبارەت بەو قەرزەی لێیان وەرگرتبوو، ستەمیان لێکرد. وەلید مافەکەی بۆ وەرگرتەوە و رێزی گرت و ئەوی کردە هاودەمی خۆی و لەمەدینە هاتوچۆی دەکرد. کاتێك وەلید وەك کارگوزاری کوفە دەستنیشان کرا، بۆ رێز گرتن و سپاس کردنی ئەو هات بەهەمان شێوە کە لەمەدینە و جەزیرە ئەو کارەی دەکرد. لەماڵی تایبەت بەمیوانەکان نیشتەجێ بوو. دووایین جار بوو باوکی زوبەید دەڕۆشتە لای وەلید و شتێکی لێ وەردەگرت و دەگەڕایەوە. پێشتر مەسیحی بوو. وەلید چەند جارێك پێشنیاری پێکرد تا ئەوەی باوەڕی هێنا. ئەم رووداوە لەکۆتاییەکانی فەرمانڕەوایی وەلید لەکوفە بوو. موسڵمانێکی راستەقینە و کاتێك باوەڕی هێنا، وەلید ئەوی بردەوە ماڵ لەبەر ئەوەی شاعیر و خوو و عادەتی عەرەبەکانی لەسەردا بوو. کەسێك ڕۆشتە لای باوکی زێنەب و باوکی موەرەع و جوندەب. ئەمان، لەو کاتەوەی وەلید کوڕەکانی ئەوانی کوشتبوو، ڕق و کینەی ئەویان لەدڵدا پەروەردە دەکرد. چەند کەسێکیان وەك سیخوڕ بەسەر کارەکانی

وەلیدەوە دانا کەپێی وتن: ئاگادارن وەلید لەگەڵ باوکی زوبەید شەراب دەخواتەوە. ئەوان، گریان گرت و باوکی موەرەع و جوندەب بەکەسانێك لەسەرکردەکانی کوفەیان وت: ئەمە ئەمیری ئێوەیە و باوکی زوبەید هاونشینی ئەوە و هەنووکە سەرقاڵی شەراب خواردنەوەن.

ئەوان هاتن. وەلید لەناو گۆڕەپانەکە دراوسێی عەمارە کوڕی عوقبە بوو. ماڵەکەی درگای نەبوو. لەمزگەوتەوە ڕژانە ناو ماڵەکەی چوونکە ڕێگەکەی لەمزگەوتەوە بوو. لەناکاو ڕۆشتنە ناو ماڵەکەی وەلید، وەلید شتێکی لەبەردەستا لابرد و خستیە ژێر تەختەکەی. کەسێك لەوان بێ ئەوەی مۆڵەت وەربگرێت، دەستی برد و شتەکەی دەرهێنا: تەبەقێك بوو دەنکی ترێی لەسەر بوو. وەلید لەشەرما لای بردبوو تا نەیبینن و نەزانن کەتەنیا دەنکی ترێ خواردنەکەیەتی.

دواتر هەستان وڕۆشتنە ناو خەڵکان و سەرکۆنەی یەکیان دەکرد. خەڵکان بیستیان و جوێنباران و نەحلەتیان دەکردن.

کەسانێك دەیانوت خواوەند لەم کردەی ئەوان تورەیە و کەسانێك دەیانوت: بەپێچەوانەی قورئان جولاونەتەوە. وەلید ئەم بابەتەی لە عوسمان کوڕی عەفان شاردەوە و نەیدەویست گەندەڵ و فساد لەناو خەڵکان دروست ببێت. ئەو، بێدەنگ و خۆڕاگری کردە پیشە.

فەیز کوڕی محەممەد دەڵێت: شەعبیم بینی لای محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی وەلید، یانی کوڕی عوقبە، کەجێگری محەممەد کوڕی عەبدولمەلیك بوو، دانیشتبوو. محەممەد باسی جەنگی موسلیمەی دەکرد و شەعبی وتی: ئەگەر جەنگ و فەرمانڕەوایی وەلیدتان دەبینی! کاتێك بۆ جەنگ پێشڕەوی دەکرد، دەگەیشتە کوێ! دوا نەدەکەوت و کەس پێچەوانەی فەرمانەکانی ئەو نەدەجوولایەوە تا ئەو کاتەی لەسەر کارەکەی دوور خرایەوە. لەو کاتەدا کارگوزاری باب عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعەی باهلی بوو. یەکێك لەو شتانەی عوسمان کوڕی عەفان لەسەر دەستی ئەو لەسەر خەڵکانی زیاد کرد ئەوە بوو کە لەزیادەی سامانی مانگانە سێ درەمی بەهەر کام لەمیرەکانی کوفە دەدا بێ ئەوەی لەمانگانەی خاوەنەکانی کەم بکاتەوە.

عەمرۆ کوڕی عەبدوللە دەڵێت: جوندەب و کەسانێك لەگەڵ ئەو ڕۆشتنە لای کوڕی مەسعود و وتیان: وەلید شەراب دەخواتەوە. ئەمەیان لەناو خەڵکدا بڵاو

کردبوویەوە و ببووە بنێشتە خۆشەی سەر زاران. کوڕی مەسعود وتی: هەرکەس شتێك لەئێمە بشارێتەوە، بەدوایدا ناگەڕێین و پەردەی ئابڕووی نادڕین.

وەلید کەسی بەدوای کوڕی مەسعود نارد و هات. سەرکۆنەی کرد و وتی: ئایا ڕەوایە کەسێکی وەك تۆبەو شێوەیە وەڵامی ئەو کەسانە بداتەوە کە تۆ سەبارەت بەمن داتەوە، من چ شتێکم شاردۆتەوە؟ ئەمە سەبارەت بەکەسێك دەهێنە سەرزمان کەلێی بەدەگومان بن.

دواتر دەنگیان لەیەك بەرز کردەوە و تووڕە لەیەك جیابوونەوە. زیاتر لەمە هیچ لەنێوان ئەوان ڕووینەدا.

تەڵحە دەڵێت: جادوگەرێکیان بردە لای وەلید، کوڕی مەسعودی بانگ کرد و سەبارەت بەباوەگەوریێی جادوگەرەکە پرسیاری کرد.

کوڕی مەسعود وتی: لەکوێوە دەزانی جادوگەرە؟

وتی: ئەمانە، یانی ئەو کەسانەی ئەویان هێناوە، دەڵێن جادوگەرە.

لەوانی پرسی: لەکوێوە دەزانن جادوگەرە؟

وتیان: خۆی دەڵێت.

لێی پرسی: تۆ جادوگەریت؟

وتی: بەڵێ.

ئەمەی وت بەرەو لای کەرەکەی ڕۆشت و لەکلکیەوە سواری بوو. دەویست وا نیشان بدات کە لەدەم و قونی کەرەکەی دێتەدەر.

کوڕی مەسعود وتی: بیکوژە.

وەلید ڕۆشت. لەمزگەوت جاڕیاندا کەپیاوێك لای وەلید جادوگەری دەکات. خەڵکان هاتن، جوندەبیش هات و ئەمەی بەدەرفەت زانی، دەیوت: لەکوێیە، لەکوێیە تا بیبینم. جادوگەرەکەی کوشت.

عەبدوللە و وەلید بڕیاریاندا زیندانی بکەن. نامەیان بۆ عوسمان کوڕی عەفان نووسی. وەڵامی دانەوە: سوێندی بدەن کە لەبۆچوونی ئێوە سەبارەت بەجادووگەرەکە ئاگادار نەبووە و لەوتەکانی خۆی کەگومان دەکات، سزادان دواکەوتووە، ڕاستگۆیە، سزای بدەن و دواتر ئازادی بکەن. فەرمانی بەخەڵکاندا

بەپێی گومان و بۆچوونی خۆیان سزای هیچ کەسێك نەدەن و بێ راپرسی لەگەڵ دەسەلأت، کەس سزا نەدەن چوونکە تۆڵە لەهەڵەکار دەستێنینەوە و ئەگەر مەبەستەکەی خۆی پێکا بێت، سزای دەدەین.

وەلید سەبارەت بەجوندەب ئەو کارەی کرد و دواتر ئازادی کرد. هاوەلأنی جوندەب لەبەر ئەم کارە توڕە و روویان لەمەدینە کرد. باوکی خەرەشەی غەفاری و جوسامە کوڕی سەعب کوڕی جوسامە لەناویاندا دەبینران. جوندەبیش هاورێیەتی دەکردن. داوای لەسەر کار لابردنی وەلیدیان دەکرد.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: بەپێی گومانی خۆتان مەجووڵێنەوە چوونکە گرفتاری هەڵە دەبن و بێ مۆڵەت وەرگرتن شارەکەتان بەجێ مەهێڵن، بگەڕێنەوە. ئەوانی گەڕاندەوە.

کاتێك ئەو دەستەیە گەیشتنە کوفە، هەرکەس کینەی لەدڵدا بوو، لەدەوری ئەوان کۆبوویەوە و یەکیان گرت. ئەوسا وەلیدیان ناکاوگیر کرد. ئەو دەرگاوانی نەبوو. باوکی زێنەبی ئەسەدی و باوکی موەرەع ڕۆشتنە سەر سەری و ئەنگوستیلەکەیان دەرهێنا و ڕۆشتنە لای عوسمان کوڕی عەفان و دژی وەلید شایەتییان دا. چەند کەسێك لەهاورێیانی ئەوان کەکەسانی ناسراو بوون، هاورێیەتی ئەوانیان دەکرد.

عوسمان کوڕی عەفان کەسی بەدوای وەلیددا نارد. کاتێك هات ئەوی بەسەعید کوڕی عاس سپارد. وەلید وتی: سوێندت دەدەم بەخوا ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەوان دوو دوژمنی کینە لەدڵن.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: ئەمە زیان لەتۆ نادات کەئێمە بەپێی ئەوەی بیستوومانە، کردەوەکانمان ئەنجام بدەین، هەرکەس ستەمی لێ بکرێت، خواوەند تۆڵەی دەستێنێتەوە و هەرکەس ستەمکار بێت، خواوەند سزای دەدات.؟

عەبدولرەحمان کوڕی حوبەیش دەڵێت: کەسانێك لەخەڵکانی کوفە کۆبوونەوە و بۆ لەسەر کار لابرانی وەلید هەوڵیان دەدا. باوکی زێنەب کوڕی عەوف و باوکی موەرەع کوڕی فیلانی ئەسەدی بۆ شایەتیدان دژی ئەو، ئامادەیی خۆیان دەربڕی. بوونە هاودەمی ئەو و چاودێری کارەکانی ئەویان دەکرد. ڕۆژێك لەگەڵ وەلید لەماڵەکەیدا بوون. وەلید لەناو ماڵەکەی دوژنی بوو کەلەنێوان ئەوان و خەڵکان پەردەیەك هەڵواسرا بوو. یەك لەژنەکانی کچی زوئەلخومار و ئەوەی دیکەیان کچی

باوکی عەقیل. کاتێك وەلید خەوت و خەڵکان بڵاوەیان لێکرد، باوکی زێنەب و باوکی موەرەع مانەوە. یەکیان ئەنگوستیلەکەی هەڵگرت و ئەوسا ڕۆشتنەدەر.

کاتێك وەلید بەئاگا هاتەوە، ژنەکانی لەسەر سەری بوون، ئەنگوستیلەکەی خۆی نەبینی، لەوانی پرسی بەڵام بێ ئاگا بوون.

وتی: چ کەسێك لەخەڵکان لەدوای هەمووانەوە ڕۆشت؟

وتیان: دوو پیاو کەنایانناسین و لەم دواییانە بوونەتە هاودەمی تۆ.

وتی: شێوە و روخساریان؟

وتیان: یەکیان جلی ڕەش و ئەوی دیکەیان عابایەك لەخەزی لەبەردا بوو. ئەوەی عابای خەزی پۆشیبوو، لەوەی دیکەیان دوورتر بوو؟

وتی: مەبەستتان باڵا بەرزە؟

وتیان: بەڵێ، ڕەش پۆشەکە لەتۆ نزیکتر بوو.

وتی: مەبەستتان کورتە باڵایە؟

وتیان: بەڵێ و دەستی ئەومان لەسەر دەستی تۆ بینی.

وتی: ئەوە باوکی زێنەبە و ئەوی دیکەیان باوکی موەرەع، مەبەستێکیان هەیە، خۆزگە دەمزانی مەبەستیان چییە.

بەدوای ئەواندا گەڕا بەڵام نەیتوانی بیاندۆزێتەوە چوونکە ڕێگەی مەدینەیان گرتبووە بەر. ڕۆشتنە لای عوسمان کوڕی عەفان و ئەو کەسانەی عوسمان کوڕی عەفانیان دەناسی و خوازیاری لەسەر کار لابرانی وەلید بوون، هاوڕێیەتی ئەوانیان دەکرد و لەگەڵ سەروەری باوەڕداران ئاخاوتن.

وتی: کێ شایەتی دەدات؟

وتیان: باوکی زێنەب و باوکی موەرەع. ئەوان ترسان.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: چیتان بینی؟

وتیان: لەو کەسانە بووین سەردانی ئەومان دەکرد، دەڕۆشتینە لای و دەمانبینی شەرابی دەهێنایەوە.

وتی: کەسێك شەراب دەهێنێتەوە کەشەرابی خواردبێت.

ئەوسا کەسی بەدوای وەلیددا نارد و کاتێك ئەو دوانەی بینی، سوێندی خوارد و

بەسەرهاتی ئەوانی بۆ عوسمان کوڕی عەففان باس کرد.

عوسمان کوڕی عەففان وتی: ئێمە دادپەروەری دەکەینە پیشە و شایەتی درۆزن دەڕواتە جەهەننەم، براکەم، خۆڕاگری بکە.

بەسەعید کوڕی عاسی وت قامچی لێ بدات و لەبەر ئەمە تا ئێستا لەنێوان منداڵەکانی ئەوان دوژمنایەتی لەئارادایە.

کاتێك فەرمان درا قامچی لەوەلید بدەن، عابایەکی خەزی لەبەردا بوو کەعەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبەری داکەند.

باوکی عوبەیدەی ئەیادی دەڵێت: باوکی زێنەب و باوکی موەرەع ڕۆشتبوونە ماڵی وەلید. وەلید دوو ژنی بوو، کچی زوئەلخومار و کچی باوکی عەقیل و خۆی خەوتبوو.

یەکێك لەو دوو ژنە وتبووی: یەکێك لەو کەسانەی ڕۆشتبوونە ناو ماڵەکەی، چەمایەوە و ئەنگوستیلەکەی هەڵگرت.

کاتێك وەلید بەئاگا هاتەوە، پرسیاری ئەنگوستیلەکەی لەوان کرد.

وتیان: ئێمە هەڵمان نەگرتووە.

وتی: کێ دوای ڕۆشتنی خەڵکان لێرە مایەوە؟

وتیان: دوو پیاو، یەکیان کورتە بالا کەجلێکی ڕەشی لەبەردا بوو و یەکیان بالأبەرز کەعابەیەکی خەزی لەبەردا بوو. ڕەش پۆشەکە چەمایەوە و شتێکی هەڵگرت.

وتی: ئەوە باوکی زێنەبە.

بەدوای ئەواندا گەڕا و بۆی دەرکەوت کارەکەی ئەوان بەراوێژ کردن لەگەڵ هاوەڵانیان ئەنجام دراوە بەڵام نەیزانی مەبەستیان چییە.

ئەو دوانە ڕۆشتنە لای عوسمان کوڕی عەففان و بەئامادە بوونی خەڵکان هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیاند. ئەو، کەسی لەدوای وەلید نارد و کاتێك هات، ئەو دوو کەسە ئامادە بوون.

عوسمان کوڕی عەففان ئەوانی بانگ کردە پێش و وتی: شایەتی بۆ چ شتێك دەدەن؟ شایەتی دەدەن کەشەراب خواردنەوەی ئەوتان بینیوە؟

وتیان: نە. ترسان.

وتی: کەواتە چی؟

وتیان: دەستمان لەپێشیدا کەشەرابی هێنابوویەوە.

عوسمان کوڕی عەفان فەرمانی بەسەعید کوڕی عاسدا قامچی لێ بدات و بەمشێوەیە لەنێوان منداڵەکانیان دوژمنی هاتە ئاراوە.

یەزیدی فەعقەسی دەڵێت: خەڵکان سەبارەت بەوەلید بوون بەدوو دەستە: زۆرینە لەگەڵ ئەودا بوون و کەسانێکی تایبەت و کەمینە دژی ئەو. بەڵام بێدەنگ بوون و دوای جەنگی سەفین کەمعاویە خەلافەتی گرتەدەست، دەیانوت: عوسمان کوڕی عەفان بەناڕەوا سەرکۆنەی وەلیدی کرد.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئێوە کەڕەخنە لەعوسمان دەگرن، هاوشێوەی کەسێکن شمشێر لەخۆی دەدات تا هاورێکەی بکوژێت. عوسمان سەبارەت بەکەسێك کە بەوتەی خۆی لەخۆیداوە، چ گوناحێکی هەیە؟ سەبارەت بەکارێك کە بەفەرمانی ئێمە کردوویەتی، چ گوناحێکی هەیە؟

نافیع کوڕی جوبەیر دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان دەیوت: کاتێك کەسێك داری حەدی لێدرا، دواتر تۆبەکەی ئاشکرا بوو، شایەتی ئەو وەردەگیرێت.

باوکی کیبران لەکەنیزەکەی خۆی دەگێڕێتەوە: وەلید چاکەی لەناو خەڵکان هێنایە ئاراوە: بەشی کەنیز و کۆیلە خاوەن منداڵەکانی دەدا، ئازادە و بەندە خەمی ئەویان دەخوارد و کەنیزە خاوەن منداڵەکان کەجل و بەرگی پرسەیان هەبوو، هۆنراوەیەکیان دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەی هاوار کەوەلید لەسەر کار لابرا

سەعید هات کەبرسیەتی لەناو خەڵکان بڵاو دەکاتەوە

پێوانەکان کەم دەکات و پێیان زیاد ناکات

چیتر کەنیز و بەندەکان برسین))

توڵەیحە دەڵێت: سەعید کوڕی عاس لەساڵی حەوتەمی خەلافەتی عوسمان کوڕی عەفان هاتە کوفە. ئەو کوڕی عاس کوڕی ئومەییە بوو. خاوەن کەس و کاری زۆر و کاتێك خواوەند شامی بۆ موسوڵمانان ئاوەڵا کرد، لەگەڵ معاویە بوو. ئەو، هەتیو و لەپەنای عوسمان کوڕی عەفان پەروەردە و گەورە کرا بوو. عومەر لەکاتی گەڕان و

لێکۆڵینەوە لەکار و کردەوەی خەڵکان، باسی قوریشی دەکرد و ناوی ئەوی دەهێنایە ئاراوە.

وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەو لەدیمەشقە و ئەو کەسەی ئەوی بینیوە، دەڵێت، بەرێگەی مردندا دەڕۆشت.

عومەر کوڕی خەتاب کەسی بۆ لای معاویە نارد و فەرمانی پێدا سەعید کوڕی عاس بۆ لای ئەو ڕەوانە بکات. معاویە سەعیدی نەخۆشی گەڕاندەوە و کاتێک گەیشتە مەدینە، باشتر بوو.

عومەر کوڕی خەتاب پێی وت: ئەی کوڕی برام! هەوڵدان و خۆپاریزی تۆم بیستووە! هەوڵەکانت زیاتر بکە تا خواوەند خێری زیاترت پێ ببەخشێت.

وتی: ژنت هەیە؟

وتی: نە.

وتی: ئەی باوکی عەمرۆ، چی دەبێتە رێگر لەوەی ژنێك بەم پیاوە بدەیت؟

وتی: ویستم ئەو کارە بکەم، بەلاّم رازی نەبوو.

رۆژێك عومەر کوڕی خەتاب رووی کردە سارا و گەیشتە قەراغی ئاوێك. چوار ژنی بینی و کاتێك سەروەری باوەڕدارانیان بینی، هەستانە سەرپێ.

وتی: کێن و کارتان چییە؟

وتیان: کچەکانی سوفیان کوڕی عەویفین.

دایکیان لەگەڵدا بوو، وتی: پیاوەکانمان لەناوچوون و کاتێك ئەوان مردن، ئەوان مانەوە، ئەوان بکەرە هاوسەری پیاوە هاوشانەکانی خۆیان.

عومەر کوڕی خەتاب یەکیانی کردە هاوسەری سەعید کوڕی عاس و یەکی دیکەیانی کردە هاوسەری عەبدولرەحمان کوڕی عەوف و سێیەمیانی کردە هاوسەری وەلید کوڕی عوقبە.

کچەکانی مەسعود کوڕی نوعەیمی نەهشەلی هاتنە لای عومەر کوڕی خەتاب و وتیان: پیاوەکانمان لەناوچوون و مناڵەکانمان ماونەتەوە، ئێمە بکە هاوسەری پیاوە هاوشانەکانی خۆمان..

عومەر کوڕی خەتاب یەك لەوانی بەسەعید کوڕی عاس بەخشی و یەکیان بەجوبەیر کوڕی موتعیم. سەعید لەهەر دوو دەستەکە بەشدار بوو.

مامەکانی سەعید لەئیسلامدا هەوڵی زۆریاندا و پێشینەی چاکەکارییان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) هەبوو. هێشتا عومەر کوڕی خەتاب زیندوو بوو کەسەعید بوو بەیەکێك لەکەسە بڕواپێکراوەکان و لەسەردەمی خەلافەتی عوسمان کوڕی عەفان وەك فەرمانڕەوا ڕۆشتە کوفە. ئەشتەر و باوکی خەشەی غەفاری و جوندەب کوڕی عەبدوللە و باوکی مەسعەب کوڕی جوسامە لەمەککەوە تا مەدینە هاوڕێیەتیان کرد. ئەوان کەسانێك بوون بۆ رەخنە گرتن لەوەلید ڕۆشتبوونە مەدینە و لەگەڵ سەعید گەڕانەوە.

سەعید کوڕی عاس لەکوفە ڕۆشتە سەر مینبەر، سپاسی خوای کرد و وتی:

((سوێند بەخوا منیان بۆ لای ئێوە نارد بێ ئەوەی خۆم بخوازم بەلاّم هیچ ڕێگە چارەیەکی دیکەم نەبوو، فەرمانیان پێدام فەرمانڕەوایەتی ئێوە بگرمە ئەستۆ، بزانن چاو و گوێچکەی ئاژاوە دەرکەوتووە، سوێند بەخوا بەشێوەیەك لەروخساری ئاژاوە دەدەم بتوانم لەناوی ببەم یا شەکەتم بکات، هەنووکە بۆ کارەکانی خۆم شارەزام.))

لەمینبەر هاتەخوار و سەبارەت بەبارودۆخی دانیشتووانی کوفە پرسیاری کرد. کاروبارەکانی ئەوانی ڕێکخست و ئەوەی لێی ئاگادار بوویەوە، عوسمان کوڕی عەفانی لێ ئاگادار کردەوە. نووسی: کاروباری خەڵکانی کوفە پەرێشان و کەسە بڕواپێکراوەکان و خاوەن بنەماڵەکان زەلیل و ریسوا بوون و کەسانی بێ پێشینە و بەدەوییەکان بەسەر ویلایەتەکەدا زاڵ بوون و کەس لەپیاوە تێکۆشەرەکانی نیشتەجێی کوفە، لای ئەوان بڕوا و پێگەی نییە.

عوسمان کوڕی عەفان وەلاّمی دایەوە:

((بەلاّم دواتر، ڕێز لەکەسانی خاوەن پێشینە کەخواوەند ئەو ویلایەتی لەسەر دەستی ئەوان گرتووە، بگرە و ئەو کەسانەی بەهۆی ئەوانەوە لەو شارە نیشتەجێ بوون شوێنکەوتەی ئەوان بن مەگەر ئەوەی لەراستییەکان دواکەوتبێتن و پشتیان کردبێتە راستییەکان و کەسانی شوێنکەوتەی ئەوان، ڕێگەی راستیی بگرنەبەر، پێگەی هەر کەسێك بپارێزە و ماف هەمووان بدە چوونکە تەنیا بەناسینی کەسەکان دەتوانی دادپەروەری بکەیتە پیشە.))

سەعید سەرکردەی خەڵکانی لەجەنگاوەرانی قادسیە و رۆژگارەکانی پێشووی

بانگ کرد و وتی: ئێوە سەرکردەی خەڵکانێکن کەلەدوای ئێوەوە دێن و سەر باسی جەستە دەکات، نیازی نیازمەندان و ڕەنجی خاوەن ڕەنجەکان بەمن بڵێن. تا ئەو جێگەی دەکرا، کەسانی شوێنکەوتەی پەیوەستی ئەوان کرد و قورئان خوێنەکان و کەسە ڕێزدارەکانی کردە هاودەم و هاونشینی خۆی.

دەتوت کوفە وشکەڵانێکە و ئاگری تێکەوتبوو: ئەم دەستانە پەیوەستی یەك بوون و پڕوپاگەندە بڵاو بوویەوە. سەعد ڕووداوەکانی بۆ عوسمان کوڕی عەفان نووسی و جارچی عوسمان جاڕی نوێژی گەشتی لێدا. کەسان کۆبوونەوە وئەوانی لەنامەکەی سەعید و ڕووداوە پێشهاتەکان ئاگادار کردەوە.

وتیان: کارێکی چاکت کرد و دەرفەتیان پێمەدە و ڕێگە مەدە ئەوەی مافی ئەوان نییە، چاوی تەماحی تێببڕن چوونکە کاتێك کەسانی نەشیاو، بەشداری لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکان بکەن، گەندەڵی و فیڕۆیی بڵاو دەبێتەوە.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: ئەی خەڵکی مەدینە، ئامادە بن و پێکەوە بن چوونکە فیتنە ڕووی کردۆتە ئێوە و دابەزیوە.

عوسمان کوڕی عەفان گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و بۆ باس کردنی نموونەی خۆی و ئەو کەسانەی دژایەتی ئەویان دەستپێکردبوو، هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((کوڕەکانی عوبەید، وتاری ئێوە و هۆنراوەی ئێوە
هاتە لای کەسانی ئێوە
کاتێك ئەم وتەیە گەیشتە ئێوە، ئامادە بن
چوونکە ڕم پیاوی بێ زرێ باش دەناسێت.))

عوروە دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان زیاتر لەهەموو خەڵکان هۆنراوەی یەك دێڕی و دوو دێڕی و سێ دێڕی تا پێنج دێڕی لەبەر بوو.

سەعید کوڕی عەبدوللە جومەحی دەڵێت: بیستم عوبەیدالله کوڕی عومەر بەباوکی دەوت کە عوسمان کوڕی عەفان خەڵکانی مەدینەی کۆکردەوە و وتی: ئەی خەڵکانی مەدینە، کەسانێك گرفتاری فیتنە دەبن، سوێند بەخوا ئەوەی هەتانە تایبەت بەئێوە نابێت تا ئەو کاتەی بخوازن و بیهێنم. دەخوازن هەموو ئەو کەسانەی لەگەڵ خەڵکانی عێراق بەشداری جەنگەکانیان کردووە، لەگەڵ سامانەکانی خۆیان بێن و

لەدیاری خۆیان نیشتەجێ بن؟

خەڵکان هەستان و وتیان: ئەی سەرورەری باوەڕداران، ئەو زەوییانەی خواوەند وەك تالآنی بەئێمەی بەخشیوە، چۆن دەگوێزێتەوە.

وتی: ئەو زەوییانە بەهەر کەسێك بخوازێت لەبەرابەر سامانەکانی لەحیجاز دەفرۆشین.

خەڵکان رازی و دڵخۆش بوون چوونکە خواوەند کێشەیەکەی بەشێوەیەك بۆ چارەسەر کردبوون هیچ کات نەیاندەتوانی تەنانەت بیری لێ بکەنەوە و کاتێك بلاوەیان لێکرد، کێشەکەیان بەبابەتێکی سانا دەهاتە بەرچاو. تەڵحە کوڕی عوبەیدالله هەموو بەشەکانی خەیبەری کۆکردەوە لەگەڵ سامانەکانی دیکەی خۆی و لەبەرابەر مڵك و ماڵەکەی لەخەیبەر، بەشی ئەو دەستە لەخەڵکانی مەدینە کە لەجەنگی قادسیە و مەداین بەشدار بوون بەلأم لەعێراق نەمابوونەوە و لەمەدینە ژیانیان بەسەر دەبرد و بەشیان لەنەشتاسج بوو، لە عوسمان کوڕی عەفان کڕییەوە. هەروەها لەبەرابەر پێدانی چاڵی ئەریش مڵك و ماڵەکەی عوسمان کوڕی عەفانی لەعێراق کڕییەوە.

مەروان کوڕی حەکەم لەبەرابەر ئەو زەوییەی عوسمان پێی بەخشیبوو، جۆگەی مەروانی لێ کڕییەوە کە لەو کاتەدا بێشەلأن بوو. خەڵکانێك لەهۆزەکانی نیشتەجێی عێراق کە لەمەدینە و مەککە و تاییف و یەمەن و حەزەرمەوت بوون، لەبەرابەر مڵك و ماڵەکەی خۆیان لەدوورگەی عەرەب شتی زۆریان لە سەرورەری باوەڕداران کڕییەوە بۆ نموونە ئەشعەس لەبەرابەر مڵکەکەی خۆی لەحەزەرمەوت، زەوییەکانی ئەوی لەتیزناباد کڕییەوە.

عوسمان کوڕی عەفان لەمبارەوە نامەی بۆ ویلایەتەکان نووسی و لەئەندازەی جەریبە تالأنییەکان ئاگاداری کردنەوە. تالأنی خەڵکی ویلایەتەکان زەوی پاشاکان بوو و کاتێك کەسرا و قەیسەر و خەڵکی سەرزەمینەکەیان بەدوای ئەواندا ڕۆشتبوون و زەوییەکانی خۆیان بەجێهێشتبوو، وەك تالأنی بۆ خەڵکان مایەوە و هەرکەسێك بەشێکی بەرکەوت و ئەو دەستە لەخەڵکانی مەدینەی بەشدار لەشەڕەکان، بەئەندازەی بەشی خۆیان وەرگرت و پێی بەخشین کە لەبەرابەر مڵك و ماڵەکانی

حیجاز و یەمەن و حەزەرمەوت فرۆشتیانەوە.

تەڵحەیش گێڕانەوەیەکی لەم چەشنەی هەیە بەم زیادەیە کەدەڵێت: ئەم جۆرە مڵك و ماڵانە لەهەموو ئەو خەڵکانەی لەعێراق مڵکیان هەبوو و دەیانویست بەمڵکێکی نزیك لەشوێنی نیشتەجێ بوونی خۆیان بیگۆڕنەوە، کڕییەوە. بەڵام ئەوانەی هیچ پێشینە و پێگەیەکیان نەبوو، لەکۆبوونەوەکان و سەرۆکایەتی نەیاندەتوانی بگەنە پێگەی کەسانی خاوەن پێشینە، رەخنەیان لەم ئیمتیازەی ئەوان دەگرت و بەستەم لەقەڵەمیان دەدا بەڵام ئاشکرایان نەدەکرد و لەدەربڕینی دەترسان و ئەو کەسانەی دژی ئەوان بوون هەرکات کەسێکی تازە باڵغ یا ئازاد کراوێك پەیوەستیان دەبوو، وتەکانی ئەوانی پەسەند دەکرد و ژمارەی ئەم دەستەیە بەردەوام زیادی دەکرد و کەسانێکی دیکە هەوڵیان بۆ کەم کردنەوەی دەدا تا ئەوەی ئاژاوە لەناو خەڵکان سەری هەڵدا.

تەڵحە دەڵێت: حوزەیفە لەدوای جەنگی رەی بۆ هاوکاری عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە بۆ جەنگی باب ڕەوانە کرا و سەعید کوڕی عاس هاورێیەتی دەکرد و لەگەڵ ئەو گەیشتە ئازەربایەجان. نەریت بوو دەستەیەکیان وەك هێزی پشتیوان بەجێدەهێشت، لەوێ مایەوە تا حوزەیفە گەڕایەوە و پێکەوە گەڕانەوە.

لەم ساڵەدا یانی ساڵی سیی کۆچ ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەر(د.خ) لەدەستی عوسمان کوڕی عەفان کەوتە ناو چاڵی ئەریس لەدوو میلی مەدینە. چاڵێکی کەم ئاو بوو بەڵام تا ئێستا نەیانتوانیوە بگەنە قوڵاییەکەی.

## گێڕانەوەی کەوتنی ئەنگوستیلەی پێغەمبەر(د.خ) لەدەستی عوسمان کوڕی عەفان بۆ ناو چاڵی ئەریس

کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دەیخواست نامە بۆ عەجەمەکان بنووسێت و پێشنیاری خواپەرەستییان پێبکات. کەسێك وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەوان نامەیەك کەمۆری پێوە نەبێت، وەریناگرن.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی ئەنگوستیلەیەکی لەئاسن بۆ دروست بکەن، کردییە پەنجەی خۆی. جبرەئیل هات و وتی: فڕێبدە. پێغەمبەر(د.خ) فڕیدا و فەرمووی

ئەنگوستیلەیەکی دیکەی بۆ دروست بکەن و ئەمجارە لەمس بۆیان دروست کرد.

جبرەئیل پێی وت: فڕیبدە.

پێغەمبەر(د.خ) فڕیدا و فەرمووی ئەنگوستیلەیەکی لەزیو بۆ دروست بکەن و ئەمجارە جبرەئیل گۆڕانکاری تیا دروست نەکرد. فەرمانیدابوو محەممەد رسول اللەی لەسەر هەڵکەنن. بەو ئەنگوستیلەیە مۆری دەکرد و نامەی بۆ عەجەمەکان دەنارد. نەخشی سەر ئەنگوستیلەکە سێ دێڕ بوو.

پێغەمبەر(د.خ) نامەیەکی بۆ خوسرەو کوڕی هورموز نووسی و بەعومەر کوڕی خەتاب ڕەوانەی کرد. عومەر کوڕی خەتاب نامەکەی بردە لای خوسرەو، بۆیان خوێندەوە بەڵام گرنگی پێنەدا.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، بەقوربانی تۆبم، تۆ لەسەر تەختێك دانیشتوویت کەبەگەڵای دار خورما رازاوەتەوە بەڵام کوڕی هورموز لەسەر تەختی زێڕ دانیشتووە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: شادمان نیت دنیا بۆ ئەوان بێت و ئەو دنیا بۆ ئێمە؟

وتی: شادمانم.

دەڵێت: نامەیەکی دیکە بەدەحییە کوڕی حولەیفەی کەلبی بۆ هێرقلی پاشای ڕۆم نارد و پێشنیاری ئیسلامی پێکرد. نامەکەی خوێندەوە و لای خۆی پاراستی.

ئەنگوستیلەکە لەپێنجەی پێغەمبەردا بوو و نامەکانی پێ مۆر دەکرد تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد و ئەبوبەکر خەلافەتی گرتەدەست و بەو ئەنگوستیلەیە مۆری دەکرد تا کاتی مردن. دووای ئەو عومەر کوڕی خەتاب خەلافەتی گرتەدەست و بەهەمان ئەنگوستیلە مۆری دەکرد تا ئەو کاتەی کوژرا. دووای ئەو عوسمان کوڕی عەفان خەلافەتی گرتەدەست و شەش ساڵ بەو ئەنگوستیلەیە نامەکانی مۆر دەکرد. چاڵێکیان لەمەدینە بۆ ئاو خواردنەوەی موسوڵمانان هەڵکەندبوو، کاتێك عوسمان کوڕی عەفان لەسەر ئاوەکە دانیشتبوو، گەمەی بەئەنگوستیلەکە دەکرد و لەپەنجەی خۆیدا دەیسوڕاند. ئەنگوستیلەکە لەپەنجەی کەوتەخوار و کەوتە ناو چاڵەکە. بەدوایدا گەڕان و چاڵەکەیان لەئاو خاڵی کرد بەڵام نەیاندۆزییەوە. عوسمان کوڕی عەفان سامانێکی زۆری وەك دیاری بۆ ئەو

کەسەی ئەنگوستیلەکەی بۆ ببات، دەستنیشان کرد. خەمبار بوو و کاتێک لەدۆزینەوەی ئەنگوستیلەکە بێ هیوا بوو، ئەنگوستیلەیەکی دیکەیان بەهەمان شێوە بۆ دروست کرد و نەخشی محەممەد رسول اللەیان لەسەر هەڵکەند و تا کاتی مەرگ لەپەنجەیدا بوو. کاتێک کوژرا، ئەنگوستیلەکەیان لەدەستی ڕفاند و کەس نەیزانی کێ ئەو کارەی کرد.

## بەسەرهاتی ئەبوزەر

لەم ساڵەدا یانی ساڵی سیی کۆچ، بەسەرهاتی معاویە و ئەبوزەر روویدا و معاویە ئەوی لەشامەوە بۆ مەدینە نارد. سەبارەت بەناردنەوەی بۆ مەدینە ئاماژەیان بەبابەتی زۆرداوە کەباسی کردنی زۆربەی ئەوان پەسەند ناکەم. ئەوانەی پاساو بۆ معاویە دەهێننەوە، ئاماژە بەگێڕانەوەیەکی لەم چەشنە دەدەن کە لەحەدیسەکەی یەزیدی فەقعەسی باسی کراوە، دەڵێت:

کاتێک کوڕی سەودا هاتە شام، ئەبوزەری بینی و وتی: ئەی ئەبوزەر! سەرت لەمعاویە سوڕنامێنێت کەدەڵێت: ئەم سامانە، سامانی خوایە، بزانن هەموو شتێک تایبەتە بەخواوەند، دەڵێی دەخوازێت ئەو ملك و ماڵە لەموسوڵمانان جیا بکاتەوە و بەدوور لەوان خاوەنی ئەو سامانە بێت.

ئەبوزەر ڕۆشتە لای معاویە و وتی: بۆ سامانی موسوڵمانان بەسامانی خواوەند ناو دەبەیت؟

وتی: ئەی ئەبوزەر، مەگەر ئێمە بەندەی خواوەند نین؟ سامان، سامانی ئەوە و ئافرێنراوەکان، ئافرێنراوی ئەو.

وتی: بڵێ، سامان، سامانی خوایە.

وتی: ناڵێم سامانی خواوەند نییە، بەڵام دەڵێم سامانی موسوڵمانانە.

دەڵێت: کوڕی سەودا ڕۆشتە لای باوکی دەردا کەپێی وت: تۆ کێیت؟ سوێند بەخوا گومان دەکەم جوولەکە بیت.

دوای ئەو، ڕۆشتە لای عیبادە کوڕی سامت کەئەوی گرت و بردییە لای معاویە و وتی: سوێند بەخوا ئەمە ئەو کەسەیە ئەبوزەری بۆ لای تۆ نارد.

دەڵێت: ئەبوزەر لەشام بوو و دەیوت: ئەی دەستەی بەتواناکان! هاوکاری هەژارەکان بکەن. ئەو کەسانەی بەزێر و زیو گەنج دروست دەکەن و لەرێگەی خوادا خەرجی ناکەن، بەڵێنی داغکەری ئاگرینیان پێداون کەئێسك و پشت و کەلەکەیانی پێ داغ دەکەن.

ئەوەندە وتەکانی دووبارە کردەوە کەهەژارەکان چاوی تەماحیان بڕییە سامانی بەتواناکان و هاوکاری کردنیان بەئەرکی سەرشانی ئەوان دەزانی. بەتواناکان لەهەڵس و کەوت و کردەوەی خەڵکان سکاڵایان بەرز کردەوە.

معاویە نامەی بۆ عوسمان کوڕی عەفان نووسی: ئەبوزەر گرفتاری بۆ من دروست دەکات و کار و کردەوەکانی بەمشێوەیە.

عوسمان کوڕی عەفان نووسی: ئاژاوە لووت و چاوی خۆی نیشاندا و زۆری نەماوە بەتەواوی سەر هەڵبدات، دومەڵی نەگەییو، مەتەقێنە، ئەبوزەر بۆ لای من ڕەوانە بکە و کەسێکی ڕێنیشاندەر بکەرە هاوڕێی، توێشوی پێبدە و بەشێوەیەکی گونجاو و شیاو هەڵس وکەوتی لەگەڵ بکە.

معاویە ئەبوزەری لەگەڵ ڕێنیشاندەرێك ڕەوانە کرد و کاتێك گەیشتە مەدینە و کۆبوونەوەی خەڵکانی لەبن کێوی سەلع بینی، وتی: مژدەی هێرشێکی دوور و درێژ و جەنگێکی لەبیرنەکراوە بەخەڵکانی مەدینە دەدەم.

دواتر ڕۆشتە لای عوسمان کوڕی عەفان و وتی: ئەی ئەبوزەر، بۆ خەڵکان لەتۆ سکاڵا دەکەن؟

ئەبوزەر وتی: شیاو نییە بڵێن سامانی خواوەند و شیاو نییە بەتواناکان سامان و گەنج پاشەکەوت بکەن.

وتی: ئەی ئەبوزەر، من دەبێت ئەرکەکانی خۆم ئەنجام بدەم و ئەوەی لەئەستۆی ژێردەستەکاندایە، وەریبگرم و بۆ خواپەرەستی ناچاریان نەکەم و پێشنیاری دادپەروەرییان پێ بکەم.

وتی: مۆڵەتی ڕۆشتنم پێدە چوونکە مەدینە شوێنی مانەوە نییە.

وتی: ئایا دەڕۆیتە شوێنێکی خراپتر لێرە؟

وتی: پێغەمبەر(د.خ) پێی فەرمووم کاتێك بینای خەڵکان گەیشتە نزیك کێوی

سەلع، لەمەدینە بڕۆم.

وتی: ئەو فەرمانەی پێی داویت، ئەنجامی بدە.

دەڵێت: ئەبوزەر ڕۆشت و لەرەبزە نیشتەجێ بوو. بناغەی مزگەوتێکی داڕشت. عوسمان کوڕی عەفان گایەلێك وشتر و دوو کۆیلەی پێبەخشی و پەیامی بۆ نارد، هەندێ کات سەردانی مەدینە بکە چوونکە خراپەی ئەو نابیستیت. ئەبوزەر جار نەجارێ سەردانی مەدینەی دەکرد.

کوڕی عەباس دەڵێت: ئەبوزەر لەترسی سارانیشن بوون هەندێ کات لەرەبزەوە سەردانی مەدینەی دەکرد بەڵام زیاتر حەزی لەتەنیایی بوو. ڕۆژێك ڕۆشتە لای عوسمان کوڕی عەفان، کەعب الاخباریش لای ئەو بوو، ئەبوزەر وتی: بەوە ڕازی مەبن خەڵکان ئازار بدەن، دەبێت چاکە بکەن ئەوەی زەکات دەدات نابێت تەنیا بەوە بەسەندە بکات بەڵکو دەبێت چاکە لەگەڵ جیران و براکانی بکات و خزمەکانی لەبیر نەکات.

کەعب وتی: هەرکەس ئەرکە دینییەکانی ئەنجام بدات، ئەرکەکانی خۆی ئەنجام داوە.

ئەبوزەر داردەستەکەی خۆی بەرز کردەوە و کێشای بەسەری کەعبدا و شکاندی.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: بیبەخشە و ئەو بەخشی، بەئەبوزەری وت: ئەی ئەبوزەر، لەخوا بترسە و ڕێگە لەدەست و زمانی خۆت بگرە.

ئەبوزەر پێی وتبوو: ئەی کوڕی ژنی جوولەکە، تۆ کارت بەکاروباری ئێرە چییە؟ یا گوێ لەمن بگرە یا حاڵیت دەکەم.

محەممەد کوڕی سیرین دەڵێت: کاتێك ئەبوزەر بینی عوسمان کوڕی عەفان گوێ لەوتەکانی ناگرێت، بەخواستی خۆی رووی کردە رەبزە. معاویە دوای ئەو بنەماڵەکەی لەشام دەرکرد و لەرەبزە پەیوەستی ئەبوزەر بوون. کیسەیەکیان پێ بوو کە لەدەستی پیاوێك قورس دەهاتە بەرچاو. معاویە وتی: سەیر کەن ئەو کەسەی پێشنیاری خواپەرەستی بەخەڵکان دەکات، چی هەیە؟

ژنەکەی ئەبوزەر وتی: سوێند بەخوا درەم و دینار لەم کیسەدا نییە، سکەی مسینە و کاتێك مانگانەکەی بەدەستی دەگەیشت، سکەی مسینی بۆ ئێمە دەکڕی.

دەڵێت: ئەبوزەر لەرەبزە نیشتەجێ ببوو، بۆ نوێژ ریزیان دەبەست. پێشنوێژ

لێپرسراوی کۆکردنەوەی زەکات بوو، بەئەبوزەری وت: پێشنوێژی بکە.

ئەبوزەر وتی: نا، تۆ پێشنوێژی بکە چوونکە پێغەمبەر(د.خ) پێی فەرمووم ببیستە و گوێرایەڵ بە تەنانەت ئەگەر کۆیلەیەکی لووت بڕاو پێشنوێژی تۆ بێت. تۆ کۆیلەیت بەڵام لووت بڕاو نیت. ئەو کەسە، یەکێك لەکۆیلە ڕەشەکان و ناوی موجاشیع بوو.

جابر دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان بۆ ئەبوزەر ڕۆژی یەك ئێسقانی دیاری کردبوو، بۆ رافیع کوڕی خودەیجیش بەهەمان شێوە، ئەوان بە هۆی ئەوەی بیستبوویان و بۆیان روون نەکرابوویەوە، لەمەدینە ڕۆشتنەدەر و کەس ڕێگەی لێ نەگرتن.

سەلمە کوڕی نەباتە دەڵێت: بەمەبەستی حەجی عەمرە بەرێکەوتین، کاتێك گەیشتینە رەبزە، بۆ بینینی ئەبوزەر ڕوومان لەماڵەکەی کرد، بەڵام نەمانبینی، وتیان: بۆ لای ئاوەکە ڕۆشتووە.

دەڵێت: لەوێ دوور کەوتینەوە و لەنزیك ماڵەکەی ئەو مەنزڵمان گرت، کەمێك دواتر گەڕایەوە و ئێسقانێکی وشتری پێبوو، کۆیلەیەك هەڵیگرتبوو. سڵاوی کرد و ڕۆشت تا گەیشتە ماڵەکەی خۆی. زۆری نەخایاند هات و لای ئێمە دانیشت، وتی: پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێداوم ببیستم و گوێرایەڵ بم تەنانەت ئەگەر لووت براوێکی حەبەشی سەروەرم بێت. لەسەر ئەم ئاوە دابەزیم کە چەندین کۆیلە لەماڵی خواوەند لێرەن و گەورەکەیان پیاوێکی حەبەشییە بەڵام لووت بڕاو نییە. وەسفی پیاوی حەبەشی کرد و وتی: ڕۆژانە یەك وشتریان هەیە، منیش ئێسقانێکم پێ دەبڕێت و لەگەڵ نانخۆرەکانم دەیخۆین.

وتم: چەندە سامانت هەیە؟

وتی: ڕانە مەڕێك و گایەلێك وشتر کەیەکیانم بەکۆیلەکەم سپاردووە و ئەوی دیکەیان بەکەنیزەکەم، کۆیلەکەم کۆتایی ساڵ ئازاد دەکرێت.

وتم: هاوەڵانی تۆ کەلای ئێمەن، سامانەکەیان زیاتر لەمەیە.

وتی: ئەوان چەندە مافیان بەسامانی خواوەندەوە هەیە، منیش بەهەمان ئەندازە.

کەسانی دیکە لەمبارەوە ئاماژەیان بەبابەتی قێزەونی ئەوتۆ داوە کەباس کردنیان

پەسەند ناکەم.

بەوتەی دەستەیەك لەم ساڵەدا یەزدگێرد کوڕی شەهریار لەفارسەوە بەرەو خوراسان هەڵات.

ئاماژەدان بەهەڵاتنی یەزدگێرد

داوود دەڵێت: کوڕی عامر هاتە بەسرە، دواتر رووی کردە فارس و دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت. لەساڵی سی یەزدگێرد لەگور کەهەمان ئەردەشێر خەرەیە، هەڵات و کوڕی عامر موجاشیع کوڕی مەسعودی سولەمی بەدوای ئەودا نارد و تا کرمان شوێنی کەوت. موجاشیع لەگەڵ سوپاکەی لەسیرجان دابەزی و یەزدگێرد هەڵات بۆ خوراسان.

دەڵێت: بەوتەی خەڵکانی عەبدقەیس، کوڕی عامر، هێرەم کوڕی حەییانی عەبدی بەدوای یەزدگێرددا نارد. بەوتەی خەڵکانی بەکر کوڕی وایل، کوڕی حەسانی یەشکوری نارد بەلاَم ڕۆشتنی موجاشیع لای ئێمە بڕواپێکراوترە.

فەزڵی کرمانی لەباوکی دەگێڕێتەوە: موجاشیع بۆ شوێنکەوتنی یەزدگێرد لەسیرجانەوە بەرێکەوت و کاتێك لەبیمەند گەیشتە کۆشکەکە، ئەو کۆشکەی بەکۆشکی موجاشیع ناوی دەبەن، گرفتاری بەفر و تۆفان بوون، بەفر باری و سەرما تەنگی پێ هەڵچنین، بەفر بەئەندازەی ڕمێك باڕی، سوپاکە لەناوچوو و موجاشیع تەندروست مایەوە لەگەڵ پیاوێکی دیکە کەژنێکی جوان هاورێیەتی دەکرد. سکی وشترەکەی خۆی دڕی و ژنەکەی لەناویدا جێگە کردەوە و هەڵات. بۆ رۆژی دواتر کاتێك گەڕایەوە، بینی ژنەکە زیندووە، ئەوی لەگەڵ خۆی برد و خەڵك ئەو کۆشکەکەیان بەکۆشکی موجاشیع ناو برد لەبەر ئەوەی سوپاکەی لەوێ لەناوچوو. کۆشك لەشەش یا حەوت فەرسەخی سیرجانە.

باوکی میقدام لەشێخەکانی خۆی دەگێڕێتەوە: موجاشیع لەگەڵ نێردراوانی بەسرە لەشووشتەرەوە هات. ئەحنەف یەکێك بوو لەوان و لەبەرەبەیانێك کە سوار لەسەر سەفرا بێچووی غەرا بێچووی غەبرا بوو، پەنجا هەزاری وەرگرت. عومەر کوڕی خەتاب کاتێك بەشێك لەسامانی کارگوزارانی خۆی دەگرت، ئەسپەکەی لێ دەسەندن.

بیژەر دەڵێت: بەنەسر کوڕی ئیسحاقم وت باوکی میقدام حەدیسێکی لەمشێوەیە هەیە، وتی: راستە، من ئەم گێڕانەوەم لەچەند کەسێکی دیکە بیستووە، ئەسپەکەی ئەو سەفرا بێچووی غەرا بێچووی غەبرا بوو. موجاشیع کوڕی سەعلەبە کوڕی عائیز کوڕی وەهب کوڕی رەبیعە کوڕی یەربووع کوڕی سەمال کوڕی عەوف کوڕی ئەمرئەلقەیس کوڕی بەهسە کوڕی سەلیم و نازناوەکەی باوکی سلێمانە.

دەڵێت: لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی عەفان بانگی سێیەمی زیاد کرد و لەمەنی چوار رەکعەت نوێژی خوێند.

لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی عەفان حەجی لەگەڵ خەڵکان کرد.

## ساڵی سی و یەك دەستی پێکرد.

## ڕووداوە گرنگەکانی ساڵی سی و یەك

بەوتەی واقدی لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە جەنگی نێوان موسوڵمانان و ڕۆمییەکان بوو کە بەجەنگی دەکەڵەکان ناویان برد. بەڵام بەوتەی باوکی مەعشەر جەنگی دەکەڵەکان لەساڵی سی و چواری کۆچ ڕوویدا. دڵێت: لەساڵی سی و یەك جەنگی ڕەشەکان لەدەریا ڕوویدا و ڕووداوەکانی تایبەت بەخوسرەو لەم ساڵە ڕوویدا. بەڵام بەوتەی واقدی جەنگی دەکەڵەکان و ڕەشەکان هەردووك لەساڵی سی و یەك ڕوویاندا.

## گێڕانەوەی ئەم دوو جەنگە

عاسم کوڕی عومەیر کوڕی قتادە دەڵێت: خەڵکانی شام بەسەرکردایەتی معاویە کوڕی ئەبی سوفیان بەڕێکەوتن. هەموو شام لەژێر دەستی معاویەدا بوو.

## دەست بەسەراگرتنی هەموو شام لەلایەن معاویە

باوکی حارسە دەڵێت: کاتێك مەرگی باوکی عوبەیدە نزیك کەوتەوە، عەیاز کوڕی غەنەمی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد کەخاڵ و کوڕە مامی بوو. عەیاز کارگوزاری جەزیرە بوو. عومەر کوڕی خەتاب ئەوی لەسەر کار لابرد و لەشام پەیوەستی باوکی عوبەیدەی کرد.

عەیاز پیاوێکی بەخشندە و بەبەخشندەیی بەناوبانگ بوو. دڵدادە و تامەزرۆی هیچ شتێك نەبوو و هیچی لەهیچ کەسێك دریغ نەدەکرد.

لەمبارەوە لەگەڵ عومەر کوڕی خەتاب قسەیان کرد و وتیان: خالیدت لەسەر کار لابرد و بۆ بەخشندەیی ئەوت سەرکۆنە کرد، عەیاز بەخشندەترین پیاوی عەرەبە و داوای هەرچی لێ بکەن، دریغی ناکات.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: دەبێت عەیاز کارەکەی خۆی تەواو بکات تا بگاتە کارەکەی ئێمە، جیاواز لەوە، من گۆڕانکاری لەکاری باوکی عوبەیدە ناکەم.

عەیاز کوڕی غەنەم دوای باوکی عوبەیدە کۆچی دوایی کرد و عومەر کوڕی

خەتاب، سەعید کوڕی حوزەیمی جومەحی لەجێگەی ئەو دانا. دووای ئەوە سەعید مرد و عومەر کوڕی خەتاب، عومەیر کوڕی سەعدی ئەنساری لەجێگەی ئەو دانا.

کاتێك عومەر کوڕی خەتاب مرد، معاویە کارگوزاری دیمەشق و ئەردەن و عومەیر کوڕی سەعد کارگوزاری حیمس وقێنسرین بوو. معاویە کوڕی ئەبوسوفیان قێنسرینی بەهۆی ئەو کەسانەی لەعێراقەوە پەیوەستی ببوون، وەك ویلایەتێك، جیای کردبوویەوە.

کاتێك یەزید کوڕی ئەبوسوفیان مرد، عومەر کوڕی خەتاب، معاویەی لەجێگەی ئەو دانا و هەواڵی مەرگی ئەوی بەئەبوسوفیان راگەیاند کەوتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، کارەکەی ئەوت بەکێ سپارد؟

وتی: معاویە.

وتی: چاکە لەخزمەکان دەبینیت.

بەمشێوەیە، ئەردەن و دیمەشق کەوتە سنووری فەرمانڕەوایەتی معاویە.

کاتێك عومەر کوڕی خەتاب کۆچی دوایی کرد، معاویە کارگوزاری دیمەشق وئەردەن و عومەیر کوڕی سەعد کارگوزاری قێنسرین و حیمس، عەلقەمە کوڕی موحریز کارگوزاری فەلەستین و عەمرۆ کوڕی عاس کارگوزاری میسر بوو.

سالم دەڵێت: یەکەم کارگوزار عوسمان کوڕی عەفان دەستنیشانی کرد، سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و ئەم کارەی لەسەر پێشنیاری عومەر کوڕی خەتاب ئەنجامدا. دوای ئەوە عومەر کوڕی سەعد تاعوونی گرت و لەبەر نەخۆشییەکەی لاواز و داوای لە عوسمان کوڕی عەفان کرد لەکارەکەی دووری بخاتەوە و مۆڵەتی ویست بۆ ئەوەی بۆ لای کەسەکانی خۆی بگەڕێتەوە. عوسمان کوڕی عەفان مۆڵەتی پێدا و حیمس و قێنسرینی پەیوەستی سنووری فەرمانڕەوایەتی معاویە کرد.

خالید کوڕی مەعدان دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان خەلافەتی گرتەدەست، کارگوزارانی عومەر کوڕی خەتابی لەشام هێشتەوە و کاتێك عەبدولرەحمان کوڕی عەلقەمەی کەنانی، کارگوزاری فەلەستین، مرد، کارەکەی ئەوی بەمعاویە سپارد. عومەر کوڕی سەعد لەماوەی فەرمانڕەوایەتی عوسمان کوڕی عەفان نەخۆش کەوت و نەخۆشییەکەی درێژەی کێشا و داوای مۆڵەتی گەڕانەوەی کرد. عوسمان کوڕی

عەفان مۆڵەتی پێدا و کارەکەی ئەوی بەمعاویە سپارد.

بەمشێوەیە لەساڵی دووەمی خەلافەتی عوسمان کوڕی عەفان، معاویە فەرمانڕەوایەتی هەموو شامی گرتەدەست.

عەمرۆ کوڕی عاس لەرۆژگاری خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب کارگوزاری میسر بوو. عوسمان کوڕی عەفان لەسەرەتای خەلافەتی خۆی ئەوی لەپێگەکەیدا هێشتەوە.

هەنووکە دەگەڕێینەوە بۆ باس کردنی گێرانەوەی واقدی تایبەت بەو دوو جەنگەی پێشتر ئاماژەمان پێدا.

دەڵێت: خەڵکانی شام بەسەرکردایەتی معاویە بەرێکەوتن. سەرکردەی سوپای دەریا عەبدوللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح بوو.

دەڵێت: لەم ساڵەدا قوستەنتین کوڕی هێرقل بەرێکەوت. موسوڵمانان لەئەفریقییە زیانی زۆریان لەوان بەرکەوت ورۆمییەکان بەسوپایەك کە لەسەرەتایی ئیسلامە هاوشێوەی ئەو سوپایان کۆنەکردبوویەوە، بەرێکەوتن. پێنسەد کەشتییان پێبوو و ڕووبەڕووی عەبدوللە کوڕی سەعد بوونەوە و ئەمانیان بەیەك بەخشی تا ئەو کاتەی کەشتی موسوڵمانان و کەشتی رومییەکان لەیەك نزیك کەوتنەوە و دەکەڵەکانیان لەیەك گیری کرد.

مالك کوڕی ئەوس کوڕی حەدسان دەڵێت: لەگەڵ سوپای دەریادا بووم. لەدەریا جەنگ دەستی پێکرد و کەشتییەکانم بینی کەهەرگیز هاوشێوەیم نەبینیبوو، با، لەدژی ئێمە بوو، کاژێرێك لەنگەرمان گرت، ئەوانیش لەنزیك ئێمە لەنگەریان گرت تا ئەو کاتەی با، ئارام بوویەوە.

دەڵێت: پێمان وتن: ئەمان بەیەك ببەخشین.

وتیان: رازین.

وتم: ئەگەر ویستتان، دەڕۆینە بەستێن، تا ئەوەی خێرایی زیاتری هەیە، لەناو بچێت.

ئەوان بەیەك دەنگ هاواریان کرد و وتیان: ئاو.

لەوان نزیك کەوتینەوە و کەشتییەکانمان پێکەوە بەست تا ئەو جێگەی ئێمە و ئەوان لەسەر کەشتییەکانی خۆمان و ئەوان، شەڕە شمشێرەمان دەکرد. شەڕێکی قورسمان تاقی کردەوە، پیاوەکان ڕژانە سەر کەشتییەکان و بەشمشێر و ڕم کەوتنە

گیانی یەك بەرادەیەك خوێن لەگەڵ شەپۆلەکانی دەریا گەیشتە بەستێن و شەپۆل، جەستەی کوژراوانی لەسەر یەك کەڵەکە کرد.

زەید کوڕی ئەسلەم لەباوکی لەزمانی کەسێکی بەشدار لەو جەنگە دەگێڕێتەوەو: بەستێنی دەریامان بینی کەبا، شەپۆلەکانی دەکێشا بەکەنارەکاندا و لاشەی کوژراوەکان هاوشێوەی تەپۆڵکەیەك بەرز، بەرز ببوویەوە، ئاوەکە ڕەنگی خوێنی گرتبوو. لەو ڕۆژەدا ژمارەیەکی زۆر لە موسوڵمانان کوژرا و لەرۆمییەکان بەئەندازەیەك کوژرا کەس نەیتوانی ژمارەکەی بخەملێنێت. بەرادەیەك خۆڕاگرییان کرد پێشتر لەهیچ جەنگێکدا بەو ئەندازەیە خۆڕاگرییان نەکردبوو. خواوەند سەرکەتنی بە موسوڵمانان بەخشی و قوستەنتین شکستی خوارد و شکستی ئەو لەبەر زۆری کوژراو و بریندارەکانی سوپای ڕۆمی بوو. خۆیشی لەچەندین شوێنەوە بریندار ببوو و تاماوەیەك بەبرینداری ژیانی بەسەر دەبرد.

جەنش کوڕی عەبدوللە سەنعانی دەڵێت: یەکەم جار کاتێك باسی محەممەد کوڕی حوزەیفە هاتە کایەوە، ئەو کاتە بوو خەڵکان ڕۆشتنە دەریا و ئەمە لەساڵی سی و یەکەمدا بوو ئەو کاتەی عەبدوللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح لەگەڵ خەڵکان نوێژی ئێوارێی خوێند و محەممەد کوڕی حوزەیفە تەکبیری وت و دەنگی خۆی بەرز کردەوە تا ئەوەی پێشنوێژ، عەبدوللە کوڕی سەعد کۆتایی بەنوێژەکەی هێنا و کاتێك ئاوڕی دایەوە، پرسی: ئەوە کێ بوو؟

وتیان: محەممەد کوڕی حوزەیفە بوو تەکبیری دەوت.

عەبدوللە کوڕی سەعد ئەوی بانگ کرد و وتی: ئەم دیاردە تازەیە چییە؟

وتی: ئەمە دیاردەیەکی تازە نییە و تەکبیر وتن کێشەی تیا نییە.

وتی: چیتر ئەوکارە دووبارە مەکەرەوە.

دەڵێت: محەممەد کوڕی حوزیفە بێدەنگ بوو، کاتێك عەبدوللە کوڕی سەعد نوێژی شەوانی دەخوێند، محەممەد کوڕی حوزەیفە بەدەنگێکی بەرزتر لەپێشوو تەکبیری هێنایە سەرزمان و عەبدوللە کەسی بەدوای ئەودا نارد و وتی: تۆ کوڕێکی ئەحمەقیت. سوێند بەخوا ئەگەر دەمزانی سەروەری باوەڕداران چی دەخوازێت، سزام دەدایت.

محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە وتی: سوێند بەخوا توانای ئەوکارەت نییە و ئەگەر بخوازیت، ناتوانیت.

وتی: ئەگەر بێدەنگ بیت، بۆ تۆ باشترە، سوێند بەخوا لەگەڵ ئێمە سوار کەشتییەکان نابیت.

وتی: من لەگەڵ موسوڵمانان سوار کەشتی دەبم.

وتی: لەهەر شوێنێك و لەگەڵ هەر کەسێك دەخوازیت، سەرکەوە.

دەڵێت: ئەو، بەتەنیایی سوار یەك کەشتی بوو، تەنیا قیبتییەکانی لەگەڵدا بوو و کاتێك گەیشتنە گۆڕەپانی جەنگ، ڕووبەڕووی ڕۆمییەکان بوونەوە کەپێنسەد یا شەشسەد کەشتییان پێبوو. قوستەنتین کوڕی هێرقل سەرکردایەتی ئەوانی دەکرد. عەبدوڵلە کوڕی سەعد داوای بۆچوونی کەسانی نزیکی خۆی کرد و وتیان: ئەمشەو، لێکۆڵینەوە دەکەین.

ڕۆمییەکان بەدرێژایی شەو، ناقوسیان لێ دەدا و موسوڵمانان نوێژیان دەخوێند و لەخوا دەپاڕانەوە. کاتێك بەیانی بوویەوە، قوستەنتین مەبەستی جەنگی لەسەردا بوو. کەشتییەکانیان لەیەك نزیك کردەوە و ئەوانیان بەیەکەوە بەست. عەبدوڵلە کوڕی سەعد لەکەنار کەشتییەکان ڕیزی بەست و فەرمانی قورئان خوێندنەوەی دەرکرد و داوای کرد خۆڕاگری بکەنە پیشە.

ڕۆمییەکان هێرشیان کردە سەر کەشتی موسوڵمانان و ڕیزەکانیان. ڕیزی موسوڵمانان شکستی خوارد و بەشێوەیەکی بەربڵاو درێژەیان بەجەنگەکەدا .

دەڵێت: شەڕێکی قورسیان ئەزمون کرد و خواوەند سەرکەوتنی بە موسوڵمانان بەخشی و تەنیا ژمارەیەکی کەم لەڕۆمییەکان توانییان گیان دەرباز بکەن. دوای شکستی ڕۆمییەکان عەبدوڵلە چەند ڕۆژێك لەگۆڕەپانی جەنگەکە مایەوە و دواتر گەڕایەوە.

محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە بەخەڵکانی دەوت: سوێند بەخوا جیهادی ڕاستەقینمان پشتگوێ خستووە.

پێیان وت: کام جیهادە؟

دەیوت: عوسمان کوڕی عەفان ئەمە و ئەوەی کرد. تا ئەو جێگەی خەڵکانی بەدگومان کرد و کاتێك گەڕانەوە سەرزەمینی خۆیان، محەممەد بیروبۆچوونی ئەوانی

بـەفیڕۆدابوو. بەشـێوەیەك قـسەیان دەهێنایـە سـەرزمان، پێـشتر بیریـشیان لـێ نەدەکردەوە.

زوهری دەڵێت: ئەو ساڵەی عەبدوللە کوڕی سەعد بۆ جەنگ ڕۆشت، محەممەد کـوڕی ئـەبی حوزەیفـە و محەممـەد کـوڕی ئـەبی بـەکریش ڕۆشـتن و ڕەخنـەیان لـە عوسمان کوڕی عەفان دەگرت و سەبارەت بەو کارانەی بەپێچەوانەی خەلیفەی یەکەم دەیکـرد، وتـەیان دەهێنایـە سـەرزمان و دەیـانوت خـوێنی عوسمـان کـوڕی عـەفان حەلاڵـە. دەیـانوت: عوسمـان کـوڕی عـەفان، عەبدوللـە کـوڕی سـەعد کـوڕی ئـەبی سەرحی، ئەو پیاوەی خوێنی ئەو بەفیڕۆ دراوە و ئایەی قورئان سەبارەت بەکوفری ئـەو هاتۆتـە خـوار، وەك کـارگوزار دەستنیـشان کـردووە. پێغەمبـەر(د.خ) چـەندین کەسی لـەخۆی دوور خستبوویەوە کـە عوسمـان کـوڕی عـەفان ئـەوان لـەخۆی نزیـك دەکاتەوە. هاوەڵانی پێغەمبەری پشتگوێ خست و سەعید کوڕی عاس و عەبدوللە کوڕی عامری کردۆتە سەرکردەی خەڵکان.

ئـەم وتانـە بـەگوێی عەبدوللـە کـوڕی سـەعد گەیـشت و وتـی: لەگـەڵ ئێمـە سەرنەکەون. ئـەوان سـوار کەشتییەکەی دیکە بوون کەکەس لە موسوڵمانان سوار نەبوو و کاتێك رووبەرووی دوژمن بوونـەوە، لاوازتر و سستتر لەهەموو موسوڵمانان دەجەنگان و کاتێك سەبارەت بەم کارە پرسیاریان لێکردن، وتیان: چۆن شان بەشانی کەسێك بجەنگین کەشیاو نییە بۆ سەرکردایەتی. عەبدوللە کوڕی سەعد کارگوزاری عوسمـان کـوڕی عـەفان و عوسمـان کـوڕی عـەفان، فلانـە کار و فیسارە کاری ئەنجام داوە. خەڵك ئەم غەزایان بەفیڕۆدا چوونکە تەنیا سەرقاڵی ڕەخنە گرتن لە عوسمان کوڕی عەفان بوون.

دەڵێت: عەبدوللە کوڕی سەعد کەسی بەدوای ئەواندا نارد و ڕێگەی ئەو کارانەی لێگـرتن و وتـی: سـوێند بـەخوا ئەگـەر لەمەبەسـتی سـەروەری بـاوەڕداران ئاگـادار دەبووم، سزام دەدان و زیندانیم دەکردن.

واقدی دەڵێت: لـەم ساڵەدا ئەبوسوفیان کوڕی حـەرب لەتەمـەنی هەشتاو هەشت ساڵی مرد.

بەوتـەی واقدی لـەم سـاڵەدا یـانی سـاڵی سـی و یـەك، ئەرمەنییـە لەسـەر دەستی

حەبیب کوڕی موسلیمەی قەهری دەستی بەسەردا گیرا.

لەم ساڵەدا یەزدگێردی پاشای پارس، کوژرا.

## گێڕانەوەی کوژرانی یەزدگێرد

سەبارەت بەکوشتنی ئەو و چۆنییەتی کوشتنەکەی گێڕانەوەکان جیاوازە. کوڕی ئیسحاق دەڵێت: یەزدگێرد لەگەڵ دەستەیەکەی کەم لەکرمانەوە بۆ مەرو هەڵهات و لەسنووورداری ئەو ناوچەیە داوای سامانی کرد بەڵام پێیان نەدا چوونکە لەگیانی خۆیان دەترسان و کەسیان بۆ لای تورکەکان نارد و دژی ئەو داوای هاوکارییان لێکرد. بەمشێوەیە شەوانە هێرشیان کردە سەر و کەسەکانی ئەویان کوشت. یەزدگێرد هەڵات و لەکەنار رووباری مەرغاب، گەیشتەماڵی پیاوێك کەبەردی ئاشی دروست دەکرد. شەوانە پەنای بۆ پیاوی ناو ماڵەکە برد و کاتێك خەوت، پیاوەکە ئەوی کوشت.

هوزەلی دەڵێت: یەزدگێردی هەڵاتوو لەکرمانەوە گەیشتە مەرو و لەسنووردار و خەڵکی ئەو شارە داوای سامانی کرد بەڵام پێیان نەدا و لێی ترسان و شەوانە هێرشیان کردە سەر. داوای هاوکارییان لەتورکەکان نەکرد، هاوەڵانی یەزدگێردیان کوشت و خۆی بەپیادە هەڵات. پشتێن و شمشێر و تاجەکەی خۆی پێبوو و لەسەر کەنار رووباری مەرغاب ڕۆشتە ماڵی ئاشەوانێك و لەنائاگاییدا پیاوی ئاشەوان کوشتی و کەل و پەلەکانی هەڵگرت و جەستەکەی فرێدایە ناو رووبارەکە.

دەڵێت: بەرەبەیانان خەڵکانی مەرو بەدوای شوێنپێکانی ئەودا هاتن و لەنزیك ماڵی پیاوەکە، شوێنپێکانی ئەویان ون کرد. پیاوەکەیان گرت و بڕیاریدا پاشای کوژراو وکەل و پەلەکانی بێنێت. دواتر ئاشەوان و کەسانی بنەماڵەکەیان کوشت و کەل و پەلەکانی ئەو و کەل و پەلەکانی یەزدگێردیان هەڵگرت و جەستەی پاشایان لەرووبارەکە هێنایەدەر و خستیانە ناو تابووتێکی دارین.

دەڵێت: بەوتەی دەستەیەك ئەویان بردە ئیستەخر و لەسەرەتایی ساڵی سی و یەکەم ئەویان بەخاك سپارد و مەرو، بەدوژمنی خوا، ناوی دەرکرد.

دەڵێت: یەزدگێرد لەمەرو نزیکی لەگەڵ ژنێك کرد و کوڕێکی بۆ هێنایە دنیا

کەلایەکی جەستەی نوقسان بوو. ئەمە دووایی کوژرانی یەزدگێرد و ئەویان بەموخەدیج ناو برد کە بەمانای نوقسانە. ئەم کوڕە لەخوراسان چەندین منالی بۆ هاتە دنیا. کاتێك قوتەیبە، سەغد یا ناوچەیەکی دیکەی گرت، دوو کچیان دەسکەوت کەپێیان وت لەمنالەکانی موخەدیجن. ئەو، هەردووکیان یا یەکیانی بۆ لای حەجاج کوڕی یوسف نارد و ئەویش بۆ وەلیدی نارد و ئەو کچە، بۆ وەلید یەزید کوڕی وەلیدی هێنایە دنیا کەئەویش نوقسان بوو.

خورداد زەببەی رازی دەڵێت: یەزدگێرد هاتە خوراسان، خەرزاد مێهر برای رۆستەم، هاورێیەتی دەکرد و بەماهویە سنووورداری مەروی وت: پاشا بەتۆ دەسپێرم. خۆی رووی کردە عێراق. یەزدگێرد لەمەرو مایەوە و مەبەستی ئەوەی کرد ماهویە لەسەر کار لاببات. ئەو، نامەی بۆ تورکەکان نوسی و لەهەلاتنی یەزدگێرد و هاتنی ئەو ئاگاداری کردنەوە و پەیمانی لەگەلّ بەستن دژی ئەو، هاوکارییان بکات و رێگەیان بۆ بکاتەوە.

دەڵێت: تورکەکان روویان لەمەرو کرد و یەزدگێرد لەگەلّ سوپاکەی خۆی رووبەروویان بوویەوە و جەنگا. ماهویە و سوارچاکەکانی مەرو، هاورێیەتییان دەکرد. یەزدگێرد ژمارەیەکی زۆر لەتورکەکانی کوشت. ماهویە ترسا تورکەکان شکست بخۆن. لەبەر ئەمە لەگەلّ سوارچاکەکانی مەرو، پەیوەستی تورکەکان بوو و سوپاکەی یەزدگێرد شکستی خوارد و کوشتار کران. لەشەودا ئەسپەکەی یەزدگێردیان کوشت و پیادە هەلات. لەکەنارەکانی رووباری مەرغاب گەیشتە ماڵێك کەئاشەوانێك لەو ماڵەدا ژیانی بەسەر دەبرد. دوو شەو لەوێ مایەوە. ماهویە بەدوایدا دەگەڕا بەلاّم نەیدۆزییەوە.

دەڵێت: بەرەبەیانی رۆژی دووەم، خاوەنی ئاشەکە گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و کاتێك یەزدگێردی بینی، پرسی، تۆ کێیت، مرۆڤ یا جنۆکە؟

وتی: مرۆڤم، خواردنت هەیە.

وتی: بەڵێ. خواردنی بۆ برد.

یەزدگێرد وتی: من گۆرانیبێژم، شتێك بێنە تا گۆڕانی بخوێنم.

ئاشەوان ڕۆشتە لای یەکێك لەسوارچاکەکان و داوای شتێکی لێکرد.

وتی: دەتەوێت چی بکەیت؟

وتی: پیاوێك لەماڵەکەی مندایە هەرگیز هاوشێوەی ئەوم نەبینیوە، داوای ئەم شتەی لەمن کردووە.

سوارچاك ئەوی بردە لای ماهویە کەوتی: ئەوە یەزدگێردە، بڕۆن و سەری بێنن.

موبید پێی وت: مافی ئەو کارەت نییە، دەزانی کەدین و پاشایەتی پەیوەستی یەکترن و هیچیان بێ ئەوەی دیکە تەواو نییە. ئەگەر ئەو کارە بکەیت، ڕێزی خەڵکان دەشکێنیت.

خەڵکان دەنگیان بەرز کردەوە و ئەم کارەیان بەقێزەون لەقەڵەمدا. ماهویە جوێنبارانی کردن و بەسوارچاکەکانی وت: هەرکەس قسەی کرد، بیکوژن. دەستەیەکی لەگەڵ ئاشەوانەکەدا نارد و فەرمانی کوشتنی یەزدگێردی پێدان. کاتێك ئەویان بینی، کوشتنی ئەویان پەسەند نەکرد و خۆیان لەو کارە بەدوور گرت، بەئاشەوانەکەیان وت: بڕۆ و بیکوژە.

ئاشەوان ڕۆشتە لای یەزدگێرد، خەوتبوو، بەردێکی گەورەی هەڵگرت و کێشای بەسەری یەزدگێرددا، دواتر سەری بڕی و تەسلیمی نێردراوانی ماهویەی کرد و جەستەکەی فڕێدایە ناو رووبارەکە. دوای ئەوە دەستەیەك لەخەڵکانی مەرو هاتن و ئاشەوانەکەیان کوشت و ئاشەکەیان وێران کرد. ئەسقوفی مەرو هات و جەستەی یەزدگێردی لەرووبارەکە دەرهێنا و خستیە ناو تابوتێك و بردی بۆ ئیستەخر و لەوێ بەخاکی سپارد.

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: دوای جەنگی نەهاوەند کەدوایین جەنگی پارسەکان بوو، یەزدگێرد هەڵات و لەسەرزەمینی ئیسفهان گیرسایەوە. پیاوێك لەوێ دەژیا بەناوی مەتیار کە لەوەرزێرەکانی ئیسفەهان بوو. کاتێك عەجەمەکان توانای جەنگان لەگەڵ عەرەبەکانیان نەما، ئامادەیی لەخۆی نیشاندا و عەجەمەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و وتی: ئەگەر کاروباری ئێوە بگرمە دەست و ئێوە بۆ جەنگی عەرەبەکان ببەم، چیم پێ دەبڕێت؟

وتیان: لەپێشی تۆ پشتڕاست دەکەینەوە.

ئەوانی لەگەڵ خۆی برد و کەمێك زیانی لەعەرەبەکاندا و بەم پێیە پێگەی لای عەجەمەکان بەرز بوویەوە.

کاتێک یەزدگێرد بارودۆخی ئیسفەهانی بینی، لەوێ دابەزی. ڕۆژێک مەتیار سەردانی کرد. دەرگاوانەکەی یەزدگێرد ئەوی ڕاگرت و وتی: چاوەڕێ بە تا مۆڵەتت بۆ وەربگرم.

مەتیار توڕە و هێرشی کردە سەر دەرگاوانەکە و لووتی شکاند.

دەرگاوان، خوێناوی ڕۆشتە لای یەزدگێرد و کاتێک ئەوی بینی، ئەم ڕووداوەی بەکارەساتێکی گەورە بینی، هەمان سات لەئیسفهان ڕۆشت، پێیان وت: بڕۆرە دوورترین شوێنی وڵاتەکەی خۆت و ماوەیەک لەوێ ژیان بەسەر ببە چوونکە عەرەبەکان تا کۆتایی هێنان بەکێشە و گرفتارییەکانی خۆیان، بیر لەتۆ ناکەنەوە.

یەزدگێرد بەرێکەوت و رووی کردە رەی و کاتێک گەیشتە ئەو شارە، فەرمانڕەوای تەبەرستان هات و سەرزەمینەکەی خۆی خستە بەردەست و بەڵێنی پارێزگاری کردن لەپاشایدا و پێی وت: ئەگەر هەنووکە بەپێشنیارەکەی من رازی نەبیت و دواتر بگەڕێیتەوە، من رازی نابم و پەنات نادەم.

بەڵام یەزدگێرد رازی نەبوو و فەرمانی سوپاسالاری بۆ نووسی چوونکە پێشتر پلە و پێگەیەکی نزمتری هەبوو.

دەستەیەک وتوویانە یەزدگێرد هەمان سات رووی کردە سیستان و لەگەڵ هەزار کەس لەسوارچاکەکان بەرەو مەرو بەرێکەوت.

دەستەیەک وتوویانە یەزدگێرد لەفارس گیرسایەوە و بۆ ماوەی چوار ساڵ لەو شارە مایەوە. دواتر رووی کردە سەرزەمینی کرمان و دوو یا سێ ساڵی دیکە لەو سەرزەمینە بوو. فەرمانداری کرمان پێشنیاری کرد لای ئەو نیشتەجێ بێت بەڵام یەزدگێرد رازی نەبوو و داوای لەو فەرمانداری کرمان کرد بارمتەیەک لای ئەو دابنێت. فەرمانداری کرمان بەو کارە رازی نەبوو و ئەوی لەسەرزەمینەکەی خۆی دەرکرد. یەزدگێرد رووی کردە سیستان و بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەو سەرزەمینە مایەوە. دواتر بڕیاریدا بڕواتە خوراسان و لەوێ خەڵکان کۆبکاتەوە و هێرش بکاتە سەر ئەو کەسانەی دەستیان بەسەر وڵاتەکەیدا گرتبوو.

دەڵێت: یەزدگێرد لەگەڵ کەسەکانی خۆی رووی کردە مەرو و لەمناڵی فەرمانڕەواکان چەندین کەسی وەک بارمتە لەگەڵدا بوو. لەسەرکردەکان فەروخزاد

هاورێیەتی دەکرد. کاتێك گەیشتە مەرو، لەپاشاکان دژی عەرەبەکان داوای هاوکاری کرد و نامەی بۆ پاشای چین و پاشای فەرغانە و کابول و خەزەر نووسی.

لەو کاتەدا فەرمانداری مەرو، ماهویە کوڕی مافنا کوڕی فید و باوکی بەراز بوو. ماهویە کوڕەکەی خۆی، بەرازی بۆ بەڕێوبردنی کاروباری مەرو راسپاردبوو. یەزدگێرد دەیویست بڕواتە ناو شارەکە و سەردانی قەڵای کۆنە بکات.

ماهویە بەکوڕەکەی خۆی وتبوو ئەگەر یەزدگێرد مەبەستی هاتنە ناو شارەکەی کرد، دەرگاکەی بۆ نەکاتەوە و لەفێڵ و فریوەکانی یەزدگێرد ئەوی ترساند.

ئەو ڕۆژەی یەزدگێرد دەیویست بڕواتە ناوشارەکە، بەدەوری شارەکەدا سووڕایەوە و کاتێك گەیشتە یەکێك لەدەروازەکان و مەبەستی ڕۆشتنە ناوەوەی کرد، باوکی بەراز هاواری کرد، بیکەرەوە بەڵام لەهەمان کات پشتێنەکەی خۆی توند دەکرد و ئیشارەی دەکرد کەنەیکاتەوە.

یەکێك لەهاوەڵانی یەزدگێرد هەستی بەمە کرد و پێی وت و داوای لێکرد مۆڵەت بدات تا سەری ماهویە بپەڕێنێت، وتی: ئەگەر ئەو کارە بکەیت، کاروبارەکان دەکەوێتە دەستی تۆ.

بەڵام یەزدگێرد رازی نەبوو.

دەستەیەك وتوویانە: یەزدگێرد فەروخزادی وەك کارگوزاری مەرو دانا و بەبەرازی وت قەڵای کۆنە و شارەکەی تەسلیم بکات بەڵام خەڵکی شارەکە رازی نەبوون لەبەر ئەوەی ماهویەی باوکی بەراز فەرمانی پێدابوون و وتبووی: ئەمە بۆ ئێوە نابێتە پاشا کەوەك کەسێکی هەڵاتوو و بریندار هاتووە و مەرو هاوشێوەی ویلایەتەکانی دیکە بەرگەی زیان و بەڵاکان ناگرێت. کاتێك بەیانی بۆ لای ئێوە هاتین، دەرگاکە مەکەنەوە.

کاتێك هاتن، دەرگاکەیان نەکردەوە و فەرخزاد گەڕایەوە، لەبەردەم یەزدگێرد کەوتە سەرخاك و وتی: مەرو دەرگاکانی بەستووە و عەرەبەکان لەزووترین کات دەگەن.

وتی: دەبێت چی بکەین؟

وتی: دەبێت بڕۆینە سەرزەمینی تورکەکان و لەوێ بمێنینەوە تا کاروباری عەرەبەکان ئاشکرا ببێت چوونکە ئەوان تا ئەو کاتەی دەست بەسەر شارێکدا نەگرن،

پشتگوێی ناخەن.

یەزدگێرد وتی: ئەو کارە ناکەم و دەگەڕێمەوە. فەروخزاد بەبۆچوونەکەی رازی نەبوو.

یەزدگێرد بۆ لای بەراز فەرمانداری مەرو بەرێکەوت و بڕیاریدا فەرمانڕەوایەتی لێ بستێنێتەوە و ئەو کارە بەسەنگانی برازای بسپێرێت. ئەم هەواڵە بەماهویە باوکی بەراز گەیشت و هەوڵی کوشتنی یەزدگێردیدا. نامەی بۆ نەیزەك تەرخان نووسی و ئاگاداری کردەوە کەیەزدگێرد هەلاتووە. پێشنیاری پێکرد تا بێت و بەهاوکاری یەکتر یەزدگێرد بگرن و بەندی بکەن یا بیکوژن و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ عەرەبەکان مۆر بکەن. پەیمانی پێدا ئەگەر شەڕی یەزدگێردی لێ دوور بخاتەوە، رۆژانە هەزار درەمی پێ بدات و داوای لێکرد بەفێڵ نامەیەك بۆ یەزدگێرد بنووسێت و سوپاکەی لەدەوری ئەو بلاوە پێبکات و دەستەیەك لەسوپاکەی بۆ لای خۆی راکێشێت و بەمشێوەیە یەزدگێرد و سوپاکەی لاواز بکات.

وتی: لەنامەکەی خۆتا بنووسە دەخوازیت دژی عەرەبە دوژمنەکان هاوکاری بکەیت تا ئەوان لەسەرزەمینەکەی پاشا دوور بخەیتەوە و داوای لێ بکە ناونیشانێك لەناونیشانی کەسانی خاوەن پێگە لەناو نامەکەی بۆ تۆ بنووسێت و بەزێر مۆری بکات و ئاگاداری بکەرەوە پەیوەستی ئەو نابیت تا ئەو کاتەی فەرخوزاد لەخۆی دوور دەکاتەوە.

نەیزەك ئەم بابەتانەی بۆ یەزدگێرد نووسی و کاتێك نامەکەی بەدەستی پاشا گەیشت، گەورەکانی مەروی کۆکردەوە و راوێژی لەگەڵ کردن.

سەنگان وتی: بۆچوونی من ئەوەیە بەهیچ شێوەیەك فەروخزاد و سوپاکەت لەخۆت دوور نەخەیتەوە.

بەلام باوکی بەراز وتی: بۆچوونی من ئەوەیە نەیزەك لەخۆت نزیك بکەیتەوە و بەخواستەکانی رازی ببیت.

یەزدگێرد بەبۆچوونەکەی ئەو رازی بوو و سوپاکەی لەخۆی دوور خستەوە و فەرمانی بۆ فەروخزاد نووسی بەرەو بێشەلانەکانی سەرەخس بڕوات.

فەروخزاد هاواری کرد و یەخەی خۆی دڕاند. گورزەکەی خۆی هەلگرت و

دەبوایە باوکی بەراز بکوژێت، وتی: ئەی شاکوژەکان، دوو پاشاتان کوشت، دەزانم دەخوازن ئەم پاشایەیش بکوژن.

فەروخزاد نەڕۆشت تا ئەو کاتەی یەزدگێرد بەخەتی خۆی نامەیەکی بۆ نووسی: ئەمە نامەیەکە بۆ فەروخزاد: تۆ یەزدگێرد و کەس و منداڵەکان و کەسانی دەوروبەری و هەموو سامانەکەی ئەوت بەماهویە فەرمانڕەوای مەرو سپارد و من شایەتی بۆ ئەم کارە دەدەم.

نەیزەك هاتە شوێنێك بەناوی حەلسدان لەنێوان دوو مەرو و کاتێك یەزدگێرد بڕیاریدا بڕوات و بیبینێت، باوکی بەراز پێی وت: بەچەکەوە سەردانی ئەو مەکە تا گومانی لا دروست نەبێت و هەڵبێت بەڵکو هاوڕێ لەگەڵ ساز و کەل و پەلی سەرگەرمی سەردانی ئەو بکە. یەزدگێرد لەگەڵ ئەو کەسانەی ماهویە دیاری کرد بەرێکەوت و باوکی بەراز مایەوە.. نەیزەك هاوەڵانی خۆی بۆ چەندین دەستە دابەش کرد و کاتێك لەیەك نزیك بوونەوە، پیادە بۆ پێشوازی یەزدگێرد بەرێکەوت. یەزدگێرد سوار لەسەر ئەسپێك و فەرمانیدا نەیزەك سوار یەکێك لەئەسپەکانی خۆی بکەن. ئەو، سوار بوو و کاتێك گەیشتنە ناو ئوردووگا، وەستان. وەك دەڵێن: نەیزەك پێی وت: یەکێك لەکچەکانی خۆت بکەرە هاوسەری من تا چاکەخوازی تۆ بم و شان بەشانی تۆ، شەری دوژمنەکانت بکەم.

یەزدگێرد وتی: ئەی سەگی کوڕی سەگ! بەمشێوەیە قسە لەگەڵ من دەکەیت؟

نەیزەك بەشمشێر لێیدا و هاواری یەزدگێرد بەرز بوویەوە کە: ئەو ناپیاوە، خیانەتی کرد. ئەسپی غاردا بۆ ئەوەی هەڵبێت، هاوەڵانی نەیزەك، شمشێریان خستە ناو سوپاکەی یەزدگێرد و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن. یەزدگێرد بەدەم هەلاتنەوە تا شوێنێك لەسەرزەمینی مەرو ڕۆشت و لەئەسپەکەی هاتەخوار و پەنای بۆ ماڵی ئاشەوانێك برد و سێ ڕۆژ لەوێ مایەوە.

ئاشەوان پێی وت: ئەی بەدبەخت، وەردەر و شتێك بخۆ، سێ ڕۆژە هیچت نەخواردووە.

وتی: بێ گۆرانی ناتوانم هیچ بخۆم.

یەکێك لەگۆرانیبێژەکانی مەرو گەنمی هێنا بوو تا بیکاتە ئارد. ئاشەوان پێی وت: گۆرانی بۆ بخوێنە تا شتێك بخوات و کاتێك ڕۆشت، بیستی باوکی بەراز

سەبارەت بەیەزدگێرد قسە دەکات. پرسیاری بارودۆخی یەزدگێردی کرد و کاتێك تایبەتمەندییەکانی ئەویان بۆ وەسف کرد، پێی وتن: ئەوانی لەماڵی ئاشەوانێك بینیوە، پیاوێکە قژلوول، دوو پرچی لەملاو لای سەری بەرداوەتەوە، ددانەکانی ڕێك و گوارە و بازوبەندی لەگوێدایە.

ماهویە یەکێك لەسوارچاکەکانی نارد و فەرمانی پێدا ئەگەر دەستی بەیەزدگێرد گەیشت، بەزێی کەوان بیخنکێنێت و جەستەکەی فڕێبداتە ناو ڕووبار.

نێردراوەکان ئاشەوانەکەیان گرت و لێیاندا تا شوێنی یەزدگێردیان نیشان بدات بەڵام ئەو کارەی نەکرد و وتی نازانێت بەکام لادا ڕۆشتووە. کاتێك ویستیان بگەڕێنەوە، یەکیان وتی: بۆنی موشك دەکەم و سووچێکی دیبای لەناو ئاوەکەدا بینی و رایکێشا و بینی یەزدگێردە. یەزدگێرد داوای لێکرد نەیکوژێت و نیشانی کەسانی دیکە نەدات و لەبەرابەردا ئەنگوستیلەو بازوبەند پشتێنەکەی خۆی پێدەدات.

ئەو پیاوە وتی: چواردرەمم پێ بدە تا ئازادت بکەم.

یەزدگێرد وتی: هاوار لەتۆ! ئەنگوستیلەکەی من هەڵبگرە کەبەهاکەی ناخەملێنرێت.

بەڵام ئەو پیاوە رازی نەبوو.

یەزدگێرد وتی: پێیان وتبووم ڕۆژێك نیازمەندی چوار درەم دەبیت و هاوشێوەی پشیلە شت دەخۆم. ئێستا بۆم دەرکەوت کەراستە.

دواتر یەکێك لەگوارەکانی خۆی دەرهێنا و بەخشی بەپیاوی ئاشەوان بۆ ئەوەی شوێنی خۆحەشاردانی یەزدگێردی بەنێردراوەکانی ماهویە نیشاننەدا، لێی نزیك کەوتەوە وەك بڵێی شتێکی بەگوێدا دەچرپاند و لەشوێنەکەی خۆی ئاگاداری دەکردەوە. ئەو پیاوە هاوەڵانی خۆی ئاگادار کردەوە و یەزدگێرد داوای لێکردن نەیکوژن و وتی: هاوار لەئێوە! لەکتێبەکاندا بینیومە هەر کەس بوێری کوشتنی پاشاکان بەخۆی بدات، خواوەند لەم دنیایە گیرۆدەی ئاگر و لەو دنیا گرفتاری سزای هەمیشەیی دەکات. مەمکوژن و بمبەنە لای فەرمانڕەوا یا بۆ لای عەرەبەکان ڕەوانەم بکەن چوونکە لەپاشاکانی وەك من شەرم دەکەن.

ئەوان زێر و زیوەکانیان تالآن کرد و خستیانە ناو کیسەیەك و بەستیانەوە و دواتر بەزێی کەوان خنکاندیان و خستیانە ناو رووباری مەرو. ئاو، جەستەی ئەوی برد تا گەیشتە کەنارەکانی زەریق و بەدارێك گیرسایەوە. دوای ئەوە، ئەسقوف مەرو هات و هەڵیگرتەوە و بەپارچەیەکی بۆنخۆش کفنی کرد و خستیە ناو تابوتێك و بۆ بابانی خوارەوەی برد کە لەژێر دەستی ماحاندا بوو. لەنشینگەی ئەسقوف بەخاکی سپارد و خۆڵی کرد بەسەریدا.

باوکی بەراز بەدوای گوارەکاندا گەڕا و ئەو کەسەی یەزدگێردی دۆزیبوویەوە، دەستگیری کرد و ئەوەندەی لێدا تا مرد. ئەوەی دەستی کەوتبوو بۆ لای خەلیفەی ئەو کاتەی نارد و خەلیفە بەهای گوارەکانی لەفەرمانڕەوا وەرگرت.

کەسانی دیکە وتوویانە: یەزدگێرد پێش ئەوەی عەرەبەکان بگەنە ئەو ناوچەیە، رۆشت و رێگەی تیبس و قەهستانی گرتەبەر و لەگەڵ نزیکەی چوار هەزار کەس گەیشتە مەرو تا لەخەڵکانی خوراسان سوپایەك کۆبکاتەوە و هێرش بکاتە سەر عەرەبەکان. دوو سەردار لەمەرو ژیانیان بەسەر دەبرد کەنەیار و دژی یەکتر بوون، لاسایی یەکیان دەکردەوە، یەکیان ناوی بەراز و ئەوی دیکەیان سەنگان بوو. هەردووکیان گوێرایەڵی و ملکەچی خۆیان بۆ یەزدگێرد دەربڕی و ئەو، لەمەرو نیشتەجێ بوو. بەرازی لەخۆی نزیك کردەوە و ئەمە بووە هۆی رژدی بردنی سەنگان. بەراز خوازیاری لەناوبردنی سەنگان و دڵی یەزدگێردی لەو ڕەش کرد تا ئەو جێگەی یەزدگێرد بڕیاری کوشتنی ئەویدا و مەبەستەکەی خۆی لای یەکێك لەژنەکانی کەهاودەستی بەراز بوو، ئاشکرا کرد. ژنەکە، ژنێکی بۆ لای بەراز نارد و ئاگاداری کردەوە کەیەزدگێرد مەبەستی کوشتنی سەنگانی هەیە. مەبەستەکەی یەزدگێرد ئاشکرا و سەنگان ئاگادار بوویەوە و خەمی خۆی خوارد و دەستەیەك هاوشێوەی هاوەڵانی بەرازو و سوپاکەی یەزدگێردی کۆکردەوە و رووی کردە شوێنی مانەوەی یەزدگێرد. ئەم هەواڵە بەبەراز گەیشت بەڵام لەرووبەڕوو بوونەوەی سەنگان خۆی بەدوور گرت چوونکە سوپاکەی فراوان بوو. یەزدگێردیش لەسوپاکەی سەنگان ترسا و بەشێوەیەکی نەناسراو لەکۆشکەکەی هاتەدەر و پیادە ملی رێگەی گرتەبەر تا گیانی دەرباز بکات. نزیکەی دوو فەرسەخ بەرێگەدا ڕۆشت تا گەیشتە ئاشێك. هیلاك و شەکەت لەوێ دانیشت. ئاشەوان کاتێك زێر و زیو و گەورەیی ئەوی

بینی، ڕاخەڕێکی ڕاخست، یەزدگێرد لەسەری دانیشت، خواردنی بۆ هێنا کەخواردی و شەو و ڕۆژێك لەوێ مایەوە. ئاشەوان داوای لێکرد شتێکی پێ ببەخشێت. یەزدگێرد پشتێنی جەواهیر نیشانەکەی خۆی پێبەخشی بەلاّم ئاشەوان بەوەرگرتنی پشتێنەکە ڕازی نەبوو، وتی: لەجیاتی ئەم پشتێنە چوار درەمم بەسە، تا خواردنی پێ بخۆم و بخۆمەوە.

یەزدگێرد وتی: زیوی پێ نییە. خاوەن ئاشەکە مەرایی بۆ کرد تا خەوی لێکەوت. ئەوسا تیرێکی هەڵگرت و سەری پان کردەوە و یەزدگێردی کوشت. جل و بەرگ و کەل و پەلەکانی هەڵگرت و جەستەکەی خستە ناو ڕووبارێك. سکی هەڵدڕی و چەند لقێکی داری تێ چەقاند بۆ ئەوەی جەستەکەی لەهەمان شوێن کەخستبوویە ناو ئاوەکە بمێنێتەوە و زیاتر نەڕواتە خوار و نەیناسنەوە و شوێن بکوژەکەی بکەون. خۆی هەلاّت.

هەواڵی کوژرانی یەزدگێرد بەیەکێك لەخەڵکانی ئەهواز گەیشت کەئەسقوفی مەرو بوو بەناوی ئیلیا. ئەو، مەسحییەکانی کۆکردەوە و وتی: پاشای فارسەکان کوژراوە، ئەو کوڕی شەهریار کوڕی خوسرەو بوو، شەهریار کوڕی شیرین دیندار بوو کەچاکەکاری ئەو دەزانن و کارە باشەکانی ئەوتان لەگەڵ هاودینەکانی لەبیرە. ئەم پاشایە ماف بەسەر مەسیحییەتەوە هەیە جیاواز لەوە مەسیحییەکان لەسەردەمی پاشایەتی باوەگەورێی خوسرەو، ڕێز و پێگەیان پێبرا. باوەگەورێکانی چاکەکار بوون تا ئەو جێگەی هەندێك لەوان کەنیسەیان بۆ مەسیحییەکان دروست دەکرد و برەویان بەدینەکەیاندا. جێگەی خۆیەتی بۆ کوژرانی ئەم پاشایە بەهۆی ڕێزداری ئەو بەئەندازەی ئەو چاکیانەی باوەگەورێکان و دایەگەورێی، شیرین، لەگەڵ مەسیحییەکان کردوویانە، خەمبار بین. بۆچوونی من ئەوەیە ئارامگایەکی بۆ دروست بکەین و جەستەی ئەو بەرێزەوە بێنین و بەخاکی بسپێرین.

مەسیحییەکان وتیان: ئەی مەتران، ئێمە شوێنکەوتەی تۆین. هەمووان بەبۆچوونەکەی تۆ ڕازین.

مەتران وتی تا لەناو مەرو لەناو بێستانی مەسیحییەکان ئارامگایەکیان بۆ دروست کرد و لەگەڵ دەستەیەك لەمەسیحییەکان مەرو بەرێکەوت و جەستەی

یەزدگێردی لەرووبار دەرهێنا و کفنی کرد و خستیە ناو تابوت. هاورێکانی تابووتەکەیان خستە سەرشان و بەرەو لای ئارامگاکەیان برد و بەخاکیان سپارد و سەریان نایەوە.

ماوەی پاشایەتی یەزدگێرد بیست ساڵی خایاند. لەو ماوەدا چوار ساڵ ئاسوودە بوو و شانزە ساڵی بۆ شەڕ لەگەڵ عەرەبەکان و رووبەرووبوونەوەی ئەوان بەسەر برد. ئەو دووایین پاشا لەبنەماڵەی ئەردەشێر کوڕی بابەك و دوای ئەوە پاشایەتی عەرەبەکان سەقامگیر بوو.

لەم ساڵەدا یانی ساڵی سی و یەکەم عەبدوللە کوڕی عامر رووی کردە خوراسان و دەستی بەسەر ئەبەر شەهر و توس و ئەبیوەرد و نەسادا گرت و تا سەرەخس پێشڕەوی کرد و لەوێ لەگەڵ خەڵکانی مەرو، پەیمانی ئاشتی مۆر کرد.

## شار گرتنەکانی کوڕی عامر

دەڵێن: کاتێك کوڕی عامر دەستی بەسەر فارسدا گرت، ئەوس کوڕی حەبیبی تەمیمی لای ئەو بۆ قسە وەستا و وتی: خواوەند رێگەی چاکسازی بۆ ئەمیر تەخت بکات، زەوی لەبەردەم تۆدایە و تەنیا بەشێکی کەمی دەستی بەسەردا گیراوە، پێشڕەوی بکە چوونکە خواوەند پشتیوانی تۆیە.

وتی: فەرمانیان بەئێمەداوە پێشڕەوی بکەین، نەیویست وانیشان بدات کە بەبۆچوونەکەی ئەو رازی بووە.

سەکن کوڕی قتادەی عورەینی دەڵێت: کوڕی عامر دەستی بەسەر فارسدا گرت و بۆ بەسرە گەڕایەوە و شەریك کوڕی ئەعوەری حارسی لەئیستەخر دانا. شەریك بناغەی مزگەوتی ئیستەخری داڕشت.

دواتر یەکێك لەمناڵەکانی تەمیم کە بەوتەی ئێمە ئەحنەف بوو و بەوتەیەك ئەوس کوڕی جابری جوشەمی تەمیمی بوو، ڕۆشتە لای و وتی: دوژمن لەتۆ هەڵدێت و ترساوە و ویلایەتەکان کراوەن، پێشڕەوی بکە چوونکە خواوەند پشتیوانی تۆیە و هێز بەدینەکەی تۆ دەبەخشێت.

کوڕی عامر کەرەستەکانی ئامادە کرد و وتی خەڵکان کەل و پەلەکانی سەفەر

ئامادە بکەن. زیادی وەك فەرمانڕەوای بەسرە دانا و رووی کردە کرمان و لەوێوە رێگەی خوراسانی گرتەبەر و بەوتەیەك رێگەی ئیسفەهان و لەوێوە بەرەو خوراسان ڕۆشت.

مەفزەلی کرمانی لەباوکی دەگێڕێتەوە:پیرانی کرمان دەیانوت کوڕی عامر لەسیرجان ئوردووی لێدا ئەوسا رووی کردە خوراسان و موجاشیع کوڕی مەسعودی سولەمی وەك کارگوزاری کرمان دەستنیشان کرد. کوڕی عامر رێگەی بیابانی گرتەبەر کەهەشتا فەرسەخ بوو. دواتر رووی کردە دو تبس و مەبەستی هێرش کردنە سەر ئەبەر شەهری لەسەردا بوو. هیتالییەکان کەخەڵکانی هەرات بوون، رووبەرووی بوونەوە. ئەحنەف لەگەڵ ئەوان جەنگی و توانی شکستیان بدات. کوڕی عامر رێگەی نەیشابووری گرتەبەر.

شەعبی دەڵێت: کوڕی عامر رێگەی بیابانی خەبیسی گرتەبەر و لەخواستەوە و بەوتەیەك لەیەزد و دواتر قەهێستان تێپەڕی و ئەحنەف وەك پێشەنگی خۆی ڕەوانە کرد. هیتالییەکان رووبەرووی بوونەوە و شەڕی لەگەڵ کردن. ئەحنەف توانی شکستیان بدات. دواتر رووی کردە ئەبەر شەهر و لەوێ دابەزی.

دەڵێت: سەعید کوڕی عاس لەگەڵ سوپای کوفە هاتە گورگان و مەبەستی هێرش کردنە سەر خوراسانی لەسەردا بوو بەڵام کاتێك بیستی کوڕی عامر لەئەبەر شەهر دابەزیوە، بۆ کوفە گەڕایەوە.

عەلی کوڕی موجاهید دەڵێت: کوڕی عامر لەئەبەر شەهر دابەزی و بەشەڕ دەستی بەسەر نیوەی شارەکەدا گرت، نیوەکەی دیکەی بەدەستی کەناری لەگەڵ نیوەی لەگەڵ نەساو توس، کوڕی عامر نەیتوانی بەرەو مەرو بڕوات و لەگەڵ کەناری پەیمانی ئاشتی بەست کەکوڕەکەی خۆی باوکی سەڵت کوڕی کەناری و کوڕی براکەی سەلیمی وەك بارمتە دانا. دواتر عەبدوللە کوڕی خازمی بۆ هەرات نارد و حاتەم کوڕی نەعمانی ڕەوانەی مەرو کرد.

کوڕی عامر دوو کوڕەکەی کەناری گرت و تەسلیمی نەعمان کوڕی ئەفقەمی نەسری کرد. ئەو، کوڕەکانی ئازاد کرد.

ئیدریس کوڕی حەنزەلەی عەممی دەڵێت: کوڕی عامر، بەشەر دەستی بەسەر

ئەبەرشەهردا گرت و لەدەوروبەری شارەکە دەستی بەسەر توس و بیوەرد و نەسا و حەمراندا گرت. ئەم ڕووداوانە لەساڵی سی و یەکەم ڕوویاندا.

موسا کوڕی عەبدوللە کوڕی خازم دەڵێت: باوکم لەگەڵ خەڵکانی سەرەخس پەیمانی ئاشتی بەست. عەبدوللە کوڕی عامر ئەوی لەئەبەر شەهرەوە بۆ ئەو شارە ڕەوانە کردبوو. کوڕی عامر لەگەڵ خەڵکانی ئەبەر شەهر پەیمانی ئاشتی مۆر کرد و دوو کچیان لەبنەماڵەی خوسرەو پێدا: بابونج و تەهمیج کەئەوانی لەگەڵ خۆی برد و ئەمین کوڕی ئەحمەدی یەشکوری نارد کە لەدەوری ئەبەرشەهر دەستی بەسەر توس و بیوەرد و نەسا و حەمراندا گرت و تا سەرەخس پێشڕەوی کرد.

کوڕی سیرین دەڵێت: کوڕی عامر عەبدوللە کوڕی خازمی بۆ سەرەخس نارد و دەستی بەسەردا گرت. کوڕی عامر دوو کچی بنەماڵەی خوسرەوی دەستکەوت. یەکیان بەنوشکان سپارد و بابونج مرد.

باوکی زەیال، زوهەیر کوڕی هونەیدی عەدەوی، لەپیرەکانی خەڵکانی خوراسان دەگێڕێتەوە: کوڕی عامر ئەسوەد کوڕی کولسومی عەدەوی بەبەیهەق سپارد کە بەشێکە لەئەبەر شەهر و لە ئەبەرشەهرەوە شانزە فەرسەخ دوور بوو. دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت بەڵام ئەسوەد کوڕی کولسوم کوژرا.

دەڵێت: ئەسوەد پیاوێکی دیندار و لەهاوەڵانی عامر کوڕی عەبدوللە عەنبەری بوو. عامر دوای ئەوەی لەبەسرە دەریان کرد، وتبووی: لەبەجێهێشتنی عێراق خەمبار نیم مەگەر بۆ ئارامی نیمەڕۆ و بانگی بانگبێژەکان وهاوەڵانی وەك ئەسوەد کوڕی کولسوم.

زوهەیر کوڕی هونەید لەیەکێك لەمامەکانی خۆی دەگێڕێتەوە: کوڕی عامر دەستی بەسەر نەیشابووردا گرت و ڕووی کردە سەرەخس، خەڵکانی مەرو کەسیان نارد و داوای پەیمانی ئاشتییان کرد. کوڕی عامر، حاتەم کوڕی نەعمانی باهلی بۆ لای ئەوان نارد کە لەگەڵ ئەبراز فەرمانداری مەرو لەسەر وەرگرتنی دوو هەزار هەزار و دووسەد هەزار پەیمانی ئاشتی واژۆ کرد.

مەسعەب کوڕی حەییان لەموقاتیل کوڕی حەییانی برای دەگێڕێتەوە: کوڕی عامر لەگەڵ خەڵکانی مەرو لەسەر بنەمای وەرگرتنی شەش هەزار هەزار و دووسەد هەزار پەیمانی ئاشتی بەست.

لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی عەفان لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد.

## ساڵی سی و دووەم دەستی پێکرد.

## ڕووداوە گرنگەکانی ساڵی سی و دووەم

یەکێك لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە جەنگی معاویە لەدژی قوستەنتەنییە بوو کەهاوسەرەکەی خۆی عاتیکە کچی قەرتە کوڕی عەبد عەمرۆ و بەوتەیەك فاختەی لەگەڵدا بوو. ئەم حەدیسەیان لە باوکی مەعشەر و واقدی گێڕاوەتەوە.

بەوتەی سەیف لەم ساڵەدا سەعید کوڕی عاس، سەلمان کوڕی ڕەبیعەی بۆ فەرمانڕەوای سنوورەکانی بەلەنجەر ڕاسپارد و سوپاکەی شامی بەسەرکردایەتی حەبیب کوڕی موسلیمەی فیهری بەهاوکاری سوپایەك کە لەگەڵ حوزەیفە نیشتەجێ بوون، ڕەوانە کرد. لەوێ، لەنێوان سەلمان و حەبیب کێشە هاتە ئاراوە و خەڵکانی شام و کوفە شەڕیان کرد.

## ڕووداوەکەی بەلەنجەر

تەڵحە دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان نامەی بۆ سەعید نووسی کەسلێمان بۆ جەنگی باب ڕەوانە بکە و نامەی بۆ عەبدولرەحمان کوڕی ڕەبیعەی کە لەبەرابەر باب جێگیر ببوو، نووسی: زۆر لەموسوڵمانان لەزۆرخۆری بێ هێز بوون، موسوڵمانان مەخەرە مەترسییەوە چوونکە دەترسم گرفتاری بەلا و زیان ببن. بەڵام ئەم نامەیە، عەبدولرەحمانی لەمەبەستەکەی دوور نەخستەوە و لەبەلەنجەر چاوی نەپۆشی. لەساڵی نۆیەمی خەلافەتی عوسمان کوڕی عەفان بۆ جەنگ ڕۆشت و کاتێك گەیشتە بەلەنجەر، خەڵکان سەنگەریان گرت و مەنجەنیق و تۆپەکانیان لەسەر قەڵاکان جێگیر کرد. هەرکەس لەوێ نزیك دەکەوتەوە، برینداریان دەکرد یا دەیانکوشت و موسوڵمانانیان بێزار کرد. مەعزەد لەو ڕۆژانەدا کوژرا. دوای ئەوە تورکەکان ڕۆژێکیان دیاری کرد و خەڵکانی بەلەنجەر هاتنەدەر و تورکەکانیش پەیوەستیان بوون و شەڕیان دەستپێکرد. عەبدولرەحمان کوڕی ڕەبیعە کە بەزوئەلنور ناویان دەبرد، کوژرا و موسوڵمانان شکستیان خوارد و بڵاوەیان لێکرد. هەرکەس لەدەوری سلێمان کوڕی ڕەبیعە کۆبوویەوە، پشتیوانی لێکرا تا لەباب ڕۆشتەدەر و هەرکەس

ڕێگەی خەزەری گرتەبەر، لەگیلان و گورگان گیرسایەوە کە سەلمان و باوکی هورەیرە لەناویاندا دەبینران.

تورکەکان جەستەی عەبدولرەحمانیان هێشتەوە و تا ئێستایش لەپیرۆزی ئەو داوای باران دەکەن.

شەعبی دەڵێت: سوێند بەخوا سەلمان کوڕی ڕەبیعە ڕێگەکانی باشتر لەوە دەناسی کەقەساب جومگەکانی وشتر دەناسێت.

غەسن کوڕی قاسم لەیەکێك لەمناڵەکانی کەنانە دەگێڕێتەوە: کاتێك جەنگ دژی خەزەرەکان دووبارە بوویەوە، سکاڵایان بەرز کردەوە و زمانیان بۆ سەرکۆنە کردنی یەك کردەوە، وتیان: ئێمە خەڵکانێك بووین کەس هاوشێوەی ئێمە نەبوو تا ئەوەی ئەم خەڵکە کەمە هاتن و ئێمە نەمانتوانی لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکەین.

یەکیان بەوەی دیکەی وت: ئەوان مەرگیان نییە، ئەگەر دەمردن، هێرشیان نەدەکردە سەر سەرزەمینی ئێمە.

لەجەنگەکانی ئەو ناوچەیە کەس نەکوژرا مەگەر دواوایین جەنگ کە عەبدولرەحمان کوژرا. بەخۆیان وت: بۆ تاقی ناکەنەوە. لەناو بێشەڵانەکان بۆسەیان دانا و شەڕکەران لەسەر ڕێگەی سوپاکە دانیشتن. ئەوسا تیربارانیان کردن و ژمارەیەکیان لەوان کوشت.

دواتر بەڵێنیان بەسەرکردەکانی خۆیاندا و یەکتریان بۆ جەنگی عەرەبەکان هاندا. ڕۆژێکیان دیاری کرد و شەڕیان دەستپێکرد. عەبدولرەحمان کوژرا و موسوڵمانان تەنگیان پێ هەڵچنرا و بوون بەدوو دەستە: دەستەیەك روویان کردە باب و سلێمان پشتیوانی لێکردن تا ئەو کاتەی ئەوانی لەوێ بردەدەر. دەستەیەك ڕێگەی خەزەریان گرتەبەر و گەیشتنە گیلان و گورگان. سەلمانی فارسی و باوکی هورەیرە لەناو ئەواندا دەبینران.

قەیس کوڕی یەزید لەباوکی دەگێڕێتەوە: یەزید کوڕی معاویەی نەخەعی و عەلقەمە کوڕی قەیس و مەعزەدی شەیبانی و باوکی مەفزەری تەمیمی لەخێوەتێکدا بوون و عەمرۆ کوڕی عوتەبە و خالید کوڕی ڕەبیعە و خەڵخاڵ کوڕی زەڕری و قورسەع لەخێوەتێکی دیکەدا و لەئوردووی بەلەنجەر لەیەك نزیك بوون. قورسەع دەیوت: چەندە جوانە ڕەنگی خوێن لەسەر جل و بەرگەکان. عەمرۆ کوڕی عوتەبە

بەعابا سپییەکەی خۆی دەوت: چەندە جوانە سووری خوێن لەسەر سپییەتی تۆ.

دانیشتووانی کوفە لەخەلافەتی عوسمان کوڕی عەفان چەندین ساڵ سەرقاڵی جەنگی بەلەنجەر بوون بەڵام هیچ ژنێك لەوان بێوەژن نەکرا و هیچ منداڵێك هەتیو نەبوو تا ساڵی نۆیەم. لەو ساڵەدا دوو ڕۆژ پێش هێرش بردن، یەزید کوڕی معاویە لەخەودا بینی کەئاسکێکیان بردە خێوەتەکەی کە لەوە جوانتری نەبینیبوو. لەمەلافەکەیەوە ئالأبوو، دواتر گۆڕێکیان نیشاندا، چوار کەس لەناو گۆڕەکەدا بوون. هیچ گۆڕێکی جوانتر و ڕازاوەتر لەو گۆڕە نەبینیبوو. ئەویان لەو گۆڕەدا دفن کرد.

کاتێك موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر تورکەکان، بەردێك بەر یەزید کەوت و سەری شکا. وەك بڵێی جلەکانی ئەویان بەخوێن ڕازاندبوویەوە و خوێناوی نەبوو. ئەو ئاسکەی لەخەودا بینی ئەمە بوو چوونکە ڕەنگی خوێن لەسەر عاباکەی نەخشێکی جوانی بەستبوو.

ڕۆژێك پێش هێرشەکە کەدووبارە موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر تورکەکان، مەعزەد بەعەلقەمەی وت: دەستارەکەی خۆت بەقەرز بدە بەمن تا سەری خۆمی پێ ببەستم. ئەو کارەی کرد و رووی کردە ئەو بورجەی یەزید بەردی بەرکەوتبوو. تیری هاویشت و یەکێك لەوانی کوشت. بەردێکیان بەسەر ئەویشدا خستەخوار و سەری شکا. هاوەڵانی ئەویان لەو شوێنە دوور خستەوە و لای یەزید بەخاکیان سپارد.

عەمرۆ کوڕی عوتەبەیش برینداربوو. عاباکەی خۆی بەو شێوە بینی کەدەیخواست و کوژرا.

لەڕۆژی دیاریکراو قورسەع بەشێوەیەك جەنگا کە بەنووکی ڕمەکان جەستەی کون کون بوو. دەتوت عاباکەی پارچەیەکە تەختەکەی سپی و بەرەنگی سوور ڕازابوویەوە. خەڵکان خۆڕاگرییان دەکرد تا ئەو کوژرا. شکستی موسوڵمانان بەکوژرانی ئەو دەستی پێکرد.

داوود کوڕی یەزید دەڵێت: یەزید کوڕی معاویەی نەخەعی و عەمرۆ کوڕی عوتەبە و مەعزەد لەجەنگی بەلەنجەر کوژران. مەعزەد دەستارەکەی عەلقەمەی لەسەر بەست و لەتە بەردێکی مەنجەنیق بەر سەری کەوت و سەری شکاند بەڵام گرنگی پێنەدا و دەستی خستە سەر و مرد. عەلقەمە خوێنی دەستارەکەی شۆرد بەڵام خوێنەکە پاك

نەدەبووییەوە. بەو دەستارەوە دەڕۆشتە نوێژی هەینی و دەیوت: خۆشمەدەوێت لەبەر ئەوەی خوێنی مەعزەدی پێوەیە. یەزیدیش شتێکی بەرکەوت و کوژرا. دەتوت گۆڕێکیان هەڵکەندبوو و یەزید سەیری دەکرد و وتی: چەندە جوانە. لەخەودا ئاسکێکی بینی کەجوانتر لەو ئاسکەی نەبینیبوو. ڕووی کردە گۆڕەکە و لەوێ دفن کرا و ئەو، هەمان ئاسکەکە بوو.

یەزیدی نەخەعی پیاوێکی لەسەرخۆ و دیندار بوو. کاتێك هەواڵی مەرگی ئەو بە عوسمان کوڕی عەفان گەیشت، وتی: انا للە و انا الیە راجعون، خەڵکانی کوفە کەم بوونەوە، خواوەندا ئەوان ببەخشە.

تەڵحە دەڵێت: سەعید، سلێمان کوڕی ڕەبیعەی وەك فەرمانڕەوای ئەم سنوورە دەستنیشان کرد و سەرکردایەتی سوپاکەی کوفەی لەجەنگەکان بەحوزەیفە کوڕی یەمان سپارد. پێشتر عەبدولرەحمان کوڕی ڕەبیعە کارگوزاری ئەم سنوورە بوو.

عوسمان کوڕی عەفان لەساڵی دەیەم خەڵکانی شامی بەسەرکردایەتی حەبیب کوڕی موسلیمەی قورەشی بۆ هاوکاری ئەوان نارد. سەلمان دژی وەستایەوە و حەبیب تەسلیم بوو تا ئەوەی خەڵکانی شام وتیان: دەمانەویست لەسەلمان بدەین. خەڵکان وتیان: سوێند بەخوا ئێمەیش لەحەبیبمان دەدا. ئەگەر خۆڕاگریتان دەکرد کەسانێکی زۆر لەئێمە و ئێوە دەکوژران.

ئەوس کوڕی مەغرا لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەگەر لەسەلمان بدەن، لەحەبیبی ئێوە دەدەین

ئەگەر بڕۆنە لای کوڕی عەفان، ئێمەیش دەڕۆین

ئەگەر دادپەروەری بکەنە پیشە، سنوور سنووری ئەمیری ئێمەیە

و ئەوە ئەمیری ئێمەیە لەگەڵ شەرکەران پێشڕەوی دەکات

لەو شەوانە تیرمان بۆ هەرکەسێك دەهاویشت

و شکستمان دەدا، پارێزەرانی بووین.))

دەڵێت: حەبیب دەیویست لەگەڵ کارگوزاری باب بەتوندی بجوڵێتەوە کەسەرکردەی سوپایەك بوو لەکوفەوە هاتبوون و کاتێك حوزەیفە هەستی بەمە کرد، پەچەکرداری لەخۆی نیشاندا و ئەوانیش بەهەمان شێوە.

حوزەیفە کوڕی یەمان لەو ناوچەیە سێ جار جەنگا کە لەسێیەم جار عوسمان

کوڕی عەفان کوژرا و کاتێك لەکوژرانی عوسمان کوڕی عەفان ئاگادار بوونەوە، وتی: خواوەندا، بکوژەکانی عوسمان و خراپەخوازان و نەیارانی عوسمان بەنەحلەت بکە. خواوەندا ئێمە سەرکۆنەمان دەکرد وئەو سەرکۆنەی دەکردین تا ئەو جێگەی هەرکەس لەدەوری ئەو بوو، سەرکۆنەی ئێمەی دەکرد و ئێمەیش سەرکۆنەمان دەکرد و ئەمەیان کردە بیانوی ئاژاوە. خواوەندا ئەوان مەکوژە مەگەر بەشمشێر.

لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی عەوف مرد. واقدی ئەم حەدیسە لە عەبدوللە کوڕی جەعفەر دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەکاتی مردن تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵ بوو.

دەڵێت: هەروەها لەم ساڵەدا عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب کۆچی دووای کرد. لەو کاتەدا تەمەنی هەشتا و هەشت ساڵ بوو. ئەو سێ ساڵ لە پێغەمبەر(د.خ) گەورەتر بوو.

دەڵێت: لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی زەید کوڕی عەبد رەببە مرد. ئەو، ئەو کەسەیە بانگی لەخەودا بینی.

دەڵێت: لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی مەسعود لەمەدینە مرد و لەبەقیع بەخاك سپێردرا. بەوتەیەك عەمار نوێژی لەسەر خوێندو بەوتەیەك عوسمان کوڕی عەفان.

دەڵێت: لەم ساڵەدا باوکی تەڵحە مرد.

بەوتەی سەیف ئەبوزەری غەفاری لەم ساڵەدا کۆچی دووای کرد.

## گێڕانەوەی کۆچی دووایی ئەبوزەر

عەتییە کوڕی یەزیدی فەقعەسی دەڵێت: کاتێك مەرگی ئەبوزەر نزیك کەوتەوە، مەرگی ئەو لەمانگی زی حەججەی ساڵی هەشتەمی خەلافەتی عوسمان کوڕی عەفان بوو، بەکچەکەی خۆی وت: کچم، سەیرکە بزانە کەس دەبینی؟

وتی: نە.

وتی: کەواتە هێشتا ئەجەلی من نەگەیشتووە.

فەرمانیدا بزنێکیان کوشت و کوڵاندیان. وتی: کاتێك ئەوانەی من دفن دەکەن، هاتنە لای تۆ، پێیان بڵێ ئەبوزەر سوێندتان دەدات سوار مەبن تا ئەو کاتەی لەخواردنەکە دەخۆن. کاتێك خواردنەکەی ئامادە بوو، وتی: بزانە کەس دەبینی؟

وتی: بەڵێ، کاروانێك نزیك دەبێتەوە.

وتی: کچم، رووەو کەعبەم بمسوورێنە.

کچەکەی ئەو کارەی کرد.

وتی: بەناوی خوا و بەهاوکاری خواوەند و لەسەر دینی پێغەمبەر(د.خ).

کچەکەی ڕۆشت و بەوان گەیشتەوە و وتی: خوا لێتان خۆش بێت، وەرنە لای ئەبوزەر.

وتیان: لەکوێیە؟

کچەکەی بەدەست ئیشارەی بۆ کرد و وتی: مردووە، دفنی بکەن.

وتیان: بەڵێ، بەسەر چاو، خواوەند بەم دینە ڕێزی لەئێمە گرتووە.

لەم کاتەدا کاروانێك لەخەڵکانی کوفە گەیشت کە عەبدوللە کوڕی مەسعود لەناویاندا دەبینرا و بەدەوری ئەبوزەردا سووڕانەوە. کوڕی مەسعود دەگریا و دەیوت: پێغەمبەر(د.خ) راستگۆ بوو کەدەیفەرموو: تەنیا دەمرێت و بەتەنیا حەشر دەکرێت.

ئەویان شۆرد و کفنیان کرد و نوێژیان لەسەر خوێند و بەخاکیان سپارد. کاتێك ویستان بەرێکەون، کچەکەی وتی: ئەبوزەر سلاوتان لێ دەکات و سوێندتان دەدات سوار مەبن تا ئەو کاتەی لەخواردنەکەی بخۆن. ئەو کارەیان کرد و ئەویان برد تا گەیشتنە مەدینە. هەواڵی مەرگی ئەبوزەریان بە عوسمان کوڕی عەفان راگەیاند. سەروەری باوەڕداران کچەکەی پەیوەستی بنەماڵەکەی خۆی کرد و وتی: خواوەند لەئەبوزەر خۆش بێت و سارا نشینی رافیع کوڕی خودەیج ببەخشێت.

خەڵحالْ کوڕی زەڕری دەڵێت: لەساڵی سی و یەکەم لەگەڵ کوڕی مەسعود ڕۆشتینەدەر. چواردە سوار بووین. کاتێك گەیشتینە رەبزە، ژنێك هاتە لای ئێمە و وتی: وەرنە لای ئەبوزەر. بەلام لەمەبەستەکەی حاڵی نەبووین و وتمان: ئەبوزەر لەکوێیە؟

ژن ئاماژەی بۆ خێوەتێك کرد.

وتمان: بۆ لێرە؟

وتی: بەهۆی ئەوەی لەمەدینە بیستبووی، لەو شارە خۆی بەدوور گرت.

کوڕی مەسعود وتی: هۆکاری سارانشینی ئەو چی بوو؟

وتی: سەروەری باوەڕداران حەزی نەدەکرد بەڵام ئەو دەیوت: ئەوێ، شوێنی لەناوچوونە، ئەوێ مەدینەیە.

دەڵێت: کوڕی مەسعود بەدەوریدا دەسوڕایەوە و دەگریا. ئەومان شۆرد و کفنمان کرد. خێوەتەکەی ئەومان بینی کە بۆنخۆش کرابوو. بەژنەکەمان وت: ئەمە چییە؟

وتی: موشکێك بوو، کاتێك سەردەمی مەرگی نزیك کەوتەوە وتی: کەسانێك لەسەر مردوو ئامادە دەبن کە هەست بەبۆنی موشك بکەن بەڵام هیچ ناخۆن. ئەم موشکە تێکەڵ بەئاوەکە بکە و بەخێوەتەکەدا بڵاوی بکەرەوە. بەبۆنی خۆش میوانداریيان بکە و ئەم گۆشتە بکوڵێنە چوونکە کەسانێکی خواپەرەست لەسەر سەری من ئامادە دەبن و کفن و دفنی من دەگرنە ئەستۆ. میوانداریيان بکە.

دەڵێت: کاتێك ئەومان دفن کرد، ژنەکە پێشنیاری خواردنی پێکردین. خواردمان و مەبەستی بردنی ئەومان کرد. کوڕی مەسعود وتی: سەروەری باوەڕداران نزیکە، داوای مۆڵەتی لێ بکەین. ڕوومان کردە مەککە و ئەم هەواڵەمان بە عوسمان کوڕی عەفان ڕاگەیاند. وتی: خواوەند ئەبوزەر ببەخشێت و لەنیشتەجێ بوونی لەڕەبزە خۆش ببێت.

کاتێك بەڕێکەوت و لەمەککە ڕۆشتەدەر، ڕێگەی ڕەبزەی گرتەبەر. عوسمان کوڕی عەفان بنەماڵەی ئەبوزەری پەیوەستی بنەماڵەکەی خۆی کرد و ڕووی کردە مەدینە و ئێمە گەڕاینەوە بۆ عێراق. ئێمە ئەم کەسانە بووین: کوڕی مەسعود، باوکی مەفزەری تەمیمی، بەکر کوڕی عەبدوڵلەی تەمیمی، ئەسوەد کوڕی یەزیدی نەخەعی، عەلقەمە کوڕی قەیسی نەخەعی، خەڵخاڵ کوڕی زەڕری زەببی، حارس کوڕی سوەیدی تەمیمی، عەمرۆ کوڕی عوتبە کوڕی فەرقەدی سولەمی، کوڕی ڕەبیعەی سولەمی، باوکی ڕافیعی موزنی، سوەید کوڕی مەسعەبەی تەمیمی، زیاد کوڕی معاویەی نەخەعی برای ئەقرەسعی زەببی و برای مەعزەدی شەیبانی.

لەساڵی سی و دووەم کوڕی عامر دەستی بەسەر مەرورۆز و تاڵەقان و فاریاب و گورگان و تەخارستان گرت.

## گێڕانەوەی ئەم جەنگانە

کوڕی سیرین دەڵێت: کوڕی عامر ئەحنەف کوڕی قەیسی بۆ مەرورووز ڕەوانە کرد و گەمارۆی خستە سەر خەڵکەکەی. ئەوان هاتنەدەر و جەنگیان دەستپێکرد و موسوڵمانان شکستیان پێهێنان و بۆ قەڵاکەیان پاشەکشێیان پێکردن. لەسەرەوەی قەڵاکەوە دەیانوت: ئەی عەرەبەکان، ئێوە لای ئێمە بەو شێوە نەبوون کەئێستا دەتانبینین، ئەگەر دەمانزانی بەو شێوەن، ئێمە و ئێوە بارودۆخێکی دیکەمان دەبوو، ئەمرۆ مۆڵەتمان پێبدەن تا لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی خۆمان بکەین، بگەڕێنەوە بۆ ئوردووگاکەتان.

ئەحنەف گەڕایەوە و بەرەبەیان هێرشی کردە سەر ئەوان. ئەوانیش بۆ جەنگ خۆیان ئامادە کردبوو. یەکێك لەعەجەمەکان هات و نامەیەکی خەڵکانی شاری پێبوو، وتی: من نێردراوم، ئەمانم پێ ببەخشن. ئەمانیان پێ بەخشی و دەرکەوت نێردراوی فەرمانڕەوای مەرو و برازا و وەرگێری تایبەت بەخۆیەتی. نامەی فەرمانڕەوا بۆ ئەحنەف بوو و نامەکەی خوێندەوە.

دەڵێت: ناوەرۆکی نامەکە بەمشێوە بوو:

(( بۆ سەرکردەی سوپا. ئێمە سپاسی خوایەکە دەکەین کەنۆرەکان لەدەستی ئەودایە، هەر پاشایەتییەك بخوازێت گۆڕانکاری تیا دروست دەکات، هەرکەس بخوازێت، دووای ریسوایی پێگە و پایەی بەرز دەکاتەوە و هەرکەس بخوازێت، پێگە و پایەی لێ دەستێنێتەوە. باوەڕداری باوەگەورێی من و ئەو ڕێزداری و گەورەییەی لەباوەگەورێی ئێوە بینیبووی، بۆ بەستنی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئێوە ناچارم دەکات، بەخێر بێن و دڵخۆش بن. پێشنیاری ئاشتیتان پێدەکەم تا ئاشتی لەنێوان ئێمە سەقامگیر بێت و شەست هەزار درەم خەراجتان پێ دەدەم و ئەو زەوییانەی کەخوسرەو شای شاکان لەکاتی کوشتنی ئەو مارەی خەڵکانی دەخوارد و ڕێگەی نێوان زەوی و گوندەکانی بەستبوو، بەباوگەورێی باوکمی بەخشیبوو، لەگەڵ جەنگاوەرانی لەدەستی مندا بێت و لەکەس لەبنەماڵەکەی من خەراج وەرمەگرن و فەرمانڕەوای لەبنەماڵەکەی منەوە تەسلیم بەهیچ بنەماڵەیەکی دیکە نەکرێت. ئەگەر بەڵێنی جێبەجێ کردنی ئەم خاڵانە بەمن دەدەیت، بۆ لای تۆ دێم. هەنوکە ماهەکی

برازام بۆ لای تۆ ناردووە و بۆ خواستەکەم بەڵێن لەتۆ وەردەگرێت.))

دەڵێت: ئەحنەف وەڵامی دایەوە:

(( لەسەخر کوڕی قەیس سەرکردەی سوپا بۆ بازان فەرمانڕەوای مەرووروز و سوارچاکەکان و عەجەمەکانی هاورێی. سڵاو لەو کەسەی شوێنکەوتەی ڕزگارییە و باوەڕ دێنێت و دەبێتە کەسێکی خۆپارێز و خواپەرەست. ماهەکی برازات هاتە لای من و بۆ چاکەخوازی تۆ هەوڵیدا و پەیامەکەی تۆی گەیاند. من پەیامەکەی تۆم لەگەڵ موسوڵمانانی هاوڕێم باس کرد و بڕیارماندا بەخواست و مەبەستەکانی تۆ رازی ببین. پێشنیارت کردبوو بۆ بەکرێگیراوان و وەرزێر و زەوییەکانی خۆت شەست هەزار درەم خەراج بەمن و سەروەری باوەڕداران بدەیت جگە لەو زەوییانەی خوسرەوی ستەمکار، بەهۆی کوشتنی ئەو مارەی لەسەر زەوی خراپەکاری ئەنجام دەدا و ڕێگەکانی بڕیبوو، بەباوەگەورێی باوکی تۆی بەخشیوە. زەوییەکان تایبەتە بەخوا و پێغەمبەر(د.خ) و بەهەر کەس لەبەندەکانی خۆی بخوازێت، دەیبەخشێت، بەو مەرجەی هاوکاری موسوڵمانان بکەیت و ئەگەر ویستیان لەگەڵ سوارچاکانی خۆت لەگەڵ دوژمنانیان بجەنگیت. موسوڵمانانیش دژی ئەو کەسانەی دژی تۆ دەجەنگن، هاوکاریت دەکەن و بۆ ئەم مەبەستە، نووسراوێك لەمنەوە بەتۆ دەدرێت کەدوای من وەك بەڵگە بەدەستی تۆوە بێت و باج و خەراج لەهیچ کام لەئەندامانی بنەماڵەکەت وەرنەگیرێت. ئەگەر موسوڵمان بوویت و باوەڕت بە پێغەمبەر(د.خ) هێنا، لای موسوڵمانان ڕێز و پێگەت پێ دەبڕێت و دەبیتە برای ئەوان. زەممەی من و زەممەی باوکم و زەممەی موسوڵمانان و زەممەی باوکانیان لەگرێوی ئەم پەیمان نامەدایە.))

جەۆ کوڕی معاویە (یا معاویە کوڕی جەۆ ) سەعدی و حەمدی کوڕی هەرماس و حەمید کوڕی خەیار، هەردووکیان مازنی و عەیاز کوڕی وەرقای ئەسەدی شایەتی ئەم پەیمان نامەیەن. کیسان موالی مناڵەکانی سەعلەبە نووسی لەرۆژی یەکشەممەی مانگی حەرامی خواوەند. سەرکردەی سوپا ئەحنەف کوڕی قەیس مۆری کرد و نەخشی مۆرەکە ئەحنەف نعبداللەیە.))

مەسعەب کوڕی حەییان لەبراکەی موقاتیل کوڕی حەییان دەگێڕێتەوە: کوڕی

عامر لەگەڵ خەڵکانی مەرو پەیمانی ئاشتی بەست و ئەحنەف لەگەڵ چوار هەزار کەس بۆ تەخارستان نارد. ئەحنەف ڕۆشت و لەمەروروز گەیشتە شوێنی کۆشکەکەی ئەحنەف و خەڵکانی تەخارستان و خەڵکانی گورگان و تاڵەقان و فاریبا دژی ئەو کۆبوونەوە. سێ دەستە بوون: سی هەزار کەس.

هەواڵی کۆبوونەوەی ئەوان بەئەحنەف گەیشت و لەگەڵ کەسانی نزیکی خۆی راوێژی کرد بەڵام بۆچوونەکانیان جیاواز بوو، یەکیان وتی: روو دەکەینە مەرو. یەکی دیکەیان وتی: دەگەڕێینەوە بۆ ئەبەر شەهر. یەکی دیکە دەیوت: دەمێنینەوە و داوای هاوکاری دەکەین. یەکی دیکە وتی: رووبەروویان دەبینەوە و دەجەنگین.

دەڵێت: ئەحنەف لەشەو هاتەدەر و بەناو ئوردووگاکەدا دەسووڕایەوە و گفتوگۆی خەڵکانی دەبیست تا ئەوەی لای خێوەتێك تێپەڕی کەیەکیان ئاگری لەژێر قازانەکەی دەکردەوە یا هەویری دەشێلا و سەرقاڵی گفتوگۆ کردن بوون. یەکیان وتی: بۆچوونی راست ئەوەیە بەرەبەیان سەرکردەی ئێمە بەرێکەوێت و لەهەر شوێنێك بێت، رووبەرووی دوژمن ببێتەوە تا زیاتر بترسن. ئەوکەسەی سەرقاڵی قازانەکە یا هەویر شێلان بوو، وتی: ئەگەر ئەم کارە بکات، هەڵەی کردووە و ئێوە بەهەڵەدا دەچن، دەڵێن: لەسارا یا لەسەرزەمینی خۆیان رووبەرووی دوژمن ببێتەوە کە بەم ژمارە کەمەی ئێمە و فراوانی سوپاکەی ئەوان، بەیەك هێرش لەناومان دەبەن. بۆچوونی راست ئەوەیە لەنێوان مێرگەلاّن و کێوەکە دابەزێت بەجۆرێك مێرگەلاّن لای راست و کێوەکە لای چەپی سوپاکەی بێت بەمشێوەیە ژمارەی دوژمن هەرچەندە زۆر بێت، تەنیا بەئەندازەی سوپای موسوڵمانان دەتوانن، رووبەروویان ببنەوە.

دەڵێت: ئەحنەف گەڕایەوە. بۆچوونەکەی ئەوی پەسەند کردبوو.

دەڵێت: ئوردووی لێدا و مایەوە و خەڵکانی مەرو کەسیان نارد تا بۆ هاوکاری ئەو بجەنگن.

وتی: پەسەندی ناکەم هاوکاری لەناباوەڕان وەربگرم، بەپێی بەڵێنەکانی نێوانمان لەشوێنی خۆتان بمێننەوە: ئەگەر سەرکەوتنمان بەدەست هێنا، ئێمە ڕێز لەپەیمانەکەی خۆمان دەگرین و ئەگەر سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و هێرشیان کردە سەر ئێوە، بەرگری لەخۆتان بکەن.

دەڵێت: لەکاتی نوێژی ئێواری، ناباوەڕان هێرشیان کرد و موسوڵمانان

ڕووبەڕوویان بوونەوە و جەنگان تا شەو داهات. ئەحنەف هۆنراوەی کوڕی جوبەی ئەعرەجی وەك نمونە دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( ئەوکەسەی نابێت لەمەرگ بترسێت

گەنجێکی بوێرە کەمناڵی نییە.))

باوکی ئەشهەبی سەعدی لەباوکی دەگێڕێتەوە: شەوانە لەنێوان ئەحنەف و موسوڵمانان لەگەڵ خەڵکانی مەرورووز و تاڵەقان و فاریاب و گوزگان جەنگ ڕوویدا و لەگەڵ ئەوان جەنگا تا ئەوەی بەشی زۆری شەو کۆتایی هات و خواوەند شکستی پێهێنان و موسوڵمانان ژمارەیەکی زۆریان لەوان کوشت تا گەیشتنە ڕەسکەن کەدوانزە فەرسەخی کۆشکی ئەحنەف بوو. فەرمانڕەوای مەرورووز ئەو شتەی پەیمانی ئاشتییان لەسەر مۆر کردبوو، ئامادە نەکردبوو، چاوەڕوان بوو بزانێت سەرئەنجامی کارەکان چۆن دەبێت.

دەڵێت: کاتێك ئەحنەف سەرکەوتنی بەدەست هێنا، دوو کەسی بۆ لای فەرمانڕەوا نارد و فەرمانی پێدان قسەی لەگەڵ نەکەن تا ئەو کاتەی خەراجەکەی لێ وەردەگرن. نێردراوەکان ئەو کارەیان کرد و فەرمانڕەوا زانی سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە بۆیە بەم شێوەیە دەجووڵێنەوە. خەراجەکەی تەسلیم کردن.

مەفزەل کوڕی زەبیی لەباوکی دەگێڕێتەوە: ئەقرەح کوڕی حابس ڕووی کردە گورگان کەئەحنەف ئەوی لەگەڵ دەستەیەك سوار بۆ لای پاشماوەی دەستەکانی دیکە نارد کەشکستی پێ هێنابوون. ئەقرەع شەڕی لەگەڵ کردن و موسوڵمانان هێرشیان برد و چەند کەسێك لەسوارچاکەکانیان کوژرا. خواوەند سەرکەوتنی بە موسوڵمانان بەخشی و دوژمنیان کوشتار کرد.

کەسیری بەهشەلی هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئاوی هەورەکان، کوشتنگەی گەنجەکانی

گوزگانی، تێراو کرد

نزیك دوو کۆشکی گوندی حوت

کە دوو ئەقرەع ئەوانی بردبووە ئەوێ.))

قەسیدەیەکی دوور و درێژە.

لەم ساڵەدا لەنێوان ئەحنەف و خەڵکانی بەڵخ پەیمانی ئاشتی مۆر کرا.

## ئاشتی بەڵخ

ئەیاس کوڕی موهەلیب دەڵێت: ئەحنەف لەمەروروودەوە رووی کردە بەڵخ و گەمارۆی خستە سەر ئەو شارە. خەڵکانی بەڵخ لەسەر پێدانی چوارسەد هەزار پەیمانی ئاشتییان بەست. ئەحنەف رازی بوو و کوڕە مامەکەی خۆی ئەسید کوڕی موتەشمسی لەوێ دانا تا ئەو بڕە پارەی پەیمانی ئاشتییان لەسەر مۆر کردبوو، وەربگرێت و خۆی رووی کردە خوارەزم و مایەوە تا زستان تەنگی پێ هەڵچنی و بەهاوەڵانی خۆی وت: بۆچوونی ئێوە چییە؟

حەسین وتی: عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب پێی وتوویت؟

وتی: چی وتووە؟

وتی: وتوویەتی:

((کاتێك توانای ئەنجامدانی کارێك نییە، وازی لێ بێنە

کارێك بگرە ئەستۆ کەتوانای ئەنجامدانیت هەبێت.))

((ئەمە پەندێکی بەناو بانگی عەرەبەکانە.))

دەڵێت: ئەحنەف فەرمانی بەرێکەوتنیدا و بۆ بەڵخ گەڕایەوە. ئامۆزاکەی بڕە پارەی پەیمان نامەی ئاشتی وەرگرتبوو، کاتی وەرگرتن، رۆژی مێهرگان بوو. چەندین دیاری لەدەفری زێڕ و زیو و دینار و درەم و جل و بەرگی گرانبایییان بۆ هێنا.

ئامۆزاکەی ئەحنەف وتی: ئەمە لەناو ئەو شتانەدایە کە لەپەیمان نامەکەدا ئاماژەی پێدراوە؟

وتیان: ئەمە ئەو دیارییانەیە لەم رۆژەدا بەفەرمانڕەوای خۆمانی دەدەین.

وتی: ئەمڕۆ چ رۆژێکە؟

وتیان: مێهرگان.

وتیك نازانم ئەمە چییە، بەلام پەسەندی ناکەم ئەمانە بگەڕێنمەوە، ئەگەری هەیە مافی من بێت، وەریدەگرم و بەجیا هەڵیاندەگرم تا دووایی.

دیارییەکانی وەرگرت و کاتێك ئەحنەف گەڕایەوە، ئاگاداری کردەوە. ئەحنەف

لەوبارەوە پرسیاری لەخەڵکان کرد و هەمان وەڵامیان دایەوە.

وتی: دەیانبەم بۆ لای سەروەری خۆم.

ئەوانی بۆ لای کوڕی عامر برد و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

کوڕی عامر وتی: ئەی باوکی بەحر، هەڵیانگرە چوونکە تایبەتن بەخۆت.

وتی: پێویستم پێیان نییە.

وتی: ئەی مسمار هەڵیگرە.

حەسەن دەڵێت: قورەشی هەڵیگرت. و تایبەت بوو بەو.

محەممەدی موڕی لەپیرەکانی منداڵەکانی موڕە دەگێڕێتەوە: ئەحنەف بیشر کوڕی موتەشمیسی وەك فەرمانڕەوای بەلّخ دانا.

سەدەقە کوڕی حەمید لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك باوکی عامر لەگەڵ خەڵکانی مەرو پەیمانی ئاشتی بەست و ئەحنەف لەگەڵ خەڵکانی بەلّخ پەیمانی ئاشتی واژۆ کرد.، خولەید کوڕی عەبدوللەی حەنەفی بۆ هەرات و بادغیس نارد و دەستی بەسەردا گرت. دوای ئەو، دووبارە کافر بوونەوە و پەیوەستی قارن بوون.

داوود دەڵێت: کاتێك ئەحنەف بۆ لای کوڕی عامر گەڕایەوە، خەڵکان بە کوڕی عامریان وت: کەس بەئەندازەی تۆ دەستی بەسەر زەوییەکاندا نەگرتووە چوونکە فارس و کرمان و سیستان و هەموو خوراسانت گرتووە.

وتی: دەبێت بۆ سپاس کردنی خواوەند حەجی عەمرە بکەم. لەنەیشابورەوە ئەحرامی بەست و کاتێك گەیشتە لای عوسمان کوڕی عەففان، ئەوی بۆ ئیحرام بەستن لەخوراسانەوە سەرکۆنە کرد و وتی: باشتر بوو ئەو کارە لەو شوێنەوە بکەیت کەخەڵکان دەیکەن.

سەکن کوڕی قتادەی عورەینی دەڵێت: کوڕی عامر، قەیس کوڕی هەیسەمی لەخوراسان وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد و لەساڵی سی و دووەم لەو شارە هاتەدەر.

دەڵێت: قارن دەستەیەکی زۆری لەناوچەی دوو تەبس و خەڵکانی بادغیس و هەرات و قەهێستان کۆکردەوە و لەگەڵ چل هەزار کەس بەرێکەوت. قەیس کوڕی عەبدوللە کوڕی خازم وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟ وتی: بۆچوونی من ئەوەیە

ویلایەتەکە بەجێبێڵێت کەمن فەرمانڕەوایەتی دەکەم و فەرمانی کوڕی عامر لای منە کە ئەگەر لەخوراسان جەنگێك روویدا، من سەرکردە بم. نامەیەکی درۆینەی دەرهێنا و قەیس نەیویست رووبەرووی ببێتەوە. ویلایەتەکەی تەسلیم کرد و گەڕایەوە بۆ لای کوڕی عامر. کوڕی عامر سەرکۆنەی کرد و وتی: لەکاتی جەنگ ویلایەتەکەت بەجێهێشت و گەڕایتەوە بۆ لای من؟

وتی: فەرمانی لەتۆوە پێ بوو.

دایکی کوڕی عامر وتی: پێم وتبووی ئەوان لەیەك ویلایەت دامەنێ تا دژی یەك شۆڕش نەکەن.

دەڵێت: کوڕی حازم لەگەڵ چوار هەزار کەس رووبەرووی قارن بوویەوە و بەخەڵکانی وت چەوری لەگەڵ خۆیان هەڵبگرن. کاتێك لەئوردووگای قارن نزیك کەوتەوە، بەخەڵکانی وت، هەرکامتان کۆنەیەك لە پەموو یا هەر شتێك بکەن بەنووکی ڕمەکانی خۆتانەوە و چەوری تێ بسوون. دواتر ڕۆشت و شەشسەد کەسی وەك پێشەنگی سوپاکەی ڕەوانە کرد و خوی بەدوای ئەوندا ملی رێگەی گرتەبەر. فەرمانی بەخەڵکاندا ئاگر لەنووکی ڕمەکان بەربدەن.

دەڵێت: کاتێك پێشەنگی سوپاکەی گەیشتە ئوردووگاکەی قارن و لەگەڵ پاسەوانەکانی ئوردوو جەنگان، خەڵکانی ترساو کەوتنە گیانی یەك. کوڕی خازم هات و بڵێسەکان لەچەپ و راستەوە دەرکەوتن کەدەهاتنە پێش. کەسیان نەبینی و شڵەژابوون و پێشەنگی سوپاکەی کوڕی خازم سەرقاڵی جەنگان بوون. کوڕی خازم لەگەڵ موسوڵمانان نزیك کەوتەوە و قارن کوژرا و دوژمن شکستی خوارد. موسوڵمانان شوێنیان کەوتن و تا ئەو جێگەی دەیانتوانی کوشتاریان کردن و ژمارەیەکی زۆر ئەسیریان دەستکەوت. بەوتەی یەکێك لەپیرەکانی مناڵەکانی تەمیم دایکی سەڵت کوڕی حورەیس لەئەسیرەکانی سوپای قارن بوو و هەروەها دایکی زیاد کوڕی رەبیع و دایکی باوکی عەبدوڵلە عەون کوڕی عەونی فەقیە، لەناویاندا دەبینران.

موسلیمە دەیوت: کوڕی خازم دەستی بەسەر ئوردووگاکەی قارن و هەموو کەل و پەلەکانی ناو ئوردووگاکە گرت و هەواڵی سەرکەوتنی بۆ کوڕی عامر نووسی کەرازی و شادمان بوو و ئەوی وەك فەرمانڕەوای خوراسان هێشتەوە و لەوێ مایەوە تا

کۆتای جەنگی وشتر. ئەوسا گەڕایەوە بۆ بەسرە و لەجەنگی کوڕی حەزرەمی بەشدار و لەماڵەکەی سەنبیل لەگەڵ ئەودا بوو.

سلێمان کوڕی کەسیری خوزاعی دەڵێت: قارن دەستەیەکی فراوانی دژی موسوڵمانان کۆکردەوە و موسوڵمانان نیگەران بوون. قەیس کوڕی هەیسەم بە عەبدوللە کوڕی خازمی وت: بۆچوونی من ئەوەیە ناتوانیت لەبەرابەر ئەو سوپایە خۆڕاگری بکەیت، بۆ لای کوڕی عامر بڕۆ و لەزۆری سوپای دوژمن ئاگاداری بکەرەوە. ئێمە لەم قەڵایانە دەمێنینەوە و کات بەسەر دەبەین تا هاوکاری بگات.

دەڵێت: قەیس کوڕی هەیسەم بەرێکەوت و کاتێك دوور کەوتەوە، کوڕی خازم فەرمانێکی نیشاندا و وتی: کوڕی عامر منی وەك فەرمانڕەوای خوراسان دەستنیشان کردووە. رووبەرووی قارن بوویەوە و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و هەواڵی سەرکەوتنەکەی بۆ کوڕی عامر نووسی. کوڕی عامر ئەوی وەك فەرمانڕەوای خوراسان هێشتەوە و خەڵکانی بەسرە بەردەوام لەگەڵ ئەو دەستە لەخەڵکانی خوراسان کەپەیمانی ئاشتییان مۆر نەکردبوو، دەجەنگان و کاتێك دەگەڕانەوە، چوار هەزار کەسیان بەجێهێشت و بەمشێوە بوون تا ئاژاوە روویدا.

## ساڵی سیی و سێیەم دەستی پێکرد

بەوتەی واقدی لەم ساڵەدا معاویە لەسەرزەمینی رۆم لەناوچەی مەڵتییە لەقەڵای زەن جەنگی کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی ئەبی سەرح بۆ جاری دووەم لەئەفریقا جەنگا چوونکە خەڵکەکەی پەیمانیان شکاند.<

لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی عامر، ئەحنەف کوڕی قەیسی بۆ خوراسان نارد چوونکە خەڵکەکەی پەیمانەکەیان شکاند. ئەحنەف دەستی بەسەر دوو مەرودا گرت: مەروی شاهجانی بەئاشتی و مەرورِوز دوای جەنگێکی سەخت و دژوار. عەبدوللە کوڕی عامر بەدوای ئەو بەرێکەوت و ئەبەر شەهری کردە مەنزڵگەی خۆی. بەوتەی واقدی بەئاشتی دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت.

بەوتەی باوکی مەعشەر جەنگی قبرێس لەساڵی سیی و سێیەم روویدا. پێشتر ئامارژەمان بەبۆچوونە جیاوازەکاندا.

هەروەها لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی عەفان دەستەیەك لەخەڵکانی عێراقی بۆ شام دوور خستەوە.

## گێڕانەوەی دوور خستنەوە دەستەیەك لەخەڵکانی شام و کوفە

مێژوو نووسان لەمبارەوە بۆچوونیان جیاوازە. بەوتەی سەیف بەو شێوە بوو کەتەنیا بیرمەندانی کوفە و جەنگاوەرانی رۆژگاری پێش قادسیە و قادسیە و قورئان خوێنەکانی بەسرە و ئەشراف دەیانتوانی بڕۆنە لای سەعید کوڕی عاس و لەتەنیایدا لەگەڵ ئەوان دادەنیشت. بەڵام کاتێك لای خەڵکان دادەنیشت، هەموان دەیانتوانی بڕۆنە لای.

رۆژێك بۆ بینینی خەڵك دانیشتبوو، دەستەیەك هاتن و لەو کاتەی سەرقاڵی گفتوگۆ بوون، خونەیس کوڕی فلانی ئەسەدی وتی: تەڵحە کوڕی عوبەیدالله چەندە بەخشندەیە!

سەعید کوڕی عاس وتی: کەسێك مڵکێکی وەك نەشاستەجی هەبێت، دەبێت بەخشندە بێت. سوێند بەخوا ئەگەر هی من دەبوو، خواوەند بژێوی ئێوەی باش

دەکرد.

عەبدولرەحمان کوڕی خونەیسی گەنج وتی: سوێند بەخوا ئارەزووم دەکرد مەڵتات هی تۆ بێت. مەبەستی مڵك وماڵی بنەماڵەی خوسرەو لەکەنارەکانی فورات لەلای کوفە بوو.

وتیان: خواوەند دەمت بشکێنێت، سوێند بەخوا دەمانویست بتکوژین.

خونەیس وتی: گەنجە، گرنگی پێمەدەن.

وتیان: ئارەزوو دەکات بەشێك لەسوادی ئێمە تایبەت بێت بەو.

وتی: ئارەزووی گەورەتری بۆ ئێوە هەیە.

وتیان: نە بۆ ئێمە داوای هیچ بکات نە بۆ ئەو.

وتی: ئەمە پەیوەندی بەئێوەوە نییە.

وتیان: خۆت ئەمەت فێر کردووە.

ئەشتەر و کوڕی زی ئەلکەحبە و جوندەب و سەعسەعە و کوڕی کەوا و کومەیل و عومەیر کوڕی زابی هەستان و عەبدولرەحمانیان گرت. باوکی بەرگری لێکرد. لەهەردووکیاندا بەئەندازەیەك بێهۆش کەوتنە سەر زەوی. سەعید سوێندی دەدان بەڵام رازی نەبوون تا مەبەستەکەی خۆیان ئەنجامدا.

منداڵەکانی ئەسەد لەرووداوەکە ئاگادار بوونەوە و هاتن. توڵەیحە لەناویاندا دەبینرا. گەمارۆیان خستە سەرکۆشکەکە و هۆزەکان دانیشتن. ئەوانەی ناو کۆشك پەنایان بۆ سەعید برد و وتیان: لەم بەڵایە رزگارمان بکە.

سەعید هاتە لای خەڵکان و وتی: ئەی خەڵکینە، دەستەیەك شەڕیان کردووە و لەیەکیانداوە، بەڵام خواوەند هەموویانی بەتەندروستی هێشتۆتەوە.

ئەوان سەرقاڵی گفتوگۆ بوون. سەعید ئەو دوانەی کردەدەر، ئەو دوانە هاتنە هۆش. سەعید وتی: هێشتا زیندوون؟

وتیان: هاونشینەکانی تۆ ئێمەیان کوشت.

وتی: چیتر نابنە هاونشینی من. رێگە لەزمانی خۆتان بگرن و خەڵکان دژی من هان مەدەن.

ئەو دووانە ئەو کارەیان کرد و کاتێك ئەو کەسانە چیتر هیوایان بەهاونشینی

سەعید نەما، لەماڵەکانی خۆیان دانیشتن و دەستیان بەبڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە کرد تا ئەو جێگەی خەڵکانی کوفە سەبارەت بەوان سەرکۆنەی سەعیدیان دەکرد.

سەعید وتی: ئەمیری ئێوە فەرمانی داوە کەس هان نەدەم، ئەگەر کەسێك مەبەستی ئەو کارەی هەیە، خۆی دەزانێت.

گەورەکان و خواپەرەستانی دانیشتووی کوفە سەبارەت بەدوور خستنەوەی ئەوان نامەیان بۆ عوسمان کوڕی عەفان نووسی. سەروەری باوەڕداران وەڵامی دانەوە: ئەگەر هەمووان لەسەر ئەوە کۆکن، ئەوان بۆ لای معاویە کوڕی ئەبوسوفیان بنێرن.

ئەو دە و چەند کەسەیان ڕەوانە کردن ریسوا بوون و بەناچاری ملکەچی خۆیان نیشاندا و بۆ لای معاویە بەرێکەوتن. ئەم هەواڵەیان بۆ عوسمان کوڕی عەفان نووسی.

عوسمان کوڕی عەفان نامەی بۆ معاویە نووسی: خەڵکانی کوفە دەستەیەك ئاژاوەچییان بۆ لای تۆ ناردووە، بیانترسێنە و چاودێرییان بکە، ئەگەر لەکارەکانی خۆیان پەشیمان بوونەوە، بیانبەخشە و ئەگەر کێشەیان بۆ تۆ دروست کرد، بیانگەڕێنەوە.

کاتێك گەیشتنە لای معاویە، بەخێری هێنان و لەکەنیسەیەك بەناوی مریەم، نیشتەجێی کردن. بەفەرمانی عوسمان کوڕی عەفان ئەو مانگانەی لەکوفە بەوان دەدرا، لەشام پێیان دەدرا و بەردەوام نانی بەیانی و ئێوارێیان دەخرایە بەردەست.

ڕۆژێك معاویە پێی وتن: ئێوە دەستەیەك لەعەرەبەکانن کەددان و زمانتان هەیە و بەهۆی ئیسلامەوە پێگەتان بەرز بۆتەوە و بەسەر ئۆمەتەکاندا زاڵ بوون و دەستتان بەسەر پێگە و میراتەکاندا گرتووە. بیستوومە دژایەتی قورەیش دەکەن. ئەگەر قورەیش نەدەبوو، ریسوا بوون بەهەمان شێوەی پێشووتان. پێشەواکانی ئێوە تا هەنووکە قەڵغانی ئێوە بوون، زیان لەقەڵغانەکانی خۆتان مەدەن. پێشەواکانی ئێوە بۆ کارە ناڕەواکانی ئێوە خۆڕاگری دەکەنە پیشە و بەئەرك و ئێشەکانی ئێوە رازی دەبن. سوێند بەخوا یا لەکارە ناڕەواکانی خۆتان دەگەڕێنەوە یا خواوەند گرفتاری کەسێکتان دەکات سزاتان بدات و ڕێز لەخۆڕاگریتان نەگرێت. هەروەها لەژیان و مەرگ لەو زیانانەی بەسەر مسکێنەکاندا دەیهێنن، شەریکی ئەوان دەبن.

یەکێك لەوان وتی: ئەوەی سەبارەت بەقورەیش هێنایە سەرزمان، لەرۆژگاری جاهلییەت نەزۆرینەی عەرەب بوون نە لەعەرەبەکانی دیکە بەهێزتر کەئێمە لەوان دەترسێنیت. ئەوەی سەبارەت بەقەڵغانت باس کرد کاتێك راستە قەڵغان کەڵکی بۆ نەخۆش هەبێت.

معاویە وتی: هەنووکە ئێوەم ناسی و تێگەیشتم کەم ئاوزی ئێوە بۆ ئەم کارانە ناچارتان دەکات. تۆ وتاردەی خەڵکانی بەلاّم ئاوز لەتۆدا نابینم. من بەشێوەیەکی گەورە باسی ئیسلام دەکەم و بیری تۆی دەهێنمەوە و تۆ رۆژگاری جاهلییەت بۆ من باس دەکەیت. موسوڵمانان مۆجیاریت دەکەم و تۆ گومان دەکەت قەڵغانەکەت دەدرێت! سەبارەت بەقەڵغان باسی دڕان ناکەن. خواوەند ئەو کەسانەی ئێوەیان بەگرنگ زانیوە و خەلیفەیان ئاگادار کردۆتەوە، ریسوا بکات. بزانن و گومانم نییە کەدەتوانن بزانن، قورەیش لەجاهلییەت و ئیسلام بەهۆی خواوەندەوە رێزی پێبڕا. زۆرینەی عەرەبەکان و بەهێزترینی ئەوان نەبوون بەلاّم پێگەیان بەرزتر و ڕەچەڵەکیان پاکتر و جوامێرییان گشتگیرتر. لەرۆژگاری جاهلییەت کەخەڵکانی یەکتریان دەخوارد، رێز و پێگەیان لەو خواوەندەوە پێبڕا کەرێز لەهەر کەسێك بگرێت، ریسوا نابێت وهەر کەس لەناو ببات، چیتر ناتوانێت لەسەر پێی خۆی هەستێتەوە. ئەوانی لەحەرەمی پارێزراو نیشتەجێ کرد بەلاّم خەڵکان لەدەوری ئەوان دەفڕێندران. عەرەب و عەجەم و ڕەش و سوورێك ناناسن کەرۆژگاری کێشە و بەلاّی نەخستبێتە دیار و پێگەی ئەوان جگە لەقورەیش کەهەرکەس دژایەتی کرد، خواوەند روخساری قێزەون کرد تا ئەو کاتەی خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد ئەو کەسانەی شوێن دینەکەی کەوتوون و رێزیان گرتووە لەریسوایی دنیا و سزاکانی ئاخیرەت رزگار بکات و بۆ ئەم کارە باشترینی ئافرێنراوەکانی خۆی هەڵبژارد. دواتر چەند کەسێکی وەك هاوەڵی ئەو دیاری کرد و ئەم پاشایەتییەی بۆ بەهێز و سەقامگیر کردن کە باشتر لەهەموو قورەیشییەکان بوون و دواتریش خەلافەتی بەوان سپارد چوونکە تەنیا بەهۆی ئەوانەوە ئەم کارە ئەگەری دەبێت. خواوەند لەسەردەمی جاهلیەت کەناباوەڕ بوون، رێزی ئەوانی دەگرت و دەیپاراستن، گومان دەکەیت هەنووکە کەشوێنکەوتەی دینەکەی ئەون، نایانپارێزێت؟

لەرۆژگاری جاهلییەت لەبەلای ئەو پاشایانەی بەسەر ئێوەدا زاڵبوون، ئەوانی پاراست. تف لەخۆت و هاوەڵانت. خۆزگە کەسێکی دیکە جگە لەتۆ دەپەیڤی، بەلام تۆ دەستتپێکرد.

بەلام تۆ ئەی سەعسەعە، گوندەکەت خراپترین گوندی عەرەبە و ڕووەکەکەی بۆگەنترینیان و دۆڵەکەی قوڵترینان و بەخراپی بەناوبانگ و جیرانەکانی ریسوا و زەلیل. هەر پیاوێکی شەریك یا ریسوا کە لەو گوندە نیشتەجێ بووبێت، هۆکارێك بووە بۆ عەیب و سەرکۆنە کردنی، نازناوەکانتان لەهەموو عەرەبەکان قێزەونتر و ناشیرینترە و خزمەکانتان لەهەمووان ریسواتر. سەرسەرییەکانی خەڵکان بوون و دراوسێکانتان بەکرێگیراوی فارسەکان تا ئەو کاتەی بانگەوازی پێغەمبەر(د.خ) بەگوێی ئێوە گەیشت. بەلام تۆی نەگرتەوە و دوورکەوتیتەوە چوونکە بەغەریبی لەعەممان ژیانت بەسەر دەبرد و لەبەحرەین نەبوویت تا لەگەڵ خەڵکەکەی خۆت بۆ وەلامدانەوەی بانگەوازی پێغەمبەر(د.خ) بەشدار بیت. لەهەموو خەڵکەکەی خۆت خراپتر بوویت و کاتێك ئیسلام روخساری تۆی ئاشکرا کرد و تێکەڵ بەخەڵکانی کردی و بەسەر ئەو نەتەوانەی بەسەر تۆدا زاڵبوون، زاڵی کردیت، هاتوویت و دەخوازیت فێرۆیی لەدینی خواوەند دروست بکەیت و خوازیاری ریسوایی و خراپەکاریت بەلام ئەم کارانەی تۆ زیان لەقورەیش نادات و لەجێبەجێ کردنی ئەرکەکانیان دووریان ناخاتەوە. شەیتان لەئێوە بێ ئاگا نییە و ئێوەی بەخراپترینی خەڵکەکەتان زانیوە و خەڵکانی بەئێوە گرفتار کردووە بەلام سەرئەنجام لەناوتان دەبات چوونکە دەزانێت ناتوانێت بەهاوکاری ئێوە رێگە لەقەزا و قەدەری خوایی بگرێت. هەرگیز بەهۆی ئاژاوە نانەوە ناگەنە مەبەست جگە لەوەی خواوەند بەبەلا و شەرێکی قێزەونتر گرفتارتان دەکات.

معاویە هەستا و ئەوانی بەجێهێشت. سەرکۆنەی خۆیان کرد و تێ ڕامان. دواتر معاویە گەڕایەوە لایان و وتی: مۆڵەتتان پێ دەدەم بۆ کوێ دەخوازن برۆن. سوێند بەخوا، خواوەند بەهۆی ئێوەوە سوود بەکەس ناگەیێنێت و زیان لەکەس نادات چوونکە پیاوی سوودو زیان گەیاندن نین. ئێوە خەڵکانێکی سەرپێچیکەر و یاخین. ئەگەر رزگاریتان دەوێت لەگەڵ خەڵکان تێکەڵ بن و لەگەڵ زۆرینە بن. دەستەیەکی کەم لەخۆباییتان نەکات چوونکە چاکەکاران گرفتاری لەخۆبایی بوون نابن. بۆ

هەرکوێ دەخوازن بڕۆن، سەبارەت بەئێوە نامە بۆ سەروەری باوەڕداران دەنووسم.

کاتێك بەرێکەوتن، ئەوانی بانگ کرد و وتی: دووبارە پێتان دەڵێم پێغەمبەر(د.خ) کە لەهەڵە و گوناح پارێزراو بوو، منی بۆ ئەم کارە راسپارد و لەکارەکانی خۆی بەشداری پێکردم. دوای ئەو ئەبوبەکر خەلافەتی گرتەدەست و کاروباری بەمن سپارد. عومەر کوڕی خەتاب خەلافەتی گرتەدەست و کاروباری بەمن سپارد. عوسمان کوڕی عەفان خەلافەتی گرتەدەست و کاروباری بەمن سپارد.

کاروباری هەرکام لەوانم گرتەدەست و ئەرکەکانم ئەنجامدا، لێم رازی بوو. پێغەمبەر(د.خ) بۆ راپەڕاندنی کاروبارەکان بەدوای کەسانی شارەزا و بەتواناداو دەگەڕا و خەڵکانی زۆربڵە و نەزان و نەشیاوی لەخۆی دوور دەخستەوە. خواوەند بۆ هەموو شتێك بەتوانایە. هەرکەس فریوی بدات، فریوی دەدات. ئێوە کەدەزانن، دەست بۆ ئەنجامدانی کارێك درێژ مەکەن کەخواوەند یەختەتان بەرنەدات. چوونکە تاقیتان دەکاتەوە و نهێنییەکانی دڵتان بۆ هەمووان ئاشکرا دەکات. خواوەند دەفەرمێت:

((الم، احسب النّاس ان يتركوا ان يقولوا آمنا و هم لا يفتنون.

واتاکەی: الیف، لام، میم، مەگەر ئەوکەسانە گومانیان کردووە هەر ئەوەندەی بڵێن، باوەڕمان هەیە، پشت گوێ دەخرێن و تاقی ناکرێنەوە.))

معاویە نامەی بۆ عوسمان کوڕی عەفان: دەستەیەك هاتنە لای من نەئاوزیان هەیە نەدین چوونکە ئیسلام لەسەر شانی ئەوان قورسە و لەدادپەروەری بێزارن. مەبەستیان رەزامەندی خواوەند نییە و بەبەڵگەوە نادوێن. مەبەستیان ئاژاوەیە و بەدەست هێنانی سامانی ئەهلی زەممە. خواوەند گرفتارو تاقیان دەکاتەوە و ریسوایان دەکات بەلاّم بەلاّی ئەوان بەرۆکی کۆمەلاّنی خەڵك دەگرێت. فەرمان بەسەعید بدە خۆی لەوان دوور بگرێت چوونکە سەرپێچیکەرن و ئاژاوەچی.

ئەوان لەدیمەشقەوە بەرێکەوتن. وتیان مەگەڕێنەوە بۆ کوفە چوونکە سەرکۆنەتان دەکەن. بەرەو جەزیرە دەڕۆین و عێراق و شام لەبیر دەکەین. روویان کردە جەزیرە.

عەبدولرەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید لەهاتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە. معاویە

ئەوی وەك كارگوزاری حیمس راسپاردبوو و كارگوزاری جەزیرەی لەحەڕان و ڕەققە دانابوو. عەبدولرەحمان ئەوانی بانگ كرد و وتی: ئەی پیاوانی شەیتان، بەخێر نەیێن و بێ هۆ هاتن، شەیتان سەرسوڕماو ڕۆشت بەڵام ئێوە لەهەوڵەكانتان بەردەوامن. خواوەند سزای عەبدولرەحمان بدات ئەگەر بەشێوەیەك ئێوە تەمێ نەكات كەگرفتاری پەشیمانی ببنەوە. ئەی ئەو كەسانەی نازانم عەرەبن یا عەجەم، ئەو وتانەی بیستوومە لای معاویە باستان كردووە، لای من باسی نەكەن. من كوڕی خالید كوڕی وەلیدم، لەڕووداوەكان ئەزموونێكی زۆرم كۆكردۆتەوە. من كوڕی كەسێكم هەڵگەڕاوەكانی لەناوبرد. سوێند بەخوا ئەی سەعسەعەی زەلیل، ئەگەر ببیستم یەكێك لەكەسەكانی من لووتی تۆی گرتووە و ڕووبەڕووی تۆ بۆتەوە، بۆ شوێنێكی دوور، دوورت دەخەمەوە.

عەبدولرەحمان یەك مانگ ڕێگەی دان بمێننەوە. هەركاتێك سوار دەبوو ئەوانی پیادە لەگەڵ خۆی دەبرد و كاتێك لای سەعسەعە گوزەری دەكرد، دەیوت: ئەی كوڕی حەتیئە! دەزانی هەركەسێك كەڵك لەچاكە وەرنەگرێت، بەرەو خراپە دەڕوات. بۆ ئەو وتانەی لای سەعید و معاویە هێناتە سەرزمان، لای من باسی ناكەیت؟

ئەو دەیوت و ئەوان دەیانوت: لەپێشگای خواوەند تۆبە دەكەین، لێمان خۆشبە تا خواوەند لێت خۆش بێت. ئەوەندە وتەكانیان دووبارە كردەوە تا وتی: خواوەند بەتۆبەكەی ئێوە ڕازی بێت. ئەوسا ئەشتەری بۆ لای عوسمان كوڕی عەفان نارد و بەكەسانی دیكەی وت: هەرچۆنێك دەخوازن، ئەگەر دەتانەوێت بڕۆن و ئەگەر دەتانەوێت، بمێننەوە.

ئەشتەر ڕۆشت و گەیشتە لای عوسمان كوڕی عەفان. تۆبەی كرد و پەشیمانی خۆی دەربڕی و وتی: لەكردەوەی خۆی و هاوەڵانی پەشیمان بۆتەوە. عوسمان كوڕی عەفان وتی: خواوەند بتانبەخشێت.

دوای ئەوە سەعید كوڕی عاس هات، عوسمان كوڕی عەفان بەئەشتەری وت: بۆ هەر شوێنێك دەخوازیت بڕۆ.

وتی: دەگەڕێمەوە بۆ لای عەبدولرەحمان. باسی گەورەیی و ڕێزداری ئەوی كرد. عوسمان كوڕی عەفان وتی: هەرچۆنێك دەخوازیت. ئەشتەر بۆ لای عەبدولرەحمان گەڕایەوە.

عامر کوڕی سەعد دەڵێت: کەسانێك شایەتییان دا کەوەلید کوڕی عوقبە شەرابی خواردۆتەوە و عوسمان کوڕی عەففان سەعید کوڕی عاسی وەك فەرمانڕەوای کوفە ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا وەلید ڕەوانە بکات.

دەڵێت: سەعید کوڕی عاس هاتە کوفە وکەسی بۆ لای وەلید نارد و پەیامیدا: سەروەری باوەڕداران فەرمانی داوە بڕۆیتە لای.

دەڵێت: وەلید چەند ڕۆژێك مایەوە. سەعد پێی وت: بۆ لای براکەی خۆت بڕۆ چوونکە فەرمانی بەمن داوە تۆ ڕەوانە بکەم.

دەڵێت: سەعید نەڕۆشتە سەر مینبەری کوفە و فەرمانیدا بیشۆن. کەسانێك لەمناڵەکانی ئومەییە هاوڕێیەتیان دەکرد، سوێندیاندا و وتیان: سوێند بەخوا ئەم کارە ناشیرینە. ئەگەر کەسێکی دیکە ئەو کارەی دەکرد، شیاو بوو، سوێند بەخوا ئەم نەنگە بەردەوام لەسەر شانی وەلید دەمێنێتەوە.

دەڵێت: بەڵام سەعید بۆ ئەو کارە پێداگری کرد و مینبەرەکەی شۆرد و کەسی بۆ لای وەلید نارد تا ماڵی فەرمانڕەوایی بەجێبێڵێت. وەلید ئەو کارەی کرد و لەماڵی عەمارە کوڕی عوقبە نیشتەجێ بوو. دواتر وەلید بۆ لای عوسمان کوڕی عەففان ڕۆشت و ئەوی لەگەڵ شایەتەکان ڕووبەڕوو کردەوە. بەباشی زانی داری حەدی لێ بدات و ئەو کارەی کرد.

شەعبی دەڵێت: کاتێك سەعید کوڕی عاس هاتە کوفە، سەرکردەکانی خەڵکی هەڵبژارد تا ببنە هاونشینی. شەوێك سەرانی کوفە و لەناو ئەوان مالك کوڕی کەعبی ئەرحەبی و ئەسوەد کوڕی یەزید و عەلقەمە کوڕی قەیس، هەردووکیان نەخەعی و مالکی ئەشتەر و کەسانی دیکە لەدەوری ئەو کۆببوونەوە. سەعید وتی: ئەم سوادە، باخی قوڕەیشە.

ئەشتەر وتی: بەگومانی تۆ ئەم سوادە کەخواوەند بەهۆی شمشێرەوە کردوویەتییە تالانی ئێمە، باخی تۆ و خەڵکەکەتە! سوێند بەخوا کەس لەئێوە کەزیاتر لەهەمووان لەسواد بەشی هەیە، زیاتر لەئێمە وەرناگرێت. کەسانی دیکە وتەکانی ئەویان پشتڕاست کردەوە.

دەڵێت: عەبدولرەحمانی ئەسەدی کەسەرکردەی پاسەوانەکانی سەعید بوو،

وتی: بەرپەرچی وتەکانی ئەمیر دەدەنەوە. بەتوندی لەگەڵیان ئاخاوت.

ئەشتەر وتی: ئەمە کێیە، ڕێگەی مەدەن بڕوات. کەسانێك پەلاماریاندا و لێیاندا تا ئەوەی لەهۆش خۆی چوو. دواتر قاچیان راکێشا و لەسووچێکدا فڕیاندا. ئاویان کرد بەروخساریدا تا هاتە هۆش خۆی. سەعید پێی وت: هێشتا زیندوویت؟

وتی: ئەو کەسانەی گومانت دەکرد باوەڕداری راستەقینەن، منیان کوشت.

وتی: سوێند بەخوا چیتر کەس لەوان وەك هاونشینی من دانانیشێت.

دواتر ئەو کەسانە لەماڵەکانی خۆیان جوێنیان بە عوسمان کوڕی عەفان و سەعید کوڕی عاس دەدا. خەڵك لەدەوریان کۆبوونەوە و ئەو کەسانەی سەردانی ئەوانیان دەکرد، ژمارەیان فراوان بوو.. سەعید نامەی بۆ عوسمان کوڕی عەفان نووسی و لەم پێشهاتە ئاگاداری کردەوە و وتی: دەستەیەك لەخەڵکانی کوفە – ناوی دەکەسی برد—خەڵکان دەبزوێنن و سەرکۆنەی تۆ و من دەکەن و رەخنە لەباوەڕ و دینداری ئێمە دەگرن. دەترسم ئەگەر دەسەڵاتیان فراوان ببێت، ژمارەیان زیاد بکات.

عوسمان کوڕی عەفان نامەی بۆ سەعید نووسی: ئەوان بۆ شام بنێرە. لەو کاتەدا معاویە لەشام بوو. سەعید نۆکەسی بۆ لای معاویە نارد کە مالکی ئەشتەر و سابت کوڕی قەیس کوڕی مونقیع و کومەیل کوڕی زیادی نەخەعی و سەعسەعە کوڕی سوحان لەناویاندا دەبینران.

پاشماوەی گێڕانەوەکە هاوشێوەی حەدیسەکەی پێشووە جگە لەوەی دەڵێت:

سەعسەعە وتی: ئەگەر قەڵغانەکە بدرێت، فریو بەئێمە ناگات؟ معاویە وتی: قەڵغان نادرێت، بەشێوەیەکی باشتر گومان لەکاروباری قورەیشییەکان بکە. ئەم زیادەی هەیە: کاتێك معاویە بۆ جارێکی دیکە ڕۆشتە لای ئەوان و ئاگاداری پێدان، لەناو قسەکانی خۆیدا وتی: سوێند بەخوا فەرمانی هەر کارێك بەئێوە بدەم لەخزم وکەس و کار و کەسانی نزیکی خۆمەوە دەست پێدەکەم. قورەیشییەکان دەزانن ئەبوسوفیان کەسی ڕێزداری ئەوان بوو و کوڕی ڕێزدارترینیان جگە لەو ڕێزەی خواوەند بەپێغەمبەری خۆی بەخشی چوونکە خواوەند ئەوی هەڵبژارد و بۆ کردەوە چاکەکان لەهەموو خەڵکان باشتر و لەکردەوە خراپەکان دووری خستبوویەوە. بەگومانی من ئەگەر هەموو خەڵکان لەمناڵەکانی ئەبو سوفیان دەبوون، هەموویان دوور ئەندێش دەبوون.

سەعسەعە وتی: درۆ دەکەیت. خەڵکان لەپشتی کەسێکەوە هاتوون لەئەبوسوفیان باشترە چوونکە خواوەند ئەوی بەدەستی خۆی ئافراند و لەرۆحی خۆی پێبەخشی و فەرمانی بەفریشتەکاندا بوو سەری کڕنوشی بۆ دانەوێنن بەڵام لەناو منداڵەکانی ئەویش چاك و خراپ و نەزان و بیرمەند هەیە.

دەڵێت: ئەو شەوە معاویە بەجێی هێشتن و شەوێکی دیکە هات و گفتوگۆی فراوانی لەگەڵ ئەوان کرد. وتی: ئەی خەڵکینە، یا وەڵامی چاکەم بدەنەوە، یا بێدەنگ بن و تێفکرن. سەیری ئەو کارانە بکەن بۆئێوە و خەڵکەکەتان و هۆزەکەتان و موسوڵمانان سوودمەندە و خوازیاری ئەو شتەبن ئێمە خوازیارین پێی.

سەعسەعە وتی: تۆ شیاوی ئەوە نیت و نابێت بۆ راپەڕاندنی ئەرکە خواییەکان شوێن تۆ کەون.

وتی: مەگەر ئەو وتانەی هێنامە سەرزمان جیاواز لەوە بوو کەدەڵێم لەخواوەند بترسن و شوێنکەوتەی ئیسلام و پێغەمبەر(د.خ) بن. هەمووتان خۆتان بەتەناف خواوەندەوە هەڵواسن و بڵاوەی لێمەکەن.

وتیان: نا، تۆ فەرمانی دووبەرەکی و دژایەتی کردنی فەرموودەکانی پێغەمبەرت پێکردین.

وتی: هەنووکە دەڵێم، ئەگەر بەو شێوەیە قسەم کردووە، تۆبە بۆ پێشگای خواوەند بەرز دەکەمەوە و دەڵێم: لەخوا بترسن و شوێنکەوتەی پێغەمبەر(د.خ) بن و هاوئاهەنگ لەگەڵ خەڵکانی موسوڵمان و لەدووبەرەکی خۆتان بەدوور بگرن و رێز لەسەرکردە و پێشەواکانی خۆتان بگرن و بەباشترین شێوە پشتیوانیان بن و ئەگەر هەڵەیان کرد، بەشێوەیەکی شیاو و نەرم و نیان، مۆجیارییان بکەن.

سەعسەعە وتی: بەتۆ دەڵێین، لەکارەکەی خۆت دەست بکێشیتەوە چوونکە لەناو موسوڵمانان کەسی شیاوتر لەتۆ بۆ ئەو کارە بوونی هەیە.

وتی: کێ؟

وتی: کەسێك کەباوکی بۆ سەرخستنی ئیسلام لەباوکی تۆ تێکۆشەرتر بووە.

وتی: سوێند بەخوا منیش بۆ سەرخستنی ئیسلام هەوڵمداوە بەڵام لەم رۆژگارەی ئێستا کەس جگە لەخۆم بۆ ئەو کارەی لەئەستۆی مندایە، بەتوانا نییە.

ئەمە بۆچوونی عومەر کوڕی خەتاب بوو، ئەگەر کەسێکی بەتواناتر لەمن بوونی دەبوو، ئەوی رادەسپارد چوونکە عومەر کوڕی خەتاب جیاوازی لەنێوان کەسەکان نەدەکرد. جیاواز لەوە کارێکم نەکردووە ببێتە هۆی ئەوەی دەست لەکارەکەم بکێشمەوە. ئەگەر سەروەری باوەڕداران و موسوڵمانان بەگشتی ئەوە بۆچوونیان بێت، بەخەتی خۆی نامەی بۆ دەنووسیم و دەستم لەکار دەکێشایەوە. ئەگەر خواوەند مەبەستی بەئەنجام گەیاندنی ئەو کارەی بێت، هیوادارم مەبەستەکەی چاکەی بەدواوە بێت. بەهێواشی رێگە ببڕن چوونکە لەم وتە و وتەکانی هاوشێوەی، ئارەزوو و مەبەستەکانی شەیتان خۆی حەشارداوە. سوێند بەگیانی خۆم، ئەگەر کاروبارەکان بەپێی خواست و حەزی ئێوە ئەنجام دەدران، کاروباری تایبەت بە موسوڵمانان شەو و رۆژێك سەقامگیر نەدەبوو بەڵام خواوەند کاروبارەکان هەڵدەسووڕێنێت و رێگە چارەیان بۆ دادەنێت و فەرمانەکانی خۆی بەئەنجام دەگەیێنێت.

وتیان: تۆ شیاوی ئەو کارە نیت.

وتی: سوێند بەخوا، خواوەند هەم سزای هەیە هەم پاداشت. دەترسم بەردەوام شوێنکەوتەی شەیتان بن بەهەمان شێوە کەگوناحی رەحمان و شوێنکەوتنی شەیتان، لەم دنیا ریسواتان دەکات و لەو دنیا گرفتاری ئازاری خواوەند.

ئەوان پەلاماری معاویەیاندا و سەر وریشیان گرت.

وتی: بەرمدەن، ئێرە سەرزەمینی کوفە نییە. سوێند بەخوا ئەگەر خەڵکانی شام ببینن بەمشێوەیە لەگەڵ پێشەواکەیان دەجووڵێنەوە، دەتانکوژن و رێگرتن لەوان ئەگەری نییە. سوێند بەگیانی خۆم، کارەکانی ئێوە هاوشێوەی یەکە.

معاویە ئەوانی بەجێهێشت و وتی: سوێند بەخوا تا کۆتایی تەمەنم لەگەڵ ئێوە دانانیشم. نامەی بۆ عوسمان کوڕی عەفان نووسی:

((بەناوی خواوەند بەخشندە و مێهرەبان: بۆ بەندەی خوا عوسمان کوڕی عەفان، سەروەری باوەڕداران، لەمعاویە کوڕی ئەبوسوفیان، بەڵام دواتر، ئەی سەروەری باوەڕداران! دەستەیەکت بۆ لای من رەوانە کرد، بەزمانی شەیتان و هاوشێوەی ئەو، دەپەیڤن، بەگومانی خۆیان وتەکانی قورئان بۆ خەڵکان باس دەکەن و کەسان دەخەنە گومانەوە و نازانن چییان دەوێت. مەبەستیان ئاژاوە نانەوەیە. ئیسلام

لەسەر شانی ئەوان قورسە و گرفتاری لەناچوون بوون. شەیتان کاریگەری لەسەر دڵی ئەوان داناوە و کەسانێکی زۆر لەخەڵکانی کوفەیان بەلاڕێدا بردووە. دەترسم ئەگەر لەناو خەڵکانی شام بمێننەوە، بەفریوەکانی خۆیان ئەوانیش فریو بدەن. ئەوان بۆ شارەکەیان بگەڕێنەرەوە تا لەو شارەی دووڕوویی و ڕیاکاری ئەوان ئاشکرا بووە، نیشتەجێ بن.))

عوسمان کوڕی عەففان نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا ئەوان بۆ کوفە و بۆ لای سەعید کوڕی عاس ڕەوانە بکاتەوە. بەڵام کاتێك گەڕانەوە، زمانیان درێژتر بوو. سەعید نامەی بۆ عوسمان کوڕی عەففان نووسی و سکاڵای بەرز کردەوە. عوسمان کوڕی عەففان وەڵامی دایەوە: ئەوان بۆ لای عەبدولرەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید ڕەوانە بکە. عەبدولرەحمان، ئەمیری حیمس بوو. سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ ئەشتەر و هاوەڵانی نووسی:

((بەڵام دواتر، من ئێوە بۆ حیمس دەنێرم. کاتێك نامەکەی منتان بەدەست گەیشت، بەرەو ئەو شارە بەڕێکەون چوونکە ئێوە دەست لەخراپەکاری و دژایەتی کردنی ئیسلام و موسوڵمانان هەڵناگرن. والسلام.))

کاتێك ئەشتەر نامەکەی خوێندەوە، وتی: خواوەندا، هەرکام لەئێمە مەبەستی خراپەکاری لەگەڵ خەڵکان و ژێردەستەکانی هەیە و زیاتر شوێنکەوتەی شەیتانە، سزای بدە. سەعید ئەمەی بۆ عوسمان کوڕی عەففان نووسی. ئەشتەر و هاوەڵانی بەرەو حیمس بەڕێکەوتن و عەبدولرەحمان کوڕی خالید ئەوانی لەکەنارەکان دابەزاند و ڕۆژانەی بۆ دیاری کردن.

باوکی ئیسحاقی هەمەدانی دەڵێت: چەند کەسێك لەگەورەکانی عێراق لەکوفە کۆبیوونەوە و خراپەی عوسمان کوڕی عەففانیان دەهێنایە سەرزمان. مالك کوڕی حارسی ئەشتەر و سابت کوڕی قەیسی نەخەعی و کومەیل کوڕی زیادی نەخەعی و زەید کوڕی سوحانی عەبدی و جوندەب کوڕی زوهەیری غامدی و جوندەب کوڕی کەعبی ئەزدی و عەروە کوڕی مەعد و عەمرۆ کوڕی حەمەقی خوزاعی. سەعید کوڕی عاس بەسەرهاتی ئەوانی بۆ عوسمان کوڕی عەففان نووسی و لەکارەکانی ئەوان ئاگاداری کردەوە. وەڵامی بۆ هاتەوە: ئەوان بۆ شام ڕەوانە بکە تا لەسنوورەکان

نیشتەجێیان بکەن.

## گێرانەوەی هۆکاری ئەوەی بۆ عوسمان کوڕی عەفان

### دەستەیەك لەخەڵکانی بەسرەی بۆ شام دوور خستەوە

عەتییە کوڕی یەزیدی فەقعەسی دەڵێت: کاتێك لەفەرمانڕەوایەتی کوڕی عامر سێ ساڵ تێپەڕی، ئاگادار بوویەوە لەناو خەڵکانی عەبدقەیس کەسێك لای حەکیم کوڕی جەبەلە نیشتەجێیە. حەکیم کوڕی جەبەلە دز بوو و کاتێك سوپاکە دەگەڕایەوە، هەڵدەهاتو هێرشی دەکردە سەر سەرزەمینی فارسەکان و ئەهلی زەممە و سامانی ئەوانی دەڕفاند و خراپەکاری ئەنجامدەدا و ئەوەی دەیویست، تالآنی دەکرد و دەگەڕایەوە. ئەهلی زەممە و موسوڵمانان سکالآیان بۆ لای سەروەری باوەڕداران بەرز کردەوە. ئەو، نامەی بۆ عەبدوللە کوڕی عامر نووسی: حەکیم و هەموو کەسانی هاوشێوەی ئەو بگرە و رێگە مەدە لەبەسرە بڕۆنەدەر تا پەشیمان ببنەوە. کوڕی عامر ئەوی دەستبەسەر کرد و چیتر نەیدەتوانی لەبەسرە بڕواتەدەر و کاتێك کوڕی سەودا هات و لای ئەو نیشتەجێ بوو، چەند کەسێك لەدەوری کۆبوونەوە. کوڕی سەودا لەگەڵ ئەوان قسەی دەکرد بەلآم بەراشکاوی هەموو شتێکی نەدەوت. بەوتەکانی رازی بوون وئەویان بەکەسێکی گەورە دەزانی.

کوڕی عامر کەسی نارد و ئەوی هێنا، وتی: تۆ کێیت؟

وتی: یەکێك لەشوێنکەوتەکانی کتێب کەئارەزوومەندی ئیسلام و دەخوازێت لەنزیکی تۆ بێت.

وتی: ئەوەی بیستوومە، جیاوازە لەوتەکانی تۆ، لای من بڕۆ.

کوڕی سەودا رووی کردە کوفە، لەوێیش دەریان کرد و رووی کردە میسر. نامەی بۆ خەڵکان دەنووسی و خەڵکان نامەیان بۆ دەنووسی و نێردراوەکان لەنێوان ئەواندا هاتوچۆیان دەکرد.

تەڵحە دەڵێت: حیمران کوڕی ئەبان ژنێکی لەکاتی سووڕی مانگانە کردە هاوسەری خۆی. عوسمان کوڕی عەفان سزایدا و جیایی لەنێوان ئەواندا دروست کرد. ئەوی بۆ بەسرە نارد و لەکوڕی عامر نزیك کەوتەوە. رۆژێك لەکاتی سواری و رێگە بڕین باسی عامر کوڕی عەبدقەیس کرا، حیمران وتی: باشترە بڕۆم وئاگاداری

بکەمەوە.

دەڵێت: لەپێشەوە ڕۆشت وخۆی گەیاندە عامر کەمەسحەفی دەخوێندەوە ووتی: ئەمیر دەخوازێت لای تۆ گوزەر بکات، ویستم ئاگادارت بکەمەوە. ئەو دەستی لەخوێندنەوەی خۆی هەڵنەگرت و گرنگی پێنەدا. حیمران لای ئەو هەستاو ویستی بڕواتەدەر. نزیك دەرگاکە، کوڕی عامری بینی و وتی: لای کەسێکەوە دیم کەبنەماڵەی ئیبراهیم لەخۆی بەگەورەتر نازانێت.

کوڕی عامر داوای مۆڵەتی کرد و ڕۆشتەژوور. لەنزیك ئەو دانیشت. عامر مەسحەفەکەی بەست و بۆ کاژێرێك ئاخاوتن. کوڕی عامر پێی وت: بۆ نایێتە لای ئێمە؟

وتی: سەعد کوڕی ئەبی عەرجا پێگەی خۆش دەوێت.

وتی: کارێکت پێ دەسپێرین.

وتی: حەسین کوڕی ئەبی بەحر حەزی لێیەتی.

وتی: ژنت بۆ دەهێنین.

وتی: ڕەبیعە کوڕی عەسەل ئارەزوومەندی ژنانە.

وتی: ئەمە گومان دەکات تۆ بنەماڵەی ئیبراهیم لەخۆت بەگەورەتر نازانیت. عامر مەسحەفەکەی کردەوە و یەکەم شت بەرچاوی کەوت، ئەم ئایە بوو:

((ان الله اصطفى آدم و نوحا و آل ابراهيم و آل عمران على العالمين.

واتاکەی: خواوەند ئادەم و نوح و بنەماڵەی ئیبراهیم و بنەماڵەی عیمرانی لەخەڵکانی جیهان هەڵبژارد.))

کاتێك حیمران گەڕایەوە، درێژەی بەم کارەی دا و خراپەی ئەوی هێنایە سەرزمان و کەسانێك دژی ئەو شایەتییاندا و عوسمان کوڕی عەفان ئەوی بۆ شام دوور خستەوە. کاتێك هەستیان بەزانستەکەی ئەو کرد مۆڵەتی گەڕانەوەیان پێدا بەلاّم ڕازی نەبوو و لەشام مایەوە.

تەڵحە دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان حیمران کوڕی ئەبانی دوور خستەوە چوونکە لەکاتی نەخۆشی مانگانە ژنێکی کردبووە هاوسەری خۆی. جیایی لەنێوان ئەوان دروست کرد و قامچی لێدا و دواتر ڕەوانەی بەسرەی کرد و دوای تێپەڕینی

ماوەیەك، مۆڵەتی گەڕانەوە بۆ مەدینەی پێدا. دەستەیەك لەگەڵ ئەو هاتن و خراپەی عامر کوڕی عەبدقەیسیان هێنایە سەرزمان کە ژن هێنان بەپێویست نازانێت و گۆشت ناخوات و لەنوێژی هەینی ئامادە نابێت. عامر پیاوێکی گۆشەگیر بوو و هەموو کارەکانی بەنهێنی ئەنجام دەدا.

عوسمان کوڕی عەفان ئەم بەسەرهاتەی بۆ کوڕی عامر نووسی کەئەوی بۆ لای معاویە نارد و کاتێك گەیشتە لای معاویە، تریتی لەبەردەمدا بوو و حیمران هاوشێوەی عەرەبەکان خواردنی خوارد. معاویە زانی تۆمەتیان بۆ هەڵبەستووە و وتی: فلاّن کەس دەزانی بۆ تۆیان دوور خستۆتەوە؟

وتی: نە.

وتی: بەخەلیفەیان وتووە تۆ گۆشت ناخۆیت و هەنووکە دڵنیا بووم تۆمەتیان بۆ تۆ هەڵبەستووە، وتوویانە تۆ ژن هێنان بەپێویست نازانیت و لەنوێژی هەینی ئامادە نابیت.

وتی: لەنوێژی هەینی ئامادە دەبم بەلاّم لەدوورترین شوێنی مزگەوتەکە دادەنیشم و زووتر لەهەمووان دەڕۆم. سەبارەت بەژن هێنان، کاتێك دەهاتم، خوازبێنیان بۆ کردم، بینیت گۆشتیشم خوارد بەلاّم لەقوربانی قەسابەکان ناخۆم چوونکە ڕۆژێك قەسابێکم بینی بزنێکی بۆ کوشتارگا دەبرد، کێردی خستە سەر قوڕگی و بەردەوام دەیوت: ریاکاری! ریاکاری! تا ئەوەی گیانی دەرچوو.

معاویە وتی: بگەڕێرەوە

وتی: بۆ شارێك کەخەڵکەکەی ئەو تۆمەتانەیان بۆ هەڵبەستووم ناگەڕێمەوە. لەم شارەی خواوەند بۆی هەڵبژاردووم، دەمێنمەوە. ئەو لەکەنارەکان ژیانی بەسەر دەبرد و سەردانی معاویەی دەکرد. معاویە بەردەوام لێی دەپرسی: نیازت بەچی هەیە؟

وەلاّمی دەدایەوە: هیچ.

کاتێك معاویە ئەم وتەی زۆر دووبارە کردەوە، وتی: دەمەوێت گەرمای بەسرە بۆ من بگەڕێنیتەوە تا ڕۆژوو گرتن دژوار بێت چوونکە لەدیاری ئێوە ڕۆژو زۆر ئاسانە.

باوکی عوسمان دەڵێت: کاتێك کەسانی دوورخراوەی کوفە گەیشتنە لای معاویە، ئەوانی لەماڵێکدا نیشتەجێ کرد و بەتەنیایی لەگەڵ ئەوان دانیشت و گفتوگۆی لەگەڵ کردن. کاتێك تەواو بوون، وتی: سوێند بەخوا لەنەزانی خۆتانەوە گرفتار

بوون چوونکە ئاوز و بەڵگەیەکی روون و توانای خۆڕاگریتان نییە. ئەی سەعسەعە! تۆ لەهەموویان نەزانتریت. تا ئەو کاتەی سەرپێچی فەرمانەکانی خواوەند نەکەن، چی دەخوازن بیکەن و بیڵێن چوونکە جگە لەسەرپێچی کردنی خواوەند بەهەموو شتێکی ئێوە رازی دەبن، لەکارەکانی نێوان ئێمە و خۆتان، خۆتان سەرپشك بن.

دواتر ئەوانی بینی بەشداری نوێژی هەینی دەکەن و لەدەوری وتارخوێن کۆدەبنەوە. ڕۆژێك ڕۆشتە لای ئەوان کەیەکیان قورئانی فێری کەسێکی دیکە دەکرد، وتی:ئەمە لەجیاتی ئەو ئارەزووەی لەسەردەمی جاهلییەت بووتان، پەسەندە. بۆ هەر شوێنێك دەخوازن بڕۆن و بزانن ئەگەر تێکەڵ بەخەڵکان و هاوئاهەنگی ئەوان بن، ئێوە بەختەوەر دەبن نەك ئەوان، ئەگەر لەوان دابڕێن، ئێوە بەدبەخت دەبن نەك ئەوان و زیان بەکەس ناگات. ئەوان پاداشتی چاکەیان بۆ معاویە خواست و بەباشترین شێوە وەسفیان کرد.

معاویە وتی: ئەی کوڕی کەوا، من چۆن پیاوێکم؟

وتی: بەتوانا و دەست کراوە و شاعیر و خۆڕاگر و کۆڵەکەیەك لەکۆڵەکەکانی ئیسلام کەسنوورێکی پڕمەترسیداریان بەتۆ سپاردووە.

وتی: باسی ئاژاوەچییەکانی ویلایەتەکە دەکەیت چوونکە تۆ لەهەموو هاوەڵانی خۆت بیرمەندتریت.

وتی: نامەم بۆ نووسیون و نامەیان بۆ ناردووم. ئەوان منیان نەناسی و من ئەوانم ناسیمەوە. ئاژاوەچییەکانی مەدینە زیاتر لەهەموو خەڵکان خوازیاری خراپەن و لەوان ناتەوانتر، ئاژاوەچییەکانی کوفە زیاتر لەهەمووان لەکارە بچووکەکان، دەترسن و بۆ کارە گەورەکان چاونەترسن. ئاژاوەچییەکانی بەسرە، پێکەوە دێن و بڵاوە پێکراو دەگەڕێنەوە. ئاژاوەچییەکانی میسر زیاتر لەهەموو شتێك سەرقاڵی خراپەکاری دەبن و زووتر لەهەمووان پەشیمان دەبنەوە. ئاژاوەچییەکانی شام زیاتر لەهەمووان شوێنکەوتەی رزگاریکەرن و نافەرمانی یاخیگەر.

لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی عەفان لەگەڵ خەڵکان ڕێ و ڕەسمەکانی حەجی ئەنجامدا. بەگومانی باوکی مەعشەر گرتنی قبرێس لەم ساڵەدا بوو. پێشتر ئاماژەم بەبۆچوونە جیاوازەکاندا.

## ساڵی سی و چوار دەستی پێکرد.

## ڕووداوە گرنگەکانی ساڵی سی و چوار

بەگومانی باوکی مەعشەر، جەنگی دەکەڵەکان لەم ساڵەدا ڕوویدا. پێشتر ئاماژەمان بەم جەنگە و گێڕانەوەی حەدیسە جیاوازەکان لەحەدیسەکەی باوکی مەعشەردا.

لەم ساڵەدا خەڵکانی کوفە ڕێگەی ڕۆشتنە ناو کوفەیان لەسەعید کوڕی عاس گرت.

لەم ساڵەدا نەیارەکانی عوسمان کوڕی عەفان نامەیان بۆ یەك نووسی تا بۆ گفتوگۆ کردن سەبارەت بەو بابەتانەی ببوە هۆی نارەزامەندی ئەوان، لای ئەو کۆببنەوە.

## کۆبوونەوەی نەیارەکانی عوسمان کوڕی عەفان و هەواڵی جورعە

قەیس کوڕی یەزیدی نەخەعی دەڵێت: کاتێك معاویە دوورخراوەکانی گەڕاندەوە، وتیان، عێراق و شام شوێنی ئێمە نییە، بەرەو جەزیرە دەڕۆین. بەدڵخوازی خۆیان ڕوویان لەجەزیرە کرد. عەبدولرەحمان کوڕی خالید بارودۆخی لەوان تەنگ و دژوار کرد. ناچار تەسلیم بوون و گوێڕایەڵییان بۆ فەرمانەکانی نیشاندا. ئەشتەری بۆ لای عوسمان کوڕی عەفان ڕەوانە کرد کەپێی وت: بۆ کوێ دەخوازیت بڕۆ.

ئەشتەر وتی: دەگەڕێمەوە بۆ لای عەبدولرەحمان. بۆ لای ئەو گەڕایەوە.

سەعید کوڕی عاس لەساڵی پانزەیەمی خەلافەتی عوسمان کوڕی عەفان گەڕایەوە بۆ مەدینە. ساڵ و چەند مانگ پێش ئەوەی سەعید کوفە بەجێبێڵێت، ئەشعەس کوڕی قەیسی بۆ ئازەربایەجان ڕەوانە کرد و سەعید کوڕی قەیسی بۆ ڕەی. سەعید کوڕی قەیس کارگوزاری هەمەدان بوو، لەوێ لەسەر کارلابرا و نەسیری عێجلی جێگەی گرتەوە. سائیب کوڕی ئەقرەع کارگوزاری هەمەدان و مالك کوڕی حەبیبی یەربوعی کارگوزاری ماه، حەکیم کوڕی سەلامەی خوزاعی کارگوزاری موسڵ، جەریر کوڕی عەبدوللە کارگوزاری قرقیسیا، سەلمان کوڕی ڕەبیعە کارگوزاری باب و کاروباری جەنگ لەو ناوچەیە لەژێر دەستی قەعقاع کوڕی عەمرۆدا بوو. عوتەبە

کوڕی نەهاس کارگوزاری حیلوان بوو.

کوفە لەسەرکردەکان چۆڵ و ئەوەی مابوویەوە یا شێت بوو یا شەیدا.

یەزید کوڕی قەیس هاتەدەر چوونکە خوازیاری لەسەر کار لابردنی عوسمان کوڕی عەفان بوو، لەمزگەوت دانیشت. کەسانێك لەدەوری کۆبوونەوە کە کوڕی سەودا یەکێك بوو لەوان. نامەی بۆ ئەوان دەنووسی. قەعقاع هێرشی کردە سەر ئەو شوێنە و یەزید کوڕی قەیسی گرت. وتی: ئێمە دەخوازین سەعید لەسەر کار لاببەین.

وتی: ئەم کارە پەیوەندی بەئێوەوە نییە، بۆ ئەم مەبەستە خەڵکان لەدەوری خۆت کۆمەکەرەوە، نیازەکەی خۆت ئاشکرا بکە سوێند بەگیانی خۆم بۆت دەستەبەر دەکەن.

قەیس گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی و کەسێکی بەکرێگرت. چەند درەم و ئێسترێکی پێدا و ڕەوانەی لای دوورخراوەکانی کرد. نامەی بۆ نووسین و داوای کرد پێش ئەوەی نامەکە لەسەر زەوی دابنێن، بەرێکەون چوونکە خەڵکانی شار هاوڕای ئێوەن.

ئەو پیاوە ڕۆشت و گەیشتە لای دوورخراوەکان. لەو کاتەدا ئەشتەر گەڕابوویەوە. کاتێك نامەکەی تەسلیم کردن، وتیان: ناوی تۆ چییە؟

وتی: بەعسەر.

وتیان: لەکام تایەفە؟

وتی: کەلب.

وتیان: دڕەندەیەکی ناتەوان کەئازاری خەڵکان دەدات، پێویستمان بەتۆ نییە.

ئەشتەر دژایەتی ئەوانی کرد و نێردراو تووڕە گەڕایەوە. کاتێك نێردراوەکە ڕۆشت، هاوەڵانی ئەشتەر وتیان: ئێمەی دەرکرد، خواوەند دەریکات. نازانین چی بکەین، ئەگەر عەبدولرەحمان بزانێت، کارەکانی ئێمە پشتڕاست ناکاتەوە و لێمان خۆش نابێت. بەدوای نێردراودا ڕۆشتن بەڵام نەیانگرتەوە.

عەبدولرەحمان ئاگادار بوویەوە کەئەوان شارەکەیان بەجێهێشتووە. لەدەرەوەی شار بەدوای ئەواندا گەڕا. ژمارەی هاوەڵانی ئەشتەر حەوت کەس بوو. بەرێکەوتن و دەستەکەی دیکە دەکەس. لەناکاو لەرۆژی هەینی ئەشتەر لەبەردەم دەرگای مزگەوتی کوفە دەرکەوت کەدەیوت: ئەی خەڵکینە من لای سەروەری باوەڕدارانەوە

دێم. سەعیدم بینی دەیویست مانگانەی ژنەکانتان بۆ سەد درەم کەم بکاتەوە و مانگانەی جەنگاوەرە تێکۆشەرەکان بۆ دوو هەزار کەم بکاتەوە. دەیوت: ئەشراف و ژنان چ کارەن و زیادەی ئەم دوو دەستەیە بۆ چییە؟ بەگومانی ئەو باخی قورەیش لەدەستی ئێوەدایە. ماوەی مەنزڵێك هاوسەفەری بووم، بەردەوام هۆنراوەی دەخوێندەوە تا ئەوەی لێی جیا بوومەوە. دەیوت: هاوار لەژنان و ئەشراف، لەدەست من رزگاریان نابێت چوونکە کەسێکی سەختگیرم وەك بڵێی لەجنۆکەکانم.

خەڵکان کەوتنە جموجۆڵ. بیرمەندان رێگەی ئەو کارەیان لێگرتن بەڵام کەس نەیبیست. کێشەکە گەورە بوویەوە. یەزید هاتەدەر و فەرمانیدا جارچییەکەی جارِبدات: هەرکەس دەخوازێت پەیوەستی یەزید کوڕی قەیس بێت تا سەعید بگەرِێننەوە و داوای ئەمیرێك جگە لەو بکەن. رێزداران و سەرکردەی خەڵکان لەمزگەوت مانەوە و کەسانی دیکە ڕۆشتن.

عەمرۆ کوڕی حورەیس کە لەو کاتەدا جێگری سەعید بوو، ڕۆشتە سەر مینبەر، سپاسی خوای کرد و وتی: نیعمەتەکانی خواوەندتان لەبیر بێت، دوژمنی یەکتر بوون و دڵتانی لەیەك نزیك کردەوە. لەسێبەری نیعمەتەکانی خواوەند بوونە برای یەك دوای ئەوەی لەسەر لێواری چاڵی ئاگر بوون، رزگاری کردن. بەرەو شەڕ و گومرایی مەڕۆن چوونکە خواوەند رێگەی ئەو کارەی لێگرتوون. بەبێ ئیسلام و سوونەت و رێنیشاندان، راستییەکان ناناسن و لێی دوور دەکەونەوە.

قەعقاع کوڕی عەمرۆ وتی: دەتەوێت رێگە لەلافاو بگریت؟ کەواتە رێگە لەئاوی فورات بگرە. سوێند بەخوا ئەم کارە تەنیا بەشمشێر ئارام دەبێتەوە. بەم زووانە شمشێرەکان لەکالان دەردێن بەڵام خواوەند بۆ ئەم کارەیان نەیانبەخشێت. خۆڕاگر بە.

وتی: خۆڕاگری دەکەم. بۆ ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە و کۆشکی بەجێهێشت.

یەزید کوڕی قەیس ڕۆشت و لەجورعە مەنزڵی گرت. ئەشتەر هاورێیەتی دەکرد. سەعید لەرێگە وەستا بوو. کاتێك خەڵکان لەجورعە ئوردوویان لێدابوو، دەرکەوت. پێیان وت: تۆمان ناوێت.

وتی: بۆ لێرە کۆبوونەتەوە؟ ئەوەندە بەس بوو کەسێك بۆ لای سەروەری باوەڕداران بنێرن و کەسێك لەسەر رێگەی من دانێن، ئایا هەزار کەسی ئاوزدار تەنیا

بۆ یەك كەس لێر كۆدەبنەوە. ئەمەی وت و گەڕایەوە.

كۆیلەكەی سەعیدیان بینی كەسوار لەسەر وشترێك بوو. كۆیلەی شەكەت وتی: سوێند بەخوا شیاو نەبوو سەعید بگەڕێتەوە. ئەشتەر ئەوی كوشت.

سەعید گەڕایەوە بۆ لای سەروەری باوەڕداران و لەپێشهاتەكە ئاگاداری كردەوە.

عوسمان كوڕی عەفان وتی: خوازیاری چین؟ ئایا سەرپێچی فەرمانەكان دەكەن؟

وتی: وایان نیشان دەدا خوازیاری گۆڕانكاری بن.

وتی: كێیان دەوێت.

وتی: باوكی موسا.

وتی: باوكی موسا دەكەینە كارگوزاری ئەو شارە، سوێند بەخوا بیانو بەدەست كەس ناهێڵینەوە. ئەو كارە دەكەین تا چیتر بیانو و پاساویان نەبێت. وەك فەرمانیان پێداوین، خۆڕاگری دەكەینە پیشە تا دەگەینە ئەو شوێنەی ئەوان خوازیارن پێی.

دوای ئەوە كەسانێك كەشوێنی كارەكەیان لەكوفەوە نزیك بوو، گەڕانەوە. جەریر لەقرقیسیا و عوتەیبە لەحیلوانەوە گەڕایەوە.

باوكی موسا لەكوفە وتارێكیدا و وتی: ئەی خەڵكینە، بۆ ئەم كێشەیە مەڕۆنەدەر و چاوپۆشی لەو كارە بكەن، هاوئاهەنگی خەڵكان و خۆتان دوور مەخەنەوە. لەپەلە كردن خۆتان بەدوور بگرن. خۆڕاگر بن چوونكە ئەمیرێكتان دەبێت.

وتیان: ببە بەپێشنوێژی ئێمە.

وتی: بەو مەرجەی گوێرایەڵ و ملكەچی فەرمانەكانی عوسمان كوڕی عەفان بن.

عەلا كوڕی عەبدوللە دەڵێت: دەستەیەك لە موسوڵمانان كۆبوونەوە و سەبارەت بەكار و كردەوەكانی عوسمان كوڕی عەفان و كارگوزارەكانی قسەیان كرد و بڕیاریاندا كەسێك بنێرن تا قسەی لەگەڵ بكات و ئەو دیاردانەی لەئیسلامدا هاتۆتە كایەوە، بیری بخاتەوە. بۆ ئەم مەبەستە عامر كوڕی عەبدوللەی تەمیمی عەنبەری كە بەعامر كوڕی عەبدقەیس بەناوبانگ بوو، ڕەوانەیان كرد و ڕۆشتە لای عوسمان كوڕی عەفان و وتی: كەسانێك لە موسوڵمانان كۆبوونەتەوە و لێكۆڵینەوەیان لەكار و كردەوەكانی تۆ كردووە، گەشتوونەتە ئەو دەرئەنجامەی كاری سەیر و سەرسوڕهێنەر ئەنجام دەدەیت. لەخواوەند بترسە و لەپێشگای ئەودا تۆبە بكە و لەو

کارانە خۆت بەدوور بگرە.

عوسمان کوڕی عەففان وتی: سەیری ئەم پیاوە بکەن خەڵکان گومان دەکەن قورئان خوێنە، دێت و سەبارەت بەشتە کەم بایەکان لەگەڵ من دەدوێت، بەلام سوێند بەخوا نازانێت خوا لەکوێیە؟

عامر وتی: من نازانم خوا لەکوێیە؟

وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا نازانی خوا لەکوێیە؟

وتی: بۆنا، سوێند بەخوا دەزانم خواوەند بۆسەی داناوە.

عوسمان کوڕی عەففان کەسی بەدوای معاویە کوڕی ئەبوسوفیان و عەبدوللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح و سەعید کوڕی عاس کوڕی وائیلی سەهمی و عەبدوللە کوڕی عامر نارد تا سەبارەت بەداخوازی ئەوان و ئەو پێشهاتە تازانە راوێژیان لەگەڵ بکات. کاتێك لەدەوری ئەو کۆبوونەوە، وتی: هەر خەلیفەیەك چەندین وەزیر و راوێژکاری هەیە. ئێوە وەزیر و راوێژکار و بڕواپێکراوانی منن. لەکارو کردەوەی خەڵکان ئاگادارن، داوایان لێکردووم کارگوزارانی خۆم لەسەر کار لاببەم و لەو شتانەی ئەوان پەسەندی ناکەن، پەشیمان ببمەوە، بیربکەن و من لەبۆچوونەکانی خۆتان ئاگادار بکەنەوە.

عەبدوللە کوڕی عامر وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆچوونی من ئەوەیە فەرمانی جیهادیان پێ بدەیت تا سەرقاڵ بن و لەجەنگەکاندا بەشدارییان پێ بکەیت تا ریسوا بن و بیر تەنیا لەخۆیان و رزگاری کردنی ژیانی خۆیان بکەنەوە و هیچ ئەندێشەیەك جگە لەبرینی پشتی چوارپێ و ئەسپێی پێستی خۆیان لەسەردا دروست نەبێت.

عوسمان کوڕی عەففان رووی کردە سەعید کوڕی عاس و وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر بۆچوونی من دەپرسیت، ئەم دەردە لەکۆڵ خۆت بکەرەوە و ئەو ڕەگەی لێی دەترسیت، بیقرتێنە، بۆچوونەکەی من بەکار ببە چوونکە سەرکەوتن بەدەست دێنیت.

وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: هەردەستەیەك ڕێبەرێکی هەیە و کاتێك لەناو بچن، ئەو دەستەیە بلاوەی

لێدەکات و چیتر ناتوانن یەکبگرنەوە.

عوسمان کوڕی عەففان وتی: بۆچوونێکی پەسەندە ئەگەر لەدەرئەنجامەکانی نەترسین. رووی کردە معاویە و پرسی: بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆچوونی من ئەوەی کارگوزارەکانی خۆت بگەڕێنیتەوە تا کاروباری ناوچەکانی خۆیان سامان بدەن، من بەڵێنی ڕێکخستنی کاروباری ناوچەکەی خۆم دەدەم.

رووی کردە عەبدوللە کوڕی سەعد و پرسی: بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆچوونی من ئەوەیە خەڵکان تەماحکارن، لەسامانی ئەم دنیایان بخەرە بەردەست تا دڵیان لەگەڵ تۆ نەرم ببێت.

رووی کردە عەمرۆ کوڕی عاس و وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: بۆچوونی من ئەوەیە خەڵکانێك بۆ رازی بوون بەو کارانە ناچار کردووە کەپەسەندی ناکەن، باشتر میانڕەوی بکەیتە پیشە، ئەگەر ناتەوێت بڕیاری بدە دەست لەکار بکێشیتەوە، ئەگەر ناخوازیت، بڕیارێکی دیکە بگرە.

عوسمان کوڕی عەففان وتی: بۆ جلەکانت ئەسپێ تێیداوە؟ ئەمە بەراست دەڵێیت؟

عەمرۆ کوڕی عاس ماوەیەك بێدەنگ بوو، کاتێك بلاوەیان لێکرد وتی: سوێند بەخوا ئەی سەروەری باوەڕداران! بەبڕوای من ئازیزتر لەوەیت بەلاّم دەمزانی وتەکانی ئێمە بەگوێی خەڵکان دەگاتەوە. ویستم وتەکانم بەگوێی خەڵکان بگاتەوە بۆ ئەوەی ببمە کەسێکی بڕواپێکراوی ئەوان و بەمشێوەیە بتوانم خێر لەتۆ نزیك وبەلاّکان لەتۆ دوور بکەمەوە.

عەبدولمەلیك کوڕی عومەیری زوهری دەڵێت: عوسمان کوڕی عەففان سەرکردەکانی سوپا، معاویە کوڕی ئەبوسوفیان، سەعید کوڕی عاس و عەبدوللە کوڕی عامر، عەبدوللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح و عەمرۆ کوڕی عاسی کۆکردەوە و وتی: لەبۆچوونی خۆتان سەبارەت بەو خەڵکانەی دژایەتی من دەکەن، ئاگادارم بکەنەوە.

معاویە وتی: بۆچوونی من ئەوەیە فەرمان بەسەرکردەکانی سوپا بدەیت هەرکام لەوان ناوچەکەی خۆی بپارێزێت. من بەڵێنی پاراستنی خەڵکانی شام دەدەم.

عەبدوللە کوڕی عامر وتی: بۆچوونی من ئەوەیە بەجەنگەکانەوە سەرقاڵیان بکەیت بۆ ئەوەی تەنیا بیر لەبرینی سەر پشتی ئەسپەکانیان و چوارپێی لەشی خۆیان بکەنەوە و لەپڕوپاگەندە دژی تۆ دوور بکەونەوە.

عەبدوللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح وتی: بۆچوونی من ئەوەیە بزانیت هۆکاری تووڕە بوونی ئەوان چییە و دڵیان بەدەست بێنیت، دواتر سامانی خواوەند لەناو ئەواندا دابەش بکە.

عەمرۆ کوڕی عاس هەستا و وتی: ئەی عوسمان کوڕی عەفان، منداڵەکانی ئومەییەت بەسەر عەرەبەکاندا زاڵ کردووە، دەڵێیت و وتوویانە: ستەم دەکەیت و ستەمکاری دەکەن، دادپەروەری بکەرە پیشە ئەگەر بەمە رازی نابیت، بڕیارێکی دیکە بگرە.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: بۆ جلەکانت ئەسپێی تێیداوە، ئایا بەراستە؟

عەمرۆ ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو. کاتێك ئەو دەستەیە بلاوەیان لێکرد، وتی: سوێند بەخوا ئەی سەروەری باوەڕداران لەهەموو کەس لای من ئازیزتریت، بەلام دەمزانی کەسانێك گوێیان هەڵخستووە و دەزانن تۆ ئێمەت بۆ راوێژ کردن کۆکردۆتەوە. ویستم وتەکەی من بەگوێی ئەوان بگات و بتوانم بەمشێوەیە خراپە و شەڕ لەتۆ دوور بکەمەوە.

عوسمان کوڕی عەفان کارگوزارەکانی بۆ شوێنی کارەکانیان گەڕاندەوە و فەرمانی پێدان، لەگەڵ نەیارەکانیان لەشوێنەکانی ژێر دەسەلاتی خۆیان، رێگەی توندوتیژ بگرنەبەر. هەروەها فەرماندیدا ماوەی مانەوەی خەڵکان لەناو سوپا درێژ بکەنەوە و بڕیاریدا مانگانەکانیان ببڕێت تا شوێنکەوتەو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن و نیازمەندی ئەو. سەعید کوڕی عاسی بۆ کوفە گەڕاندەوە. بەلام خەڵکانی کوفە بەسیلاحەوە رووبەرووی بوونەوە و ئەویان گەڕاندەوە. وتیان: نا، سوێند بەخوا تا ئەو کاتەی شمشێرمان بەدەستەوە، نابەدڵ کەس ناکەنە ئەمیری ئێمە.

باوکی یەحیا عومەیر کوڕی سەعدی نەخەعی دەڵێت: دەڵێی ئەشتەر، مالك کوڕی حارسی نەخەعی دەبینم کەروخساری تەپوتۆزاوی و شمشێر بەدەست دەیوت: سوێند بەخوا تا ئەو کاتەی شمشێرمان بەدەستەوەیە، نایێتە ناو کوفە. مەبەستی سەعید بوو و ئەمە لەرۆژی جورعە روویدا. جورعە شوێنێکی بەرزە لەنزیك

قادسیە کەخەڵکانی کوفە لەوێ ڕووبەڕووی سەعید بوونەوە.

کوڕی سەوری حەدائی دەڵێت: ڕۆژی جورعە کەخەڵکان بەو شێوەیە لەگەڵ سەعید کوڕی عاس جووڵانەوە، ڕۆشتمە لای حوزەیفە کوڕی یەمان و باوکی مەسعود عوقبە کوڕی عەمرۆی ئەنساری. لەمزگەوتی کوفە دانیشتبوون. باوکی مەسعود ئەم ڕووداوەی بەگەورە دەزانی و دەیوت: بەبڕوای من ئەو ناگەڕێتەوە مەگەر ئەوەی خوێن برژێت.

حوزەیفە وتی: سوێند بەخوا دەگەڕێتەوە و بەئەندازەی نەخۆشی مانگانەی ژنێك، خوێن نارژێت. ئەوەی ئێستا دەیزانم کاتێك محەممەد پێغەمبەر(د.خ) بوو، دەمزانی کەکەسێك بەرەبەیان موسوڵمانە و لەکاتی شەو موسوڵمان نییە و لەگەڵ موسوڵمانان دەجەنگێت و ڕۆژی دواتر خواوەند دەیکوژێت... و خوێنی بەفیڕۆ دەڕوات.

دەڵێت: بەباوکی سورم وت: ئەگەری هەیە ئەوە ڕوویدابێت.

وتی: نا، سوێند بەخوا هێشتا ڕووی نەداوە.

کاتێك سەعید کوڕی عاس بۆ لای عوسمان کوڕی عەفان گەڕایەوە، باوکی موسای وەك فەرمانڕەوای کوفە نارد و خەڵکان پێی ڕازی بوون.

واقد کوڕی عەبدوللە دەڵێت: لەڕۆژی ئاژاوەکە عەبدوللە کوڕی عومەیری ئەشجەعی لەمزگەوتا وەستا و وتی: ئەی خەڵکینە! بێدەنگ بن، لە پێغەمبەری خوام بیست دەیفەرموو: هەرکەس شۆڕش بکات و خەڵکان ئیمامیان (پێشەوا)هەبێت، سوێند بەخوا نەیوت دادپەروەر، هەرکەسێکە خوێنی بڕێژن.

تەڵحە دەڵێت: کاتێك یەزید کوڕی قەیس لەخەڵکان دژی سەعید کوڕی عاس داوای هاوکاری دەکرد، باسی عوسمان کوڕی عەفانی هێنایە ئاراوە، قەعقاع کوڕی عومەر پەلاماریدا و وتی: چیت دەوێت؟ مەگەر دەتوانی ئێمە لەسەر کار لاببەیت؟

وتی: نە، بەڵام ئایا هیچ ڕێگە چارەیەك ماوە؟

وتی: نە.

وتی: کەواتە دەست لەکار بکێشەرەوە.

یەزید هاوەڵانی خۆی لەوێ برد سەعیدیان گەڕاندەوە و خوازیاری باوکی موسا

بوون. عوسمان کوڕی عەفان نامەی بۆ نووسین:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

بەڵام دواتر، ئەو کەسەی داواتان کرد، وەك ئەمیری ئێوە دەستنیشانم کرد و سەعیدم لەئێوە دوور خستەوە، سوێند بەخوا مەبەستی خۆم دەخەمە ژێر دەست و پێی ئێوە و لەبەرابەر ئێوە خۆڕاگری دەکەمە پیشە و بۆچاکسازی ئێوە هەوڵ دەدەم، ئەوەی گوناحی خواوەندی تیا نەبێت، داوای بکەن، هەرکەس پەسەند ناکەن، دووری دەخەینەوە. ئەگەر نەبێتە هۆی سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خواوەند، ئەوەی بخوازن ئەنجامی دەدەین تا دژی من هیچ بەڵگەیەکتان بەدەستەوە نەبێت.))

نامەیەکی هاوشێوەی بۆ ویلایەتەکانی دیکە نووسی.

دواتر فەرمانی فەرمانڕەوایی باوکی موسا و جەنگی حوزەیفەی نووسی. باوکی موسا فەرمانڕەوایی دەستپێکرد. کارگوزاران بۆ شوێنی کارەکانی خۆیان گەڕانەوە و حوزەیفە بەرەو باب بەڕێکەوت.

بەڵام واقدی لە محەممەد دەگێڕێتەوە: کاتێك ساڵی سی و چوارەم دەستی پێکرد، هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) نامەیان بۆ یەك نووسی: کۆببنەوە چوونکە ئەگەر خوازیاری جیهادن، لێرەیە. خەڵك سەبارەت بە عوسمان کوڕی عەفان قسەیان دەکرد و قێزەونترین وتەکانیان دەهێنایە سەرزمان، هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەیانبینی و دەیانبیست بەڵام کەس ڕێگەی ئەو کارەی لێنەدەگرتن وکەس بەرگری لە عوسمان کوڕی عەفان نەدەکرد جگە لەچەند کەسێك: زەید کوڕی سابت، باوکی ئەسدی ساعدی ، کەعب کوڕی مالك و حسان کوڕی سابت.

دەڵێت: خەڵکان کۆبوونەوە و لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب قسەیان کرد. ئەو ڕۆشتە لای عوسمان کوڕی عەفان و وتی: خەڵك شوێن من کەوتوون و سەبارەت بەتۆ قسە دەکەن، سوێند بەخوا نازانم چی بەتۆ بڵێم، شتێك نازانم کەنەیزانیت و ناتوانم لەشتێك ئاگادارت بکەمەوە کەلێی بێ ئاگا بیت. ئەوەی ئێمە دەیزانین، تۆیش دەیزانیت. هیچ زیاتر لەتۆ نازانین کەتۆی لێ ئاگادار بکەینەوە. تۆ بینیوتەو بیستووتە و هاوەڵ و هاودەمی پێغەمبەر(د.خ) و زاوای ئەویت. ئەبوبەکر بۆ ئەم کارە لەتۆ شیاوتر نەبوو. کوڕی خەتاب بۆ چاکەکاری لەتۆ شیاوتر نەبوو چوونکە پەیوەندی خزمایەتی تۆ لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەهێزتر و نزیکترە. لەخزمایەتی

لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) پێگەیەکت پێبڕاوە کەس نەیتوانی بەدەستی بێنێت و کەس پێش تۆ نەکەوت. خواوەندا، خواوەندا، ئاگات لەخۆت بێت چوونکە ناتوانیت سۆمای چاو بۆ کوێر بگەڕێنیتەوە و زانست فێری نەزان بکەیت. ڕێگە ئاشکرایە و نیشانەکانی دین سەقامگیر. بزانە ئەی عوسمان، باشترینی بەندەکانی خواوەند پێشەوایەکی دادپەروەرە کەرزگاری بێت و رزگار بکات و سوونەتە ئاشکراکان زیندوو بکاتەوە و دیاردە ناڕەواکان لەناو ببات. سوێند بەخوا هەموو شتێك ئاشکرایە، سوونەتەکان سەقامگیرە و نشانەی هەیە، دیاردە تازەکان بوونیان هەیە و نیشانەیان هەیە. خراپترینی خەڵکان لای خواوەند پێشەوایەکی ستەمگەرە کەگومڕا بێت و گومڕا بکات و سوونەتە ئاشکراکان بمرێنێت و دیاردە ناڕەواکان زیندوو بکاتەوە. لەپێغەمبەرەم بیست دەیفەرموو: ڕۆژی هەستانەوە پێشەوای ستەمگەر دەهێنن کەنەهاوەڵی هەیە و نەبەڵگە و پاساو و دەیخەنە ناو ئاگری جەهەننەم و لە جەهەننەمدا دەسووڕێتەوە بەهەمان شێوە کەئاش دەسووڕێتەوە. دواتر لەقووڵاییەکانی جەهەننەم ڕۆدەچێت. تۆ لەئازاب و سزا خواییەکان دەترسێنم چوونکە ئازابی خواوەند دژوارە و مەترسیدار، با پێشەوای کوژراوی ئەم خەڵکە نەبیت چوونکە دەڵێن لەناو ئەم ئۆمەتە پێشوایەك دەکوژرێت و بەمشێوەیە تا ڕۆژی هەستانەوە کوشت و کوشتار لەناو ئەم خەڵکە بەردەوام دەبێت و کاروبارەکانی خەڵك پەرێشان و ئاڵۆز و بڵاو دەبنەوە و لەراستییەکان دوور دەکەونەوە و کارە فێرۆەکان جێگەی کارە چاکەکان دەگرنەوە. خەڵکان لەخراپەکاریدا ڕۆدەچن.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: دەزانم ئەوەی باسی دەکەیت، خەڵکانیش باسی دەکەن بەلاّم ئەگەر تۆ لەجێگەی من دەبوویت، نەسەرکۆنەم دەکردی، نەتەسلیمم دەکردی و نەرەخنەم لێ دەگرتی. ناڕەوام نەکردووە کەرێز لەپەیوەندییە خزمایەتییەکان دەگرم و نیازەکان بەراوەردە دەکەم و پەنا بەسەرگەردانەکان دەدەم و کەسانی هاوشێوەی کەسەکانی عومەر کوڕی خەتاب وەك کارگوزاری خۆم دەستنیشان دەکەم. ئەی عەلی، سوێندت دەدەم بەخوا، دەزانی موغەیرە کوڕی شوعبە لەوێ نییە؟

وتی: بەڵێ.

وتی: دەزانی عومەر کوڕی خەتاب ئەوی وەك کارگوزاری خۆی دەستنیشان کرد؟

وتی: بەڵێ.

وتی: کەواتە بۆ سەرکۆنەی من دەکەیت کەکوڕی عامرم بۆ ئەنجامدانی کارەکان راسپاردووە کەخزمی خۆمە.

عەلی وتی: دەزانی عومەر کوڕی خەتاب کاتێك کەسێکی بۆ کارێك رادەسپارد ئەگەر کارێکی ناڕەوای لێ دەبینی یا دەبیست، سزای دەدا، بەڵام تۆ ئەو کارە ناکەیت، لەبەرەدەم خزمەکانت لاوازیت.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: ئەوان خزمی تۆیشن.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەوان خزمی نزیکی منن، بەڵام کەسانی دیکە لەپێشترن.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: دەزانی عومەر کوڕی خەتاب لەهەموو ماوەی خەلافەتی خۆی معاویەی بۆ ئەنجامدانی کارەکانی راسپاردبوو، منیش ئەو کارەم کردووە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: سوێند بەخوا دەزانی معاویە بەرادەیەك لەعومەر کوڕی خەتاب دەترسا کەیەرفای کۆیلەی لێی دەترسا.

وتی: بەڵێ.

عەلی وتی: بەڵام معاویە ئێستا بێ راوێژ کردن بەتۆ رێگە چارە بۆکاروبارەکان دادەنێت و تۆ بەمە دەزانیت. دەڵێت: ئەمە فەرمانی عوسمان کوڕی عەفانە دەبیستیت بێ ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەیت.

عەلی لەماڵی عوسمان هاتەدەر. عوسمان کوڕی عەفان بەدوای ئەو هاتەدەر و ڕۆشتە سەر مینبەر و وتی: بەڵام دواتر، هەر شتێك زیانێکی هەیە و هەر کارێك بەڵایەك. زیان و بەڵای ئەم ئۆمەتە رەخنەگەر زمان درێژەکانن کە بەرووکەش خۆیان بەنزیك دەزانن بەڵام لەناخەوە مەبەستی جیاوازیان هەیە. دەڵێن و دەڵێن و هاوشێوەی وشترمر شوێن یەکەم دەنگ دەکەون، حەزیان لەشوێنی ئاوخواردنەوەی دوورە. تەنیا ئاوی لێڵ دەخۆنەوە و تەنیا بەقوڕاو رازی دەبن. کەس بەرێگەی ئەواندا ناڕوات. بۆ کارەکان ناتەوانن و لەکاروان بەجێ ماون. سوێند بەخوا بۆ ئەو کارانە رەخنە لەمن دەگرن کە لەکاتی عومەر کوڕی خەتاب پەسەندتان دەکرد. چوونکە

بەشەق تێی هەڵدەدان و شەقەزللەی دەکێشا بەروخسارتانا و بەزمان دەیچزاندن. بەهەموو شتێکی خۆش و ناخۆشی ئەو رازی دەبوون. من بەشێوەیەکی نەرم و نیان لەگەڵ ئێوە دەجووڵێمەوە ودەست و زمانم لەئێوە دوور خستەوە بەمشێوەیە لەبەرابەر من بوێر بوون. سوێند بەخوا لایەنگرانی من بەهێزتر و هاوەڵانی من نزیکتر و ژمارەمان فراوانترە و شیاوتر. ئەگەر بڵێم وەرن، دێن. هاوتاکانی خۆتانم بۆ رووبەروو بوونەوەی ئێوە ئامادە کردووە زیاتر لەخۆتان. تورەیی خۆم نیشاندان کەعادەتم نەبوو، ئەو وتانەم هێنایە سەرزمان کەپێشتر نەمهێنابوو. زمانتان لەئەمیرەکانی خۆتان دوور بخەنەوە و سەرکۆنە و تانەیان لێ مەدەن. سوێند بەخوا کەسێکم لەئێوە دوور خستۆتەوە کەئەگەر لەگەڵ ئێوە قسەی دەکرد تەنیا بەم قسانە لێی رازی دەبوون، چ مافێك لەئێوە زەوت کراوە؟ سوێند بەخوا ئەو تاوانەی من نییە ئەو کارانە ئەنجام دەدەم کەپێشینانی من کردوویانە و دژایەتی ئەوانتان نەدەکرد. شتێك لەم سامانە زیادی کردووە، بۆ ماڤ ئەوەم نییە بەو شێوەی دەخوازم بەکاری ببەم؟ کەواتە بۆ بوومەتە خەلیفەی ئێوە؟

مەروان هەستا و وتی: سوێند بەخوا ئەگەر دەخوازین کێشەی خۆمان و ئێوە بەشمشێر دەسپێرین. سوێند بەخوا ئێمە و ئێوە بەو شێوەین کەشاعیر دەڵێت:

ئابرووی خۆمان خستە ژێر دەست و پێی ئێوە

شوێنی خەوتان دوور کەوتەوە و لەسەر خۆڵ و خاشاك بناغەتان داڕشت.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: بێدەنگ بە، بۆ لەمبارەو قسە دەکەیت؟ من و هاوەڵانم بەجێبێڵە، مەگەر نەموت نابێت قسە بکەیت.

مەروان بێدەنگ بوو. عوسمان کوڕی عەفان لەمینبەرەکەی هاتەخوار.

## ساڵی سی و پێنج دەستی پێکرد

## ڕووداوە گرنگەکانی ساڵی سی و پێنج

یەکێك لەرووداوەکانی ئەم ساڵە هاتنی میسرییەکان بۆ زی خەشب بوو.

باوکی مەعشەر دەڵێت: ڕووداوی زی خەشب لەساڵی سی وپێنج روویدا. واقدیش بەمشێوەیە دەڵێت.

## گێڕانەوەی ڕۆشتنی میسرییەکان بۆ زی خەشب و هۆکاری ڕۆشتنی عێراقییەکان بۆ زو ئەلمورە

یەزیدی فەقعەسی دەڵێت: عەبدوللە کوڕی سەبای جولەکە یەکێك بوو لەخەڵکانی سەنعا و دایکی، کەنیزێکی ڕەش پێست بوو. ئەو، لەرۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان باوەڕی بەئیسلام هێنا و بەولایەتە موسوڵمان نشینەکاندا دەگەڕا و مەبەستی گومڕا کردنی ئەوانی لەسەردا پەروەردە دەکرد. لەحیجازەوە دەستی پێکرد، دوواتر رووی کردە بەسرە، کوفە و دوای ئەو دوو شارە، رووی کردە شام. بەڵام لای هیچ کام لەخەڵکانی شام نەیتوانی بەمەبەستەکەی خۆی بگات. ئەویان لەشام دەرکرد و رووی کردە میسر و لەوێ نیشتەجێ بوو. یەکێك لەو وتانەی بەخەڵکانی میسری دەوت ئەمە بوو: سەیرە کەسانێك دەڵێن عیسا دەگەڕێتەوە بەڵام رازی نابن بەوەی محەممەد بگەڕێتەوە لەکاتێکدا خواوەند لەقورئاندا فەرموویەتی:

((ان الذی فرض علیك القرآن لرادك الی معاد.

واتاکەی: ئەوەی راگەیاندنی ئەم قورئانەی بەتۆ سپارد، بۆ شوێنی گەڕانەوە دەتباتەوە.))

کەواتە محەممەد لەعیسا بۆ گەڕانەوە شیاوترە. بەمشێوەیە گەڕانەوەی بۆ خەڵکانی میسر شیکردەوە و لەوبارەوە دەپەیڤی. وتی: هەزار پێغەمبەر هاتوون و هەر پێغەمبەرێك جێگرێکی بوو. عەلی جێگری پێغەمبەرە.

وتی: محەممەد کۆتایی پێغەمبەرەکانە، عەلیش خاتەمی جێگرەکان. دوای ئەوە وتی: ئەو کەسەی وەسیەتەکەی پێغەمبەری ئەنجام نەدا و دژی عەلی راپەڕی و کاروباری ئەم خەڵکەی گرتەدەست، لەهەمووان ستەمگەرترە.

وتی: عوسمان کوڕی عەفان بەشێوەیەکی ناڕەوا دەستی بەسەر خەلافەتدا گرت. هەنووکە جێگری پێغەمبەر(د.خ) ئامادەیە. بۆ ئەم کارە شۆڕش بکەن و گۆڕنکاری بێننە کایەوە. سەرەتا خراپەی ئەمیرەکانی خۆتان بێننە سەرزمان و بەریا خۆتان بەکەسانی چاکەکار و رێگر لەخراپەکاری نیشان بدەن تا خەڵکان ئارەزوومەندی کۆبوونەوە لەدەوری ئێوە بن و پێشنیاری ئەم کارەیان پێ بکەن.

بانگەشەکەرانی خۆی بۆ هەموو سووچ و کەنارەکان ڕەوانە کرد و بۆ ئەو کەسانەی لەویلایەتەکان ئەوانی گومڕا کردبوو، نامەی نووسی. ئەوانیش وەڵامی نامەکانیان دایەوە و بەشێوەیەکی نهێنی مەبەستەکانی خۆیان ئاڵوگۆڕ دەکرد بەڵام بەرواڵەت خۆیان بەکەسانی چاکەکار و رێگر لەخراپەکاری نیشان دەدا.براکانیشیان بەمشێوەیە نامەیان بۆ نووسیبوون. خەڵکی هەر ویلایەتێك کاروباری ویلایەتەکەی خۆی بۆ ویلایەتەکانی دیکە دەنووسی و لەو ویلایەتانە دەخوێندرایەوە. ئەم کارە بەمەدینەیش گەیشت و لەهەموو شوێنێك پڕوپاگەندەیان بڵاو کردەوە. مەبەستیان لەوەی دەیانهێنایە سەرزمان، جیاواز بوو. ئەوەی دەیانویست شتێکی دیکە بوو و ئاشکرایان نەدەکرد. خەڵکی هەر شارێك وتیان: ئێمە لەبەلا و زیانی شارەکانی دیکە ئاسوودەین. خەڵکانی مەدینە وتیان: ئێمە لەبەلا و زیانی هەموو خەڵکان ئاسوودەین.

تەڵحە دەڵێت: کەسانێك ڕۆشتنە لای عوسمان کوڕی عەفان و وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئایا ئەو هەواڵانەی بەئێمە دەگات، تۆیش دەیانبیستی؟

وتی: نا، سوێند بەخوا تەنیا هەواڵە دڵخۆشکەرەکان بەمن دەگات.

وتیان: ئەم هەواڵانە بەئێمە گەیشتووە و عوسمانیان لێ ئاگادار کردەوە.

وتی: ئێوە هاوبەش و شەریکی منن، بۆچوونی ئێوە چییە؟

وتیان: بۆچوونی ئێمە ئەوەیە کەسانی بڕواپێکراوی خۆت بۆ ویلایەتەکان بنێریت تا لەکارو چالاکییەکانی ئەم دەستەیە ئاگادارمان بکەنەوە.

عوسمان کوڕی عەفان، محەممەد کوڕی موسلیمەی بانگ کرد و ڕەوانەی کوفەی کرد، ئوسامە کوڕی زەیدی بۆ بەسرە نارد، عەمار کوڕی یاسری بۆ میسر ڕەوانە کرد. عەبدوللە کوڕی عومەر بۆ شام و کەسانێکی هاوشێوەی ئەوانی بۆ

ویلایەتەکانی دیکە ڕەوانە کرد. هەموویان پێش عەمار گەڕانەوە و وتیان: ئەی خەڵکینە، ئێمە هیچ شتێکی ناڕەوامان نەبینی و سەرکردەی موسوڵمانان و زۆرینەی خەڵکیش بەهەمان شێوە.

هەموویان وتیان: لەهەموو شوێنێك باسی موسوڵمانان دەکرێت و لەدادپەروەری ئەمیرەکانیان دەدوێن و سەرقاڵی کاری خۆیانن.

ماوەی گەڕانەوەی عەمار زۆری خایاند تا ئەو جێگەی گومانیان کرد کوژراوە. سەرەئەنجام نامەی عەبدوللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح گەیشت و ئاگاداری کردنەوە دەستەیەك لەمیسرییەکان ئەویان پەیوەستی خۆیان کردووە کە عەبدوللە کوڕی سەودا و خالید کوڕی مولجیم و سەودانم کوڕی حیمران و کەنانە کوڕی بیشر لەناویاندا دەبینرێن.

عەتییە دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان نامەی بۆ خەڵکی ویلایەتەکان نووسی:

بەڵام دواتر، فەرمانم بەکارگوزارەکانم داوە هەمووساڵێك لەکاتی حەج سەردانی من بکەن. لەسەرەتای خەلافەتی خۆت پێشنیاری چاکەکاری و ڕێگرتن لەخراپەکاریم کردووە، ئەوەی سکاڵا لەمن و کارگوزراکەم بەرزی بکەنەوە، جێبەجێ دەکەم، ماف خۆم و خێزانەکەم بەژێردەستەکان دەدەم. خەڵکانی مەدینە پێیان وتووم کەسانێك جوێنیان پێدەدرێت و لێیان دەدرێت، هەرکەس بەشێوەیەکی نهێنی لێدانی بەرکەوتووە یا جوێنی پێدراوە، لەکاتی حەج بێت و ماف خۆی وەربگرێت ئەگەر پەیوەندی بەمن و کارگوزارانی منەوە هەیە، یا بیانبەخشێت چوونکە خواوەند بەخشەرانی خۆش دەوێت.

کاتێك ئەم نامەیان لەولایەتەکاندا خوێندەوە، خەڵکان گریان و بۆ عوسمان کوڕی عەفان پاڕانەوە و وتیان: خەڵك گرفتاری بەلاَ بوون.

عوسمان کوڕی عەفان کەسی بەدوای کارگوزاری ویلایەتەکان ڕەوانە کرد کە عەبدوللە کوڕی عامر و معاویە کوڕی ئەبوسوفیان و عەبدوللە کوڕی سەعد هاتن و لەگەڵ ئەوان ڕاوێژی کرد. سەعید و عەمرۆیشی لەم ڕاوێژ کردنە بەشداری پێکرد و وتی: هاوار لەئێوە، ئەم سکاڵایانە لەچییە؟ ئەم پروپاگەندانە لەکوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ سوێند بەخوا دەترسم ئەم قسانەی دژی ئێوەی دەیهێننە سەرزمان، ڕاست بێت و ئەمە بەکاری من بزانن.

وتیان: مەگەر کەست ڕەوانە نەکرد؟ مەگەر هەواڵی ئەو دەستەیە بەتۆ نەگەیشت؟ مەگەر نەهاتن و کەس ڕووبەڕوو هیچی بەوان نەوت؟ نا، سوێند بەخوا ڕاست ناکەن و کەسانی ڕاستگۆ و چاکەکار و چاکەخواز نین. ئەم هەواڵانە لەڕاستییەوە دوورە. کەست دەستناکەوێت شتێکی دیار و ئاشکرا بێنێتە سەرزمان، هەرچی بێت، پڕوپاگەندەیە و نابێت ببیستی و گرنگی پێبدەیت.

وتی: بۆچوونی ئێوە چییە؟

سەعید کوڕی عاس وتی: ئەم هەواڵانە دەسکرد و درۆن و بەنهێنی ئامادەیان دەکەن. لای خەڵکانی بێ ئاگا باسی دەکەن بۆ ئەوەی لەکۆڕ و کۆبوونەوەکانی خۆیان بیگێڕنەوە.

وتی: چارە چییە؟

وتی: دەبێت ئەو دەستەیە بدۆزینەوە و هەموو ئەو کەسانەی هاوکارییان دەکەن، لەناو ببەین.

عەبدوللە کوڕی ئەبی سەرح وتی: کاتێك ماڧ خەڵکان دەدەیت، ئەوەی لەئەستۆی ئەواندایە، وەریبگرە چوونکە ئەمە لەپشتگوێ خستنیان خراپترە.

معاویە وتی: منت وەك یەکێك لەکارگوزارەکانی خۆت دەستنیشان کردووە و کەسانێکم بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکان راسپاردووە کە تەنیا هەواڵی چاکەی ئەوان بەتۆ دەگات. ئەم دوو پیاوە ناوچەکەی خۆیان باشتر دەناسن.

وتی: دەبێت چی بکەین؟

وتی: کردەوەی چاکە.

وتی: ئەی عەمرۆ، تۆ دەڵێی چی؟

وتی: بەبڕوای من بەشێوەیەکی نەرم و نیان لەگەڵ خەڵکان مامڵە دەکەیت و ڕێگەی سستی و لاوازیت گرتۆتەبەر، ئەوەی عومەر کوڕی خەتاب زیادی دیاری کردبوو، زیادت کرد، دەبێت ڕێچکەی دوو هاوڕێکەی خۆت بگریتەبەر و لەو شوێنەی کەپێویست دەکات توندوتیژی و لەو شوێنەی پێویست دەکات نەرمی لەخۆت نیشان بدەیت. دەبێت بەرپەرچی ئەو کەسانە بدەیتەوە کەخراپەخوازی خەڵکن و دەست لەکارەکانیان هەڵناگرن و کردەوەیەکی شیاو لەگەڵ چاکەکاران بنوێنیت بەڵام تۆ

لەگەڵ هەمووان زۆر بەنەرمی دەجووڵێیتەوە.

عوسمان کوڕی عەفان هەستا، سپاسی خوای کرد و وتی: ئەوەی باستان کرد، بیستم، هەرکارێك دەروازەیەکی هەیە کەلێی دەڕۆنە ژوور، ئەو شتەی لەروودانی بۆ ئەم ئۆمەتە دەترسن، لەبەردەمماندایە و ڕێگەی ڕووبەڕوو بوونەوەی نەرم و نیانی و ئاسانکارییە مەگەر ئەوەی دەستدرێژی بکرێتە سەر سنووره دیاریکراوه خواییەکان کەکەس ناتوانێت بەوە رازی بێت. ئەوەی بتوانێت ڕێگەیان لێ بگرێت، نەرمی نواندنەوە چوونکە کرانەوە و فراوانی بەدوواوە دێت.

کەس دژی من هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نییە. خواوەند دەزانێت لەچاکەخوازی بۆ خەڵکەکەی خۆم دوور نەکەوتوومەتەوە. سوێند بەخوا ئاشی ئاژاوە دەسوورێت، خۆزگە عوسمان بمرێت و بزوێنەری ئەو ئاشە نەبێت. ڕێز لەخەڵکان بگرن، مافەکانیان بۆ بگەڕێننەوە، بیانبەخشن بەڵام ئەگەر دەستدرێژییان کردە سەر سنووره خواییەکان، لێیان خۆش مەبن.))

دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان لەمەککەوە بەرێکەوت، معاویە و عەبدوڵلەی هێنایە مەدینە. کوڕی عامر و سەعید لەگەڵ ئەو گەڕانەوە. کاتێك عوسمان کوڕی عەفان بەرێکەوت، یەکێك لەکاروانەکەی هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((چوارپێ لەڕەکان زانیویانە

کەئەمیر دوای ئەو عەلی کوڕی ئەبی تالیبە

زوبەیر جێگرێکی شیاوە

تەڵحەیش بەهەمان شێوە.))

کەعب لەدوای عوسمان کوڕی عەفانەوە ڕێگەی دەبڕی، وتی: سوێند بەخوا دوای ئەو خاوەنی ئێستر دەبێتە ئەمیر. ئاماژەی بۆ معاویە کرد.

بەدر کوڕی خەلیلی ئەسەدی دەڵێت: دوای ئەوەی عوسمان کوڕی عەفان کارگوزارەکانی خۆی لەکاتی حەج کۆکردەوە و معاویە ڕۆشتە لای، بەردەوام چاوی تەماحی لەخەلافەت بڕیبوو.

دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان بەرێکەوت، یەکێك وتی:

((دوای ئەو عەلی ئەمیرە

و زوبەیر جێگرێکی شیاوە.))

بەڵام کەعب وتی: درۆت کرد، خاوەنی ئەسپە سپییەکە، دوای ئەو دەبێتە ئەمیر.
مەبەستی معاویە بوو. کاتێك ئەم هەواڵە بەمعاویە گەیشت، لەکەعبی پرسی کەوتی:
بەڵێ دوای ئەو خەلافەت دەگریتە دەست بەڵام سوێند بەخوا خەلافەت بەتۆ ناگات تا
ئەو کاتەی حاشا لەقسەکەی من بکەیت. ئەم وتەیە کاریگەری لەدڵی معاویە دانا.

رەجا کوڕی حەبوە دەڵێت: کاتێك سەروەری باوەڕداران گەیشتە مەدینە، ئەمیرەکانی بۆ شوێنی کارەکانیان گەڕاندەوە. هەموویان ڕۆشتن و سەعید دوای ئەوان بەجێما. کاتێك معاویەماڵئاوایی لە عوسمان کوڕی عەفان کرد، لای ئەو هاتەدەر، جل و بەرگی سەفەری لەبەردا بوو، شمشێری بەکەمەرەوە بەستبوو وکەوانێکی کردبووە شان. لای چەند کەسێك لەموهاجیرەکان گوزەری کرد. تەڵحە و زوبەیر و عەلی لەناویاندا دەبینران. لای ئەوان وەستا. سڵاوی کرد و پاڵی بەکەوانەکەی خۆیەوەدا و وتی: دەزانن سەردەمێك کەسان بەدوای گرتنەدەستی کاروباری خەلافەتەوە بوون و ئێوە هەرکام لەتایەفەی خۆتان کەسێکتان سەروەرتان بوو کەپشتی بەبۆچوونەکانی خۆی دەبەست و گرنگی بەکەس نەدەدا و لەگەڵ کەس راوێژی نەدەکرد تا ئەو کاتەی خواوەند پێغەمبەری ڕەوانە فەرموو و شوێنکەوتەکانی ئەوی رێزدار کرد و بوونە سەروەری موهاجیرەکان و کارەکە لەنێوان خۆیان بەراوێژ کردن ئەنجام دەدرا و ئەوەی پێشینیەی لەئیسلامدا درەوشاوە بوو، لەهەمووان بۆ ئەو کارە شیاوتر بوو. ئەگەر رێز لەم رێچکەیە بگرن، ئەم کارە لەدەستی ئەواندا دەمێنێتەوە و خەڵکان گوێڕایەڵ و شوێنکەوتەیان دەبن بەڵام ئەگەر گرنگی بەدنیا بدەن و تەنیا بیر لەبەدەست هێنانی خەلافەت بکەنەوە، لەدەستی دەدەن و خواوەند بەکەسێکی دەبەخشێت کەسەروەری خەڵکان بێت. لەمە بترسن چوونکە خواوەند توانای گۆڕانکاری هەیە و لەسەرزەمینەکەی خۆی ئەوەی بخوازێت، ئەنجامی دەدات. ئەمە پیرەپیاوەم لەناو ئێوە بەجێهێشت، چاکەخواز و شوێنکەوتەی ئەو بن چوونکە بۆ ئێوە سوودمەندترە تا بۆ خۆی. دواتر ماڵئاوایی لێکردن و ڕۆشت.

عەلی وتی: هەرگیز لەم پیاوە خێرم نەبینیوە.

زوبەیر وتی: نا، سوێند بەخوا هەرگیز لای ئێمە و تۆ لەمرۆی گرنگتر نەبووە.

موسا کوڕی تەڵحە دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان کەسی بەدوای تەڵحەدا نارد، منیش لەگەڵی ڕۆشتم تا گەشتینە لای سەروەری باوەڕداران، عەلی و سەعد و زوبەیر و عوسمان و معاویە پێکەوە بوون. معاویە بەشێوەیەکی شیاو سپاسی خوای کرد. وتی: ئێوە هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) و هەڵبژێردراوەکانی ئەون. سەروەری کاری ئەم خەڵکەن و کەس جگە لەئێوە چاوی تەماحی نەبڕیوەتە ئەم کارە، ئێوە هاوڕێکەی خۆتان بەبێ زۆر و تەماح هەڵبژارد، ساڵەکانی تەمەنی درێژ بۆتەوە، ئەگەر چاوەڕوانی مردنی ئەو دەکەن، زۆر ناخایەنێت هەرچەندە هیوادرام خواوەند ڕێزی بگرێت و بگاتە شوێنی مەبەست. پڕوپاگەندە بلاو بۆتەوە و دەترسم لەئێوەوە سەرچاوەی گرتبێت، لەئەستۆی مندایە گلەیی و گازندەکانی ئێوە لەو دوور بخەمەوە، تەماحی خەڵکان مەبزوێنن چوونکە ئەگەر تەماح بکەنە ئەو کارە، خەلافەت لەئێوە دوور دەکەوێتەوە.

عەلی وتی: ئەمە چ پەیوەندییەکەی بەتۆوە هەیە؟ ئەی بێ دایك، تۆ چی دەزانی؟

وتی: باسی دایکی من مەکە چوونکە خراپتر لەدایکی ئێوە نییە. باوەڕی هێنا و وتەکانی پێغەمبەری پشتڕاست کردەوە، وەلامی وتەکانی من بدەرەوە.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: برازاکەم ڕاست دەکات، من باسی خۆم و کارەکانم بۆ ئێوە دەکەم: دوو هاوڕێکەی پێش من، لە خۆیان و کەسەکانیان بەمەبەستی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خواوەند ستەمیان کرد، پێغەمبەر(د.خ) بەشی کەسە نزیکەکانی خۆی دەدا، من خزمی خێزاندار و هەژارم هەیە و بەهۆی ئەو کارانەی بۆ ئەم سامانە دەیکەم، کەمێك دەستبلاویم کردووە و گومان دەکەم ئەمە مافی خۆمە، ئەگەر ئەمە بەهەڵە دەزانن، وەریبگرنەوە چوونکە فەرمانی من شوێنکەوتەی فەرمانی ئێوەیە.

وتیان: ڕاستت وت و چاکەت هێنایە سەرزمان.

وتیان: عەبدوللە کوڕی خالید کوڕی ئەسەد و مەروانت لەبەخششەکانی خۆت بەهرەوەر کرد. دەیانوت بیست و پێنج هەزار بەمەروان و بیست و پێنج هەزار بەکوڕی ئەسید داوە. ئەم بڕە پارەیان لێ وەرگرتنەوە. ئەوان ڕازی بوون و کردەوەکانی عوسمانیان پەسەند کرد و ڕەزامەند چۆڵیان کرد.

سەیف دەڵێت: معاویە بەیانی ئەو ڕۆژەی ماڵئاوایی کردبوو، بەعوسمان کوڕی عەفانی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، پێش ئەوەی کەسانێك هێرش بکەنە سەرتۆ

و نەتوانی خۆڕاگری بکەیت، لەگەڵ من بۆ شام وەرە چوونکە خەڵکانی شام هێشتا گوێرایەڵی فەرمانەکانن.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: نزیك بوون لە پێغەمبەر(د.خ) بەهیچ شتێك ناگۆڕمەوە تەنانەت ئەگەر شادەمارەکەم بپڕن.

وتی: سوپایەك لەخەڵکانی شام بۆ لای تۆ دەنێرم تا ئەگەر پێشهاتێك روویدا، ئامادەبن.

وتیك رۆژی کەسانی نزیکی پێغەمبەر(د.خ) بەهۆی سوپایەك کەدەبێت لەمەدینە نیشتەجێ بێت، دژوار بکەم و خەڵکانی ماڵی کۆچ و سەرکەوتن گرفتاری دژوارییەکان بکەم؟

وتی: سوێند بەخوا ئەی سەروەری باوەڕداران، یا بەشێوەیەکی لەناکاو دەتکوژن، یا هێرشت دەکەنە سەر.

وتی: خواوەند پشتیوانی منە و بۆمن بەسە.

معاویە وتی: ئەی وشتر دابەشکەران! ئەی وشتر دابەشکەران لەکوێن؟ هاتەدەر و لای هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) وەستا، دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ شام.

دەڵێت: خەڵکانی میسر بۆ هاودەستەکانی خۆیان لەخەڵکانی کوفە و بەسرە نامەیان نوسیبوو تا دژی فەرمانڕەواکانی خۆیان ئاڵای شۆڕش بەرز بکەنەوە و رۆژی گەڕانەوەی فەرمانڕەواکانیان دیاری کردبوو بەڵام تەنیا خەڵکی کوفە ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە کەیەزید کوڕی قەیسی ئەرحەبی لەوێ راپەڕی وهاوەڵانی لەدەوری کۆبوونەوە. کاروباری جەنگی کوفە لەدەستی قەعقاع کوڕی عەمرۆدا بوو. هێرشی کردە سەریەزید و سوپاکە و دەوریاندان.

یەزید بەقەعقاعی وت: تۆ کارت بەمن و ئەم دەستەیە چییە؟ سوێند بەخوا گوێرایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانم. من و ئەم دەستە هاوڕای خەڵکانین. بەڵام من و ئەمانە خوازیاری لەسەر کار لابرانی سەعیدین و کەسە تایبەت و گەورەکان لەگەڵ زۆرینەی خەڵك هاوڕا دەبن.

وتی: ئەمە پەیوەندی بە سەروەری باوەڕدارانەوە هەیە. ئەوانی ئازاد کرد چوونکە هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نەبوو. دوای ئەوە رێگەی سەعیدیان گرت و

ئەویان لەجورعەوە گەڕاندەوە و خەڵکان لەدەوری باوکی موسا کۆبوونەوە. عوسمان کوڕی عەفان ئەوی کردە فەرمانڕەوای کوفە.

دەڵێت: کاتێك فەرمانڕەواکان گەڕانەوە، سەبائییەکان کەنەیاندەتوانی بڕۆنە ناو خەڵکی ویلایەتەکان، نامەیان بۆ هاودەستەکانی خۆیان لەخەڵکی ویلایەتەکان نووسی تا رووبکەنە مەدینە بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە لەکاروباری خۆیان بکەن. وایان نیشاندەدا کەسانێکی چاکەکارن و لە سەروەری باوەڕداران پرسیاری ئەو دەنگوباسانە دەکەن کە لەناو خەڵکاندا بلاّو بۆتەوە.

روویان کردە مەدینە و عوسمان کوڕی عەفان دوو پیاوی مەخزومی و زوهری نارد و وتی: بزانن چییان دەوێت و لەکارەکانی ئەوان ئاگادار ببنەوە. ئەم دووانە لەو کەسانە بوون کە سەروەری باوەڕداران ئەوانی تەمێ و سزادابوو، بەلاّم رێزیان لەراستی گرت و رق و کینەی عوسمان کوڕی عەفان لەدڵی ئەواندا گەرای نەچاند. کاتێك هاتنی ئەو دوو کەسەیان بینی، مەبەستەکەی خۆیان لای ئەوان باس کرد.

دوو نێردراوەکە وتیان: لەخەڵکانی مەدینە کێتان لەگەڵدایە؟

وتیان: سێ کەس.

پرسیان: ئایا جگە لەوان کەسی دیکە هەیە؟

وتیان: نە.

پرسییان: دەتانەوێت چی بکەن؟

وتیان: دەخوازین سەبارەت بەو شتانەی بیستوومانە پرسیار لەعوسمان بکەین، دواتر دەگەڕێینەوە بۆ لای خەڵکان و دەڵێین دانی بەتاوانەکانیدانا بەلاّم بێزاری دەرنەبڕی و تۆبەی نەکرد، دواتر بەمەبەستی حەج کردن بەرێدەکەوین و دوری دەگرین و لەسەر کار لایدەبەین و ئەگەر خۆڕاگری کرد، خوێنی دەرێژین. و سەرئەنجام بەمەبەستەکەی خۆیان گەیشتن.

ئەو دوو کەسە گەڕانەوە و عوسمان کوڕی عەفانیان لەمەبەستی ئەوان ئاگادار کردەوە. سەروەری باوەڕداران پێکەنی و وتی: خواوەندا، لەم کەسانە خۆش ببە، ئەگەر نەیانبەخشیت، بەدبەخت دەبن. عەمار هێرشی کردۆتە سەر عەباس کوڕی عوتبە کوڕی ئەبی لەهەب و لێی داوە. محەممەد کوڕی ئەبوبەکر بەرادەیەك لەخۆباییە گومان دەکات هیچ حەقێکی لەسەر شان نییە، کوڕی سەهلە گرفتاری زیاد دەبێت.

دواتر خەڵکانی کوفە و بەسرەی بانگ کردو بۆ نوێژ کۆبوونەوە. ئەوان لەبەردەم مینبەرەکەدا بوون. هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) هاتن و دەوری عوسمانیان گرت. ئەو، سپاسی خوای کرد و لەمەبەستی ئەو دەستەیە ئاگاداری کردنەوە و ئەو دوو پیاوە (نێردراوەکان) قسەیان کرد.

هەمووان وتیان: بیانکوژە چوونکە پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی کاتێك خەڵکان پێشەوایان هەیە هەرکەس داوای پێشەوایی بۆ خۆی یا کەسێکی دیکە بکات، خواوەند بەنەحلەتی بکات، بیکوژن. عومەر کوڕی خەتابیش وتوویەتی: ئێوە نابەخشم مەگەر ئەوەی بیکوژن و من شەریکی ئێوەم.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: دەیانبەخشم و لێیان خۆش دەبم و بۆ گەڕاندنەوەیان بۆ ڕێگەی راست تێدەکۆشم. ڕووبەڕووی کەس نابمەوە مەگەر ئەوەی ئامێز بۆ کوفر بکاتەوە. ئەوان شتی ئەوتۆیان هێناوەتە سەرزمان کەهاوشێوەی ئێوە لەراستییەکان ئاگادارن بەڵام وتوویانە لەو بارەوە دەیانەوێت لەگەڵ خۆم گفتوگۆ بکەن تا لای کەسانی نائاگا باری گوناحەکان و تاوانەکانی من بەگەورە نیشان بدەن، وتوویانە لەسەفەر نوێژی تەواوی خوێند و پێشتر ئەو کارەی نەدەکرد. بزانن من ڕۆشتمە شارێك کەبنەماڵەکەم لەوێ دەژیا، لەبەر ئەوە نوێژی تەواوم خوێند. ئایا بەمشێوەیە؟

وتیان: بەڵێ، بەڵێ.

دەڵێن: زەوی تایبەتی دروست کرد، سوێند بەخوا من ئەو کارەم نەکرد، پێشتر زەوییەکان تایبەت کرابوون، سوێند بەخوا دەستیان بەسەر زەوی کەسدا نەگرتووە، ئەو شتانەی تایبەت کرا لەدەستی خەڵکانی مەدینەدا بوو و دوای ئەوە قامیشەڵانی مسکێنەکان تایبەت کرا و تایبەت بوو بەچوارپێکانی زەکاتی موسوڵمانان. تایبەت کران بۆ ئەوەی لەنێوان لێپرسراوانی کۆکردنەوەی زەکات و کەسانی دیکە جەنگ و ئاژاوە دروست نەبێت و لەگەڵ ئەوەیشدا ڕێگەیان لەکەس نەگرت و کەسیان دوور نەخستەوە مەگەر ئەوەی پێچەوانەی ئەمان جووڵابێتەوە. خۆم زیاتر لەدوو وشترم نییە، نا گایەڵی وشترم هەیە و نەڕانە مەڕ. کاتێك خەلافەتم گرتەدەست لەهەموو عەرەبەکان زیاتر وشتر و مەڕم هەبوو و ئێستا هیچم نییە جگە لەدوو وشتر بۆ حەج، ئایا راستە؟

وتیان: بەڵێ، بەڵێ، راستە.

وتی: دەڵێن: قورئان چەندین دانە بوو و هەمووانی جگە لەیەك دانە لەناو برد. بزانن قورئان یەك دانەیە و یەك کەس ڕەوانەی فەرمووە و من لەم کارە شوێنکەوتەی ئەوانم. ئایا راستە؟

وتیان: بەڵێ. داوایان لێکرد بیانکوژێت.

وتی: دەڵێن: من حەکەمم گەڕاندەوە کە پێغەمبەر(د.خ) دووری خستبوویەوە. حەکەم یەکێکە لەدانیشتووانی مەککە، پێغەمبەر(د.خ) دووری خستەوە و خۆیشی ئەوی گەڕاندەوە، ئایا راستە؟

وتیان: بەڵێ.

وتی: دەڵێن گەنجەکانت بۆ ئەنجامدانی کاروبارەکان راسپاردووە. بەلاّم کاروبارەکانم بەکەسانێك سپارد کەشیاو و جێی ڕەزامەندی بوون، ئەوان لەناوچەکانی ئەوانەوە هاتوون. سەبارەت بەوان بپرسن. ئەوان دانیشتووانی ویلایەتەکانن، کەسی پێش من گەنجتر لەوانی بۆ راپەڕاندنی کاروبارەکان راسپارد. تۆمەتی دژوارەتر لەوەی منیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) هەڵبەست و سەبارەت بەدیاری کردنی ئوسامە کوڕی زەید زۆریان وت. ئایا راستە؟

وتیان: بەڵێ، بەڵێ.

وتی: ڕەخنە لەکەسان دەگرن و لەراستییەکان بێ ئاگان، من ئەو تالاّنییانەی کوڕی ئەبی سەرح بەدەستی هێناوە، پێم بەخشیوە. من یەك پێنجی پێنج یەکی تالاّنییەکانم پێ بەخشی کەیەك سەد هەزار بوو. ئەبوبەکر و عومەریش ئەو کارەیان دەکرد. سوپاییەکان بەمە رازی نەبوون و لێم وەرگرتەوە و لەناو خۆیاندا دابەشم کرد لەکاتێکدا مافی ئەوان نەبوو، ئایا راستە.

وتیان: بەڵێ.

وتی: دەڵێن من کەسانی بنەماڵەکەم خۆش دەوێت و بەخششەکانی خۆم تایبەت کردووە بەوان. ئەوەی ئەوانم خۆش دەوێت نەبۆتە هۆکاری هیچ ستەمێك بەڵکو مافی خۆیان پێ دەدەم و ئەوەی دەیبەخشم لەسامانی خۆم دەیبەخشم و ماڵی موسوڵمانان بۆ خۆم و هیچ کەسێکی دیکە بەڕەوا نازانم. لەرۆژگاری پێغەمبەر(د.خ) و ئەبوبەکر و عومەریش سامانی گەورەم لەماڵی خۆم بەخشیوە لەکاتێکدا ئەو کاتە

تەماحکار و دەست قونجاو بووم بۆ ئێستاکە گەشتوومەتە تەمەنی ئاسای بنەماڵەکەم و ساڵەکانی تەمەنم بەرەو کۆتایی دەڕوات و ماڵی خۆم دەبەخشم، ناباوەڕان بەوشێوەیە دەدوێن. سوێند بەخوا لەهیچ کام لەشارەکان شتێکی زیاترم وەرنەگرتووە کەئەم وتانە ڕەوا بێت، هەرچی بووە بەخۆیانم بەخشیوە و تەنیا پێنج یەکیان هێناوەتە لای من و هیچی بۆ من حەلاڵ نییە و موسوڵمانان، نەك من، تەسلیمی کەسانی تایبەت بەوەرگرتنی پێنج یەکیان کردووە و لەسامانی موسوڵمانان تەنانەت یەك سکەی مسین بەفیڕۆ نەدراوە. من لەسامانی خۆم ڕۆژی دەخۆم. دەڵێن زەوی بەخەڵکان داوە. ئەم زەوییانە کاتێك دەستیان بەسەردا گرت موهاجیرەکان و ئەنسار بەشداربوون تیایدا و هەرکەس بۆ لای کەسەکانی خۆی گەڕابێتەوە چیتر مافی بەسەریەوە نەماوە. من سەبارەت بەبەشەکەی خۆم لەو تالآنییەی خواوەند پێی بەخشیبووین، لێکۆڵینەوەم کرد و بەرەزامەندی خۆیان تەسلیمم کرد و هەنووکە لەدەستی ئەواندایە نەك من.

عوسمان کوڕی عەفان سامان و زەوییەکانی خۆی لەنێوان منداڵەکانی ئومەییە دابەش کردبوو و هاوشێوەی ئەوان بەشی منداڵەکانی خۆی جیاکردبوویەوە. لەمنداڵەکانی کوڕی عاسەوە دەستپێکردبوو: بەپیاوەکانی بنەماڵەی حەکەم هەر کام دەهەزار دەهەزار پێی بەخشین و یەکسەد هەزاریان وەرگرت. منداڵەکانی خۆیشی بەهەمان شێوە. بەشی منداڵەکانی عاس و ئەلعەیس و منداڵەکانی حەربیشیدا.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان لەگەڵ ئەو دەستەیە نەرمی نواند. موسوڵمانان دەیانویست بیانکوژن بەڵام عوسمان کوڕی عەفان ئەوانی ئازاد کرد کەبۆ سەرزەمینەکانی خۆیان گەڕانەوە تا لەگەڵ حاجییەکان بۆ حەج بگەڕێنەوە. نامەیان بۆ یەك نووسی: کات و شوێنی دیاریکراوی ئێمە لەمانگی شەوال لەدەرەوەی مەدینەیە. لەمانگی شەوالی ساڵی سی و دووەم، هاوشێوەی حاجییەکان هاتن و لەدەرەوەی مەدینە مەنزڵیان گرت.

باوکی عوسمان دەڵێت: لەمانگی شەوالی ساڵی سی و پێنج خەڵکانی میسر لەچوار دەستەدا هاتن لەگەڵ چوار سەرکردە. ئەو کەسەی کەمی دەکاتەوە دەڵێت شەشسەد کەس و ئەوەی زیادی دەکات دەڵێت هەزار. عەبدولرەحمان کوڕی

عەدیسی بەلەوی و کەنانە کوڕی بیشری لەیسی و سودان کوڕی حیمرانی سەکونی و فەتیرە کوڕی فلأنی سەکونی سەرکردەکان بوون و سەرکردەی هەمووان غافقی کوڕی حەربی عەکی بوو. نەیانوێرابوو بەخەڵکان بڵێن بەمەبەستی جەنگ دەڕۆن بەڵکو هاوشێوەی حاجییەکان هاتبوون. ئەدا کوڕی سواد هاوڕێیەتی ئەوانی دەکرد. خەڵکانی کوفەیش لەچوار دەستەدا هاتن، زەید کوڕی سوحانی عەبدی و ئەشتەری نەخعی و زیاد کوڕی نەزری حارسی و عەبدوللە کوڕی ئەسەمی عامری سەرکردەکان بوون. ژمارەیان هاوشێوەی ژمارەی خەڵکانی میسر و سەرکردەیان عەمرۆ کوڕی ئەسەم بوو. خەڵکانی بەسرەیش لەچوار دەستەدا هاتن. حەکیم کوڕی حەبلەی عەبدی و زورەیح کوڕی عوبادی عەبدی و بیشر کوڕی شورەیحی قەیس و کوڕی موخەریشی کوڕی عەبدعەمرۆ حەنەفی سەرکردەی دەستەکان و ژمارەیان هاوشێوەی خەڵکانی میسر و سەرکردەیان حێرقوس کوڕی زوهەیری سەعدی بوو. ئەمە جیاواز لەو کەسانە بوو لەخەڵکانی دیکەوە پەیوەستیان ببوون.

خەڵکانی میسر خوازیاری خەلافەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوون، خەڵکانی بەسرە تەڵحە و خەڵکانی کوفە زوبەیریان دەویست. شۆڕشیان کردبوو و بۆ ئەو کارە هاودەنگ و هاوڕا بەلأم سەبارەت بەخەلیفەی دوای عوسمان کوڕی عەفان بۆچوونیان جیاواز بوو. هەردەستەیەك گومانی دەکرد خۆی بەمەبەستەکەی دەگات.

کاتێك گەیشتنە سێ مەنزڵی مەدینە، دەستەیەك لەخەڵکانی بەسرە ڕۆشتن و لە زوخەشب دابەزین و دەستەیەك لەخەڵکانی کوفە لەئەعوەس مەنزڵیان گرت. خەڵکانی میسر پێش ئەوان کەوتنەوە بەلأم زۆربەیان لەزو ئەلمورە بوون. زیاد کوڕی نەزر و عەبدوللە کوڕی ئەسەم لەنێوان خەڵکانی میسر وبەسرە هاتوچۆیان دەکرد و وتیان: پەلە مەکەن تا بڕۆینە مەدینە و بارودۆخ هەڵسەنگێنین چوونکە بیستوومانە دژی ئێمە ئوردوویان لێداوە. سوێند بەخوا ئەگەر خەڵکانی مەدینە لەئێمە ترسابێتن و بێ ئەوەی لەکار و مەبەستەکەی ئێمە ئاگادار بووبێتنەوە، بۆ جەنگی ئێمە خۆیان ئامادە دەکرد و کاتێك لەمەبەستەکەی ئێمە ئاگادار ببنەوە، بوێرتر دەبن و بەمەبەستەکەی خۆمان ناگەین. ئەگەر بۆ جەنگ خۆیان ئامادە نەکردبێت و هەواڵی ناڕاستیان بەئێمە گەیاندبێت، لەگەڵ هەواڵە ڕاستەکان بۆ لای ئێوە دەگەڕێینەوە.

وتیان: بڕۆن.

ئەو دوو کەسە ڕۆشتنە ناو مەدینە و هاوسەرانی پێغەمبەر(د.خ) و عەلی و تەڵحە و زوبەیریان بینی و وتیان: بەمەبەستی حەج هاتووین و دەمانەوێت خەلیفە دەستەیەك لەکارگوزارانی ئێمە لەسەر کار لاببات. داوای مۆڵەتیان بۆ کردن بەڵام کەس بەبینینی ئەوان رازی نەبوو و وتیان: تۆوەکان نابنە جووجکە.، ئەو دووانە گەڕانەوە. دواتر چەند کەسێك لەخەڵکانی بەسرە هاتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و چەند کەسێك لە خەڵکانی بەسرە رۆیشتنە لای تەڵحە و چەند کەسێك لەخەڵکانی کوفە ڕۆشتنە لای زوبەیر. هەردەستەیەك دەیانوت: ئەگەر لەگەڵ سەروەری ئێمە بەیعەت نەکەن، لەگەڵیان دەجەنگین و بڵاوە بەکۆبوونەوەکەیان دەکەین، دواتر هێرشیان دەکەینە سەر و بەشێوەیەکی لەناکاو دەیانکوژین.

مسرییەکان ڕۆشتنە لای عەلی کە لەگەڵ دەستەیەك لەنزیك بەردەکانی تایبەت بەرۆن گرتن بوو، عابایەکی ناسکی لەبەردا بوو، پارچەیەکی یەمەنی سووری لەسەرییەوە ئاڵاندبوو، شمشێری لەکەمەر بەستبوو بێ ئەوەی کراسی لەبەردا بێت. عەلی حەسەنی بۆ لای عوسمان کوڕی عەفان نارد و لەگەڵ کەسانی دیکە لای ئەو دەمایەوە. خۆی لەنزیك بەردەکان بوو. میسرییەکان سڵاویان لێکرد و مەبەستی ئەوەیان کرد بەیعەتی لەگەڵ ببەستن بەڵام عەلی بەسەر ئەواندا قیژاندی و دووری خستنەوە و وتی: چاکخوازەکان بزانن کەسوپاکەی زو ئەلمورە و زو خەشب لەسەر زمانی محەممەدی پێغەمبەر(د.خ) نفرین کراون. بڕۆن هیوادرام خواوەند هاورێیەتیتان نەکات.

وتیان: زۆر باشە. لای عەلی ڕۆشتن.

خەڵکانی بەسرەیش ڕۆشتنە لای تەڵحە کە لەگەڵ دەستەیەکی دیکە لەنزیکی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو و کوڕەکەی خۆی بۆ لای سەروەری باوەڕداران ناردبوو. سڵاویان کرد و مەبەستی بەستنی بەیعەتیان کرد بەڵام ئەویش قیژاندای و ئەوانی لەخۆی دوور خستەوە، وتی: باوەڕداران دەزانن سوپاکەی زوئەلمورە و زو خەشب و ئەعوەس لەسەر زمانی پێغەمبەر(د.خ) نفرین کراون.

خەڵکانی کوفە ڕۆشتنە لای زوبەیر. ئەویش لەگەڵ دەستەیەك بوو و کوڕەکەی خۆی بۆ لای عوسمان کوڕی عەفان ناردبوو. سڵاویان کرد و ویستیان بەیعەتی

لەگەڵ ببەستن. ئەوانی دەرکرد و وتی: موسوڵمانان دەزانن سوپاکەی زوخەشب و ئەعوەس و زو ئەلموڕە لەسەر زمانی پێغەمبەر(د.خ) نفرین کراون.

هەموویان گەڕانەوە و وایان نیشاندا دەیانەوێت بۆ سەرزەمینی خۆیان بگەڕێنەوە. لەزوخەشب و ئەعوەسەوە بەرێکەوتن و ڕۆشتنە ئوردووگاکانی خۆیان کە لەسێ مەنزڵی مەدینەدا بوو بەو هیوایەی خەڵکانی مەدینە بلاوەی لێ بکەن و بگەڕێنەوە. خەڵکانی مەدینە دوای ڕۆشتنی ئەو دەستەیە بلاوەیان لێکرد. ئەوان کەگەشتبوونە ئوردووگاکانی خۆیان دووبارە گەڕانەوە و خەڵکانی مەدینەیان ناکاوگیر کرد. لەناکاو لەدەوروبەری مەدینە دەنگی تەکبیر بەرز بوویەوە و هاتووان لەشوێنی ئوردووی خەڵکانی مەدینە جێگیر بوون و گەمارۆیان خستە سەر عوسمان کوڕی عەفان و وتیان: هەرکەس خۆی بپارێزێت، ئەمانی هەیە.

عوسمان کوڕی عەفان چەند ڕۆژێك پێشنوێژی خەڵکانی دەکرد و خەڵکانی مەدینە لەماڵەکانی خۆیاندا بوون. نەیارەکان ڕێگەی قسە کردنیان لەکەس نەدەگرت. دەستەیەك لەخەڵکانی مەدینە هاتنە لایان و گفتوگۆیان کرد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەناویاندا دەبینرا و وتی: بۆ دوای ڕۆشتن گەڕانەوە و بۆچوونی خۆتان گۆڕی؟

وتی: نامەمان لەنێردراوێك گرت کەفەرمانی کوشتنی ئێمەی تیا بوو.

تەڵحەیش ڕۆشتە لای خەڵکانی بەسرە و هەمان شتی بیست. زوبەیریش لای خەڵکانی کوفە هەمان شتی بیست. خەڵکانی کوفە و بەسرە دەیانوت ئێمە هاوکاری براکانمان دەکەین و بۆ پشتیوانی ئەوان ئالای شۆڕش بەرز دەکەینەوە. وەك بڵێی پێشتر بڕیاری ئەو کارەیان دابوو.

عەلی وتی: ئەی خەڵکانی کوفە و بەسرە! ئێوە کەچەند مەنزڵ دوور کەوتبوونەوە، بۆ لای ئێمە گەڕانەوە، چۆن زانیتان خەڵکانی میسر چییان بینیوە، سوێند بەخوا ئەم کارانەتان لەمەدینە ڕێکخستووە.

وتیان: چۆنتان پێخۆشە لێکدانەوەی بۆ بکەن. ئێمە ئەم پیاوەمان ناوێت و دەبێت دەست لەخەلافەت هەڵبگرێت.

لەم کاتەدا عوسمان کوڕی عەفان پێشنوێژی خەڵکانی دەکرد. ئەوانیش لەپشت سەری ئەو نوێژیان دەخوێند. هەرکەس دەیخواست دەیتوانی بڕواتە لای سەروەری

باوەڕداران بیّ ئەوەی گرنگی بەو دەستەیە بدات. ڕێگەی گفتوگۆیان لەکەس نەدەگرت. لەمەدینە بلاّو ببوونەوە و ڕێگەیان نەدەدا خەڵکان کۆببنەوە.

عوسمان کوڕی عەفان نامەی بۆ هەموو ویلایەتەکان نووسی و داوای هاوکاری لێکردن بەم ناوەرۆکە:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

بەلاّم دواتر، خواوەند پێغەمبەری بۆ ڕاستی ڕەوانە فەرموو کەمژدەدەر و ترسێنەر بوو. ئەوەی خواوەند فەرمانی پێکردبوو، رایگەیاند و دواتر کۆچی کرد و ئەرکەکانی سەرشانی خۆی بەکۆتا هێنا و کتێبی خواوەندی لەناو ئێمەدا بەجێهێشت کە لەخۆگری حەلاڵ و حەرام و شیکردنەوەی کاروبارەکانە و بەدڵخواز و نابەدڵخوازی خەڵکان ڕەوانەی فەرمووە. دووای پێغەمبەر(د.خ) ئەبوبەکر و عومەر کوڕی خەتاب خەلیفە بوون. دووای ئەوان بیّ ئەوەی بزانم و بخوازم و بەرەزامەندی خەڵکان منیان کردە خەلیفە و خەڵکان بیّ ئەوەی بمەوێت، لەسەر خەلافەتی من ڕێککەوتن. ئەو کارانەم کردووە کەدەیزانن و کەس حاشای لیّ ناکات چوونکە شوێنکەوتوو بووم نەك داهێنەر، لاسایکەرەوە بووم و لێپرسراو. کاتێك بارودۆخ گۆڕا و شوێنکەوتەکانی شەڕ سەریان بەرز کردەوە، ڕق و کینەکان دەرکەوتن و هیچ هۆکارێك جگە لەخوێندنەوەی قورئان نەبوو. شتێکیان دەویست و داوای شتێکی دیکەیان دەکرد. بیّ بەڵگە و پاساو، رەخنەیان لەمن گرت و بەوە رازی بوون. بۆ ئەو کارانە رەخنەیان لیّ دەگرتم کەجێی ڕەزامەندی خەڵکانی مەدینە بوو. خۆڕاگریم کردە پیشە و چەندین ساڵە ئەوانم پشتگویّ خستووە، بەردەوام دەمبینی و دەمبیست تا ئەوەی بوێری ئەوان زیادی کرد و لەنزیك پێغەمبەر(د.خ) و لەسەرزەمینی کۆچ هێرشیان کردۆتە سەر ئێمە. بەدەوییەکانیش پەیوەستی ئەوان بوون کەهەمان ئەحزابن لەجەنگی ئەحزاب یا هێرشبەرانی ئۆحۆد جگە لەوەی قسەکەیان دەگۆڕن. کەواتە، هەرکەس دەتوانێت، بەرەو مەدینە بەرێکەوێت.))

نامە بەخەڵکی ویلایەتەکان گەیشت و بەهەر شتێك دەیانتوانی بەرێکەوتن. معاویە حەبیب کوڕی موسلیمەی فیهری نارد، عەبدوللە کوڕی سەعد، معاویە کوڕی حودەیجی سەکونی نارد. قەقعاع کوڕی عەمرۆ و عەبدوللە کوڕی ئەبی ئەوفی و

حەنزەلە کوڕی ڕەبیعی تەمیمی و کەسانی دیکە خەڵکیان بۆ هاوکاری کردنی دانیشتووانی مەدینە هان دەدا. لەشوێنکەوتەکانیش هاوەڵانی عەبدوللە کوڕی مەسروق کوڕی ئەجدەع و ئەسوەد کوڕی یەزید و شورەیح کوڕی حارس و عەبدوللە کوڕی حەکیم و کەسانی دیکە خەڵکیان بۆ پشتیوانی خەڵکانی مەدینە هان دەدا. ئەوان لەکوفە بەناو کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا دەگەڕان و دەیانوت: ئەی خەڵکینە، قسە! ئەمڕۆ دەبێت نەك بەیانی. ئەندێشە، ئەمڕۆ چاکە و بەیانی قێزەون، جەنگ ئەمڕۆ حەلاڵە و بەیانی حەرام، بۆ پشتیوانی لەخەلیفە و پارێزەری کاروبارەکان بەرێکەون.

لەبەسرەیش لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ)، عیمران کوڕی حەسین و ئەنس کوڕی مالیك و هوشام کوڕی عامر و کەسانی وەك ئەوان هەستان و قسەی هاوشێوەی ئەوانیان دەهێنایە سەرزمان. لەشوێنکەوتەکان، کەعب کوڕی سور و هێرەم کوڕی حەیانی عەبدی و کەسانی دیکەیش بەهەمان شێوە. لەشام لەهاوە لانی پێغەمبەر(د.خ) عوبادە کوڕی سامت و باوکی دەردا و ئەبو ئیمامە و کەسانی دیکە خەڵکیان بۆ پشتیوانی کردنی عوسمان کوڕی عەفان هاندەدا. لەشوێنکەوتەکانیش شەریك کوڕی خوباشەی نەمیری و باوکی موسلیم خەولانی و عەبدولرەحمان کوڕی غەنەم خەڵکیان هاندەدا. لەمیسر حارسە و کەسانی هاوشێوەی ئەو خەڵکیان بۆ پشتیوانی کردن لەسەرۆەری باوەڕداران ڕەوانە دەکرد.

دەستەیەك لەهاندەران گەڕانەوەی ئاژاوەچییەکانیان بینیبوو و بۆ سەرزەمینەکانی خۆیان گەڕابوونەوە.

ڕۆژێکی هەینی کەخەڵکانی میسر ڕۆشتبوونە ناو مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ)، عوسمان کوڕی عەفان هات و لەگەڵ خەڵکان نوێژی خوێند. دواتر ڕۆشتە سەر مینبەر و وتی: ئەی نەیارەکان! خواوەندا! خواوەندا! خەڵکانی مەدینە دەزانن ئێوە لەسەر زمانی پێغەمبەر(د.خ) بەنەحلەت کراون. هەڵەکان بەچاکەکاری بسڕنەوە چوونکە خواوەند خراپە تەنیا بەچاکە دەسڕێتەوە.

محەممەد کوڕی موسلیمە هەستا و وتی: من بۆ ئەم وتەیە، شایەتی دەدەم. حەکیم کوڕی حەبلە ئەوی گرت و داینشیاند.

زەید کوڕی سابت هەستا و وتی: قورئان بدە بەمن. محەممەد کوڕی ئەبی قەتیرە پەلاماریدا و داینیشاند و قسەی ناشیرینی پێ وت. نەیارەکان بەردبارانی خەڵکیان

کرد تا لەمزگەوتەکە دەریان کرد. بەردیان بۆ عوسمان کوڕی عەفان دەهاویشت و لەهۆش خۆی چوو. لەمینبەرەکە کەوتە خوار و ئەویان بردەوە بۆ ماڵ.

خەڵکانی میسر چاوەڕوانی هاوکاری کردنی سێ کەس لەخەڵکانی مەدینە بوون. سەردانی ئەوانیان دەکرد: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر، محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە و عەماری یاسر.

دەستەیەك لەخەڵکانی مەدینە خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کرد کەسەعد کوڕی مالك و باوکی هورەیرە و زەید کوڕی سابت و حەسەن کوڕی عەلی لەناویاندا دەبینران. بەڵام عوسمان کوڕی عەفان کەسی نارد و سوێندیدان بلاوەی لێ بکەن.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتە لای عوسمان کوڕی عەفان، تەڵحە و زوبەیریش هاتن. لەبەر ئەوەی لەمینبەرەکە کەوتبووە خوار، پرسیاری تەندروستی ئەویان کرد و سکالاَیان لەبارودۆخ کرد و بۆ ماڵەکانی خۆیان گەڕانەوە.

کوڕی عەمرۆ دەڵێت: لەحەسەنم پرسی: ئایا لەکاتی گەمارۆ خستنە سەر عوسمان کوڕی عەفان ئامادە بوویت؟

وتی: بەڵێ، نەوجەوان بووم و لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆم لەمزگەوتا بووین. کاتێك دەنگە دەنگ بەرز بوویەوە، دەکەوتمە سەر ئەژنۆ یا هەڵدەستامە سەرپێ. ئەو دەستە هاتن و لەناو مزگەوتەکە جێگیر بوون. دەستەیەك لەخەڵکانی مەدینە لەدەوریان کۆبوونەوە وکارەکەی ئەوانیان سەرکۆنە کرد. ئەوانیش هەڕەشەیان لەخەڵکانی مەدینە کرد. لەکاتی دەنگەدەنگەکە عوسمان کوڕی عەفان دەرکەوت. هاوشێوەی ئاگر بوو کەدەکوژایەوە. سەروەری باوەڕداران ڕۆشتە سەر مینبەر، سپاسی خوای کرد. کەسێك پەلاماریدا بەڵام کەسێکی دیکە ئەوی لەجێگەکەی دانیشاند. کەسێکی دیکە هەستا و دووبارە کەسێکی دیکە داینیشاند. بەردبارانی عوسمان کوڕی عەفانیان کرد تا لەمینبەرەکە کەوتەخوار و ئەویان بردەوە بۆ ماڵ. بیست ڕۆژ پێشنوێژی بۆ خەڵکان کرد بەڵام دواتر ڕێگەی ئەو کارەیشیان لێ گرت.

باوکی عوسمان دەڵێت: دوای ئەوەی ئەو دەستەیە لەمزگەوتەکە جێگیر بوون، عوسمان کوڕی عەفان سی ڕۆژ پێشنوێژی بۆ خەڵکان کرد دواتر ڕێگەیان لێگرت و غافقی کەسەرکردەی خەڵکانی میسر و کوفە و بەسرە بوو، پێشنوێژی دەکرد.

خەڵکانی مەدینە بڵاوەیان لێکرد و لەماڵەکانی خۆیان مانەوە و کەس نەدەهاتەدەر و لەهیچ شوێنێك دانەدەنیشتن بێ ئەوەی شمشێریان پێ بێت بۆ ئەوەی لەئەرك و ئازاری ئەوان خۆی بپارێزێت. ماوەی گەمارۆکە چل ڕۆژی خایاند و لەو ماوەیەدا کوشتنیش ڕوویدا. هەرکەس رەخنەی لێدەگرتن، بەشمشێر هەڕەشەیان لێدەکرد. پێشتر بۆ ماوەی سێ ڕۆژ دەستدرێژییان نەدەکرد سەر کەس.

سەبارەت بەگفتوگۆ و ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان و هۆکاری گەمارۆ خستنە سەر ئەو ئاماژەیان بەگێڕانەوەیەکی دیکە داوە کەباوکی نەزرە لەباوکی سەعید موالی باوکی ئەسیدی ئەنساری دەگێڕێتەوە: عوسمان کوڕی عەفان بیستی کەنێردراوانی خەڵکانی میسر هاتوون، ڕۆشتە لای ئەوان و لەگوندێك کەتایبەت بەخۆی بوو، لەدەرەوەی مەدینە جێگیر بوو. کاتێك میسرییەکان ئاگادار بوونەوە، ڕۆشتنە شوێنەکەی عوسمان کوڕی عەفان.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان حەزی نەدەکرد ئەوان لەمەدینە بڕۆنە لای. کاتێك ڕۆشتنە لای، وتیان: بڵێن با مەسحەف بێنن.

دەڵێت: عوسمان فەرمانیدا و مەسحەفیان بۆ هێنا.

وتیان: حەوتەم بکەرەوە. سوڕەی یونسیان بەحەوتەم ناو دەبرد.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان سوڕەکەی خوێندەوە تا گەیشتە ئەم ئایە:

((قل ارایتم ما انزل الله لكم من رزق فجعلتم منه حراما و حلالا، قل الله اذن لكم ام على الله تفترون.

واتاکەی: بڵێ، بەمن بڵێ: ئەم ڕۆژەی خواوەند ڕەوانەی فەرمووە و حەڵاڵ و حەرامتان تیا جێگیر کردووە، بڵێ ئایا خواوەند مۆڵەتی پێدان یا درۆ بۆ خواوەند هەڵدەبەستن؟

وتیان: لێرەدا بێستە.

وتیان: ئەو زەوییانەی تایبەتت کردووە بەکەسەکانی خۆت، ئایا خواوەند ڕێگەی ئەو کارەی پێداویت یا درۆ بۆ خواوەند هەڵدەبەستیت؟

وتی: ڕازی ببە، ئایا سەبارەت بەفلان کەسەروەری باوەڕدارانە و فیسارەکەس هاتۆتە خوار.

وتی: عومەر کوڕی خەتاب پێش من بۆ وشترەکانی زەکات چەندین پارچە زەوی

تایبەتی دیاری کرد و کاتێك من خەلافەتم گرتەدەست، ژمارەی وشترەکانی زەکات زیادی کرد و منیش زەوییەکانم فراوانتر کرد.

دەڵێت: ئەوان بەلێکدانەوەی ئایەکە رەخنەیان لێدەگرت و ئەو دەیوت: رازی بن، ئایەکە سەبارەت بەفلانە و فیسارە هاتۆتەخوار.

دەڵێت: ئەو کەسەی لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان دەپەیڤی لەتەمەنی تۆدا بوو.

باوکی نەزرە دەڵێت: باوکی سەعید ئەم حەدیسەی بۆ گێڕامەوە. لەو کاتەدا هێشتا ڕیشم نەبوو. لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە کەدەڵێت: لەو کاتەدا تەمەنم سی ساڵ بوو.

دەڵێن: ئەوان بۆ چەندین کاری دیکە رەخنەیان لێگرت کەنەیتوانی وەڵام بداتەوە ودانی بەهەڵەکانی خۆیدا نا. وتی: داوای بەخشین لەخواوەند دەکەم و لەپێشگای ئەو تۆبە و پەشیمان بوونی خۆم دەردەبڕم.

دەڵێت: پێی وتن: چیتان دەوێت؟

نەزر دەڵێت: پەیمانیان لێوەرگرت و مەرجیان بۆ دانا.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان بەڵێنی لێوەرگرتن ئەگەر پابەندی بەڵێنەکەی بێت و خواستەکانی ئەوان بەدیبێنێت، چیتر نەیاری نەبن و لەریزی موسوڵمانان نەڕۆنەدەر.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: چیتان دەوێت؟

وتیان: دەمانەوێت خەڵکانی مەدینە مانگانە وەرنەگرن چوونکە ئەم سامانە تایبەتە بەو کەسانەی دەجەنگن و تایبەتە بەو پیرانەی هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بوون.

دەڵێت: بەمە رازی بوون و لەگەڵ ئەو گەڕانەوە بۆ مەدینە.

دەڵێت: عوسمان وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: هیچ دەستەیەکی نێردراو بۆ هەڵەکانی من باشتر لەم دەستەیە نەبوو.

لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە کەوتی: بێ هۆ لەنێردراوەکانی میسر دەترسام. هەرکەس زەوی کشتوکاڵی هەیە بۆ سەر زەوییەکەی خۆی بگەڕێتەوە و هەرکەس مەڕ و ماڵاتی هەیە، سەرقاڵی دۆشینیان بێت، بزانن هیچ سامانێکتان لای من نییە.

ئەم سامانە تایبەتە بەو کەسانەی بۆ بەدەست هێنانی جەنگاون و تایبەتە بەپیرەکانی هاوەڵی پێغەمبەر(د.خ).

دەڵێت: خەڵکان تووڕە بوون و وتیان: ئەمە فێڵی منداڵەکانی ئومەییەیە.

دەڵێت: نێردراوانی میسر ڕازی بوون و ڕۆشتن. لەڕێگەدا سوارێکیان لەسەر ڕێگەکەی خۆیان بینی و لێیان جیابوویەوە. دواتر دەگەڕایەوە و سەرنجی ئەوانی رادەکێشا.

وتیان: چ کارەیت؟ دەڵێی بۆ مەبەستێك لەمەدینە دڕۆیت، ئاگادارمان بکەرەوە.

وتی: نێردراوی سەروەری باوەڕدارانم و بۆ لای کارگوزاری میسر دەڕۆم.؟

دەڵێت: ئەویان پشکنی و نامەکەی عوسمان کوڕی عەفانیان دەرهێنا کەمۆری ئەوی پێوەبوو و داوای لەکارگوزاری میسر کردبوو ئەوان بگرێت و بیانکوژێت یا دەست و پێیان بەپێچەوانەوە ببڕێت.

دەڵێت: ئەوان گەڕانەوە و ڕوویان لەمەدینە کرد و ڕۆشتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتیان: دەبینیت، دوژمنی خوا سەبارەت بەئێمە چ فەرمانێکی دەرکردووە، خواوەند خوێنی ئەوی حەڵاڵ کردووە، لەگەڵ ئێمە بۆ لای ئەو وەرە.

وتی: سوێند بەخوا لەگەڵ ئێوە نایێم.

وتیان: کەواتە بۆ نامەت بۆ ئێمە نووسی؟

وتی: سوێند بەخوا هەرگیز نامەم بۆ ئێوە نەنوسیوە.

ئەوان سەیری یەکیان کرد و وتیان: لەبەر ئەم پیاوە دەجەنگن.

یا وتیان: لەبەر ئەم پیاوە توڕە بوون.

دەڵێت: عەلی مەدینەی بەجێهێشت و لەگوندێك نیشتەجێ بوو.

دەڵێت: خەڵکانی میسر ڕۆشتنە لای عوسمان کوڕی عەفان و وتیان: سەبارەت بەئێمە نامەت بۆ فلانەکەس و فیسارەکەس نووسیوە.

وتی: دەبێت یەکێك لەم دوو شتە ڕوویدابێت یا دوو پیاوی موسوڵمان دژی من شایەتییانداوە یا سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، سوێند دەخۆم نامەم نەنوسیوە و ئاگاداری نیم.

وتی: دەزانن نامە لەزمانی کەسێکەوە دەنووسن و بەئەنگوستیلەکەی ئەو مۆری دەکەن.

وتیان: سوێند بەخوا ئێستا کەپەیمانەکەت شکاند و لەبەڵێنەکانی خۆت پەشیمان بوویتەوە خوێنی تۆ بۆ ئێمە حەڵاڵە. گەمارۆیان خستەسەر.

بەڵام واقدی سەبارەت بەهاتنی میسرییەکان و مەنزڵ گرتنیان لەزوخەشب ئاماژەی بەبابەتی زۆرداوە کەپێشتر بەشێکیمان باس کرد و بەشێکی نا لەبەر ئەوەی ئاماژەی بەبابەتی قێزەوەنداوە و حەزمان نەکرد لەم کتێبەدا باسیان بکەین. یەکێك لەبابەتەکانی ئەو گێڕانەوەیە کە لەباوکی عەون موالی مسوەر ئامارژەی پێداوە کەعەمرۆ کوڕی عاس کارگوزاری میسر بوو، عوسمان کوڕی عەفان لێپرسراویەتی خەراجی لێوەرگرتوە و ئەوی وەك پێشنوێژی خەڵکان دیاری کرد و عەبدوللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرحی بۆ ئەو کارە راسپارد. دواتر پێشنوێژی کردنیشی بەو سپارد. کاتێك عەمرۆ کوڕی عاس هاتە مەدینە، بەردەوام خراپەی عوسمانی دەهێنایە سەرزمان. رۆژێك سەروەری باوەڕداران ئەوی بانگ کرد و بەتەنیایی لەگەڵی دانیشت و وتی: ئەی کوڕی روسپی (نابغە) چەندە خێرا گیرفانەکانی عاباکەت ئەسپێی تێیداوە. کاری تۆ تەنیا ساڵی یەکەم بوو، خراپەی من باس دەکەیت و بوویتە کەسێکی ریاکار؟ سوێند بەخوا بێ هۆ ئەو کارە ناکەیت.

عەمرۆ وتی: زۆربەی ئەو شتانەی خەڵکان باسی دەکەن و بەگوێی پێشەواکانیان دەگات، ناڕاستە. ئەی سەروەری باوەڕداران، لەکاروبارەکانی ژێردەستەکانت لەخواوەند بترسە.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: سوێند بەخوا هەرچەندە گومڕا بوویت و خەڵکان سەبارەت بەتۆ قسەیان دەکرد، تۆم وەك کارگوزار دیاریکرد.

عەمرۆ وتی: کارگوزاری عومەر کوڕی خەتاب بووم و کاتێك مرد، لەمن رازی بوو.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: سوێند بەخوا ئەگەر منیش وەك عومەر کوڕی خەتاب لێپرسینەوەم لەگەڵ تۆ دەکرد، لەمنیش رازی دەبوویت بەڵام بەشێوەیەکی نەرم و نیان هەڵس و کەوتم لەگەڵ کردیت. سوێند بەخوا لەرۆژگاری جاهلییەت و پێش ئەوەی دەسەڵات بگرمەدەست، خزم وکەس و کارەکانم لەتۆ زیاتر بوو.

عەمرۆ وتی: چاو لەم قسانە بپۆشە. سپاس بۆ ئەو خوایەی بەهۆی پێغەمبەرەوە رێزی لێگرتین و رێگەی نیشاندایین. عاس کوڕی وائیلت بینیبوو، منیش عەفانم

بینیبوو، سوێند بەخوا عاس لەباوکی تۆ بڕواپێکراوتر بوو.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان شکستی خوارد و وتی: نامانەوێت بیری ڕۆژگاری جاهلییەت بکەین.

دەڵێت: کاتێك عەمرۆ ڕۆشتەدەر، مەروان هات و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، باوردۆخت بەشێوەیەکە عەمرۆ کوڕی عاس دێت و ئیهانەی باوکت دەکات؟

وتی: چاو لەم قسەیە بپۆشە، هەرکەس باسی باوکی کەسانی دیکە بکات، باسی باوکی دەکەن.

دەڵێت: کاتێك عەمرۆ لای عوسمان کوڕی عەفان هاتەدەر، ڕقی ئەوی لەدڵ گرت. جارێك ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و دژی عوسمان کوڕی عەفان هانیدا، جارێك ڕۆشتە لای زوبەیر و دژی عوسمان کوڕی عەفان هانیدا و ڕۆشتە لای تەڵحە و دووبارە ئەو کارەی کرد. دەڕۆشتە لای حەجکەران و باسی کردەوەکانی عوسمان کوڕی عەفانی دەکرد.

دەڵێت: کاتی گەمارۆی یەکەمی عوسمان کوڕی عەفان، عەمرۆ لەمەدینە ڕۆشتەدەر و رووی کردە پارچە زەوییەکی خۆی لەسەرزەمینی فەلەستین بەناوی وەسیع و لەکۆشکەکەی خۆی بەناوی عەجلان نیشتەجێ بوو. دەیوت: ئەوەی لەکوڕی عەفان بەسەر ئێمەدا دێت، سەرسوڕهێنەرە.

ڕۆژێك لەکۆشکەکەی خۆی دانیشتبوو، دوو کوڕەکەی محەممەد و عەبدوللە و سەلامە کوڕی روەحی جوزامی لەگەڵیدا بوون. سوارێك لای ئەوان گوزەری کرد. عەمرۆ بانگی کرد و وتی: ئەی پیاو، لەکوێوە دێیت؟

وتی: مەدینە.

وتی: ئەو پیاوە چی بەسەرهات؟ مەبەستی عوسمان کوڕی عەفان بوو.

وتی: گەمارۆی لەسەرە و گەمارۆکە دژوارە.

وتی: بەمن دەڵێن باوکی عەبدوللە، کاتێك داغ لەناو ئاگردا بێت، کەری کێوی با پشت گوێ دەخات.

دەڵێت: عەمرۆ لەوێ دانیشتبوو تا ئەوەی سوارێکی دیکە گوزەری کرد. عەمرۆ پرسی: ئەو پیاوە چی بەسەرهات؟ مەبەستی عوسمان کوڕی عەفان بوو.

وتی: کوژرا.

عەمرۆ وتی: بەمن دەڵێن باوکی عەبدوڵلە، کاتێك دەست لەدومەڵێك بدەم، دەیکەمەوە. خەڵکانم دژی ئەو هان دەدا تا ئەو جێگەی شوانم لەسەر کێوەکان دژی ئەو دەبزواند.

سەلامە کوڕی روەح وتی: ئەی قورەیشییەکان، لەنێوان ئێوە و عەرەبەکان دەروازەیەکی بەهێز بوو، شکانتان، بۆ ئەو کارەتان کرد؟

وتی: دەمانەویست راستییەکان لەچەوتی جیا بکەینەوە و خەڵکان بۆ مافەکانیان یەکسان بن.

دەڵێت: زڕخوشکی عوسمان، دایکی کولسوم کچی عوقەبە کوڕی ئەبی موعیت، ژنی عەمرۆ بوو. کاتێك عوسمان کوڕی عەفان ئەوی لەسەر کار لابرد، تەلاقیدا.

عەبدوڵلە کوڕی محەممەد لەباوکی دەگێڕێتەوە: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و محەممەد کوڕی حوزەیفە لەمیسر دژی عوسمان کوڕی عەفان خەڵکیان هاندەدا. شۆڕشی میسرییەکان بەو شێوە بوو کە عەبدولرەحمان کوڕی عەدیسی بەلەوی لەگەڵ پێنسەد کەس بەرێکەوت و وایان نیشاندا مەبەستی حەجی عەمرەیان لەسەردایە. لەمانگی رەجەب بەرێکەوتن. عەبدوڵلە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح کەسێکی نارد کەیانزە ڕۆژە رێگەی بڕی و سەروەری باوەڕدارانی ئاگادار کردەوە کە کوڕی عەدیس و هاوەڵانی بەرەو مەدینە بەرێکەوتن و محەممەد کوڕی حوزەیفە تا عێجرود لەگەڵ ئەوان هاتووە و گەڕاوەتەوە و محەممەد لای خەڵکان دەڵێت ئەوان بەمەبەستی حەجی عەمرە بەرەو مەککە دەڕۆن بەڵام بەنهێنی لای پیاوەکانی خۆیان دەڵێن دەڕۆنە لای سەروەری باوەڕداران و ئەگەر رازی نەبوو دەست لەکار بکێشێتەوە، دەیکوژن.

خەڵکانی میسر رێگەیان بڕی تا لەزوخەشب مەنزڵیان گرت. کاتێك نێردراوی عەبدوڵلە کوڕی سەعد گەیشتە مەدینە، عوسمان کوڕی عەفان وتی: دەستەیەك لەخەڵکانی میسر بەگومانی خۆیان دەیانەوێت بۆ حەج بڕۆن بەڵام مەبەستی ئەو کارەیان نییە. کەسان هانیانداون و مەبەستی ئاژاوەیان لەسەردایە و چاوەڕوانی مەرگی منن. سوێند بەخوا ئەگەر بمرم ئارەزوو دەکەن خۆزگە تەمەنم درێژ دەبوو و

لەجیاتی هەر ڕۆژێك ساڵێك لە بەر ئەو هەموو خوێنەی دەڕژێت و دوژمنی و جیاوازییەکان خۆیان نیشان دەدەن و فەرمانەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت.

دەڵێت: کاتێك ئەو دەستەیە لەزوخەشب دابەزین، ئاگادار بوونە کەدەیانەوێت ئەگەر عوسمان بەدەست لەکار کێشانەوە ڕازی نەبوو، دەیکوژن. نێردراوی ئەوان شەوانە ڕۆشتە لای عەلی و تەڵحە و زوبەیر و عەمار کوڕی یاسر. محەممەد کوڕی حوزەیفە بەهۆی ئەوانەوە نامەی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسیبوو. نامەکەی وەرگرت بەڵام نەیخوێندەوە. کاتێك عوسمان کوڕی عەفان لەڕووداوەکان ئاگادار بوویەوە، ڕۆشتە ماڵی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتی: ئەی کوڕی مام، هیچ ڕێگەیەکی دەرباز بوون بۆ من نەماوەتەوە، خزمی نزیکی تۆم و مافی پاراستنی من لەسەر شانی تۆیە. ئەم خەڵکە هاتوون و هێرش دەکەنە سەرمن. دەزانم تۆ لای ئەوان پێگەیەکی بەرزت هەیە، دەمەوێت بڕۆیتە لایان و قسەیان لەگەڵ بکەیت چوونکە ناخوازم بێنە ناو مەدینە چوونکە بوێری ئەوان زیاد دەکات وکەسانی دیکەیش پەیوەستیان دەبن.

عەلی وتی: بیانگەڕێنمەوە کەچی ببێت؟

وتی: چیتر بەپێی مۆجیارییەکانی تۆ کاروبارەکان ئەنجام دەدەم و سەرپێچی فەرمانەکانی تۆ ناکەم.

عەلی وتی: زۆرجار قسەم لەگەڵ کردوویت و هەرجار کەئێمە دەگەڕێینەوە، تۆ پەشیمان دەبیتەوە. ئێمە شتێك دەڵێین و تۆ شتێکی دیکە. هەموو ئەم کارانە لەمەروان کوڕی حەکەم و سەعید کوڕی عاس و معاویەوە سەرچاوە دەگرێت چوونکە گوێڕایەڵی ئەوان بوویت و سەرپێچیکەری فەرمانەکانی من.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: چیتر ئەو کارە دووبارە ناکەمەوە.

دەڵێت: محەممەد عەماری یاسری بانگ کرد و لەگەڵی ئاخاوت تا لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بڕوات بەڵام ڕازی نەبوو. سەعد کوڕی وەقاسی بانگ کرد و داوای لێکرد بڕواتە لای عەمار و ڕازی بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بڕواتە لای میسرییەکان.

دەڵێت: سەعد ڕۆشتە لای عەمار، وتی: ئەی باوکی یەقزان، بۆ ناڕۆیت؟ عەلی دەڕوات، هاوڕێیەتی بکە و ئەم دەستە لەسەروەری باوەڕداران دوور بخەرەوە چوونکە

بەگومانی من ئەمە باشترین ڕێگەیە.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان کەسیر کوڕی سەڵتی کەندی لەهاوەڵانی ئەوی بانگ کرد و وتی: بەدوای سەعددا بڕۆ و بزانە سەعد چی بەعەمار دەڵێت و چی وەڵام دەداتەوە و بەخێرایی بۆ لای من بگەڕێرەوە.

دەڵێت: کەسیر ڕۆشت، سەعد لەگەڵ عەمار گفتوگۆی دەکرد و ئەو چاوی خۆی بڕیبووە کونی دەرگاکە. عەمار ئەوی نەناسی، دارێکی هەڵگرت و کردی بەکونی دەرگاکەدا. کەسیر خۆی دوور خستەوە، ڕوخساری داپۆشی و دوورکەوتەوە.

عەمار شوێن پێکانی ئەوی ناسییەوە و وتی: ئەی بی قیمەت و کوڕی دایکی بێ قیمەت! گوێ بۆ وتەکانی من هەڵدەخەیت! سوێند بەخوا ئەگەر دەمزانی تۆیت، بەم دارە چاوم کوێر دەکردیت چوونکە پێغەمبەر(د.خ) ئەم کارەی حەڵاڵ کردووە.

عەمار بۆ لای سەعد گەڕایەوە. سەعد لەگەڵی ئاخاوت و هەموو فێڵ و فریوێکی بەکار برد بەڵام کۆتا قسەی عەمار ئەمە بوو: سوێند بەخوا خەڵکانی میسر ناگەڕێنمەوە.

سەعد بۆ لای عوسمان کوڕی عەفان گەڕایەوە و لەوتەکەی عەمار ئاگاداری کردەوە. عوسمان کوڕی عەفان پێی وت: دڵسۆزیت نەکردووە. سەعد سوێندی خوارد بەئەندازەی پێویست پێداگری کردووە و عوسمان کوڕی عەفان ڕازی بوو.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتە لای خەڵکانی میسر و قسەی لەگەڵ کردن و ئەوانی گەڕاندەوە.

مەحمود کوڕی لوبەید دەڵێت: کاتێك میسرییەکان لەزوخەشب مەنزڵیان گرت، عوسمان لەگەڵ عەلی و هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) قسەی کرد تا ئەوان بگەڕێننەوە. عەلی سوار بوو. چەند کەسێك لەموهاجیرەکان و لەناو ئەوان سەعد کوڕی زەید و باوکی جوهمی عەدەوی و جوبەیر کوڕی مەتعیم و حەکیم کوڕی حوزام و مەروان کوڕی حەکەم و سەعید کوڕی عاس و عەبدولرەحمان کوڕی عەتاب، لەگەڵ ئەو بەرێکەوتن. لەئەنسار باوکی ئەسید و باوکی حەمید هەردووکیان ساعدی و زەید کوڕی سابت و حسان کوڕی سابت و کەعب کوڕی مالك هاوڕێیەتیان دەکرد. لەخەڵکانی عەرەب یەنار کوڕی موکریزیان لەگەڵدا بوو لەگەڵ سی کەسی دیکە.

دەڵێت: عەلی و محەممەد کوڕی موسلیمە لەپێشەوە ڕۆشتبوون. لەگەڵ خەڵکانی میسر قسەیان کرد و ملکەچی خۆیان نیشاندا و گەڕانەوە.

مەحمود دەڵێت: محەممەد کوڕی موسلیمە پێی وتم: هێشتا لەزوخەشب نەهاتبووینەدەر کەرێگەی میسریان گرتەبەر و سڵاویان لەمن کرد. وتەکەی عەبدولرەحمان کوڕی عەدیسی بەلەوی لەبیر ناکەم کەدەیوت: ئەی باوکی عەبدولرەحمان، لای من وەسیەت ناکەیت؟

دەڵێت، وتم: تەنیا لەخواوەند بترسە و کەسەکانی خۆت لە سەروەری باوەڕداران دوور بخەرەوە چوونکە بەڵێنی بەئێمەداوە گۆڕانکاری لەکردەوەکانی ئەنجام دەدات.

کوڕی عەدیس وتی: بەخواستی خوا ئەو کارە دەکەم.

دەڵێت: دوای ئەوە گەڕانەوە بۆ مەدینە.

عەبدوللە کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك عەلی گەڕایەوە بۆ لای عوسمان کوڕی عەفان و وتی خەڵکانی میسر گەڕاونەتەوە، سەبارەت بەو قسەی کرد و وتی: دەزانی زیاتر لەوەی وتوومە نابێت هیچی دیکە بڵێم. ئەوسا گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان ئەو ڕۆژەی بەسەر برد و بۆ بەیانی مەروان هات و وتی: بۆ خەڵکان قسە بکە و بڵێ خەڵکانی میسر گەڕاونەتەوە و ئەوەی سەبارەت بەپێشەوای خۆیان بیستبوویان، ناڕاست بووە پێش ئەوەی خەڵکی ویلایەتەکان دژی تۆ کۆببنەوە و ڕووبکەنە مەدینە کەچیتر نەتوانین دووریان بخەینەوە.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان ڕازی نەبوو بەڵام مەروان پێداگری کرد کەڕۆشتە سەر مینبەر، سپاسی خوای کرد و وتی: خەڵکانی میسر سەبارەت بەپێشەواکەی خۆیان شتی سەیریان بیستبوو و کاتێك لەناڕاست بوونی زانیارییەکانی خۆیان دڵنیا بوون، بۆ سەرزەمینەکەی خۆیان گەڕانەوە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس لەسوچێکی مزگەوتەکەوە هاواری کرد: ئەی عوسمان، لەخواوەند بترسن، کاری هەڵەت ئەنجام داوە و ئێمەیش لەگەڵ تۆدا هەڵەمان کردووە، تۆبە بکە و ئێمەیش تۆبە دەکەین.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان هاواری کرد: ئەی ڕوسپی زادە تۆ لێرەیت، سوێند بەخوا لەو کاتەوەی تۆم لەسەر کار لابردووە، جلەکانت ئەسپێی تێیداوە.

دەڵێت: دەنگ لەسوچێکی دیکەوە بەرز بوویەوە و وتی: تۆبە بکە و پەشیمانی

خۆت دەربڕە تا خەڵکان دەست لەتۆ هەڵبگرن.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان هەردوو دەستی بەرز کردەوە و ڕووی کردە قیبلە و وتی: خواوەندا یەکەم کەسم ڕوودەکەمە پێشگای تۆ و تۆبە دەکەم. دواتر بۆماڵەکەی خۆی گەڕایەوە و عەمرۆ کوڕی عاس ڕووی کردە فەلەستین و دەیوت: سوێند بەخوا ئەگەر تەنانەت شوانێك ببینم، دژی عوسمان کوڕی عەفان هانی دەدەم.

عەلی کوڕی عومەر لەباوکی دەگێڕێتەوە: دوای ڕۆشتنی میسرییەکان عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتە لای عوسمان کوڕی عەفان و وتی: قسە بکەن تا خەڵکان ببیستن و ببنە شایەتی تۆ و نیشانەی گۆڕانکاری لەکردەوەکانی تۆدا بێت چوونکە ویلایەتەکان دژی تۆن و دەترسم دەستەیەکی دیکە لەکوفەوە بێنێت و بڵێیت ئەی عەلی بڕۆ قسەیان لەگەڵ بکە چوونکە چیتر ناتوانم ئەو کارە بکەم و هیچ پاساوێکت نییە یا دەستەیەك لەخەڵکانی بەسرە لەمەدینە کۆببنەوە و داوا لەمن بکەیت قسەیان لەگەڵ بکەم و گومان بکەیت ڕێز لەپەیوەندی خزمایەتی ناگرم.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان هاتەدەر و سەبارەت بەگۆڕانکاری لەکار و کردەوەکانی خۆی قسەی کرد: سەرەتا ناوی خوای هێنایە سەرزمان، دواتر وتی: ئەی خەڵکینە، سوێند بەخوا ڕەخنەیەکیان لەمن نەگرت کەنەیزانم، گیرۆدەی ئارەزوو و هەوا هەوەس بووم و لەرزگاری دوور کەوتمەوە. لەپێغەمبەرەم بیست دەیفەرموو: هەرکەس هەڵەی کرد، تۆبە بکات و هەرکەس خراپەی کرد،تۆبە بکات و لەسەر تاوانەکانی پێداگری نەکات. هەرکەس لەسەر گومڕایی پێداگری بکات، لەڕێگە دوور دەکەوێتەوە. یەکەم کەسم گوێ لەم مۆجیارییە دەگرم و تۆبە بۆ پێشگای خواوەند بەرز دەکەمەوە. لەکردەوەکانی خۆم پەشیمانم. سەرکردەکانی ئێوە بێن وبۆچوونی خۆیان بەمن بڵێن. سوێند بەخوا ئەگەر ڕاستییەکان من بکاتە بەندە، دەبمە بەندە و هاوشێوەی بەندەکان دەبم و خۆڕاگری دەکەم وئەگەر ئازاد کرام، سپاسی خواوەند دەهێنمە سەرزمان. هیچ ڕێگەیەکی هەڵاتن لەخواوەند بوونی نییە مەگەر پەنا بردن بۆ خۆی. چاکەکانتان لەمن خۆیان دوور نەخەنەوە بەڵێن دەدەم ئەگەر لای ڕاستم ڕازی نەبێت، لای چەپم گوێڕایەڵیان دەبێت.

دەڵێت: خەڵکان بەزەییان پیایدا هاتەوە و دەستەیەکیان گریان. سەعید کوڕی

زەید هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، هەرکەس لەگەڵ تۆ نەبێت، دەستی بەتۆ ناگات. ئەوەی باسی دەکەیت، بەکردەوە نیشانی خەڵکانی بدە.

کاتێك عوسمان کوڕی عەفان لەسەر مینبەرەکەی هاتەخوار، مەروان و سەعید و چەند کەس لەمناڵەکانی ئومەییەی لەماڵەکەی خۆیدا بینی کە لەکاتی قسە کردنی ئەو ئامادە نەبوون. مەروان وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، قسە بکەم یا بێدەنگ بم؟

نائیلەی کەلبی، کچی قەرافسە، هاوسەری عوسمان کوڕی عەفان وتی: بێدەنگ بە چوونکە سوێند بەخوا دەیکوژن و بەگوناحکار لەقەڵەمی دەدەن. وتارێکی هێناوەتە سەرزمان کەشیاو نییە پەشیمان ببێتەوە.

مەروان رووی تێکرد و وتی: تۆ کارت بەم کارانە چییە. سوێند بەخوا باوکت مرد و نەیدەزانی دەستنوێژ بگرێت.

نائیلە وتی: مەروان ئارامبە و باسی باوکان مەهێنەرە سەرزمان. تۆمەت بۆ باوکم هەڵدەبەستیت کەلێرە نییە، ناتوانی بەرگری لەباوکی خۆت بکەیت. سوێند بەخوا ئەگەر مامی عوسمان نەدەبوو سەروەری باوەڕدارانم بەقسەکانم خەمبار نەدەکرد، باسی بەشێك لەکردەوەکانی باوکتم دەکرد کە لەراستییەوە دوور نین.

دەڵێت: مەروان پشتی تێکرد و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران قسە بکەم یا بێدەنگ بم؟

وتی: قسە بکە.

وتی: دایك و باوکم بەقوربانی تۆبن. حەزم دەکرد کاتێك ئەو قسانە بێنیتە سەرزمان کەبێ گوناح و پارێزراو دەبوویت بەڵام کاتێك ئەم قسانەت هێناوەتە سەرزمان کەکاروبارەکان و بارودۆخ شڵەژاوە و نیشانەی بێ دەسەڵاتییە. سوێند بەخوا پێداگرتن لەسەر هەڵەیەك کە بەتۆبە راست دەکرێتەوە باشترە لەو تۆبەی ببێتە هۆکاری ترس. ئەگەر دەتخواست بەتۆبە لەخواوەند نزیك ببیتەوە، نەدەبوا دان بەگوناحەکانت بنێیت. ئێستا قەرەباڵغی خەڵکان هاوشێوەی کێوەکان لەبەر دەرگان.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: برۆ قسەیان لەگەڵ بکە چوونکە لەقسە کردن لەگەڵ ئەوان شەرمەزارم.

دەڵێت: خەڵکان بەسەر شان و کۆڵی یەك هەڵدەگەڕان. مەڕوان بەرەو دەرگاکە

ڕۆشت و وتی: بۆ کۆبوونەتەوە، دەڵێی بۆ تالآنی هاتوون؟ ڕوخسارتان قێزەون بێت. هەرکامتان گوێچکەی هاوڕێکەی بگرێت وبڕوات مەگەر ئەو کەسەی کاریان پێی بێت. هاتوون و دەخوازن پاشایەتی لەدەستی ئێمە دەربێنن. بڕۆن چوونکە ئەگەر مەبەستی خراپتان لەسەردا بێت بەلآیەکتان بەسەردا دێنین ڕازی نەبن و لەدەرئەنجامی کارەکانتان سەرتان سوڕبمێنێت. بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆتان چوونکە ئەوەی لەدەستی ئێمەدایە بەزۆر تەسلیمی کەسی ناکەین.

دەڵێت: خەڵکان گەڕانەوە. دەستەیەکیان ڕۆشتنە ماڵی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و لەم ڕووداوە ئاگاداریان کردەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب توڕە ڕۆشتە لای عوسمان کوڕی عەفان و وتی: دەڵێی جگە لەمەت ناوێت و مەروان جگە لەمە ناخوازێت ئاوز و دین لەتۆ بستێنێتەوە. وەك وشتری کاروان بۆ هەرکوێت دەبەن، دەڕۆیت. سوێند بەخوا مەروان نە لەئەنجامی کارەکانی ئاگادارە نەدینی هەیە. سوێند بەخوا دڵنیام تۆ گرفتاری کێشەکان دەکات بەلآم هاوکاریت ناکات. چیتر بۆ سەرکۆنە کردن ناگەڕێمەوە ماڵەکەی تۆ. بڕوای خۆت لەدەستداوە و دەسەلآتت بەفیڕۆ دراوە.

کاتێك عەلی ڕۆشت، نائیلە ڕۆشتە لای هاوسەرەکەی و وتی: قسە بکەم یا بێدەنگ بم؟

وتی: قسە بکە.

وتی: قسەکانی عەلیم بیست کەچیتر ناگەڕێتەوە بۆ لای تۆ. گوێڕایەڵی وتەکانی مەروانیت و بۆ هەر شوێنێك بخوازێت، دەتبات.

وتی: دەبێت چی بکەین؟

وتی: لەخواوەندی تاقانە بترسە و ڕێچکەی دوو هاوڕێکەی خۆت بگرەبەر، ئەگەر ملکەچی فەرمانەکانی مەروان بێت، بەکوشتنت دەدات. مەروان لای خەڵکان پێگە و ڕێزی نییە. خەڵکان بەهۆی مەروانەوە لەدەوری تۆ بلآوەیان لێکردووە. کەس بەدوای عەلی کوڕی ئەبی تالیب بنێرە و داوای ڕێگە چارە لەو بکە چوونکە پێچەوانەی بەرژەوەندی تۆ ناجووڵێتەوە.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان کەسی بەدوای عەلیدا نارد بەلآم نەهات و وتی: پێم وتووە چیتر ناگەڕێمەوە.

دەڵێت: وتەکانی نائیلە بەگوێی مەروان گەیشت و ڕۆشتە لای عوسمان کوڕی عەفان. لەبەردەم ئەو دانیشت و وتی: قسە بکەم یا بێدەنگ بم؟

وتی: قسە بکە.

وتی: ئەم کچی قەرافسە.....

عوسمان کوڕی عەفان وتی: یەك وشەی دیکە سەبارەت بەو بێنیتە سەرزمان، ڕوڕەشت دەکەم چوونکە زیاتر لەتۆ بەرژەوەندی و چاکەی منی دەوێت.

دەڵێت: مەروان بێدەنگ بوو.

عەبدولرەحمان کوڕی ئەسوەد کوڕی عەبد یەغوس دەڵێت: خواوەند مەروان ڕوڕەش بکات. عوسمان کوڕی عەفان هاتەدەر و خەڵکانی ڕازی کرد. لەسەر مینبەر گریا و خەڵکان گریان. ڕیشی عوسمان کوڕی عەفان لەفرمێسك تەڕ ببوو، دەیوت: خواوەند تۆبە بۆ پێشگای تۆ بەرز دەکەمەوە، خواوەند تۆبە دەکەم، خواوەندا تۆبە دەکەم. ئەگەر ڕاستییەکان پێگەی من تا بەندەیەك بێنێتەخوار، ڕازی دەبم. کاتێك گەڕامەوە بۆ ماڵ، وەرنە ماڵەکەم سوێند بەخوا خۆم لەئێوە داناشارم و ڕەزامەندی ئێوە بەدەست دێنم و مەروان و کەسەکانم لەخۆم دوور دەخەمەوە.

دەڵێت: کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵ، فەرمانیدا دەرگاکە بەکراوەیی بهێڵنەوە و ڕۆشتە ژوور. مەروان ڕۆشتە لای و ئەوەندە قسەی بۆ کرد تا بۆچوونی گۆڕا و لەمەبەستەکەی پەشیمانی کردەوە. دوای ئەوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ عوسمان کوڕی عەفان نەهاتەدەر چوونکە شەرمی دەکرد. مەروان هاتە لای خەڵکان و وتی: دوور کەونەوە. مەگەر ئەو کەسەی سەروەری باوەڕداران کاری پێی بێت. بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانی خۆتان، ئەگەر سەروەری باوەڕداران کاری بەئێوە بێت کەسێك دەنێریت بەشوێنتانا.

عەبدولرەحمان دەڵێت: ڕۆشتمە لای عەلی و لەنێوان گۆڕ و مینبەرەکەدا بنیم. عەماری یاسر و محەممەد کوڕی ئەبی بەکر لای ئەو بوون و دەیانوت: مەروان ئەمە و ئەوەی بەخەڵکان وت:

دەڵێت: عەلی ڕووی کردە من و وتی: وتەکانی عوسمانت بیست؟

وتم: بەڵێ.

وتی: وتەکانی مەروانت بیست؟

وتم: بەڵێ.

وتی: پەنا بەخوا، ئەی موسوڵمانان، ئەگەر لەماڵەوە دانیشم، دەڵێت منی پشتگوێ خستووە و ڕێز لەپەیوەندی خزمایەتی ناگرێت؟ ئەگەر قسە بکەم و بەدڵخوازی ئەو بجووڵێمەوە، مەروان دێت و بەو تەمەنەوە و دوای هاودەمی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ))، بۆ هەر شوێنێکی بوێت دەیبات.

عەبدولرەحمان دەڵێت: بەردەوام قسەی دەکرد تا نێردراوی عوسمان کوڕی عەففان هاتە بەشوێنیدا.

عەلی بەدەنگی بەرز و توڕە وتی: پێی بڵێ چیتر ناڕۆمە لای.

دەڵێت: نێردراو ڕۆشت.

دەڵێت: دوو ڕۆژ دواتر عوسمان کوڕی عەففانم بینی بەتەواوی بێ هیوا ببوو. لەناتلی کۆیلەی پرسیم: سەروەری باوەڕداران لەکوێوە دێت.

وتی: ڕۆشتبووە ماڵی عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

دەڵێت: ڕۆژی دواتر لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب بووم، دەیوت: دوێنێکە عوسمان کوڕی عەففان هات و دەیوت: چیتر ئەو کارە ناکەم.

پێم وت: دوای ئەوەی لەسەر مینبەر پێغەمبەر(د.خ) قسەت کرد و بەڵێنت بەخەڵکاندا، گەڕایتەوە بۆ ماڵ و مەروان هاتە لات و لەبەردەرگاکەی تۆ، جوێنی بەخەڵکاندا و ئازاری پێگەیاندن.

عەلی وتی: عوسمان کوڕی عەففان ڕۆشت و دەیوت: ڕێزت لەپەیوەندی خزمایەتی نەگرت، ریسوات کردم و بوێری خەڵکان بۆ سەر من زیادی کردووە.

وتم: سوێند بەخوا ڕێگە نادەم کەس دەستی بەتۆ بگات بەڵام هەرکات شتێك دەڵێم کەگومان دەکەم ڕازی بوویت، مەروان دێت و بۆچوونت دەگۆڕێت و وتەکانی مەروان پێش وتەکانی من دەخەیت و ئەو لەکاروبارەکان بەشدار دەکەیت.

عەلی دەڵێت: عوسمان کوڕی عەففان گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی.

عەبدولرەحمان دەڵێت: عەلی بەهەمان شێوە خۆی لەعوسمان دوور دەخستەوە و کاری بەکارەکانی نەبوو بەڵام دەزانم کاتێك گەمارۆ خرایە سەر عوسمان کوڕی عەففان، لەگەڵ تەڵحە قسەی کرد تا ئاوی بۆ ببەن و لەمکارەیان توڕە بوو تا ئاویان بۆ

سەروەری باوەڕداران برد.

ئیسماعیل کوڕی محەممەد دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان لەڕۆژی هەینی ڕۆشتە سەر مینبەر، سپاسی خوای کرد. دواتر کەسێك هەستا و وتی: بەپێی فەرموودەکانی قورئان کردەوەکانت ئەنجام بدە.

عوسمان کوڕی عەفان پێی وت: دانیشە.

دەڵێت: ئەوکەسە دانیشت و جارێکی دیکە هەستایەوە و وتەکانی دووبارە کردەوە. سەروەری باوەڕداران وتی: دانیشە. دەڵێت: دانیشت و خەڵکان دەستیان بەهاویشتنی وردە بەرد کرد بەشێوەیەك ئاسمان نەدەبینرا. عوسمان کوڕی عەفان لەسەر مینبەرەکەی کەوتەخوار و بێهۆش کەوت و بردیانەوە بۆ ماڵەکەی. یەکێك لەپەردەدارەکانی عوسمان کوڕی عەفان هات، مەسحەفێکی بەدەستەوە بوو. ئەم ئایەی بەدەنگی بەرز دەخوێندەوە:

(( ان الذین فارقوا دینهم و کانوا شیعا لست منهم فی شیئی انما امرهم الی الله.

واتاکەی: ئەوکەسانەی دینەکەی خۆیان بڵاوە پێکرد و بوونە چەندین دەستە، کارت بەوان نییە، کاری ئەوان تەنیا بەخواوەندە.))

دەڵێت: ئەو ڕۆژەی عوسمان کوڕی عەفان بێهۆش بوو، عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەردانی کرد. مناڵەکانی ئومەییە لەدەوری بوون. عەلی وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، چیت بەسەر هاتووە؟

مناڵەکانی ئومەییە یەك زمان پێیان وت: ئەی عەلی، ئێمەت بەکوشتندا و ئەم بەڵایەت بەسەر سەروەری باوەڕداراندا هێنا، سوێند بەخوا ئەگەر بەمەبەستەکەی خۆت بگەیت، دنیات لێ تاڵ دەبێت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب تووڕە هەستا.

لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی عەفان کوژرا.

## گێڕانەوەی کوژرانی عوسمان کوڕی عەففان و چۆنیەتییەکەی

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ئاماژەمان بەزۆر لەو بەڵگانەدا کەبکوژەکانی پشتیان پێ دەبەست و بەشێکیمان باس نەکرد لەبەر ئەوەی چاوپۆشین لەوان پێویست بوو. ئێستا باسی چۆنیەتی کوژرانەکەی دەکەین و ئەوەی سەرەتاکەی چۆن بوو و کێ دەستی پێکرد و پێش کوژران کێ هێرشی کردەسەر.

دایکی بەکر کچی میسوەر کوڕی مەخریمە دەڵێت: ژمارەیەك لەوشترەکانی زەکاتیان بردە لای عوسمان کوڕی عەفان کەبەخشی بەمناڵەکانی حەکەم. ئەم هەواڵە بەگوێی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف گەیشت و کەسی بۆ لای میسوەر کوڕی مەخریمە و عەبدولرەحمان کوڕی ئەسوەد نارد کەوشترەکانیان وەرگرتەوە و عەبدولرەحمان لەناو خەڵکاندا دابەشی کرد. عوسمان کوڕی عەفان لەماڵەوە نەبوو.

عوسمان کوڕی ئەبی شورەید دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان لای جەبەلە کوڕی عەمرۆ ساعدی گوزەری کرد کە لەحەوشی ماڵەکەی دانیشتبوو. زنیجرێکی بەدەستەوە بوو و دەیوت: ئەی نەعسەل سوێند بەخوا دەتکوژم و سوار وشترێکت دەکەم و بەرەو ئاگرت دەبەم.

دەڵێت: ئەو بوو کاتێك عوسمان کوڕی عەفان لەسەر مینبەر بوو پەلاماریدا و هێنایە خوار.

عامر کوڕی سەعد دەڵێت: یەکەم کەس قسەی ناشیرینی بەعوسمان کوڕی عەفان وت جەبەلە کوڕی عەمرۆ ساعدی بوو. رۆژێك لەناو کۆبوونەوەی خەڵکەکەی دانیشتبوو. عوسمان کوڕی عەفان گوزەری کرد. جەبەلە زنجێرێکی بەدەستەوە بوو. کاتێك سەروەری باوەڕداران گوزەری کرد سڵاوی کرد و ئەوان وەڵامیان دایەوە بەڵام جەبەلە وتی: بۆ وەڵامی پیاوێك دەدنەوە کەفلاْنەکار و فیسارە کاری ئەنجام داوە؟

دەڵێت: رووی کردە عوسمان کوڕی عەفان و وتی: سوێند بەخوا یا ئەم زنجیرە لەدەوری گەردنت توند دەکەم یا کەسانی دەوروبەرت پشتگوێ دەخەیت.؟

عوسمان کوڕی عەفان وتی: کام کەسانە؟ سوێند بەخوا من کەس هەڵنابژێرم.

جەبەلە وتی: مەروانت هەڵبژارد، معاویت هەڵبژارد، عەبدوللە کوڕی عامرت هەڵبژارد، عەبدوللە کوڕی سەعدت هەڵبژارد کەقورئان بۆ سەرکۆنە کردنی یەکێك

لەوان هاتۆتەخوار و پێغەمبەر(د.خ) خوێنی ئەوی حەڵاڵ کرد.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان ڕۆشت و خەڵکان بەردەوام بوێرتر دەبوون.

کوڕی حەبیبە دەڵێت: یەکێك لەرۆژکان عوسمان کوڕی عەفان قسەی کرد، عەمرۆ کوڕی عاس وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆ کاری ناڕەوات ئەنجامداوە و ئێمەیش بەهەمان شێوە، تۆبە بکە تا ئێمەیش تۆبە بکەین.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان رووی کردە قیبلە و دەستەکانی بەرز کردەوە.

دەڵێت: هەرگیز بەو ئەندازەیە ژن و پیاوی چاو بەگریانم نەبینیبوو. جارێکی دیکە عوسمان کوڕی عەفان لەگەڵ خەڵکان قسەی کرد، جەهجاهی غەفاری هەستا و هاواری کرد: ئەی عوسمان، وشترێکی پیرم هێناوە کەعابا و زنجیری پێوەیە، وەرەخوار تا عاباکەی بکەمە بەرتۆ و بەرەو کێوەکەت ببەین.

سەروەری باوەڕداران وتی: خوا ڕوڕەشت بکات و ئەوەی هێناوتە، ڕووڕەشی بکات.

باوکی حەبیبە دەڵێت: ئەمە لەناو خەڵکاندا روویدا، کەسانی نزیکی سەروەری باوەڕداران هاتن و ئەویان گەڕاندەوە بۆ ماڵ.

دەڵێت: ئەوە دوایین جار بوو سەروەری باوەڕداران ببینم.

عەبدولرەحمان کوڕی حاتب لەباوکی دەگێڕێتەوە: سەیری عوسمان کوڕی عەفانم دەکرد کەپاڵی بەداردەستەکەی پێغەمبەرەوە دابوو و قسەی دەکرد. ئەو داردەستەی ئەبوبەکر و عومەریش پشتیان پێ دەبەست. جەهجاه پێی وت: ئەی نەعسەل هەستە و لەمینبەر وەرە خوار. داردەستەکەی گرت و کێشای بەقاچی راستی خۆیدا و شکاندی. تەڵزمێکی لەقاچی چەقی و برینەکەی مایەوە تا نەخۆشی خۆرەی گرت و بینیم کرمی هەڵدەهێنا. عوسمان کوڕی عەفان هاتەخوار و ئەویان بردەوە. فەرمانیدا داردەستەکەیان بۆ چاك کردەوە. دوای ئەو رۆژە، عوسمان کوڕی عەفان جارێك یا دووجار هاتەدەر و دوای ئەوە گەمارۆی خرایە سەر و کوژرا.

عەبدولرەحمان کوڕی یەسار دەڵێت: کاتێك خەڵکان کارەکانی عوسمان کوڕی عەفانیان بینی، هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لەمەدینە بۆ ئەوانەی لەویلایەتەکان بوون، نامەیان نووسی. ئێوە ڕۆشتوون و لەرێگەی خوادا جیهاد دەکەن و هەوڵ بۆ سەرخستنی دینی محەممەد دەدەن بەڵام دینی محەممەد لەپشت سەری ئێوە بەفیڕۆ

دراوە، بگەڕێنەوە و دینەکەی زیندوو بکەنەوە. هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لەهەموو ویلایەتەکانەوە گەڕانەوە و عوسمان کوڕی عەفانیان کوشت.

دەڵێت: کاتێك شۆڕشچییەکان گەمارۆی سەر ماڵەکەی عوسمانیان شکاند و گەڕانەوە، ئەو، سەبارەت بەو خەڵکانی هاتبوون و بەتایبەت خەڵکانی میسر کەزیاتر لەهەمووان پێداگرییان دەکرد، نامەی بۆ عەبدوللە کوڕی سەعد کارگوزاری میسر نووسی:

کاتێك فلاَن کەس و فیسارەکەس هاتنە لای تۆ، بیانکوژە و فلاَنە و فیسارەکەس ئەشکەنجە بکە. چەند کەسێکیان لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) و چەند کەسێکیان لەشوێنکەوتەکان بوون.

دەڵێت: نێردراوەکەی عوسمان کوڕی عەفان باوکی ئەعوەر کوڕی سوفیانی سولەمی بوو. عوسمان کوڕی عەفان ئەوی سوار وشترەکەی خۆی کرد و فەرمانی پێدا پێش ئەوەی خەڵکانی میسر بگەنە سەرزەمینەکەیان، خۆی بگەیێنێتە میسر. باوکی ئەعوەر لەرێگا خەڵکانی میسری بینی کەلێیان پرسی: بۆ کوێ دەڕۆیت.

وتی: دەمەوێت بەرەو میسر بڕۆم. یەکێك لەخەڵکانی شام لەتایەفەی خەولان هاوڕێیەتی دەکرد.

وتیان: نامەت پێیە؟

وتی: نە.

وتیان: بۆ چ کارێك تۆیان ڕەوانە کردووە؟

وتی: نازانم.؟

وتی: نامەت پێ نییە و نازانی بۆ چ کارێك دەڕۆیت، سوێند بەخوا گومانمان لەتۆ هەیە.

ئەویان پشکین و نامەکەیان دۆزییەوە کە لەناو دەفرێکی چەرمینی ئاودا شاردبوویەوە. کاتێك سەیری نامەکەیان کرد، فەرمانی کوشتنی چەند کەسێك ئەشکەنجە کردنی چەند کەسێکی دیکەی تیا نووسرا بوو. کاتێك ئەمەیان بینی، بۆ مەدینە گەڕانەوە و خەڵکان لەگەڕانەوەی ئەوان و نامەکە ئاگادار بوونەوە و لەویلایەتەکانی دیکەوە ڕوویان لەمەدینە کرد و خەڵکانی مەدینەیش هاوکارییان

کرد.

محەممەد کوڕی سایبی کەلبی دەڵێت: خەڵکانی میسر دوای ڕۆشتنیان لەبەر ئەوە گەڕانەوە چوونکە یەکێك لەکۆیلەکانی عوسمان کوڕی عەفانیان لەرێگە بینی کە سوار وشترەکەی سەروەری باوەڕداران و نامەیەکی بۆ ئەمیری میسر هەڵگرتبوو کەفەرمانی کوشتن و ئەشکەنجە دانی چەند کەسێکی تیا نووسرا بوو. کاتێك گەڕانەوە بۆ لای عوسمان کوڕی عەفان، وتیان: ئەمە کۆیلەی تۆیە؟

وتی: ئەمە کۆیلەی منە و بیٚ ئاگاداری من ڕۆشتووە.

وتیان: ئەمە وشتری تۆیە؟

وتی: بیٚ ئاگام لەبردنەکەی.

وتیان: ئەنگوستیلەکەی تۆیە؟

وتی: لێیان دروست کردووە.

کاتێك عوسمان کوڕی عەفان بارودۆخی خۆی و ئاژاوەچییەکانی بینی، نامەی بۆ معاویە کوڕی ئەبوسوفیان لە شام نووسی: بەم ناوەرۆکە:

((بەناوی خواوەند بەخشندەی مێهرەبان

خەڵکانی مەدینە کافر بوون و چیتر گوێرایەڵی فەرمانەکان نین و پەیمانیان شکاندووە، لەجەنگاوەرانی شام، هەرکەس دەتوانێت، ڕەوانەی مەدینەی بکە.))

دەڵێت: کاتێك نامەکەی بەدەستی معاویە گەیشت، سستی لەخۆی نیشاندا چوونکە دژایەتی کردنی کۆبوونەوەی هاوەڵانی پێغەمبەری پەسەند نەدەکرد. کاتێك وەڵامەکەی معاویە زۆری پێچوو، سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ یەزید کوڕی ئەسەد کوڕی کورز و خەڵکانی شام نووسی تا بەرەو مەدینە بەرێکەون. ئامارژەی بەچاکییەکانی خۆی کرد و باسی خەلیفەکانی هێنایە ئاراوە کەخواوند فەرمانی گوێرایەڵیی کردنی ئەوانی داوە. بەڵێنی دا ئەوان دەکات سوپا و کەسانی نزیکی خۆی و وتی: ئەگەر هاوکاریم دەکەن، پەلە بکەن، پەلە بکەن چوونکە ئەم خەڵکە لەزووترین کات هێرش دەکەنە سەرمن.

دەڵێت: کاتێك نامەکەیان بۆ ئەوان خوێندەوە، یەزید کوڕی ئەسەدی بێجلی قەسری هەستا، سپاسی خوای کرد و دواتر باسی چاکییەکانی سەروەری باوەڕدارانی هێنایە سەرزمان. ئەوەی بەخاوەن حەق زانی و کەسانی بۆ هاوکاری

کردنی ئەو هاندا و وتی دەبێت سوار لەسەر ئەسپ بەرەو مەدینە بەرێکەوێت. کەسانێکی زۆر شوێنی کەوتن و بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ. کاتێك گەیشتنە وادی ئەلقورا لەکوژرانی عوسمان کوڕی عەفان ئاگادار بوونەوە وبەناچاری گەڕانەوە.

هەروەها عوسمان کوڕی عەفان نامەی بۆ عەبدوللە کوڕی عامر نووسی و داوای کرد سوپای خەڵکانی بەسرە ڕەوانەی مەدینە بکات. نامەکەی هاوشێوەی نامەی خەڵکانی شام بوو. عەبدوللە کوڕی عامر کەسانێکی کۆکردەوە و نامەکەی عوسمان کوڕی عەفانی بۆ خوێندنەوە. چەند کەسێك لەخەڵکانی بەسرە هەستان و بۆ بەرێکەوتن بۆ مەدینە و هاوکاری کردنی سەروەری باوەڕداران خەڵکیان هاندا. یەك لەوان موجاشیع کوڕی مەسعودی سولەمی بوو کەپێش هەمووان دەستی بەقسە کردن کرد. ئەو، لەو ڕۆژگارەدا سەرکردەی قەیسییەکانی بەسرە بوو. قەیس کوڕی هەیسەمی بەسری قسەی کرد و خەڵکی بۆ هاوکاری کردنی سەروەری باوەڕداران هاندا و خەڵکان بەخێرایی خۆیان ئامادە کرد. عەبدوللە کوڕی عامر سەرکردایەتی ئەوان بەموجاشیع کوڕی مەسعودی سولەمی سپارد و لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت بەڵام کاتێك گەیشتنە ڕەبزە و پێشەنگەکانی خەڵکی زەرار گەیشتن، لەکوژرانی عوسمان کوڕی عەفان ئاگادار بوونەوە.

عەبدوللە کوڕی زوبەیر لەباوکی دەگێڕێتەوە: خەڵکانی میسر لەسەقیایازی خەشبەوە نامەیەکیان بۆ عوسمان کوڕی عەفان نووسی. کەسێك نامەی گەیاند بەڵام وەڵامی نەدایەوە و فەرمانی دەرکردنی نێردراوەکەیدا. میسرییەکان شەشسەد کەس بوون لەدەوری چوار ئاڵا و چوار سەرکردە. سەرکردەی هەموویان عەمرۆ کوڕی بودەیل کوڕی وەرقای خوزاعی لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بوو لەگەڵ عەبدولرەحمان کوڕی عەدیسی تەجیبی. نامەی میسرییەکان بەمشێوە بوو:

بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

بەڵام دواتر، بزانە خواوەند بارودۆخ ناگۆڕێت تا ئەو کاتەی خەڵکان خۆیان بگۆڕن. خواوەندا، خواوەندا، دووبارە خواوەندا، ئێستا کەدنیا هەیە، ئەو دنیایشی پەیوەست بکە و بەشی ئەو دنیایی خۆت لەبیرمەکە چوونکە کاروبارەکانی دنیا بۆ تۆ هەمیشەیی نیە. دڵنیا بە ئێمە، سوێند بەخوا لەبەر فەرمانەکانی خواوەند تووڕە

دەبین و بەرەزامەندی ئەو شادمانین. شمشێرەکانی خۆمان دانانێین تا ئەو کاتەی لەتۆبەی ئاشکرا و راشکاوی تۆ دڵنیا دەبین، بانگەواز و پەیامی ئێمە بۆ تۆ ئەوەیە و خواوەند بەڵگە و پاساوی روونی خستووینەتە بەردەست.

دەڵێت: خەڵکانی مەدینەیش نامەیان بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی وپێشنیاری تۆبەیان پێکرد و بەڵگەیان بۆ هێنایەوە و سوێندیان خوارد دەستی لێ هەڵناگرن تا ئەو کاتەی خوێنی دەرێژن یا ئەوەی ناچاری دەکەن ئەرکە خواییەکان بەباشترین شێوە ئەنجام بدات. کاتێك عوسمان کوڕی عەفان مەترسی کوژرانی کرد، لەگەڵ چاکەخوازان وکەسانی نزیکی خۆی راوێژی کرد و وتی: وتە و کرداری ئەم خەڵکەتان بینیوە، دەبێت چی بکەین؟

پێیان وت: کەس بەدوای کوڕی ئەبی تالیب بنێرە و داوای لێبکە بیانگەڕێنێتەوە و بەڵێنیان پێبدات و کاتیان لێ وەربگرێت تا هێزی پشتیوان دەگات.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: ئەم خەڵکە بەوە رازی نابن و پەیمانی منیان دەوێت چوونکە پێشتر ئەو کارەم کردووە و کاتێك پەیمان بدەم چاوەڕوانن ئەنجامی بدەم.

مەروان کوڕی حەکەم وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بەردەوام پەیوەندییان پێوە بکە تا هێزی پشتیوان دەگات باشترە لەوەی رووبەروویان ببیتەوە، بەڵێنیان پێ بدە تا کاتی زیاترت دەستکەوێت چوونکە ئەوان یاخین و هیچ پەیمانێکیان نییە.

عوسمان کوڕی عەفان کەسی بەدوای کوڕی ئەبی تالیب نارد و کاتێك هات، وتی: ئەی باوکی حەسەن، هەڵسوکەوتی خەڵکانت بینیوە و ئاگاداری کردەوەکانی منیت، دەترسم بمکوژن، بیانگەڕێنەرەوە. سوێند بەخوا بەڵێن دەدەم لەوەی پەسەندی ناکەن خۆم دوور بخەمەوە و سەبارەت بەخۆم و کەسانی دیکە دادپەروەری بکەمە پیشە تەنانەت ئەگەر خوێنم برێژن.

عەلی وتی: دادپەروەری تۆ بۆ خەڵکان لەکوشتنت باشترە، بەڵێنتدا لەوەی پەسەندی ناکەن خۆت بەدوور بگریت و من ئەوانم گەڕاندەوە بەلاّم بەڵێنەکەی خۆت نەبردە سەر، ئەمجارەیان فریوم مەدە چوونکە بەنوێنەرایەتی تۆ بەڵێن دەدەم رێگەی راست بگریتەبەر.

وتی: بەڵێن بدە سوێند بەخوا بەڵێنەکەم دەبەمە سەر.

عەلی رۆشتە لای خەڵکان و وتی: ئەی خەڵکینە! داوای دادپەروەریتان دەکرد و

بەڵێنتاندا. سەروەری باوەڕداران دەڵێت: دادپەروەری سەبارەت بەخۆی و کەسانی دیکە سەقامگیر دەکات و لەوەی پەسەندی ناکەن خۆی دوور دەخاتەوە. بەبەڵێنەکەی رازی بن.

وتیان: رازی دەبین بەڵام دەبێت دڵنیا بین، سوێند بەخوا بەوتاری بێ کردار رازی نابین.

عەلی وتی: ئەو کارە دەکەم.

گەڕایەوە بۆ سەروەری باوەڕداران و لەوتەکانی ئەوان ئاگاداری کردەوە.

وتی: لەنێوان من و ئەوان کاتێك دیاری بکە چوونکە پێویستە کاتی تایبەتم لەبەردەستا بێت لەبەر ئەوەی گۆڕینی ئەوەی ئەوان خوازیارن پێی، لەیەك رۆژدا ئەگەری نییە.

عەلی وتی: ئەوەی لەمەدینەدایە پێویستی بەکات نییە و ئەوەی لەشوێنەکانی دیکەدایە ئەوەندەی کات دەوێت تا فەرمانەکانی تۆ بگات.

سەروەری باوەڕداران وتی: رازیم، بەڵام بۆ سامان دانی کارەکانی مەدینە سێ رۆژ مۆڵەتم پێبدە.

عەلی وتی: رازیم.

دواتر گەڕایەوە بۆ لای خەڵکان و لەوتەکانی سەروەری باوەڕداران ئاگاداری کردنەوە. لەنێوان ئەوان و عوسمان کوڕی عەفان پەیمان نامەیەکی نووسی و سێ رۆژ مۆڵەتی پێدا تا ستەمکارییەکان لەناو ببات و هەر کارگوزارێك کەخەڵکان پەسەندی نەکەن، لەسەر کار لایببات. چەند کەسێك لەموهاجیر و ئەنسارەکانی کردە شایەتی پەیمان نامەکە.

موسوڵمانان دەستیان لە سەروەری باوەڕداران هەڵگرت وگەڕانەوە بەو مەرجەی بەڵێنەکانی خۆی بباتەسەر. بەڵام ئەو خۆی بۆ جەنگ ئامادە دەکرد و چەکی کۆدەکردەوە. سوپایەکی فراوانی لەکۆیلەکانی پێنج یەك تەیار کرد و دوای بەسەر چوونی سێ رۆژ ئەو مایەوە بێ ئەوەی گۆڕانکاری لەکار و فەرمانەکانی بکات و هیچ کام لەکارگوزارەکانی لەسەر کار لانەبرد. خەڵکان ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و عەمرۆ کوڕی باوکی حەزمی ئەنساری ڕۆشتە لای خەڵکانی میسر لەزی خەشب و

لەبەسەرهاتەکە ئاگاداری کردنەوە. لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت تا گەیشتنە مەدینە و کەسیان بۆ لای سەروەری باوەڕداران ناردو وتیان: گەڕانەوەی ئێمە بەهۆی ئەوە بوو کەبەڵێنتدا لەکردەوەکانی خۆت پەشیمان دەبیتەوە و تۆبە دەکەیت و لەوەی پەسەندی ناکەین، خۆت بەدوور دەگریت و بەناوی خواوەند بەڵێن و پەیمانت بەئێمەدا.

وتی: بەڵێ، راستە.

وتیان: کەواتە ئەم نامە چییە کە لەنێردراوەکەی تۆمان گرت کە بۆ کارگوزارەکەی خۆتت نوسیوە.

وتی: وتی نەمکردووە و لەوەی باسی دەکەن بێ ئاگام.

وتیان: نێردراو لەسەر وشتری تۆ و نوسراوی دەبیری تۆ بەمۆری تۆ.

وتی: وشترەکەیان دزیوم، مۆرەکەیشیان دروست کردۆتەوە.

وتیان: پەلە ناکەین، کارگوزارە خراپەکارەکانت لەکارەکانیان دوور بخەرەوە و کەسانێك وەك ئەمیر دەستنیشان بکە پارێزەر گیان و سامان و خوێنی ئێمە بن و مافەکانمان بۆ بگێڕنەوە.

وتی: هەرکەس پەسەند بکەن، کاروبارەکان بەو بسپێرم و هەرکەس پەسەند نەکەن، لەسەر کار دووری بخەمەوە، کەواتە من چ کارەم! هەموو شتێك بەفەرمانی ئێوەیە.

وتیان: سوێند بەخوا یا ئەو کارە دەکەیت، یا خەلافەتت لێ دەستێنینەوە یا خوێنت دەرێژین. تێفکرە و دەست لەخەلافەت هەڵبگرە.

بەڵام عوسمان کوڕی عەفان رازی نەبوو و وتی: ئەو جل و بەرگەی خواوەند کردوویەتیە بەرم، هیچ کات دەری ناهێنم.

دەڵێت: بۆ ماوەی چل رۆژ گەمارۆیاندا و تەڵحە پێشنوێژی بۆ خەڵکان دەکرد.

وەساب یەکێك بوو لەئازاد کراوەکانی عومەر کوڕی خەتاب و لەکاتی گەمارۆ خستنە سەر عوسمان کوڕی عەفان، دوو برین لەقوڕگی دەرهاتبوو کەشوێنەکەی هاوشێوەی دوو جومگە بەدەرەوە بوو، دەڵێت: سەروەری باوەڕداران منی نارد تا ئەشتەر ببەمە لای. ئەشتەر هات، پشتییەکەم بۆ سەروەری باوەڕداران دانا بۆ ئەشتەریش بەهەمان شێوە.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران وتی: ئەی ئەشتەر خەڵکان چییان لەمن دەوێت؟

وتی: سێ شت کەدەبێت یەکیان ئەنجام بدرێت.

وتی: چییە؟

وتیان: سەرپشکت دەکەن لەوەی دەست لەخەلافەت هەڵبگریت و کاروبارەکان بەوان بسپێریت تا بەدڵخوازی خۆیان کەسێك وەك خەلیفە هەڵبژێرن یا قیساس لەخۆت وەربگریت. ئەگەر بەم دوو کارە ڕازی نەبوویت، دەتکوژن.

وتی: دەبێت یەکێك لەو دوو کارە ئەنجام بدرێت؟

وتی: دەبێت یەکێك لەو دوو کارە ئەنجام بدرێت.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: ئەوەی دەڵێی دەبێت دەست لەخەلافەت هەڵبگرم، کەسێك نیم، ئەو جل و بەرگەی خواوەند منی پێ داپۆشیوە، دابنێم.

لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە کەوتی: ئەگەر بمکوژن باشترە لەوەی ئەو جل و بەرگەی خواوەند منی پێ داپۆشیوە، دەربهێنم و ڕێگە بۆ ئۆمەتی محەممەد خۆش بکەم هێرش بکەنە سەر یەك.

وەساب دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان وتی: ئەوەی دەڵێی دەبێت قیساس لەخۆم وەربگرم، سوێند بەخوا دڵنیام دوو هاوڕێکەی پێش خۆم سزای کەسانیان دەدا جیاواز لەوە جەستەی من بەرگەی قیساس ناگرێت. بەڵام ئەوەی دەڵێی دەمکوژن، سوێند بەخوا ئەگەر خوێنم بڕێژن دووای من چیتر هیچ کات یەك ناگرنەوە و هیچ کات پێکەوە نوێژ ناخوێنن و دوای من هیچ کات لەیەك سوپادا لەگەڵ دوژمنان ناجەنگن.

دەڵێت: ئەشتەر هەستا و ڕۆشت و ئێمە چەند ڕۆژێکی دیکە چاوەڕوان بووین.

دەڵێت: پیاوێك هات هاوشێوەی گورگ، لەدوورەوە سەیری دەکرد. گەڕایەوە و محەممەد کوڕی ئەبی بەکر لەگەڵ سیانزە کەس هات و کاتێك لە سەروەری باوەڕداران نزیك کەوتەوە، ڕیشی ئەوی گرت و ڕایکێشا بەشێوەیەك کەدەنگی ددانەکانیم بیست، وتی: معاویە هیچ کارێکی بۆ نەکردیت، کوڕی عامر فریات نەکەوت، ئەو نامانەی ناردت، هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندیت.

سەروەری باوەڕداران وتی: کوڕی برام، ڕیشم بەربدە، ڕیشم بەربدە.

دەڵێت: محەممەدم بینی بەدەست ئاماژەی بۆ یەکێك لەو پیاوانە کرد کەمەستا و بەتیر سەری سەروەری باوەڕدارانی بریندار کرد.

بێژەر دەڵێت: وتم: دواتر چی روویدا؟

وتی: هەمووان پێکەوە کوشتیان.

محەممەد کوڕی موسلیمە دەڵێت: لەگەڵ چەند کەسێك ڕۆشتمە لای میسرییەکان، سەرکردەکانیان چوار کەس بوون: عەبدولرەحمان کوڕی عەدیسی بەلەوی، سودان کوڕی حیمرانی مورادی، عەمرۆ کوڕی حەمەقی خوزاعی – ئەم ناوە زیاتر لەوانی دیکە ناوبانگی دەرکردبوو تا ئەو جێگەی عوسمان کوڕی عەفانیان بەزیندانی کوڕی حەمەق ناو دەبرد— و کوڕی نەباع.

دەڵێت: ڕۆشتمە لایان کە لەخێوەتێکدا بوون و خەڵکان لەدەوریان کۆببوونەوە.

دەڵێت: باسی مافەکانی سەروەری باوەڕداران و بەیعەتی خۆیانم کرد و لەفیتنە و ئاژاوە ئەوانم ترساند و وتم کوشتنی ئەو دەبێتە هۆی دوو بەرەکی و کارێکی دژوارە و هیوادارم ئەو کارە نەکەن. ئەو لەکار و کردەوەکانی خۆی پەشیمان دەبێتەوە و من دەبمە دەستەبەری ئەو.

وتیان: ئەگەر پەشیمان نەبوویەوە؟

وتم: ئەوسا چیتان پێخۆشە ئەنجامی بدەن.

دەڵێت: ئەوان ڕۆشتن و شادمان بوون. گەڕامەوە بۆ لای سەروەری باوەڕداران و وتم: دوو بەدوو گفتوگۆ دەکەین.

دەڵێت: دوو بەدوو دانیشتین. پێم وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، گیانت لەمەترسیدایە، ئەم خەڵکە بەمەبەستی کوشتنی تۆ هاتوون، هاوەڵانت تۆیان بەتەنیا جێ هێشتووە و لایەنگری لەدوژمنەکەت دەکەن.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران بەڵێنی دا و داوای پاداشتی خوایی بۆ کردم.

دەڵێت: سەروەری باوەڕدارانم بەجێهێشت و ماوەیەك تێپەڕی. دوای ئەوە عوسمان کوڕی عەفان سەبارەت بەگەڕانەوەی میسرییەکان قسەی دەکرد و وتی: بۆیە هاتبوون چوونکە هەواڵی ناڕاستیان بیستبوو و کاتێك دڵنیا بوون گەڕانەوە. دەمویست بڕۆمە لای و بەسەرهاتەکەی بیربێنمەوە بەڵام بێدەنگ بووم. لەناکاو بیستم کەسێك دەیوت: میسرییەکان گەڕاونەتەوە و هەنووکە لەسوەیدان.

وتم: ڕاست دەکەیت؟

وتی: بەڵێ.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران کەسی بەدوای مندا نارد. ئاشکرا بوو ئەویش ئاگادار بۆتەوە. لەم کاتەدا میسرییەکان لەزی خەشەب دابەزیبوون. پێی وتم: ئەی باوکی عەبدولرەحمان، ئەم خەڵکە گەڕاونەتەوە، دەبێت چی بکەین؟

وتم: سوێند بەخوا نازانم بەڵام دڵنیا بۆ مەبەستی خێر نەهاتوون.

وتی: بڕۆ وبیانگەڕێنەرەوە.

دەڵێت: وتم: سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەم.

وتی: بۆ؟

وتم: چوونکە بەڵێنم پێدان دەست لەکارەکانت هەڵبگریت بەڵام تۆ ئەو کارەت نەکرد.

وتی: داوای هاوکاری لەخوا دەکەم.

دەڵێت: هاتمەدەر. میسرییەکان هاتن و لەبازاری مەدینەدا بڵاو بوونەوە و گەمارۆیان خستە سەر عوسمان کوڕی عەفان.

دەڵێت: عەبدولرەحمان کوڕی عەدیس لەگەڵ سودان کوڕی حیمران و دوو هاورێکەی دیکەی دەهاتنە لای من و دەیانوت: ئەی باوکی عەبدولله لەبیرتە قسەت لەگەڵ ئێمە کرد و ئێمەت گەڕاندەوە و گومانت کرد هاورێکەت دەست لەکارە ناپەسەندەکانی هەڵدەگرێت.

وتم: بەڵێ.

وتی: سەفحەیەکی بچووکیان هێنا. لوولەیەکی سوربی بوو. دەیانوت: وشترێك لەوشترەکانی زەکاتمان بینی کەکۆیلەکەی سەروەری باوەڕدارانی بەسەرەوە بوو. بارەکەیمان گرت و ئەم نامەمان دۆزییەوە. ناوەرۆکەکەی بەمشێوەیە:

بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

بەڵام دواتر، کاتێك عەبدولرەحمان کوڕی عەدیسی بەلەوی گەڕایەوە میسر، سەد قامچی لێ بدە و سەر وریشی بتاشە و زیندانی بکە تا فەرمانەکانی منت پێ دەگات، لەگەڵ عەمرۆ کوڕی حەمەقیش بەهەمان شێوە. سودان کوڕی حیمرانیش بەهەمان

شێوە، عوروە کوڕی نەباعی لەیسیش بەهەمان شێوە.

دەڵێت: وتم: چۆن دڵنیان سەروەری باوەڕداران ئەم نامەی نووسیوە؟

وتیان: ئەگەر مەروان لەزمانی عوسمان کوڕی عەفانەوە ئەو کارەی کردبێت، خراپترە، دەبێت دەست لەخەلافەت هەڵبگرێت.

وتیان: ئێمە ببە لای عوسمان کوڕی عەفان چوونکە لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب قسەمان کرد و ئەو بەڵێنی داوە کاتێك نوێژی نیمەڕۆی خوێند لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان قسە دەکات. ڕۆشتینە لای سەعد کوڕی وەقاس و وتی: خۆم لەم کارە هەڵناقورتێنم، ڕۆشتینە لای سەعید کوڕی زەید و ئەویش بەهەمان شێوە وەڵامی داینەوە.

وتم: کاتی ئێوە لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب چ کاتێکە؟

وتیان: بەڵێنی داوە دوای ئەوەی نوێژی نیمەڕۆی خوێند بڕواتە لای.

دەڵێت: لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نوێژم خوێند. دواتر پێکەوە ڕۆشتینە لای عوسمان کوڕی عەفان، وتمان: میسرییەکان لەبەردەگان و سەروەری باوەڕداران مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی پێدان.

دەڵێت: مەروان لای ئەو دانیشتبوو، وتی: بەقوربانت بم، ڕێگە بدە من قسەیان لەگەڵ بکەم.

سەروەری باوەڕداران وتی: خوا دەمت بشکێنێت، هەستە بڕۆ، پێویست ناکات تۆ خۆت لەم قسانە هەڵقورتێنیت.

دەڵێت: مەروان ڕۆشت و عەلی کوڕی ئەبی تالیب رووی کردە سەروەری باوەڕداران. میسرییەکانیش هەمان داوایان لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب کردبوو. عەلی لەناوەڕۆکەی نامەکەی ئاگاداری کردەوە و عوسمان سوێندی خوارد نەینووسیوە و ئاگاداری نییە و کەس راوێژی لەگەڵ نەکردووە.

محەممەد کوڕی موسلیمە وتی: راست دەکات ئەوە کاری مەروانە. با بێن و پاساوەکەی تۆ ببیستن.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان رووی کردە عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتی: من خزمی تۆم، سوێند بەخوا ئەگەر ئەم گرفتارییە بۆتۆ دروست دەبوو، بۆ نەهێشتنی هەوڵم دەدا. بڕۆ قسەیان لەگەڵ بکە چوونکە گوێرایەڵی وتەکانی تۆن.

عەلی وتی: سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەم، مۆڵەتیان پێ بدە با بێت و پاساوەکانی خۆت باس بکە.

عوسمان کوڕی عەففان وتی: مۆڵەتیان هەیە.

دەڵێت: هاتن و هاوشێوەی خەلیفە سڵاویان لێنەکرد، دڵنیا بووم مەبەستی شەڕیان هەیە.

وتیان: سڵاوتان لێ بێت.

وتمان: سڵاو لەئێوە بێت.

دەڵێت: میسرییەکان دەستیان بەقسە کردن کرد. سەرەتا کوڕی عەدیسیان پێشت خست کەباسی کردەوەکانی کوڕی سەعدی لەمیسر کرد و وتی: لەگەڵ موسوڵمانان و ئەهلی زەممە بەشێوەیەکی ستەمکارانە مامڵە دەکات و بۆ دابەش کردنی تالأنییەکان دادپەروەری ناکات. کاتێك لەمبارەوە گفتوگۆی لەگەڵ دەکەین دەڵێت ئەمە نامەی سەروەری باوەڕدارانە و بەمشێوەیە فەرمانی پێداوم. دواتر سەبارەت بەکارەکانی عوسمان کوڕی عەففان لەمەدینە قسەی کرد کەپێچەوانەی کردەوەکانی دوو خەلیفەکەی پێشووترە. کوڕی عەدیس وتی: لەمیسرەوە هاتووین و مەبەستی کوشتنی تۆمان لەسەردا بووە یا ئەوەی دەست لەخەلافەت هەڵبگریت بەڵام عەلی کوڕی ئەبی تالیب و محەممەد کوڕی موسلیمە ئێمەیان گەڕاندەوە و محەممەد بەڵێنیدا دەست لەکارە ناپەسەندەکانت هەڵدەگریت.

دواتر رووی کردە محەممەد و وتی: مەگەر تۆ ئەو بەڵێنەت بەئێمەنەدا.

دەڵێت: وتم: بۆ نا.

وتی: ئێمە گەڕاینەوە بۆ سەرزەمینی خۆمان و پشتمان بەهاوکاری خواوەند دەبەست چوونکە دژی تۆ چەندین بەڵگەی روون و ئاشکرامان لەبەردەستا بوو. کاتێك گەیشتینە بوەیب، کۆیلەکەی تۆمان گرت و نامەکەی تۆ بەمۆری تۆمان کە بۆ عەبدوللە کوڕی سەعدت نووسیبوو، لێسەند. فەرمانت دابوو قامچی لەئێمە بدات وسەر وڕیشمان بتاشێت و زیندانیمان بکات.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەففان سپاسی خوار کرد و وتی: سوێند بەخوا من نەمنوسیوە و فەرمانم نەداوە و کەس راوێژی پێ نەکردووم و ئاگاداری نیم.

دەڵێت: من و عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێکەوە وتمان: ڕاست دەکات.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران لەمە شادمان بوو.

بەڵام میسرییەکان وتیان: کێ نووسیویەتی؟

وتی: نازانم.

وتی: ئایا ئەوەندە دەسەڵاتیان هەیە کۆیلەکەی تۆ بنێرن و وشترێك لەوشترەکانی زەکاتی پێ بدەن و مۆری تۆ لەنامەکان بدەن و فەرمانی لەو شێوەیە بۆ کارگوزارەکانت بنوسێت بێ ئەوەی ئاگادار بیت؟

وتی: بەڵێ.

وتیان: کەسێکی وەك تۆ شیاوی خەلافەت نییە، دەست لەخەلافەت هەڵبگرە چوونکە سوێند بەخوا خواوەند تۆی لەسەر کار لابردووە.

وتی: ئەو کراسەی خواوەند منی پێ داپۆشیوە، هیچ کات دەری ناهێنم.

دەڵێت: دەنگە دەنگ بەرز بوویەوە. گومانم کرد ناڕۆن تا ئەو کاتەی پەلاماری دەدەن.

دەڵێت: عەلی هەستا و ڕۆشت. کاتێك ئەو هەستا، منیش هەستام.

دەڵێت: بەمیسرییەکانی وت: بڕۆن. ڕۆشتن.

دەڵێت: گەڕامەوە بۆ ماڵەکەی خۆم. عەلی کوڕی ئەبی تالبیش گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی. میسرییەکان گەمارۆیان لەسەر سەروەری باوەڕداران دانابوو تا ئەو کاتەی کوشتیان.

سوفیان کوڕی ئەبی عەوجا دەڵێت: یەکەم جار کەمیسرییەکان هاتن عوسمان کوڕی عەفان لەگەڵ محەممەد کوڕی موسلیمە قسەی کرد و ئەو لەگەڵ پەنجا کەس لەئەنسار لەزی خەشەب ڕۆشتە لایان و ئەوانی گەڕاندەوە. میسرییەکان ڕۆشتن و کاتێك گەیشتنە بوەیب، یەکێك لەکۆیلەکانی سەروەری باوەڕدارانیان بینی کەنامەیەکی بۆ عەبدوللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح دەبرد و گەڕانەوە و هێرشیان کردە سەر مەدینە. ئەشتەر و حەکیم کوڕی جەبەلە بەجێمابوون. نامەکەیان نیشاندان کە سەروەری باوەڕداران حاشای لەنووسینی کرد و وتی: نامەیەکی دەسکردە.

وتیان: نامەکە لەلایەن دەبیرەکەی تۆوە نووسراوە؟

وتی: بەڵێ بەڵام بێ مۆڵەت وەرگرتن لەمن.

وتیان: نێردراوەکە کۆیلەی تۆیە؟

وتی: بەڵێ بەڵام بێ پرسی من بەرێکەوتووە؟

وتیان: وشترەکە وشتری تۆیە؟

وتی: بەڵێ، بەڵام بێ ئاگاداری من بردوویانە.

وتیان: یا ڕاست دەکەیت یا درۆ، ئەگەر درۆ دەکەیت شیاوی ئەوەیت لەخەلافەت دوور بخرێیتەوە چوونکە فەرمانت داوە بەناڕەوا خوێنی ئێمە برێژن و ئەگەر راست بکەیت، دووبارە شیاوی لەسەر کار لابرانیت چوونکە کەسێکی لاواز و بێ ئاگا لەکاروبارەکان و کەسانێکی خراپەکار دەوریان گرتوویت. شیاو نییە کەسێك خەلیفەی ئێمە بێت بەهۆی بێ ئاگایی و لاوازی فەرمانی کارێکی لەم شێوە بێ ئاگاداری ئەو دەربکەن.

هەروەها وتیان: تۆ یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) و کەسانی دیکەت سزاداوە لەبەر ئەوەی مۆجیاری تۆیان دەکرد و دەیانوت پێبەندی راستییەکان بیت. ئەوان کردەوەکانی تۆیان پەسەند نەدەکرد. ستەمت لەو هاوەڵەی پێغەمبەر(د.خ) کردووە و دەبێت قیساسی خۆت بکەیت.

وتی: پێشەوا هەڵە دەکات و کاری چاکەیش ئەنجام دەدات. من خۆم قیساس ناکەم. ئەگەر سەبارەت بەهەرکەس کەهەڵەم کردووە، خۆم قیساس بکەم، گیانی خۆم دەخەمە مەترسییەوە.

وتیان: کاری ناڕەوات ئەنجام داوە کەبەهۆیانەوە شیاوی لەسەر کار لابرانیت. کاتێك لەو بارەوە گفتوگۆت لەگەڵ دەکەن، تۆبە دەکەیت بەڵام دووبارە لەسەر ئەنجامدانیان بەردەوام دەبیت. ئێمە هاتینە لای تۆ و تۆبەت کرد و بەڵێنت دا بۆ ڕێگەی راست بگەڕێیتەوە. محەممەد کوڕی موسلیمە سەرکۆنەی ئێمەی کرد و بەڵێنیدا چیتر ئەو کارانە دووبارە نابێتەوە بەڵام ڕێزی بەڵێنەکەی ئەویشت نەگرت و بەهۆیەوە بێزاری خۆی لەتۆ دەربڕی و وتی خۆی لەکارەکانی تۆ هەڵناقورتێنێت. یەکەم جار گەڕاینەوە تا هیچ بەڵگە و پاساوێکت بەدەستەوە نەبێت و خواوەندت کردە شایەت بەڵام نامەکەی تۆ بۆ کارگوزارەکەت بەدوای ئێمەدا ڕەوانە کرا

کەفەرمانی کوشتنی ئێمەی تیا نووسرا بوو. گومان دەکەیت بیٚ ئاگاداری تۆ ئەو کارەیان کردووە بەلاٚم نامەکە بەکۆیلەکەی تۆ و سوار وشترەکەی تۆ و دەسخەتی دەبیرەکەی تۆ و مۆری تۆی پێوەیە. بۆیە شیاوە تۆمەتی قێزەونت بۆ هەڵبەستن. جیاواز لەمە ستەمکاریت کردە پیشە و لەکاروباری دابەش کردنی تالاٚنییەکان، سزادانی کەسان و تۆبە و گەڕانەوە لەگوناحەکان. جارێك گەڕاوینەتەوە بەلاٚم چیتر ناگەڕێینەوە تا لەسەر کار دوورت بخەینەوە و یەکێك لەهاوەلاٚنی پێغەمبەر(د.خ) لەجێگەی تۆ دابنێین کەهاوشێوەی کردەوە ناپەسەندەکانی تۆی ئەنجام نەدابێت و هیچ تۆمەتێکی لەسەر نەبێت. دەستبەرداری خەلافەت بە و خۆت لەبەرێوەبردنی کاروبارەکان بەدوور بگرە و بەمشێوەیە لەئەرك و ئازارەکانی ئێمە بەدوور دەبیت.

عوسمان وتی: ئەوەی پێتان خۆش بوو باستان کرد؟

وتیان: بەڵیٚ.

وتی: سپاسی خوا دەکەم و پشت بەهاوکاری ئەو دەبەستم، باوەڕم پێیەتی و تاکە پشتیوانی منە و شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی نییە و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە و ئەوی بەدینی رزگاری بۆ لای ئێمە ڕەوانە کردووە تا بەسەر هەموو دینەکانی دیکە سەرکەوێت هەرچەندە ناباوەڕان نەخوازن. ئێوە لەقسە کردن زێدەڕۆیتان کرد و لەهەڵسەنگاندن دادپەروەریتان نەکردە پیشە. ئەوەی دەڵێن دەبێت دەست لەخەلافەت هەڵبگرم، ئەو کراسەی خواوەند بەهۆیەوە ڕێزی لیٚ گرتووم، هیچ کات دەریناهێنم بەلاٚم تۆبە دەکەم و لەکردەوەکانم پەشیمان دەبمەوە و ئەو کارانەی موسوڵمانان پەسەندی ناکەن، چیتر ئەنجامی نادەم. سوێند بەخوا، نیازمەندی خوام و تەنیا لەو دەترسم.

وتیان: ئەگەر ئەمە یەکەم کاری هەڵەی تۆدەبوو و دواتر تۆبەت دەکرد و تۆبەکەت دەشکاند، دەبوا رازی ببین و بگەڕێینەوە بۆ سەرزەمینەکەمان بەلاٚم پێشتر چەندین جار بەڵێنت داوە و خۆت دەزانی. جاری پێشوو گەڕاینەوە و بیٚ ئەوەی بیر لەوە بکەینەوە سەبارەت بەئێمە نامە بۆ کارگوزارەکەت دەنووسیت. ئێستا دڵنیا کاتێك تۆبە دەکەیت، ڕێز لەتۆبەکەی خۆت ناگریت، چۆن بەتۆبەکەی تۆ رازی ببین؟ ناڕۆین تا لەخەلافەت دوورت دەخەینەوە و کەسێکی دیکە بۆ ئەو کارە رادەسپێرین و ئەگەر خزم وکەس و کار و شوێنکەوتەکانت بۆ بەرگری کردن لەتۆ بێن، ڕووبەڕوویان

دەبینەوە و دەجەنگین تا ئەو کاتەی یاخوێنت دەرێژین یا خوێنمان دەرژێت.

سەروەری باوەڕداران وتی: ئەوەی دەڵێن دەستبەرداری خەلافەت ببەم، ئەگەر هەڵم واسن زیاترم پێخۆشە لەوەی دەست لەخەلافەت هەڵبگرم. دەڵێن لەگەڵ هەرکەسێك بەرگری لەمن بکات، دەجەنگن، من بەکەس ناڵێم شەڕ لەگەڵ ئێوە بکات. ئەگەر کەسێك بەرگری لەمن بکات بیٚ مۆڵەتی من ئەو کارەی کردووە. ئەگەر مەبەستی جەنگان لەگەڵ ئێوەم دەبوو، نامەم بۆ ویلایەتەکان دەنووسی تا سوپاکانیان ڕەوانە بکەن یا خۆم دەرۆشتمە یەکێك لەویلایەتەکانی میسر یا عێراق، ئەی خوایە، ئەی خوایە، ئەگەر گیانی من ناپارێزن، پارێزگاری لەگیانی خۆتان بکەن چوونکە ئەگەر خوێنی من برێژن دەستبەرداری ئێوە نابن.

دەڵێن: میسرییەکان ڕۆشتن و جەنگیان ڕاگەیاند. عوسمان کوڕی عەفان کەسی بەدوای محەممەد کوڕی موسلیمە نارد و لەگەڵی ئاخاوت تا بیانگەڕێنێتەوە بەڵام وتی: سوێند بەخوا لەماوەی یەك ساڵ دوو جار درۆ ناکەم.

باوکی حەبیبە دەڵێت: ئەو ڕۆژەی عوسمان کوڕی عەفان کوژرا، سەعد کوڕی وەقاسم بینی لای ئەو دەگەڕایەوە و بۆ ئەوەی لەبەر دەرگاکە دەیبینی، اناللەی هێنایە سەرزمان. مەروان پێی وت: بەمەبەستەکەی خۆت گەشتیت و ئێستا پەشیمان بوویتەوە.

دەڵێت: بیستم سەعد دەیوت: داوای بەخشین لەخواوەند دەکەم. گومانم نەدەکرد خەڵکان ئەوەندە بوێربن و بیانەوێت خوێنی برێژن. ئێستا لای ئەو بووم. باسی هەندیٚ بابەتی کرد کەتۆ و هاوەڵانت لێی بیٚ ئاگان. لەهەموو کردەوە نەشیاوەکانی پەشیمان بوویەوە و تۆبەی کرد و وتی بۆ لەناوچوونی خۆم پێداگری ناکەم، هەرکەس پێداگری لەسەر گومڕایی بکات، لەرێگەی ڕاست دوور دەکەوێتەوە. تۆبە دەکەم و پەشیمان بوونەوەی خۆم ڕادەگەیێنم.

مەروان وتی: ئەگەر دەتەوێت بەرگری لەو بکەیت، بڕۆ لای کوڕی ئەبی تالیب کەخۆی داشاردووە و و خۆی نیشانی کەس نادات.

دەڵێت: سەعد ڕۆشت و گەیشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب کە لەنێوان گۆڕ و مینبەرەکەدا وەستابوو، پێی وت: ئەی باوکی حەسەن، بۆ کارێکی خێر هاتوومەتە

لای تۆ و بۆ ئەنجامدانی کەس لەتۆ بەشیاوتر نابینم، ڕێز لەخزمایەتی کوڕە مامەکەت بگرە و گیانی بپارێزە چوونکە چیتر کارەکان بەدڵخوازی تۆ دەبێت، سەروەری باوەڕداران بەڵێنی داوە، کردەوە و هەڵس و کەوتێکی شیاو دەگرێتەبەر.

عەلی وتی: ئەی باوکی ئیسحاق خوا لێی ڕازی بێت، سوێند بەخوا ئەوەندە بەرگریم لێکردووە چیتر شەرم دەکەم بەڵام مەروان و معاویە و عەبدوللە کوڕی عامر و سەعید کوڕی عاس ئەم بارۆدۆخەیان بۆ دروست کردووە. کاتێك چاکەی ئەوم دەویست و پێم دەوت خۆی لەوان دوور بخاتەوە، گوێرایەڵی وتەکانم نەدەبوو تا لەم دۆخەدا گرفتار هات.

دەڵێت: لەو کاتەدا محەممەد کوڕی ئەبی بەکر هات و بەهێواشی لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب قسەی کرد. عەلی دەستی منی گرت و هەستا و وتی: لەتۆبەکەی ئەو چ سوودێکمان دەست دەکەوێت؟

دەڵێت: سوێند بەخوا نەگەشتبوومە ماڵەکەم لەناو خەڵکان بڵاو بوویەوە کە عوسمان کوڕی عەفان کوژرا. سوێند بەخوا شەرمەزار بووین.

باوکی خەیر دەڵێت: کاتێك خەڵکانی میسر ڕوویان کردە ماڵەکەی عوسمان کوڕی عەفان، عەبدوللە کوڕی سەعد کەسێکی بۆ لای ئەو نارد تا لەجووڵەی ئەوان ئاگاداری بکاتەوە و بڵێت ئەم دەستەیە مەبەستی کوشتنی ئەویان هەیە.

دەڵێت: نێردراو ڕۆشتە لای عوسمان کوڕی عەفان و لەمەبەستی ئەو دەستەیە ئاگاداری کردنەوە. سەروەری باوەڕداران لەمبارەوە قسەی کرد و کەسی بۆ لای خەڵکانی مەککە نارد و میسرییەکانی ئەو شارەی بەخەڵکان ناساند و وتی: ئەوان ڕەخنە لەپێشەواکەی خۆیان دەگرن.

دەڵێت: عەبدوللە کوڕی سەعد دوای خەڵکانی میسر بەرێکەوت. پێشتر داوای مۆڵەتی کردبوو و سەروەری باوەڕداران ئەو مۆڵەتی پێدا. سەعد هات و گەیشتە ئیلە و ئاگادار بوویەوە دووبارە خەڵکانی میسر گەمارۆیان خستۆتە سەر عوسمان کوڕی عەفان و محەممەد کوڕی ئەبی حوزەیفە لەمیسرە.

دەڵێت: کاتێك محەممەد لەگەمارۆکەی سەر سەروەری باوەڕداران ئاگادار بوویەوە، دەستی بەسەر میسردا گرت و خەڵکەکەی شوێنی کەوتن و کاتێك عەبدوللە کوڕی سەعد بۆ میسر گەڕایەوە، کوڕی حوزەیفە ڕێگەی لێگرت و عەبدوللە بەناچاری

روویکردە فەلەستین و لەوێ مایەوە تا سەروەری باوەڕداران کوژرا.

دەڵێت: خەڵکانی میسر هاتن و لەبازارەکاندا نیشتەجێ بوون و گەمارۆیان خستە سەر عوسمان کوڕی عەفان. حەکیم کوڕی جەبەلە لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکانی بەسرە و ئەشتەر لەگەڵ خەڵکانی کوفە هات و لەمەدینە پەیوەستی یەك بوون. بەڵام ئەشتەر و حەکیم کوڕی جەبەلە خۆیان بەدوور گرت. تەنیا کوڕی عەدیس و هاوەڵانی گەمارۆیان خستە سەر سەروەری باوەڕداران. ژمارەیان پێنسەد کەس بوو. بۆ ماوەی چل و حەوت رۆژ گەمارۆیان خستە سەرماڵەکەی و عوسمان کوڕی عەفان لەرۆژی هەینی هەژدەی زیحەججەی ساڵی سی و پێنجەم کوژرا.

عەبدوللە کوڕی عەباس کوڕی ئەبی رەبیعە دەڵێت: ڕۆشتمە لای سەروەری باوەڕداران و کاژێرێك گفتوگۆمان کرد. وتی: ئەی کوڕی عەباس، دەستی منی گرت و وتەی ئەو کەسانەمان بیست لەبەر دەرگاکەی دانیشتبوون. یەکیان دەیوت: چاوەڕوانی چی دەکەن؟ یەکی دیکە دەیوت: چاوەڕوانین ئەگەری هەیە کردەوەکانی بگۆڕێت.

دەڵێت: لەو کاتەی لەوێدا وەستابووین، تەڵحە کوڕی عوبەیداللە لەوێ گوزەری کرد و وتی: کوڕی عەدیس لەکوێیە؟

وتیان: لێرەیە.

دەڵێت: کوڕی عەدیس هات. تەڵحەی بەهێواشی قسەی لەگەڵ کرد. کوڕی عەدیس گەڕایەوە وبەهاوەڵانی خۆی وت: رێگە مەدەن کەس بڕواتە لای ئەو پیاوە.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان بەمنی وت: ئەمە فەرمانی تەڵحە کوڕی عوبەیداللەیە. دواتر وتی: خواوەندا شەڕی تەڵحە لەمن دوور بخەرەوە چوونکە ئەو، ئەمانی هێناوەتە سەرماڵەکەی من. هێوادارم لەم کارەی هیچ سوودێکی پێنەبڕێت و خوێنی برێژرێت چوونکە بەناڕەوا منی گرفتاری ئەم بەڵایە کرد. لە پێغەمبەرم بیست کەدەیفەرموو: خوێنی پیاوی موسوڵمان حەڵاڵ نییە جگە لەم سێ حاڵە: کەسێك دوای باوەڕهێنان کافر بێت پێویستە بکوژرێت. پیاوێك کەژنی هەبێت و زینا بکات و پێویستە بەردباران بکرێت. یا پیاوێك دەستی بەخوێنی کەسێکی دیکە پیس بووبێت. کەواتە لەبەر چی من دەکوژن؟

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان ڕۆشت. منیش دەمویست بگەڕێمەوە بۆ ماڵ بەڵام ڕێگەی هاتنەدەرەوەیان پێ نەدام تا ئەو کاتەی محەممەد کوڕی ئەبی بەکر هات و فەرمانیدا ئازادم بکەن و ڕێگەیان بۆ کردمەوە.

عەبدوللە کوڕی ئەبزی دەڵێت: ئەو ڕۆژەی هێرشیان کردە سەر ماڵەکەی عوسمان کوڕی عەفان، لەوێ بووم. لەماڵەکەی عەمرۆ کوڕی حەزم دەلاقەیەك بەرووی ماڵەکەی سەروەری باوەڕداراندا دەکرایەوە. ڕۆشتنە ناو ماڵەکە. شەڕ و پێکدادان دەستی پێکرد. سوێند بەخوا لەبیری ناکەم حیمران کوڕی سودان هاتەدەر و هاواری دەکرد: تەڵحە کوڕی عوبەیدالله لەکوێیە؟ کوڕی عەفانیان کوشت.

باوکی حەفسەی یەمانی دەڵێت: من کۆیلەی یەکێك لەعەرەبەکانی سارا بووم. ئەو یانی مەروان منی پەسەند کرد. من و ژنەکەمی کرییەوە و هەردووکمانی ئازاد کرد. بەردەوام لەگەڵی مامەوە و ئەو کاتەی گەمارۆ خرایە سەر عوسمان کوڕی عەفان، منداڵەکانی ئومەییە کەوتنە خۆ. مەروان لەماڵی سەروەری باوەڕداران مایەوە. منیش هاورێیەتیم دەکرد.

دەڵێت: سوێند بەخوا من جەنگم دەستپێکرد. لەسەر بانی ماڵەکەوە یەکێکم لەمنداڵەکانی ئەسلەم بەناوی نیارا سولەمی بەتەور کوشت و جەنگ دەستی پێکرد. لەسەر بانەکە هاتمەخوار و کەسەکان لەبەردەرگا دەجەنگان. مەروان شەڕی کرد تا لەپێ کەوت. ئەوم هەڵگرت و بردم بۆ ماڵی پیرێژنێك و دەرگام بەسەردا داخست. خەڵك دەرگای ماڵەکەی سەروەری باوەڕدارانیان ئاگرتێبەردا و یەکێك لەدەرگاکان بەتەواوی سووتا.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: دەرگایان بۆ کارێکی گەورەتر سووتاند. کەس لەئێوە دەستیان لێ نەکاتەوە. سوێند بەخوا ئەگەر دوورتر لەهەمووتان بن هەمووتان دەکوژن تا بەمن دەگەن بەڵام ئەگەر من لەپێشەوە بم، تەنیا بەکوشتنی من بەسەندە دەکەن. من لەسەر فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) خۆڕاگری دەکەمە پیشە و بەهەمان شێوە کەخواوەند ئیرادەی فەرمووە، گیان دەبەخشم.

مەروان وتی: سوێند بەخوا تاگیانم هەبێت، تۆ ناکوژرێیت؟ ئەمەی وت و شمشێر بەدەست بەرەو دەرگاکە ڕۆشت.

باوکی حەفسە دەڵێت: بۆ ڕۆژی پێنجشەممە، لەسەر بانەکەوە بەردێکم

فڕدایەخوارو کەسێکم کوشت. کەسیان بۆ لای سەرورەری باوەڕداران نارد و داوایان کرد بکوژەی ئەو پیاوەیان تەسلیم بکات.

سەرورەری باوەڕداران وتی: سوێند بەخوا بکوژەکەی ناناسم.

دەڵێت: شەوی هەینی تورە ماڵەکەیان بەجێهێشت و بەرەبەیان گەڕانەوە. یەکەم کەس دەرکەوت، کەنانە کوڕی عەتاب بوو. ئاگری بەدەستەوە بوو. ڕۆشتبووە سەر بانی ماڵەکان. بنەماڵەی حەزم دەرگایان بۆ کردبوویەوە. دوای ئەو کەسانی دیکە هاتن و هەموویان ئاگریان بەدەستەوە بوو. عوسمان کوڕی عەفان بەهاوەڵانی خۆی وت: خراپتر لەئاگر بوونی نییە، دەرگاکان سووتان، دارەکان سووتان، هەرکەس گوێڕایەڵی منە، ماڵ و گیانی خۆی بپارێزێت. ئەم خەڵکە مەبەستی کوشتنی منیان هەیە و لەکوشتنی من پەشیمان دەبنەوە. سوێند بەخوا ئەگەر دەستبەرداری من دەبوون، تامەزرۆی ژیان نیم جیاواز لەوە تەمەنێکم بەسەر بردووە و ئێسکەکانم بەرەو پووکانەوە دەڕۆن.

دەڵێت: بەمەروانی وت: دانیشە و مەڕۆدەر.

بەڵام مەروان گوێی نەگرت و وتی: سوێند بەخوا تا من زیندووم دەستیان بەتۆ ناگات.

خەڵکان ڕۆشتن. بەخۆم وت نابێت سەرورەری باوەڕداران بەتەنیا جێ بێڵم و لەگەڵ مەڕوان ڕۆشتم. ژمارەی ئێمە کەم بوو. مەروان هۆنراوەی دەخوێندەوە و داوای شەڕکەری کرد. زرێکەی بەرز کردەوە و خستییە ژێر پشتێنەکەی.

دەڵێت: کوڕی نەباع هێرشی کردە سەر مەروان ولە پشتەوە زەربەیەکەی لەملیدا و لەپێ کەوت. وەك مردوو وابوو. ئەوم بۆ ماڵی فاتیمە کوڕی ی ئەوس، دایەگەورێی ئیبراهیمی عودەی برد.

دەڵێت: عەبدولمەلیك و منداڵەکانی ئومەییە بۆ ئەم کارەیان بەردەوام ڕێزی بنەماڵەی عودەییان دەگرت.

ئەبوبەکر کوڕی حارس دەڵێت: دەڵێی هێشتا عەبدولرەحمان کوڕی عەدیسی بەلەوی دەبینم کەپشتی بەمزگەوتی پێغەمبەرەوە دابوو، عوسمان کوڕی عەفان گەمارۆی لەسەر بوو. مەروان کوڕی حەکەم هاتەدەر و وتی: کێ شەڕ دەکات؟

دەڵێت: عەبدولرەحمان کوڕی عەدەیس بەفلان کوڕی عوروەی وت: شەڕ لەگەڵ ئەو پیاوە بکە. گەنجێکی بالآبەرز رووبەرووی بوویەوە، داوێنی زرێکەی هەڵکرد و قاچی دەرکەوت. مەروان پەلاماریدا و کوڕی عوروە زەربەیەکی لەپشتە ملیدا. مەروان کەوتە سەر زەوی و لەخۆیەوەو دەئالآ. عوبەیدە کوڕی ریفاعەی زەرقی ڕۆشت تا بیکوژێت.

دەڵێت فاتیمە کچی ئەوس، دایە گەورێی ئیبراهیم کوڕی عودەی کەشیری بەمەروان دابوو، هاتە سەر مەروان و وتی: ئەگەر مەبەستی کوشتنی ئەو پیاوە هەیە، کوژرا و ئەگەر دەتەوێت گوێچکەی ببڕێت، ئەوە کارێکی زۆر قێزەونە.

دەڵێت: عوبەید دەستی لەمەروان هەڵگرت و منالەکانی ئومەییە رێزی ئەو بنەماڵەیان گرت و دواتر چەندین کاریان بەئیبراهیم سپارد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: عەبدولرەحمان کوڕی عەدیسی بەلەوی کاتێك لەمیسرەوە بەرەو مەدینە دەڕۆشت، هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەربەلبس و سەعید هاتن

چەکی ئاسنینیان بەدەستەوە بوو

داوای حەق و مافەکانی خواوەندیان دەکرد

و لەگەڵ ئەوەی دەمانویست، گەڕانەوە))

حسەین کوڕی عیسا لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك گەمارۆیان خستە سەر ماڵەکەی سەروەری باوەڕداران، عوسمان کوڕی عەفان رازی نەبوو دەست لەکارەکەی بکێشێتەوە و کەسی بەدوای کەسانی نزیك و دەوروبەری خۆی نارد و ئەوانی کۆکردەوە.

دەڵێت: یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بەناوی نەیار کوڕی عەیاز کەپیرەپیاوێکی بەتەمەن بوو، لەناو خەڵکان هەستا و وتی: ئەی عوسمان، عوسمان لەسەر بانی ماڵەکەیەوە دەرکەوت. نەیار سوێندیدا تا دەست لەخەلآفەت بکێشێتەوە و لەم کاتەدا کەگفتوگۆیان دەکرد، یەکێك لەهاوەڵانی عوسمان کوڕی عەفان، تیرێکی بۆ هاویشت و نەیاری کوشت. گومانیان کرد ئەو کەسەی تیرەکەی هاویشت، کەسیر کوڕی سەڵتی کێندی بوو بێت. بە سەروەری باوەڕدارانیان وت: بکوژەکەی نەیار تەسلیم بکە تا بیکوژینەوە.

وتی: ئێوە مەبەستی کوشتنی منتان هەیە، منیش ئەوکەسەی هاوکاری من دەکات، تەسلیمی ئێوەی ناکەم.

دەڵێت: کاتێك ئەمەیان بینی، هێرشیان کردە سەر دەرگاکە و گڕیان تێبەردا. مەروان کوڕی حەکەم لەگەڵ دەستەیەك لەماڵەکەی عوسمان کوڕی عەفان هاتەدەر. سەعید کوڕی عاسیش لەگەڵ دەستەیەکی دیکە هات. موغەیرە کوڕی ئەخنەسی سەقەفی، هاوپەیمانی مناڵەکانی زوهرە لەگەڵ دەستەیەکی دیکە، شەڕێکی قورس دەستی پێکرد. هۆکاری هاندرانی خەڵکان بۆ جەنگ ئەوە بوو کە بیستبوویان هاوکاری خەڵکانی بەسرە لەزەرار دابەزیون کە یەك مەنزڵ لەمەدینەوە دوور بوو. هەروەها بیستبوویان خەڵکانی شامیش بەرێکەوتوون. لەبەردەرگای ماڵی سەروەری باوەڕداران شەڕێکی قورسیان ئەزمون کرد. موغەیرە کوڕی ئەخنەسی سەقەفی هێرشی کردە سەردەستەیەك و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((کچی جوان کەزێر و خەڵخاڵی هەیە

دەزانێت کەمن پیاوی شمشێر وەشێنم))

عەبدوڵلە کوڕی بودەیل کوڕی وەرقای خوزاعی هێرشی کردەسەر و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((ئەگەر تۆ پیاوی شمشێر وەشێنیت

لەبەرابەر جەنگاوەر

کە بەشمشێرێکی ئاودراو هەڵمەت دەبات

خۆڕاگری بکە.))

عەبدوڵلە بەشمشێر لێیدا و کوشتی.

دەڵێت: روفاعە کوڕی رافیعی ئەنساری زورەقی هێرشی کردە سەر مەروان کوڕی حەکەم و بەشمشێر لێیدا. مەروان لەپێ کەوت و روفاعە گومانی کرد کوژراوە و دەستی لێ هەڵگرت. عەبدوڵلە کوڕی زوبەیریش برینداربوو. هاوەڵانی عوسمان کوڕی عەفان شکستیان خوارد و پەنایان بۆ کۆشکەکە برد و دەرگاکەیان کردە پەناگەی خۆیان ولەبەردەم دەرگاکە شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. زیاد کوڕی نەعەیمی قەهری لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی عوسمان کوڕی عەفان کوژرا. شەڕ

بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی عەمرۆ کوڕی حەزمی ئەنساری کەماڵەکەی لەتەنیش ماڵەکەی عوسمان کوڕی عەفان بوو، دەرگای ماڵەکەی خۆی کردەوە و خەڵکانی کۆکردەوە. هێرشبەران لەماڵەکەی عەمرۆوە هێرشیان کردە سەر بەرگریکارانی سەروەری باوەڕداران. بەرگریکاران هەڵاتن و پەنایان بۆ کۆڵانەکانی مەدینە برد. عوسمان کوڕی عەفان لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەڵانی خۆی مایەوە کەهەموویان کوژران. سەروەری باوەڕدارانیش کوژرا.

باوکی سەعید موالی باوکی ئەسیدی ئەنساری دەڵێت: رۆژێك عوسمان کوڕی عەفان لەسەربانی ماڵەکەیەوە خۆی نیشانی گەمارۆدەراندا و وتی: (السلام علیکم) بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە جگە لەیەك کەس ئەویش لەبەردەم خۆیەوە.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا ئایا دەزانن من چاڵی رۆمەم بەسامانی خۆم کڕی تا خەڵکان ئاوی لێ بخۆمەوە و منیش هاوشێوەی کەسانی دیکە لەو چاڵە ئاو هەڵدەگرم.

وتیان: بەڵێ.

وتی: کەواتە بۆ نابێت لێی بخۆمەوە و بەو ئاوە رۆژوو بشکێنم.

وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا دەزانن فلأنە و فیسارە زەویم بەسامانی خۆم کڕی و بەمزگەوتم بەخشی؟

وتیان: بەڵێ.

وتی: ئایا پێش من رێگەی نوێژ خوێندی کەسیان لەم مزگەوتە گرتووە؟ سوێندتان دەدم بەخوا ئایا بیستووتانە پێغەمبەر(د.خ) فلأنە حەدیسی هێنایە سەرزمان کەخواوەند لەکتێبەکەی خۆیدا ئاماژەی پێداوە.

دەڵێت: دەستدرێژی کردن دەستی پێکرد و خەڵکان دەیانوت: دەستدرێژی مەکەنە سەر سەروەری باوەڕداران.

دەڵێت: دەستدرێژی کردن بەردەوام بوو و ئەشتەر هەستایە سەر پێ.

دەڵێت: نازانم ئەو رۆژە بوو ئەشتەر هەستا یا رۆژێکی دیکە، وتی: ئەگەری هەیە فریوی لەئێوە و ئەو کردبێت. خەڵك جوێنبارانیان کرد.

دەڵێت: جارێکی دیکە عوسمان کوڕی عەفانم بینی، هاتە لای خەڵکان و مۆجیاری کردن بەڵام مۆجیارییەکانی کاریگەری لەسەر کەسان دانەنا. پێشتر کاتێك

مۆجیارییەکانی ئەویان دەبیست، کاریگەری لەسەر دادەنان بەڵام بەدووبارە بوونەوەیان چیتر کەس گوێی بۆ نەدەگرت.

دەڵێت: دەرگاکەی کردەوە. قورئانەکەی خستە بەردەم خۆی و ئەمە بەهۆی خەوێکەوە بوو شەوی پێشتر بینیبووی کە پێغەمبەر(د.خ) پێی فەرموو بوو: ئەمشەو لای ئێمە رۆژوو بشکێنە.

حەسەن دەڵێت: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ڕۆشتە لای، ریشی گرت کەوتی: شوێنێکت گرتووە و کارێکت ئەنجام داوە کەئەگەر ئەبوبەکر دەبوو، هیچ کات ئەوکارەی نەدەکرد.

دەڵێت: محەممەد ڕۆشتەدەر و دەستی لێ هەڵگرت.

دەڵێت: دواتر کەسێك کەپێیان دەوت مەرگی ڕەش، ڕۆشتە لای عوسمان کوڕی عەفان و ئەوی خنکاند و جەستەی پێشێل کرد.

دەڵێت: هاتەدەر و وتی: سوێند بەخوا هیچ شتێکی نەرمتر لەقورگی ئەوم نەبینیوە، سوێند بەخوا ئەوەندە قورگیم گوشی تا هەناسەی وەك هەناسەی مار لەجەستەی لوولی دەخوارد.

دەڵێت: ڕۆشت.

لەحەدیسی باوکی سەعیددا هاتووە، کەسێك ڕۆشتە لای سەروەری باوەڕداران و ئەو، وتی: کتێبی خواوەند لەنێوان من و تۆدا داوەر بێت.

دەڵێت: قورئانەکەی لەبەردەمدا بوو.

دەڵێت: بەڵام پیاوەکە شمشێری بۆ هاویشت کەدەستی خستەبەر و دەستی بڕا.

دەڵێت: نازانم دەستی بڕی و لێ بوویەوە یا تەنیا برینداری کرد.

سەروەری باوەڕداران وتی: سوێند بەخوا ئەمە یەکەم دەست بوو قورئانی نووسی.

لەحەدیسێکی دیکەدا هاتووە، تەجیبی ڕۆشتە لای و تیرێکی لەقورگی چەقاند و خوێن ڕژایە سەر ئایەی فسیکفیکهم الله.

دەڵێت: هێشتا خوێنەکە بەقورئانەکەوە ماوەتەوە و پاکیان نەکردۆتەوە.

دەڵێت: کچی قەرافسە زێ و خشڵەکانی خۆی هەڵگرت و لەتەنیشت خۆی داینا.

ئەمە پێش کوژرانی سەروەری باوەڕداران بوو.

دەڵێت: کاتێك کوژرا - یا دەڵێت قوڕگیان بڕی—لەسەر جەستەی ئەو دەستی بەگریان کرد و یەکیان وتی: خوای بیکوژێت، سمتی چەندە پانە؟

دەڵێت: زانیم دوژمنی خواوەند تەنیا بەشوێن مەبەستەکانی دنیاوە بوو.

بەدر کوڕی عوسمان دەڵێت: دووایین وتەکانی سەروەری باوەڕداران بۆ خەڵکان بەمشێوە بوو: خواوەند دنیای بەئێوە بەخشیوە تا بەدوای ئاخیرەتدا بگەڕێن. دنیای پێنەبەخشیون پێوەی سەرقاڵ بن چوونکە جیهان کۆتایی پێدێت و ئەو دنیا هەمیشەییە. ئەم دنیایە نەتانکاتە کەسانێکی سەرکێش و یاخی و پشت لەو دنیا مەکەن. ئەوەی لەناو دەچێت مەخەنە پێش ئەوەی دەمێنێتەوە. دنیا کۆتایی پێدێت و دەگەڕێنەوە بۆ لای خواوەند. لەخواوەند بترسن چوونکە ترس لەخواوەند دەبێتە هۆی خۆپاراستن لەگوناح و نزیك بوونەوە لێی. لەگۆڕانکارییەکانی خواوەند بترسن و پەیوەست و هاودەنگی کۆمەڵانی خەڵك بن. دووبەرەکی لەناوتانا دروست نەبێت و نیعمەتەکانی خواوەندتان لەبیر بێت. پێشتر دوژمن بوون و دڵی ئێوەی نەرم کرد و لەهۆی نیعمەتەکانی خواوەندەوە بوونە برای یەك.

باوکی عوسمان دەڵێت: کاتێك لەو کۆبوونەوەدا وتەکانی خۆی هێنایە سەر زمان و دڵنەوایی خۆی کردەوە، موسوڵمانانیش دڵنواییان دایەوە بۆ ئەوەی خۆڕاگری و بەپشت بەستن بەهێزی خواوەند بەرگری بکات. وتی: خواوەند بتانبەخشێت، بڕۆن و لەبەر دەرگا بمێننەوە و ئەو کەسانەی ڕێگەی هاتن بۆ لای منیان نییە، لەگەڵ ئێوەدا کۆببنەوە. کەسی بەدوای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و زوبەیر و تەڵحەدا نارد کەهاتن و کۆبوونەوە. لەسەر بانی ماڵەکەیەوە خۆی نیشاندان و وتی: ئەی خەڵکینە دانیشن. هەموویان چ شەڕکەرانی ڕۆژئاوا و چ خەڵکانی نیشتەجێی مەدینە، دانیشتن. وتی: ئێوە بەخوا دەسپێرم و داوا دەکەم دوای خۆم کەسێکی شیاو خەلافەتی ئێوە بگرێتە دەست. سوێند بەخوا چیتر ناڕۆمە لای هیچ کەسێك تا قەزای خواوەند سەبارەت بەمن ڕەوانە بکرێت. ئێوە و ئەوانەی دژی من وەستاون، بەجێدێڵم و هیچ بەڵێنێك نادەم دژی ئێوە لەکاری دینی خواوەند یا دنیا بیانو و پاساو بهێننەوە تا ئەو کاتەی خواوەند فەرمانەکانی خۆی سەبارەت بەمن بەسەر دەبات.

بەخەڵکانی مەدینەی وت: بڕۆن. سوێندیدان و هەمووان بەناچاری ڕۆشتن جگە

لەحەسەن و محەممەد و کوڕی زوبەیر و کەسانی هاوشێوەی ئەوان کە لەسەر فەرمانی باوکیان لەسەر دەرگا دانیشتن و کەسانێکی زۆر پەیوەستیان بوون. سەروەری باوەڕداران لەماڵەکەی خۆی مایەوە.

باوکی حارسە دەڵێت: گەمارۆدانەکە چل ڕۆژی خایاند و نەیارەکان بۆ ماوەی حەفتا ڕۆژ لەمەدینە مانەوە. کاتێك هەژدە ڕۆژ لەچل ڕۆژەکە بەسەر چوو، چەندین سوار لەسەرکردەکانی خەڵك هاتن و هەواڵیان هێنا کەسانێك لەویلایەتەکانەوە بۆ بەرێکەوتن خۆیان ئامادە کردووە: حەبیب لەشام و معاویە لەمیسر و قەعقاع لەکوفە و موجاشیع لەبەسرەوە. لەمکاتەدا ڕێگەی بینینی سەروەری باوەڕدارانیان لەخەڵکان گرت و تەنانەت نەیانهێشت ئاوی پێ بگات. عەلی کوڕی ئەبی تالیب شتی بۆ دەنارد. بەدوای بیانودا دەگەڕان بەلام دەستیان نەکەوت. بەردیان بۆ ناو ماڵەکەی هاویشت تا وەڵامیان بدەنەوە و بڵێن جەنگیان دەست پێکردووە. ئەم کارانەیان لەشەواندا ئەنجام دەدا. عوسمان کوڕی عەفان پێی وتن: مەگەر لەخوا ناترسن؟ مەگەر نازانن کەس جگە لەمن لەماڵەکەدا نییە؟

وتیان: سوێند بەخوا ئێمە بەردمان نەهاویشتووە؟

وتی: کەواتە کێ بەردی هاویشت؟

وتیان: خواوەند.

وتی: درۆ دەکەن، ئەگەر خواوەند دەیهاویشت، بەردەکانی بەهەڵەدا نەدەچوو، بەلام بەردی ئێوە بەهەڵەدا دەچێت.

دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان لەسەر بانی ماڵەکەیەوە ڕۆشتە لای بنەماڵەی حەزمی دراوسێی. کوڕە مامەکەی، عەمرۆی بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕەوانە کرد و وتی: ئەوان ڕێگە نادەن ئاومان پێ بگات، ئەگەر دەتوانن ئاومان بۆ بنێرن، بۆمان بنێرن. هەروەها کەسی بۆ لای تەڵحە و زوبەیر و عایشە و هاوسەرانی پێغەمبەر(د.خ) نارد بەلام پێش هەمووان عەلی کوڕی ئەبی تالیب و دایکی حەبیبە بۆ هاوکاری کردنی هاتن. عەلی بەرەبەیان هات و وتی: ئەی خەڵکینە، ئەو کردەوەی ئێوە، نە لەکردەوەی باوەڕداران دەچێت نە بێ باوەڕان. ڕێگەی ئاو لەم پیاوە مەگرن. ڕۆمی و فارسەکان ئەسیر دەگرن بەلام خواردن و ئاوی پێ دەدەن. ئەم پیاوە

دەستدرێژی نەکردۆتە سەر ئێوە، بۆ گەمارۆدان و کوشتنی ئەو بەرەوا دەزانن؟

وتیان: نا، سوێند بەخوا، رێگە نادەین ئاو بخواتەوە. عەلی دەستارەکەی خۆی بۆ ماڵەکەی عوسمان کوڕی عەفان هاویشت تا لەمەبەستەکەی ئاگاداری بکاتەوە.

دوای ئەو، دایکی حەبیبە سوار لەسەر ئێسترەکەی هات. قومقومەیەکی ئاوی چەرمین لەسەر زینەکەی بوو. وتیان: دایکی باوەڕداران، دایکی حەبیبە هات. لەئێسترەکەیاندا. وتی: وەسیەت نامەی مناڵەکانی ئومەییە لەدەستی ئەم پیاوەدایە. دەمەوێت بڕۆم و سەبارەت بەو پرسە بپرسم تا سامانی هەتیو و بێوەژنەکان بەفیڕۆ نەڕوات.

وتیان: درۆ دەکات. دەست درێژیان کردەسەر و هەوساری ئێسترەکەیان قرتاند. ئێسترەکەی ڕەمی کرد و خەڵکان شوێنی کەوتن و گرتیانەوە. زۆری نەمابوو دایکی حەبیبە بکوژرێت. ئەویان بردەوە بۆ ماڵەکەی.

عایشە بەمەبەستی هەڵاتن خۆی بۆ حەج ئامادە دەکرد و دەیویست براکەی لەگەڵ خۆی ببات بەڵام رازی نەبوو. عایشە پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر دەمتوانی کارێك بکەم لەمەبەستەکەیان دووریان بخەمەوە، ئەو کارەم دەکرد.

حەنزەلەی کاتب ڕۆشتە لای محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و وتی: ئەی محەممەد، دایکی باوەڕداران دەخوازێت تۆ لەگەڵ خۆی ببات و ناڕۆیت بەڵام گورگەکانی عەرەب پێشنیاری کارێکی ناڕەوات پێدەکەن و هاوکارییان دەکەیت.

محەممەد وتی: ئەی زادی تەمیمی، کارت بەم پرسانە چییە؟

وتی: ئەی زادەی خەسعەمی، سوێند بەخوا ئەگەر ئەم کارە بە دەسەڵات گرتنە دەست بێت، مناڵەکانی عەبدمەناف بەدەستی ناهێنن. ڕۆشت و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((لەوەی خەڵکان پێوەی سەرقاڵن، سەرمسوڕماوە
ئەگەر بخوازن خەلافەت گۆڕانکاری تیا دەکرێت
و ئەگەر گۆڕانکاری تیا بکرێت، چاکە پشتیان تێ دەکات
و دەکەونە گێژاوێکی سەختەوە
هاوشێوەی جوولەکە و مەسحییەکان
کەهەموویان ڕێگەیان ون کردووە)).

دەڵێت: دوای ئەوە رووی کردە کوفە.

دەڵێت: عایشە کە لەخەڵکانی میسر تورە بوو، بەرێکەوت. مەروان کوری حەکەم رۆشتە لای و وتی: ئەی دایکی باوەرداران ئەگەر بمێنیتەوە، بەشێوەیەکی شیاو پارێزگاری لەم پیاوە دەکەن.

وتی: دەخوازیت ئەو بەلایش بەسەرمندا بێنن کە بەسەر دایکی حەبیبەدا هێنایان و کەسم دەستنەکەوێت پارێزگاریم لێ بکات. نا، سوێند بەخوا لەمەبەستەکەم پەشیمان نابمەوە چوونکە نازانم سەرئەنجامی ئەم خەڵکە بەکوێ دەگات.

دەڵێت: تەڵحە و زوبەیر لەو بەلای بەسەر عەلی کوری ئەبی تالیب و دایکی حەبیبە هات، ئاگادار بوونەوە و لەماڵەکانی خۆیان مانەوە. بنەماڵەی حەزم لەکاتی نائاگایی پاسەوانەکان، ئاویان بۆ سەروەری باوەرداران دەبرد. لەم کاتەدا عوسمان کوری عەفان خۆی نیشانی خەڵکاندا و داوای عەبدوللە کوری عەباسی کرد. ئەویان بانگ برد. سەروەری باوەرداران وتی: برۆ، ئەمساڵ تۆ سەرپەرەستی حاجییەکانی.

دەڵێت: عەبدوللە کوری عەباس لەو کەسانە بوو لەبەردەرگای ماڵی سەروەری باوەرداران مابوویەوە.

وتی: ئەی سەروەری باوەرداران، شەر کردن لەگەڵ ئەم دەستەیە بەخۆشتر لەحەج کردن دەزانم.

سەروەری باوەرداران سوێندیدا بروات و کوری عەباس ئەو ساڵە کاروباری حەجی گرتەدەست. عوسمان کوری عەفان وەسیەتی خۆی لای زوبەیر کرد و رۆشت.

دەڵێت: سەبارەت بەزوبەیر بۆچوونەکان جیاوازن کە ئایا لەکاتی کوشتنی عوسمان کوری عەفان ئامادە بوو یا پێشتر مەدینەی بەجێهێشتبوو.

عوسمان کوری عەفان وتی: ئەی دەستەی نەیار، دژایەتی من نەبێتە هۆی ئەوەی ئەو بەلاتان بەسەردا بێت کە بەسەر خەڵکانی نوح هات. خواوەند لەنێوان ئەم دەستانە و مەبەستەکانیان ببە لەمپەر بەهەمان شێوە کەپێشتر بۆ کەسانی هاوشێوەی ئەوان لەمپەرت دروست کردووە.

عەمرۆ کوری محەممەد دەڵێت: لەیلی کچی عەمیس کەسی بەدوای محەممەد

کوڕی ئەبی بەکر و محەممەد کوڕی جەعفەر نارد و وتی: چرا خۆی دەخواتەوە و رووناکی بەخەڵکان دەبەخشێت، کاروبار لەبەرژەوەندی کەسێك دەسووڕێنن گرنگی بەئێوە نادات و هەڵە دەکەن. ئەم کارەی ئێوە ئەمڕۆ دەیخوازن، سبەی لەدەستی کەسێکی دیکەدایە، ئاگاداربن ئەمڕۆ کارێك نەکەن بەیانی پەشیمان ببنەوە.

بەڵام ئەوان پێداگر بوون و توڕەماڵەکەی ئەویان بەجێهێشت. دەیانوت: کردەوەکانی عوسمان کوڕی عەفان لەگەڵ خۆمان لەبیر ناکەین. لەیلی دەیوت: چی لەگەڵ ئێوە کردووە جگە لەوەی ڕێگەی خواوەندی نیشان داون.

باوکی عوسمان دەڵێت: کاتێك خەڵکان لەگەڵ ئەوکەسە پەیمانیان بەست، تەندروست هات و هەواڵەکانی مەککەی هێنا کەهەمووان مەبەستی لەناوبردنی میسرییەکانیان لەسەردایە و دەخوازن بەم کارە پاداشتی حەجەکەیان زیاد بکەن. کاتێك میسرییەکان لەمەبەستی ئەوان و بەرێکەوتنی سوپای ویلایەتەکان ئاگادار بوونەوە، شەیتان بەسەریاندا زاڵبوو، وتیان: لەم گێژاوە رزگارمان نابێت مەگەر ئەوەی ئەم پیاوە بکوژین و خەڵکان بەمشێوەیە ئێمەیان لەبیر بچێتەوە. هیچ ڕێگەیەك بۆ رزگار بوون جگە لەکوشتنی خەلیفە نەمایەوە. مەبەستی هێرش کردنە سەر دەرگاکەیان کرد بەڵام حەسەن و کوڕی زوبەیر و محەممەد کوڕی تەڵحە و مەروان کوڕی حەکەم و سەعید کوڕی عاس و منداڵی ئەسحابەکان، ڕێگەیان لێگرتن. شەڕ دەستی پێکرد و عوسمان هاواری کرد: خواوەندا، خواوەندا، ئێوە لەهاوکاری کردنی من بەخشراون. بەڵام رازی نەبوون.

سەروەری باوەڕداران دەرگاکەی کردەوە و بەقەڵغان و شمشێر هاتەدەر تا ئەوان دوور بکاتەوە. کاتێك ئەویان بینی، میسرییەکان پاشەکشێیان کرد و بەرگریکاران شوێنیان کەوتن و دووریان خستنەوە. کاتێك دوو دەستەکە گەڕانەوە، هەردووك نیگەران بوون. سەروەری باوەڕداران ئەسحابەکانی سوێنددا بڕۆنە ناو ماڵەکە و کاتێك بەڕۆشتن رازی نەبوون، ڕۆشتنە ناو ماڵەکەی سەروەری باوەڕداران و دەرگا لەسەر میسرییەکان داخرا.

دەڵێت: موغەیرە کوڕی ئەخنەس کوڕی شورەیق لەناو حاجییەکاندا بوو. لەگەڵ دەستەیەك لەحەجکەران بەخێرایی گەڕایەوە و پێش ئەوەی عوسمان کوڕی عەفان بکوژرێت، خۆی گەیاندە ماڵەکەی. بینەری شەڕ و پێکدادانەکان بوو. لەگەڵ

بەرگریکاران ڕۆشتە ناو ماڵەکەی و لەناوەوە لەبەر دەرگاکە دانیشت و وتی: ئەگەر دەست لەهاوکاری کردنی تۆ هەڵبگرین، لای خواوەند، چ پاساوێکمان دەبێت لەکاتێکدا دەتوانین ڕێگەیان لێ بگرین تا ئەو کاتەی دەمرین.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران لەو ڕۆژانە بەبەردەوامی قورئانی لەبەردەمدا بوو. کاتێك نوێژی دەخوێند، قورئانەکەی لەبەردەم خۆیدا دادەنا و کاتێك هیلاك دەبوو، دادەنیشت و قورئانی دەخوێندەوە چوونکە خوێندنەوەی قورئانیان بەیەکێك لەشێوازەکانی خواپەرەستی دەزانی. بەرگریکاران لەنێوان سەروەری باوەڕداران و میسرییەکان وەستابوون. لەبەر ئەوەی کەس نەبوو میسرییەکان لەدەرگاکە دوور بخاتەوە و نەیاندەتوانی بڕۆنە ناو ماڵەکە، ئاگریان هێنا و دەرگا و تاقەکانیان گڕ تێبەردا. کاتێك بڵێسەی سەند و دارەکان سووتان، تاقی سەردەرگاکە کەوت. سەروەری باوەڕداران سەرقاڵی نوێژ خوێندن بوو. خەڵك هێرشیان کردە سەر ماڵەکە بەڵام بەرگریکاران ڕێگەی هاتنە ژوورەوەیان لێگرتن.

یەکەم کەس ڕووبەڕوویان بوویەوە، موغەیرە کوڕی ئەخنەس بوو کەهۆنراوەی دەخوێندەوە. دوای ئەو حەسەن کوڕی عەلی و بەهەمان شێوە هۆنراوەی دەخوێندەوە. محەممەد کوڕی تەڵحەیش بەدەم هۆنراوە خوێندنەوەوە هات و دوای ئەو سەعید کوڕی عاس. دووایین کەسیان عەبدوللە کوڕی زوبەیر بوو چوونکە پێشتر عوسمان کوڕی عەفان ئەوی بۆ لای باوکی ناردبوو تا سەبارەت بەپرسێك ئاگاداری بکاتەوە. هەروەها فەرمانی پێدابوو بڕواتە لای بەرگریکاران و پێیان بڵێت بۆ ماڵەکانی خۆیان بگەڕێنەوە. عەبدوللە کوڕی زوبەیر دووای هەموویان ڕۆشت و بەردەوام شانازی بەوەوە دەکرد کە لەدوا ساتەکان هاودەمی عوسمان کوڕی عەفان بووە.

باوکی عوسمان دەڵێت: سەروەری باوەڕداران سەرقاڵی نوێژ خوێندن بوو کەدەرگاکەیان سووتاند. سوڕەی طه ما انزلنا علیك القرآن لتشقی دەخوێندەوە. بەدەنگی بەرز دەیخوێندەوە و گرنگی بەدەنگە دەنگ نەدەدا. هەڵەی نەدەکرد و دوا نەدەکەوت و پێش ئەوەی بیکوژن، کۆتایی بەسورەکە هێنا و جارێکی دیکە قورئانەکەی کردەوە و ئەم ئایەی خوێند:

((الذین قال لهم الناس ان الناس قدجمعوالکم فاخشوهم فزادهم ایمانا و قالوا حسبنا الله و نعم الوکیل.

واتاکەی: کەسانێك کەخەڵکان پێیان وتن خەڵکان بۆ جەنگی ئێوە کۆبوونەتەوە، بترسن بەڵام لەوان نەترسان و باوەڕەکەیان بە هێز بوو، وتیان: خواوەند بۆ ئێمە بەسە چوونکە باشترین پشتیوانە.))

دەڵێت: موغەیرە کوڕی ئەخنەس لەگەڵ هاوەڵانی خۆی لەناوماڵەکەدا بوو، هۆنراوەی دەخوێندەوە، لەم کاتەدا باوکی هورەیرە هات. خەڵکان لەماڵەکەی ئەو خۆیان دوور خستبوویەوە جگە لەو دەستەی کۆببوونەوە و خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کردبوو. باوکی هورەیرە لەگەڵ ئەوان مایەوە و وتی: هاوشێوەی من بن. هەروەها وتی: ئەمڕۆ ڕۆژێکە شمشێر وەشاندن پەسەند و خۆشە. ڕستەکەی هاوشێوەی حەمیرییەکان هێنایە سەرزمان. دواتر هاواری کرد: ئەی خەڵکینە، چی ڕوویداوە من پێشنیاری ڕێگەی رزگاریتان پێ دەکەم و ئێوە پێشنیاری جەهەننەم.

دەڵێت: لەو ڕۆژەدا مەروان هات و هاواری کرد: پیاو! پیاو! یەکێك لەمناڵەکانی لەیس ڕووبەڕووی بوویەوە و شمشێریان وەشاند. مەروان کەوتە سەر زەوی و هاوەڵانی لەدەروی کۆبوونەوە. هاوەڵانی شەڕکەرەکەی دیکەیش کۆبوونەوە. خەڵکانی میسر وتیان: سوێند بەخوا لەنێوان خەڵکان دژی ئێمە هیچ بەڵگەیەکتان دەست ناکەوێت چوونکە دووای ئاگادار کردنەوە دەتانکوژین.

موغەیرە وتی: کێ لەگەڵ من دەجەنگێت؟

کەسێك ڕووبەڕووی بوویەوە و شەڕیان تاقیکردەوە. موغەیرە هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( بەشمشێر دەیانکوژم

شمشێری گەنجێکی بوێر

کە لەژیان بێ هیوایە))

دوژمنەکەی وەڵامی دایەوە.

دەڵێت: خەڵکان وتیان: موغەیرە کوڕی ئەخنەس کوژرا. ئەو کەسەی ئەوی کوشت، انالڵەی هێنایە سەرزمان.

وتیان: چی روویداوە؟

وتی: لەخەودا بینیم پێیان وتم: بەبکوژەکەی موغەیرە کوڕی ئەخنەس بڵێ دەچێتە جەهەننەم. خۆم گرفتاری ئەو بەڵایە بووم.

دەڵێت: قوباسی کەنانی، نەیار کوڕی عەبدوڵڵەی ئەسلەمی کوشت. نەیارەکان لەماڵەکانی دەوروبەرەوە ڕژانە ماڵەکەی عوسمان کوڕی عەفان و پڕیان کرد بەڵام ئەوانەی لەبەر دەرگا بوون، بێ ئاگا بوون. خەڵکی هۆزەکان هاتن و مناڵەکانی خۆیان بردەوە چوونکە خەلیفە کەوتە دەستی دوژمنەکانی. کەسێکیان بۆ کوشتنی سەروەری باوەڕداران ناردە ژوور، وتی: دەست لەخەلافەت هەڵبگرە تا دەستبەرداری تۆ ببین.

وتی: هاوار لەتۆ! لەڕۆژگاری جاهلییەت و ئیسلام دەستدرێژیم نەکردۆتە سەر هیچ ژنێك، ئارەزووی ناڕەوام لەسەردا نەبووە و لەو کاتەوەی بەیعەتم لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەستووە، دەستم بۆ شەرمی خۆم نەبردووە. ئەو کراسەی خواوەند لەبەری کردووم، هیچ کات دایناینێم. لەجێگەکەی خۆم دەمێنمەوە تا خواوەند ڕێز بەچاکەکاران ببەخشێت و خەڵکانی بەدبەخت ریسوا بکات.

دەڵێت: ئەو پیاوە هاتەدەر، وتیان: چیت کرد؟

وتی: گرفتار بووین، سوێند بەخوا تەنیا بەکوشتنی ئەو لەدەست خەڵکان ڕزگارمان دەبێت، بەڵام کوشتنی ئەو بۆ ئێمە ڕەوا نییە.

کەسێکی دیکە لەمناڵەکانی لەیسیان بۆ کوشتنی ئەو نارد.

سەروەری باوەڕداران وتی: ئەی پیاو لەکام تایەفەیت؟

وتی: لەیس.

وتی: رکەبەری من نیت.

وتی: بۆ؟

وتی: مەگەر ئەو کەسە نیت پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەتۆ و فلأنە و فیسارە کەس دۆعای کرد کە لەفلأنە و فیسارە ڕۆژ پارێزراو بن؟

وتی: بۆنا.

وتی: کەواتە بەرێگەی هەڵەدا ناڕۆیت.

دەڵێت: ئەو کەسە گەڕایەوە و خەڵکانی میسری بەجێهێشت.

دەڵێت: یەکێك لەقوڕیشیان بۆ کوشتنی عوسمان کوڕی عەفان نارد و وتی: دەتکوژم.

وتی: هەرگیز، فلأنکەس تۆ من ناکوژیت.

وتی: بۆ؟

وتی: پێغەمبەر(د.خ) فلأنە ڕۆژ داوای بەخشینی تۆی کرد و خوێنی ناڕەوا ناڕێژیت؟

ئەویش گەڕایەوە و لەهاوەڵانی جیابوویەوە. عەبدوڵلە کوڕی سەلام هات و ڕێگەی کوشتنی سەروەری باوەڕدارانی لەخەڵکان گرت و وتی: ئەی خەڵکینە، شمشێری خۆتان دژی خۆتان لەکالآن دەرمەکێشن چوونکە سوێند بەخوا ئەگەر ئەو کارە بکەن، هیچ کات ناتوانن بیکەنەوە کالآن. هاوار لەئێوە! ئێستا خەڵکان بەقامچی فەرمانڕەواییان بەسەردا دەکرێت ئەگەر بیکوژن تەنیا بەشمشێر دەتوانن دەسەلآت بەسەر خەڵکاندا بکەن، هاوار لەئێوە! هەنووکە فریشتەکان شارەکەی ئێوەیان گەمارۆداوە، ئەگەر بیکوژن، ئەم شارە بەجێدێڵن.

وتیان: ئەی زادەی جوولەکە، تۆ کارت بەم کارانە چییە؟ ئەو ڕۆشت.

دەڵێت: دووایین کەس کە بۆ کوشتنی ئەو ڕۆشت و گەڕایەوە، محەممەد کوڕی ئەبی بەکر بوو. سەروەری باوەڕداران پێی وت: هاوار لەتۆ! ئایا لەخواوەند تووڕەیت؟ چ هەڵە و تاوانێکم سەبارەت بەتۆ کردووە، جگە لەوەی مافی خواوەندم لیٚ وەرگرتوویت؟ ئەو راچەنی و گەڕایەوە.

دەڵێت: کاتێك محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ڕۆشتەدەر و لەشکستی ئەو ئاگادار بوونەوە، قەتیرە و حیمران، هەردووك سەکوونی، و غافقی پەلاماریاندا. غافقی بەئاسن لێیدا و شەقی لەقورئانەکە هەڵدا و کەوتە بەردەم سەروەری باوەڕداران و خوێنی ڕژایەسەر. سودان کوڕی حیمران هات و بەشمشێر لێیدا. نایلە کچی قەرافسە خۆیدا بەسەر سەروەری باوەڕداران ودەستی خۆی خستە بەر شمشێرەکە و پەنجەکانی قرتا. ئەو ئاوڕی دایەوە و سوودان دەستی لەڕانیدا و وتی: سمتی چەندە پانە.

ئەوسا لە سەروەری باوەڕدارانیدا و کوشتی.

چەند کەسێك لەکۆیلەکانی سەروەری باوەڕداران و کەسانی دیکە هاتن تا هاوکاری بکەن. پێشتر عوسمان کوڕی عەفان پێی وتبوون هەرکەس لەوان بەرگری نەکات، ئازادە.

کاتێك بینیان سوودان بەشمشێر لێیداوە، یەکیان پەلاماریدا و سودانی کوشت. قەتیرە هێرشی کردە سەر کۆیلەکە و کوشتی.

دواتر هەرچی لەناو ژوورەکەدا بوو تالأنیان کرد و هەموو کەسانی ناو ژوورەکەیان دەرکرد و دەرگایان لەسەر سێ کوژراوەکە داخست. کاتێك هاتنە ناو حەوشەکە، یەکێکی دیکە لەکۆیلەکانی عوسمان کوڕی عەفان هێرشی کردە سەر قەتیرە و کوشتی.

دەرگای ماڵەکەیان داخست و هەموو شتەکانیان هەڵگرت تا ئەو جێگەی پۆششی ژنانیان لەگەڵ خۆیان برد. یەکیان جل و بەرگەکانی نایلەی برد، ناوی کولسوم کوڕی تەجیب بوو، کاتێك نایلە دوور کەوتەوە، وتی: دایك مردووە، چەندە سمتی جوانە؟ چەندە گۆشتنە؟ یەکێك لەکۆیلەکانی سەروەری باوەڕداران ئەوی بینی و کوشتی بەڵام دواتر خۆیشی کوژرایەوە. خەڵکانی میسر بەیەیکیان وت ئاگایان لەدەوروبەری خۆیان بێت. هەروەها هاواریان کرد خێراتر لەهەمووان خۆتان بگەیێنە بیت المالْ تا کەس زووتر لەئێوە نەگاتە ئەو شوێنە.

لێپرسراوانی بیت المال دەنگی ئەوانیان بیست. لەوێ تەنیا دوو کیسەی لێ بوو. وتیان: هەڵبێن چوونکە ئەم دەستەیە بەدوای مەبەستەکانی دنیاوەن. هەڵاتن. خەڵکانی میسر روویان کردە بیت المال و تالأنیان کرد. خەڵکان سەبارەت بە سەروەری باوەڕداران چەندین دەستە بوون. دانیشتووانی مەدینە انا لله یان هێنایە سەرزمان و دەگریان و هێرشبەران، شادمانییان دەکرد. بەڵام ئەوانیش پەشیمان بوونەوە.

زوبەیر مەدینەی بەجێهێشتبوو و لەسەر رێگەی مەککە خێوەتی هەڵدا بوو تا لەکاتی کوشتنی سەروەری باوەڕداران ئامادە نەبێت. کاتێك هەواڵی کوژرانی سەروەری باوەڕدارانی پێگەیشت، وتی: انا لله و انا الیه راجعون. خواوەند سەروەری باوەڕداران ببەخشێت و تۆڵەی ئەو و ئیسلام بستێنێت.

پێیان وت: ئەو دەستەیە پەشیمانن.

وتی: بیریان کردۆتەوە، بیریان کرۆدتەوە.

ئەم ئایەی خوێندەوە:

((وحيل بينهم و بينمايشتهون. كما فعل باشياعهم من قبل انهم كانوا فى شك مريب.

واتاکەی: لەنێوان ئەوان و ئارەزووەکەیان لەمپەرێك دروست بکەن بەهەمان شێوە لەگەڵ کەسانی پێشووی هاوشێوەی ئەوان ئەو کارەیان کردووە چوونکە بەتەواوی لەگوماندا دەژیان.))

دەڵێت: تەڵحە کاتێك ئاگادار بوویەوە، وتی: خواوەند سەروەری باوەڕداران ببەخشێت و تۆڵەی ئەو و ئیسلام بستێنێت.

پێیان وت: ئەو دەستەیە پەشیمانن.

وتی: هیوادارم لەناو بچن. ئەم ئایەی خوێندەوە:

((فلا يستطيعون توصية و لا الى اهلهم يرجعون.

واتاکەی: نەدەتوانن وەسیەت بکەن نەدەتوانن بۆ لای کەسەکانی خۆیان بگەڕێنەوە.))

عەلی کوڕی ئەبی تالیب کاتێك ئاگادار بوویەوە، وتی: خواوەند سەروەری باوەڕداران ببەخشێت و بەهەشت بکاتە جێگەی.

پێیان وت: ئەو دەستەیە پەشیمانن.

ئەم ئایەی خوێندەوە:

((كمثل الشيطان اذقال للانسان اكفر فلما كفر قال انى برى منك انى اخاف الله رب العالمين.

واتاکەی: هاوشێوەی شەیتان ئەو کاتەی بەمرۆڤ دەڵێت: کافر بە و کاتێك کافر دەبێت دەڵێت: لەتۆ بێزارم، من لەخواوەندی جیهانیان دەترسم.))

بەدوای سەعددا گەڕان. لەباخەکەی خۆیدا بوو، وتبووی: حەز ناکەم کوژرانی سەروەری باوەڕداران ببینم. کاتێك لەکوژرانی ئەو ئاگادار بوویەوە، وتی: بەرەو بەڵا ڕامان کرد و گرفتاری بەڵا بووین.

ئەم ئایەی خوێندەوە:

((الذين ضل سعيهم فى الحيوة الدنيا و هم يحسبون انهم يحسنون صنعا.

واتاکەی: ئەو کەسانەی هەوڵی ئەوان لەم ژیانەدا ونبووە، بەڵام گومان دەکەن چاکەکارن.))

وتی: خواوەندا پەشیمانیان بکەرەوە و دواتر لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکە.

موغەیرە کوڕی شوعبە دەڵێت: بەعەلیم وت: ئەم پیاوە دەکوژرێت و ئەگەر بکوژرێت و تۆ لەمەدینەدا بیت، گومانی خراپ لەتۆ دەکەن، بڕۆ لەفلاّنە شوێن بمێنەرەوە چوونکە ئەگەر بڕۆیت و لەیەکێك لەئەشکەوتەکانی یەمەندا خۆت حەشار بدەیت، بەدوای تۆدا دەگەڕێن.

دەڵێت: بەلاّم ئەو رازی نەبوو. بۆ ماوەی بیست و چەند رۆژ گەمارۆیان خستە سەر عوسمان کوڕی عەفان و ئەوسا ئاگریان لەماڵەکەی بەردا. زۆر کەس، بۆ نموونە عەبدوللە کوڕی زوبەیر و مەروان لەناو ماڵەکەدا بوون و وتیان: مۆڵەتی بەرگری کردنمان پێبدە.

وتی: پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێداوم خۆڕاگری بکەمە پیشە چوونکە ئەم کەسانە بۆ مەبەستێکی گەورەتر دەرگاکەیان سووتاند. من بۆ شەڕ کردن کەس ناخەمە گرفتارییەوە.

دەڵێت: هەمووان ڕۆشتن. سەروەری باوەڕداران داوای قورئانی کرد و دەستی بەخوێندنەوە کرد. حەسەن کوڕی عەلی لای بوو، پێی وت: هەنووکە باوکت سەرقاڵی کارێکە، سوێندت دەدەم بەخوا بڕۆ.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران بەباوکی کەرب، یەکێك لەخەڵکانی هەمەدان و یەکێك لەئەنساری وت لەبەر دەرگای بیت المال بێستن بەلاّم تەنیا دوو کیسەی زیوی لێ بوو. کوڕی زوبەیر و مەروان جەنگیان دەستپیکرد و ئاگرەکە کوژایەوە. محەممەد کوڕی ئەبی بەکر هەڕەشەی لەمەروان و کوڕی زوبەیر کرد و کاتێك ڕۆشتە لای سەروەری باوەڕداران، ئەوان هەلاّتن. محەممەد ڕۆشتە لای سەروەری باوەڕداران و ڕیشی گرت.

سەروەری باوەڕداران وتی: ڕیشم بەردە، سوێند بەخوا ئەگەر باوکت دەبوو، ڕیشی منی نەدەگرت.

محەممەد ڕیشی بەردا. خەڵکانی میسر هاتنە ژوور. یەکێك بەپشتی شمشێر لێی ئەدا و یەکی دیکە بەشەقەزللە. کەسێك هات و چەند تیرێکی بەدەستەوە بوو. تیرێکی لەقورگی چەقاند و خوێن ڕژایە سەر قورئانەکە.

لەم کاتەدا لەکوشتنی ئەو دەترسان. ئەو، پیر و لەهۆش خۆی چوو. چەند کەسێکی دیکە هاتن و کاتێك بەبێهۆشی سەروەری باوەڕدارانیان بینی، قاچیان ڕاکێشا. نایلە و کچیەکانی سەروەری باوەڕداران شین و ڕۆڕۆیان دەستپێکرد. تەجیبی هات، ششمێری لەکالآن دەرکێشا بوو تا لێی بدات. نایلە دەستی خستە بەر شمشێرەکە، دەست بڕا و نایلە شمشێرەکەی لەسینەی سەروەری باوەڕداران چەقاند.

سەروەری باوەڕداران پێش ئاوابوونی هەتاو کوژرا، یەکێك هاواری کرد: کاتێك خوێنەکەی حەلآڵ بێت، سامانەکەی حەلآڵترە. هەموو شتێکیان تالآن کرد. دواتر هێرشیان کردە سەر بیت المال و ئەو دوو پیاوە کلیلەکانیان فرێدا و گیانی خۆیان دەرباز کرد، وتیان: هەلآتن، هەلآتن، ئەم دەستەیە تەنیا ئەمەیان دەویست.

عەبدولرەحمان کوڕی محەممەد دەڵێت: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر لەماڵەکەی عەمرۆ کوڕی حەزم، لەسەر دیوارەکەوە، ڕۆشتە لای سەروەری باوەڕداران، کەنانە کوڕی بیشر کوڕی عەتاب و سودان کوڕی حیمران و عەمرۆ کوڕی حەمەق هاوڕێیەتیان دەکرد.

سەروەری باوەڕداران لای نایلەی هاوسەری بوو، سورەی (بقرە)ی دەخوێندەوە، محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ڕۆشتە پێی و ڕیشی عوسمان کوڕی عەفانی گرت و وتی: ئەی نەعسەل، خواوەند ریسوای کردی.

سەروەری باوەڕداران وتی: من نەعسەل نیم، بەندەی خوام و سەروەری باوەڕداران.

محەممەد وتی: معاویە و فلآنە و فیسارە کەس نەیانوتوانی هاوکاریت بکەن.

سەروەری باوەڕداران وتی: ئەی برازا، ڕیشم بەردە، ئەگەر باوکت دەبوو، ئەو کارەی تۆی نەدەکرد.

محەممەد وتی: ئەگەر لە کارەکانی تۆ ئاگادار دەبوویەوە، ڕەخنەی لێ دەگرتیت، تەنیا بەگرتنی ڕیشی تۆ بەسەندە دەکەم.

سەروەری باوەڕداران وتی: لەخواوەند دژی تۆ داوای هاوکاری دەکەم. محەممەد بەتیر لەناوچاویدا. کەنانە کوڕی بیشر بەتیر لەبن گوێچکەیدا و تا قورگی ڕۆشتەخوار. دواتر بەشمشێر لێیدا و کوشتی.

باوکی عود دەڵێت: کەنانە کوڕی بیشر، ناوچاو و سەری سەروەری باوەڕدارانی بەگورزێکی ئاسنین کوتی و کەوتە سەر پشت و لەم کاتەدا سودان کوڕی حیمران بەشمشێر کوشتی.

عەبدولرەحمان کوڕی حارس دەڵێت: ئەو کەسەی سەروەری باوەڕدارانی کوشت، کەنانە کوڕی بیشر کوڕی عەتابی تەجیبی بوو.

دەڵێت: ژنی مەنزور کوڕی سەیاری فەزاری دەیوت: بەرەو مەککە دەڕۆشتین و لەکوژرانی عوسمان کوڕی عەفان ئاگادار نەبووین، کاتێك گەیشتینە عەرج، کەسێك لەتاریکی شەو هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( بزانن باشترینی کەسەکان دوای ئەو سێ کەسە

کوژراوەکەی دەستی تەجیبییە کە لەمیسرەوە هاتووە.))

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی حەمەق، هێرشی کردە سەر سەروەری باوەڕداران و لەسەر سینەی دانیشت. هێشتا گیانی بەبەردا مابوو. نۆ زەربەی لەسینەیدا. وتبووی: سێ زەربەی لەرێگەی خوا و شەش زەربەی بۆ تۆڵە سەندنەوە.

موسا تەڵحە دەڵێت: لەرۆژی ڕووداوەکە، عوروە کوڕی شیمم بینی کەشمشێری لەملی مەرواندا و یەکێك لەدوو دەمارەکەی ملی بڕی. دوای ئەمە، مەروان تا کۆتایی تەمەن، ملی خوار بوو.

عوسمان کوڕی محەممەدی ئەخنەسی دەڵێت: گەمارۆدانی سەروەری باوەڕداران پێش خەڵکانی میسر دەستی پێکردبوو. خەڵکانی میسر ڕۆژی هەینی هاتن و هەینی دواتر ئەویان کوشت.

یەزید کوڕی حەبیب دەڵێت: ئەو کەسەی سەروەری باوەڕدارانی کوشت، بێهرانی ئەسبەحی بکوژی عەبدوللە کوڕی بوسرە بوو. بێهران لەتایەفەی مناڵەکانی عەبدئەلدار بوو.

باوکی عەون موالی میسوەر کوڕی مەخریمە دەڵێت: خەڵکانی میسر لەکوشتنی

سەروەری باوەڕداران و جەنگ کردن دەستیان هەڵگرتبوو تا ئەوەی هێزی پشتیوانی عێراق لەکوفەوە و بەسرەوە بەرێکەوت و کاتێك هاتن ورەیان بەنەیارەکان بەخشی و ئاگادار بوونەوە کە نێردراوان لەعێراق و لەمیسرەوە پێش عەبدوللە کوڕی سەعد بەرێکەوتوون. عەبدوللە کوڕی سەعد پێشتر لەمیسر نەبوو و وەك کەسێکی هەڵاتوو رووی لەشام کردبوو. نەیاران دەیانوت: پێش ئەوەی هێزی پشتیوان بگات، لەناوی دەبەین.

یوسف کوڕی عەبدوللە کوڕی سەلام دەڵێت: سەروەری باوەڕداران لەسەر بانی ماڵەکەیەوە خۆی نیشانی نەیارەکانیدا. ئەو گەمارۆی لەسەر بوو. لەهەر چوارلاوە دەوری ماڵەکەیان گرتبوو. وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا ئایا دەزانن لەکاتی کوژرانی سەروەری باوەڕداران، عومەر کوڕی خەتاب، داواتان لەخواوەند کرد باشترین کەس وەك خەلیفەی ئێوە هەڵبژێرێت و بتوانن لەسەر باشترین کەس هاوڕا بن، گومانی چی دەکەن؟ ئایا دەڵێن دۆعاکەی ئێوەی گیرا نەکرد و لای خواوەند بێ بەها بوون؟ لەکاتێکدا لەو کاتەدا زیاتر لەهەموو خەڵکان بەرێز و هێشتا دوو بەرەکی لەناو ئێوەدا سەری هەڵنەدابوو. دەڵێن خواوەند گرنگی بەدینەکەی نەدەدا و بەلاوازترین کەسی سپارد؟ لەکاتێکدا ئەو رۆژە ئەم دینە هۆکاری پەرەستینی خواوەند بوو و هێشتا خەڵکەکەی بڵاوەیان لێنەکردبوو، ئەگەر بەمشێوەیە، باوەشتان بۆ ریسوایی و ئەنجامی خراپی پێشهاتەکان کردۆتەوە. یا ئەوەی دەڵێن ئەم کارە بەراوێژ نەکراوە و پێداگری دەکەن لەو گومانەی خواوەند بەهۆی نافەرمانییەوە ئۆمەتەکەی خۆی لەبیر کردووە و دەڵێن بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە پرس و راوێژیان بەئێمە نەکردووە و بۆ رێگرتن لەنافەرمانی خواوەند هیچ هەوڵێکیان نەداوە. یا ئەوەی گومان دەکەن خواوەند نەیدەزانی سەرئەنجامی من چی دەبێت. من کە لەبەشێك لەکارەکانم چاکەکار و جێی رەزامەندی باوەڕداران، دواتر چ کارێکم ئەنجامدا نارەزایی خواوەندی لێکەوتەوە و ئێوە پەسەندتان نەکرد و خواوەند لەکاتی هەڵبژاردنی من بۆ خەلیفە لێی بێ ئاگا بوو؟ سوێندتان دەدەم بەخوا ئایا پێشینەی چاکەکاری من نازانن کەخواوەند پێی بەخشیوم و لەگەڵ دوژمنان جەنگاوم تا ماف من بەسەر داهاتووان بسەلمێنێت و لەپێشییەکانی من بزانن؟ ئارام بن، مەمکوژن چوونکە کوشتن رەوا نییە مەگەر یەکێك لەم کەسانە: ئەو کەسەی ژنی هەبێت و زینا بکات،

کەسێکی موسوڵمان کافر ببێت یا کەسێك بۆ قیساس. ئەگەر من بکوژن شمشێر دەخەنە سەر گەردنی خۆتان و خواوەند تا ڕۆژی پەسڵان لەو بەڵایە ڕزگارتان ناکات. مەمکوژن چوونکە ئەگەر من بکوژن چیتر پێکەوە نوێژ ناخوێنن و خواوەند هیچ کات دووبەرەکی لەناو ئێوەدا لەناو نابات.

وتیان: ئەوەی باسی دەکەیت کەدوای تەمەنێك چاوەڕوانی چاکەمان لەخواوەند دەکرد، ئەوەی خواوەند فەرمانی پێداوە، چاکەیە بەڵام خواوەند دەرئەنجامی کارەکەی تۆی کردە هۆکاری تاقیکردنەوەی بەندەکانی، ئەوەی باسی لەپێشی و چاکەکاری خۆت دەکەیت، کەسێکی چاکەکار و شیاوی خەلافەت بوویت بەڵام دوای گرتنە دەستی ئەو کارە، گۆڕایت و کردەوە ناپەسەندەکانت ئەنجامدا. بەڵام ئەو زیانانەی کە لەئەگەری کوشتنی تۆ بەسەر ئێمەدا دەبارێت، ڕەوا نییە لەترسی ئاژاوە و بەلا ماف تۆ نەدەین. ئەوەی دەڵێیت کوشتن ڕەوا نییە مەگەر لەیەکێك لەم دۆخانە. بەڵام ئێمە لەکتێبی خواوەند کوشتنی ئەم کەسانە دەبینین و بەڕەوای دەزانین: کوشتنی ئەو کەسەی سەرکێشی بکات و لەسەر یاخیگەری پێداگری بکات و هەرکەس بۆ چەسپاندنی ڕاستی بەو کارە هەستێت دەتوانێت خوێنی بڕێژێت و لەسەر کارەکەی پێداگری بکات. تۆ سەرکێشیت کرد و ڕێگر بوویت و پێداگریت کرد و ناخوازیت لەخۆت بۆ ئەو کەسانەی ستەمت لێکردوون، تۆڵە بستێنیتەوە. ئەگەر دەڵێیت لەگەڵ ئێمەدا کەسێکی پێداگر نەبوویت و ئەوانەی بەرگری لەتۆ دەکەن و لەنێوان ئێمە و تۆ بوونەتە لەمپەر، لەسەر فەرمانی تۆ دەجەنگن لەبەر ئەوەی خوازیاری خەلافەتیت و ناخوازیت دەستبەرداری بیت. ئەگەر خۆت لەسەر کار لاببەیت، چیتر شەڕی تۆ ناکەین.

## گێڕانەوەی دەستەیەك لەكردەوەكانی عوسمان كوڕی عەفان

حەسەن كوڕی ئەبی حەسەن دەڵێت: ڕۆشتمە ناو مزگەوت، عوسمان كوڕی عەفانم بینی پاڵی بەعاباكەی خۆیەوە دابوو. دوو ئاوكێش بۆ داوەری كردن هاتن و لەنێوان ئەوان داوەری كرد.

حەسەنی بەسری دەڵێت: عومەر كوڕی خەتاب ڕێگەی ڕۆشتنی بەسەركردەكانی قورەیش لەموهاجیرەكان نەدەدا مەگەر بەوەرگرتنی مۆڵەت و بۆ ماوەیەكی دیاریكراو. ئەم كارە بووە هۆی ئەوەی زمان بۆ سكالاّ و گازندە بكەنەوە. عومەر كوڕی خەتاب ئاگادار بوویەوە و وتی: بزانن من هاوشێوەی وشتر سەیری ئیسلام دەكەم كەساوایە، دواتر دوو ساڵە، چوار ساڵە، شەش ساڵە و دوای ئەوە كامڵ دەبێت. مەگەر دەتوانین لەكامڵ جگە لەكەمبوونەوە چاوەڕوانی شتی دیكە بكەین؟ دڵنیا بن ئیسلام كامڵ بووە، دڵنیا بن قورەیشییەكان دەخوازن سامانی خواوەند تایبەت بكەن بەخۆیان. دڵنیابن تا كوڕی خەتاب زیندوو بێت، ئەو ئارەزووە دەبەنە ژێر گڵ. من لەبەردەم ڕێگەی حوڕە رادەوەستم و قوڕگی قورەیشییەكان و دۆخینەی شەرواڵەكانیان دەگرم تا نەڕۆنە ناو جەهەننەم.

تەڵحە دەڵێت: كاتێك عوسمان كوڕی عەفان خەلافەتی گرتەدەست، هاوشێوەی عومەر كوڕی خەتاب ڕێگەی لەوان نەگرت و لەویلایەتەكاندا بلاّو بوونەوە و دنیایان بینی و خەڵكان ئەوانیان بینی و بەمشێوە ئەوانەی لەناو ئیسلامدا پێگە و جێگەیان نەبوو، تێكشكان. خەڵكان بەردەوام پەیوەستیان دەبوون چوونكە چاوەڕوانییان لەوان و لەمبارەوە گفتوگۆیان كرد و وتیان: ئەوان دەسەلاّت دەگرنە دەست، با بمانناسن و ببینە كەسانی نزیكی ئەوان. ئەمە یەكەم بەلاّ بوو لەئیسلامدا هاتە كایەوە و یەكەم ئاژاوە بوو لەناو كۆمەلاّنی خەڵك بەگشتی روویدا.

شەعبی دەڵێت: پێش ئەوەی عومەر كوڕی خەتاب بمرێت، قورەیشییەكان لێی بێزار ببوون چوونكە عومەر كوڕی خەتاب ئەوانی لەمەدینە هێشتبوویەوە و ڕێگەی ڕۆشتنی لێ دەگرتن و دەیوت: لەڕۆشتنی ئێوە بۆ ویلایەتەكان زیاتر لەهەر شتێك بۆ ئەم ئۆمەتە دەترسم. لەگەڵ كەسانی دیكەی دانیشتووی مەككە ئەو كارەی نەدەكرد.

ئەگەر یەکێك لەموهاجیرەکان داوای بەشداری کردن لەجەنگەکانی دەکرد، دەیوت: ئەو جەنگانەی شان بەشانی پێغەمبەر(د.خ) تیایاندا بەشدار بوویت، بۆ تۆ بەسە، باشترە دنیا نەبینی و تۆ نەبینێت.

دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان خەلافەتی گرتەدەست، ئازادی کردن و بەناو ویلایەتەکاندا بلاو بوونەوە. خەڵکان پەیوەستیان بوون و بەمشێوەیە عوسمان کوڕی عەفانیان زیاتر لەعومەر کوڕی خەتاب خۆش دەویست.

سالیم کوڕی عەبدولله دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان خەلافەتی گرتەدەست، هەموو ساڵێك حەجی دەکرد جگە لەدوواین ساڵ. ئەویش هاوسەرانی پێغەمبەری لەگەڵ خۆی بۆ حەج دەبرد. عەبدولرەحمان کوڕی عەوف جێگری بوو، سەعید کوڕی زەیدیش بۆ ماوەیەك جێگری بوو. سەعید لەدوواین جار و عەبدولرەحمان لەیەکەم جار. نامەی بۆ ویلایەتەکان نووسیبوو هەر ساڵە لەکاتی حەج لێپرسراوان و ئەو کەسانەی سکالایان هەیە، لەدەوری کۆببنەوە. نامەی بۆ خەڵکی ویلایەتەکان نووسی: چاکەکار بن و رێگە لەخراپەکاری بگرن. باوەڕدار، خۆی ریسوا ناکات و من پشتیوانی ستەم لێکراوانم دژی دەسەلاتداران بەخواستی خوا. خەڵك بەوشێوەیە بوون و ئەم دۆخە بەردەوام بوو تا ئەوەی خەڵکان بۆ ئاژاوە و دووبەرەکی لەنێوان موسوڵمانان پاساویان دەستکەوت.

تەڵحە دەڵێت: ساڵێك لەخەلافەتی عوسمان کوڕی عەفان تێنەپەڕیبوو کە قورەیشییەکان لەناو شارەکاندا دەوڵەمەند و خەڵکان پەیوەستیان بوون. حەوت ساڵ بەمشێوەیە بوو و هەردەستەیەك دەیانخواست هاورێکەی خۆیان خەلافەت بگرێتەدەست. دواتر کوڕی سەودا باوەڕی هێنا و شتی سەیری هێنایە سەرزمان و دنیا باوەشی بۆ خۆشگوزەرانی کردەوە و دیاردەکان لەسەر دەستی عوسمان کوڕی عەفان هاتنە بوون و لەدرێژی تەمەنی ئەو سکالایان دەکرد.

عوباد کوڕی حەنیف لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك دنیا بوو بەجێگەی خۆشگوزەرانی، یەکەم دیاردەی ناشیرین کە لەمەدینە بلاو بوویەوە، کۆتربازی و بەردەقانی بوو. عوسمان کوڕی عەفان یەکێك لەمناڵەکانی لەیسی راسپارد کە باڵی کۆترەکانی هەڵکەند و بەردەقانییەکانی شکاند.

عەمرۆ کوڕی شوعەیب دەڵێت: یەکەم کەس ڕێگەی ئەو کارانەی لەناو مەدینەدا گرت، عوسمان کوڕی عەففان بوو. کاتێك ئەو دیاردانە لەناو مەدینە بڵاو بوویەوە، کەسێی بۆ لەناوبردنیان راسپارد.

قاسم کوڕی محەممەد لەباوکی حەدیسێکی لەمشێوەیە دەگێڕێتەوە بەم زیادەیە کە لەناو خەڵکان (نەشئە) (جۆرێك لەسەرخۆشی) هاتە ئاراوە.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران کەسێکی نارد کە گۆچان بەدەست لەناو خەڵکاندا دەسووڕایەوە و ڕێگەی ئەو کارەی لێدەگرتن. بەڵام ماوەیەك دواتر پەرەی سەند و بڵاو بوویەوە. سەروەری باوەڕداران لەگەڵ خەڵکان قسەی کرد و بڕیاریاندا چەند کەسێکیان بگرن و قامچییان لێ بدەن.

سالیم کوڕی عەبدوللە دەڵێت: کاتێك دیاردە تازەکان لەناو مەدینە هاتە ئاراوە، کەسانێك لەو شارەوە روویان لەشارەکانی دیکە کرد هەم بەمەبەستی جیهاد و خۆ نزیك کردنەوە لەعەرەبەکان: دەستەیەك روویان لەبەسرە و دەستەیەك روویان لەکوفە و دەستەیەك روویان لەشام کرد. دەستەیەك لەمناڵی موهاجیرەکانی شارەکان دەستیان بەئەنجامدان و دووبارە کردنەوەی دیاردەکانی ناو مەدینە کرد جگە لەمناڵەکانی شام. دواتر هەمووی ئەوانەی روویان لەشارەکان کردبوو گەڕانەوە جگە لەوانەی شام. ئەم هەواڵەیان بە عوسمان کوڕی عەففان راگەیاند. ئەو لەناو خەڵکان وتارێکی پێشکەش کرد و وتی:

ئەی خەڵکانی مەدینە، ئێوە ڕەگ و ریشەی ئیسلامن، خەڵکان لەگەندەڵی ئێوە گەندەڵ دەبن و لەچاکسازی و چاکەکاری ئێوە، بەرەو چاکسازی دەڕۆن، سوێند بەخوا، کاتێك بزانم یەکێك لەئێوە دیاردەیەکی تازەی هێناوەتە کایەوە، دووری دەخەمەوە. کەس نابێت لەمبارەوە قسە یا داوای مۆڵەت بکات چوونکە ئەوانەی پێش ئێوە بوون، ئەندامەکانیان دەبڕدرایەوە بێ ئەوەی کەسیان لەمبارەوە قسە بکات.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران هەرکام لەوانی بەهۆی ئاژاوە نانەوە یا بەکار هێنانی سیلاح دەگرت، دووری دەسختەوە، باوکیان لەم کارەی سەروەری باوەڕداران سکاڵایان بەرز بوویەوە تا ئەو جێگەی بیستی کەدەیانوت: سەروەری باوەڕداران هەمووان دوور دەخاتەوە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) حەکەم کوڕی ئەبی عاسی

دوور خستبوویەوە.

وتی: حەکەم لەخەڵکانی مەککە بوو، پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بۆ تاییف دوورخستەوە و دواتر گەڕاندییەوە. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بەهۆی گوناحەکەیەوە دوور خستەوە و خۆی بەخشی. دوای ئەو، ئەبوبەکر و دوای ئەو، عومەر کوڕی خەتاب، خەڵکانیان دوور دەخستەوە. سوێند بەخوا چاوپۆشی لەبەخشش دەکەم و لەوان زیاتر لەسەر کارە ناپەسەندەکان ئێوە دوور دەخەمەوە. چەندین دیاردە و پێشهات هاتوونە کایەوە ناخوازم لەنێوان ئێمەدا بوونی هەبێت. دەترسم و وشیارم. وشیاربن و وانە وەربگرن.

یەحیا کوڕی سەعید دەڵێت: کەسێك لەسەعید کوڕی موسەییب سەبارەت بە محەممەد کوڕی حوزەیفە پرسیاری کرد کە بۆ دژی عوسمان کوڕی عەفان راپەڕی؟

وتی: هەتیوێك بوو لەژێر دەستی عوسمان کوڕی عەفان پەروەردە کرا. ئەو، سەرپەرەستی هەتیوخانەی بنەماڵەکەی خۆی بوو. کاتێك خەلافەتی گرتەدەست، حوزەیفە داوای لێکرد وەك کارگوزار دەستنیشانی بکات. وتی: کوڕی خۆم، ئەگەر جێگەی رەزامەندی دەبوویت، ئەو کارەم پێ دەسپاردیت، بەڵام جێگەی رەزامەندی نیت.

وتی: مۆڵەتم بدە بڕۆم و بۆ بژێوی ژیانی خۆم هەوڵ بدەم.

وتی: بۆ هەر شوێنێك دەخوازی بڕۆ. کەرەستە و چوارپێی پێبەخشی.

دەڵێت: کاتێك محەممەد رووی کردە میسر، یەکێك لەنەیارەکانی بوو چوونکە وەك کارگوزار دەستنیشانی نەکرد.

پرسی: ئەی عەمار کوڕی یاسر؟

وتی: لەنێوان ئەو و عەباس کوڕی عوتەبە کوڕی ئەبی لەهەب دەمەقاڵێ روویدا. عوسمان کوڕی عەفان لەهەردووکیانیدا و ئەمە بووە هۆی دوژمنایەتی لەنێوان بنەماڵەی عەمار و بنەماڵەی عوتەبە و تا هەنووکەیش بەردەوامە.

دەڵێت: سەعید کوڕی موسەییب لێدانەکەی وەك تانە لێدان هێنایە سەرزمان.

عەبدوللە کوڕی سەعید دەڵێت: لەباوکی سلێمان کوڕی باوکی حەسمە لەمبارەوە پرسیارم کرد، وتی: هەردووك بەرابەرەکەی بەریسوایی تۆمەتبار دەکرد.

موبەشیر دەڵێت: لەسالیم کوڕی عەبدوللە سەبارەت بە محەممەد کوڕی حوزەیفە پرسیارم کرد کە چ شتێك بووە هۆکاری ئەوەی دژایەتی عوسمان کوڕی عەفان بکات؟

وتی: توڕەیی و تەماح.

وتی: توڕەیی و تەماحی چی؟

وتی: لەئیسلامدا پێگەی بوو. کەسانێك هانیاندا و تەماحی لا دروست بوو، بوێری لەخۆی نیشاندا و خۆی بەخاوەن ماف زانی. عوسمان لەکاروبارەکان دووری خستەوە بێ ئەوەی چاوپۆشی لێ بکات. ئەمە بووە هۆی ئەوەی محەممەد ڕێگەی دژایەتی کردنی محەممەد بگرێتەبەر.

سالیم کوڕی عەبدوللە دەڵێت: یەکێك لەو کارانەی سەروەری باوەڕداران کەرەزامەندی خەڵکانی بەدواوە بوو، ئەمەیە، لەکەسێکیدا کە لەناو شەڕێکدا ئیهانەی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیبی کرد. کاتێك لەمبارەوە لێیان پرسی، وتی: پێغەمبەر(د.خ) ڕێزی لەمامەکەی خۆی دەگرت و من، ڕێگە بەکەس نادەم ئیهانەی بکات.

حیمران کوڕی ئەبان دەڵێت: سەروەری باوەڕداران دوای ئەوەی بەیعەتیان لەگەڵ بەست، منی بۆ لای عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب نارد. ئەوم بردە لای عوسمان کوڕی عەفان، وتی: بۆ منت هێناوەتە ئێرە؟

وتی: هیچکات زیاتر لەم ڕۆژانە نیازمەندی تۆ نیم.

عەباس وتی: ڕێز لەپێنج شت بگرە چوونکە تا ئەو کاتەی ئەم کارە بکەیت، خەڵکان گوێرایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی تۆ دەبن.

وتی: چین؟

وتی: خۆ دوورخستنەوە لەکوشتن، پاراستنی خەڵکان، بەخشش، نەرمی و پاراستنی نهێنی.

عەمرۆ کوڕی ئومەییەی زەمووری دەڵێت: هەرکام لەقورەیشییەکان دەگەیشتە تەمەنی پیری، حەزی لەخواردنی حەلیم دەکرد. جارێك لەگەڵ سەروەری باوەڕداران حەلیممان خوارد کەهیچکات لەو حەلیمەیان باشتر دروست نەکردبوو.

سەروەری باوەڕداران وتی: خواردنەکە چۆنە؟

وتم: باشترین خواردنێکە تا ئێستا خواردوومە.

وتی: خواوەند کوڕی خەتاب ببەخشێت، هەرگیز لەگەڵ ئەو حەلیمت خواردووە؟

وتم: بەڵێ، کاتێك تیکەم بۆ دەمم دەبرد، دەرژا چوونکە گۆشتی تیا نەبوو، بەبێ شیر دروستی دەکرد.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: ڕاست دەکەیت. سوێند بەخوا عومەر منداڵەکانی خۆی خستە زەحمەتەوە. لەم سۆنگەوە شێوازێکی گرتبووە بەر لاسایی کردنەوەی ئاسان نییە. سوێند بەخوا ئەم خواردنە لەسەر خەرجی موسوڵمانان ناخۆم، بەڵکو سامانی خۆمە. دەزانی من لەهەموو قورەیشییەکان دەوڵەمەندتر بووم و زیاتر لەهەمووان شارەزای کاروباری بازرگانی و بەردەوام خواردنی نەرم و سووك دەخۆم، هەنووکە پیر بووم و حەزم لەخواردنە سووکەکانە. گومان ناکەم کەس بۆ ئەم کارەم ڕەخنەم لێ بگرێت.

عەبدوللە کوڕی عامر دەڵێت: لەمانگی ڕەمەزان لەگەڵ سەروەری باوەڕداران بەربانگمان کرد. ئەو خواردنەی بۆ ئێمەیان دەهێنا، سووکتر لەخواردنەکەی عومەر کوڕی خەتاب بوو. هەموو شەوێك لەسەر خوانەکەی عوسمان کوڕی عەفان نانی باش و گۆشتی بەرخ دەبینرا. بەڵام کەمتر دەمبینی عومەر کوڕی خەتاب ئاردی بێژراو بەکار ببات. ئەو گۆشتەی دەیخوارد، گۆشتی مەڕی پیر بوو. لەمبارەوە لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان قسەم کرد، وتی: خواوەند عومەر ببەخشێت، بەرگەی هەندێ شتی دەگرت، کەس توانای ئەو کارانەی نییە.

عەبدوللە کوڕی باوکی سایب لەباوکی دەگێڕێتەوە: یەکەم خێوەت کە لەمەنی بینیم، خێوەتەکەی عوسمان کوڕی عەفان بوو. خێوەتێکی دیکە تایبەت بوو بە عەبدوللە کوڕی کورەیز. یەکەم کەس فەرمانیدا لەهەموو شوێنەکانی مەدینە بانگی سێیەم بدەن، عوسمان کوڕی عەفان بوو. هەروەها یەکەم خەلیفە بوو ئاردیان بۆ بێژایەوە.

تەڵحە دەڵێت: عوسمان ئاگادار بوویەوە کوڕی زینەلحەبکە سەرقاڵی فرتوفێڵە، کەسی بۆ لای وەلید کوڕی عوقەبە نارد تا لەمبارەوە پرسیاری لێ بکات، وتی: ئەگەر دانی بەکارەکانیدانا، سزای بدە.

دەڵێت: وەلید بانگی کرد و پرسیاری کرد، وتی: کارێکە دەبێتە هۆی

سەرسوڕهێنانی خەڵكان.

دەڵێت: وەلید سزایدا و خەڵكانی لەكارەكانی ئەو ئاگادار كردەوە و نامەی سەروەری باوەڕدارانی بۆ خوێندنەوە، پێی وتن: سەروەری باوەڕداران بەشێوەیەكی جیددی لەگەڵ ئێوەدا دەجووڵێتەوە، كەواتە هاوشێوەی ئەم كەسانە مەبن.

خەڵكان بوونە نەیاری ئەو كەسانە و لەوەی سەروەری باوەڕداران بەو شێوەیە لەدەنگ و باسەكان ئاگادار دەبوویەوە، سەریان سووڕدەما.

ئەو كەسە توڕە و لەگەڵ چەند كەسێك ئالای شۆڕشی بەرز كردەوە. ئەوانیان گرت و لێیاندان و سەبارەت بەوان نامەیان بۆ عوسمان كوڕی عەفان نووسی. سەروەری باوەڕداران كاتێك چەند كەسێكی بۆ شام دوور خستەوە، كەعب كوڕی زی ئەلحەبكەی و مالك كوڕی عەبدوللەی بۆ دۆنباوەند دوور خستەوە چوونكە ئەو ناوچەیە سەرزەمینی جادوو بوو. كوڕی زی ئەلحەبكە سەبارەت بە عوسمان كوڕی عەفان هۆنراوەیەكی هۆنییەوە بەم ناوەرۆكە:

((ئەگەر منت دوورخستەوە

ئەو گوناحەی منت پێ تۆمەتبار دەكرد، لە من دوور بوو

ئەی كوڕی ئەروی، چاوەڕوانی گەڕانەوەم

گەڕانەوەی من لەم رۆژگارەدا ئاسان نییە

غەریبی من لەویلایەتەكانی ستەم و جوێن

لەرێگەی خودا زۆر نییە

لەدۆنباوەند شەو و رۆژەكان بەدۆعا كردن لەتۆ بەسەر دەبەم.))

كاتێك سەعد فەرمانڕەوایی كوفەی گرتەدەست، ئەوی گەڕاندەوە، چاكەی لەگەڵ كرد و بڕێك سامانی پێدا بەڵام ناباوەڕی كردە پێش و كەسێكی خراپەكار لەئاو دەرهات.

دەڵێت: زابی كوڕی حارس بەرجەمی لەرۆژگاری وەلید كوڕی عوقبە لەیەكێك لەتایەفەكانی ئەنسار، سەگێكی بەناوی قورحان، بەقەرز وەرگرت. ئەو راوی ئاسكی دەكرد بەڵام سەگەكەی نەگەڕاندەوە و ئەنسارییەكان گفتوگۆ و لەخەڵكەكەی دژی ئەو داوای هاوكارییان كرد. خەڵكانێكی زۆر ناوبژیوانییان كرد و سەگەكەیان لێ سەندەوە. ئەو، بۆ ریسوا كردنی ئەوان هۆنراوەیەكی هۆنییەوە كەناوەرۆكەكەی

بەمشێوەیە:

((دەستەی قورحان دژی من هەوڵیان دەدا

چوونکە شەڕ، لەو گومڕا و سەرگەردان دەبێت

شادمان و دڵخۆش بوون وەك بڵێی خەلیفە

ماڵی فەرمانڕەوای بەوان بەخشبێت

دەستبەرداری سەگەکەتان مەبن چوونکە دایکتانە

و نارەزایی دایکتان کارێکی دژوارە.))

ئەنسارییەکان لای سەروەری باوەڕداران سکاڵایان کرد. سەروەری باوەڕداران کەسی نارد و سزایدا و ڕێگەی ئەو کارەی لێگرت. ئەم کارە لای زابی دژوار و بەناپەسەندی دەزانی.

دەڵێت: زابی دەستبەسەر بوو تا ئەو کاتەی مرد. سەبارەت بەکوشتن و داوای بەخشین کردن لەهاورێکانی هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناورەۆکە:

((مەبەستم نەبوو بەڵام دەمەوێت

نزیك بوو، خۆزگە ئەو کارەم دەکرد

و ژنەکانیم بەگریان ناچار دەکرد.

ژن دەڵێت: زابی لەزینداندا مرد

بەڵام دوای ئەو کەسێك لەگەڵ دوژمنی بوێر ڕووبەڕوو دەبێتەوە.

ژنێکی دیکە دەڵێت خواوەند زابی دوور نەخاتەوە

چوونکە گەنجێکی جوان ڕوخسارە و کاتێك

بەتەنیا لەگەڵی دادەنیشت،

ئارەزووی ئەو دەکەیت.))

دەڵیت: لەبەر ئەمە بوو عومەیر کوڕی زابی ڕێچکەی سەبەئییەکانی گرتەبەر.

موستەنیر لەبراکەی دەگێڕێتەوە: سوێند بەخوا کەسم نەبینیوە و ناناسم کە بۆجەنگی عوسمان کوڕی عەفان هات و نەکوژرابێت. لەکوفە دەستەیەك و لەناو ئەوان ئەشتەر، زەید کوڕی سوحان، کەعب کوڕی زی ئەلحەبکە، باوکی زێنەب، باوکی موەرع، کومەیل کوڕی زیاد و عومەیر کوڕی زابی کۆبوونەوە و وتیان: سوێند بەخوا

تا ئەو کاتەی عوسمان کوڕی عەفان خەلیفەی خەڵکان بێت، کەس ناتوانێت سەر بەرز بکاتەوە.

دەڵێت: عومەیر کوڕی زابی و کومەیل کوڕی زیاد وتیان: ئێمە دەیکوژین. بەمەبەستی ڕۆشتن بۆ مەدینە بەرێکەوتن. عومەیر لەکومەیل جویٰ بوویەوە بەڵام کومەیل بوێری لەخۆی نیشاندا و لەسەر ڕێگەی سەروەری باوەڕداران دانیشت. عوسمان لای ئەو گوزەری کرد و شەقەزللەی لەروخساریدا و بەپشتا کەوتە سەرزەوی و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئازارت پیٰ گەیاندم.

وتی: مەگەر تۆ پیاوکوژ نیت؟

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سوێند بەوخوایەی جگە لەو خوایەك نییە، نە. سوێندی خوارد. خەڵکان کۆبوونەوە و وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، بیپشکنین.

وتی: نا، خواوەند تەندروستی پێبەخشیم و ناخوازم زیاتر لەوەی هێنایە سەرزمان، شتی دیکە بزانم.

پێی وت: ئەی کومەیل، ئەگەر دەخوازیت تۆڵەی خۆت لەمن بستێنەرەوە. کەوتە سەر ئەژنۆ و وتی: سوێند بەخوا گومانم دەکرد مەبەستی کوشتنی منت هەیە.

هەروەها وتی: ئەگەر ڕاست دەکەیت خواوەند پاداشتت بداتەوە و ئەگەر درۆ دەکەیت، خواوەند ریسوات بکات.

کەوتە سەر ئەژنۆ و وتی: تۆڵەی خۆت بستێنەرەوە.

کومەیل وتی: لێت خۆش بووم.

دەڵێت: مانەوە تا ئەوەی خەڵکان سەبارەت بەمانەوەی ئەوان گفتوگۆیان دەکرد.

دەڵێت: کاتێك حەجاج هات، وتی: هەرکەس لەناو دەستەی موهەلیبدایە، بۆ ئەو شوێنەی فەرمانیان پێداوە بڕوات و خۆی نەخاتە ڕەنجەوە.

عومەیر هەستا و وتی: من پیرێکی پەککەوتەم و دوو کوڕی بەهێزم هەیە، یەکێك لەوان لەجیاتی من ڕەوانە بکە.

وتی: تۆ کێیت؟

وتی: عومەیر کوڕی زابی.

وتی: سوێند بەخوا چل ساڵ پێش ئێستا نافەرمانی خواوەندت دەکرد، تۆ دەکەمە وانەیەك بۆ موسوڵمانان. لەبەر دزی سەگ، بەناڕەوا توڕە بوویت، باوکت

خیانەتی کرد و کەوتە زیندان. تۆیش هەمان مەبەستت کرد بەڵام زیندوو مایتەوە بەڵام من ڕێگەی ئەو کارەت پێ نادەم. ئەویان کوشت.

سەیف دەڵێت: یەکێك لەمناڵەکانی ئەسەد کە لەنەیارەکانی عوسمان کوڕی عەفان بوو، بۆی گێڕامەوە: کاتێك حەجاج هات و خەڵکانیان کۆکردەوە، کەسێك پێشنیاری کەسێکی لەجیاتی خۆی کرد. حەجاج رازی بوو و کاتێك ڕۆشت، ئەسما کوڕی خاریجە وتی: من بۆ کارەکەی عومەیر خۆم ئامادە کردبوو.

وتی: عومەیر کێیە؟

وتی: ئەم پیاوە پیرە.

وتی: ئەو برینەی لەبیرم کردبوو، کەوتە بیرم، مەگەر تۆ لەناو ئەو کەسانەدا نەبوویت هێرشتان کردە سەر عوسمان کوڕی عەفان؟

وتی: بۆ نا.

وتی: جگە لەو کەسی دیکە لەکوفە ماوەتەوە؟

وتیان: بەڵێ، کومەیل.

وتی: عومەیر بێنن و بیکوژن.

دواتر کومەیلی بانگ کرد بەڵام هەڵات و لەجیاتی ئەو ئیهانەی تایەفەکەیان کرد. هەروەها خەڵکانی نەخەعیان ریسوا کرد.

ئەسوەد کوڕی هەیسەم پێی وت: لەپیرێکی پەککەوتەی بەساڵاچوو، چاوەڕوانی چیت؟

وتی: سوێند بەخوا یا ڕێگە لەزمانت دەگریت یا شمشێر دەکەمە هاوڕێی گەردنت.

وتی: ئەو کارە دەکەم.

دەڵێت: کاتێك کومەیل ترسی تایەفەکەی خۆی بینی کەدوو هەزار کەس بوون، وتی: مەرگ لەترس باشترە لەوەی دوو هەزار کەس بەهۆی منەوە بترسن و لەژیان بێ بەش بکرێن.

گەڕایەوە بۆ لای حەجاج.

حەجاج پێی وت: تۆ مەبەستی کوشتنی عوسمان کوڕی عەفانت کرد بەڵام

سەروەری باوەڕداران تۆی نەپشكنی. تۆ رازی نەبوویت و ئەوت خستە سەر زەوی لەكاتێكدا بەرگری لەخۆی دەكرد.

وتی: بەچ هۆكارێك من دەكوژیت؟ لەبەر بەخشینەكەی ئەو؟ یا ئەوەی تەندروست و زیندووم؟

وتی: ئەدهەم كوڕی موحریز بیكوژە.

ئەدهەم وتی: پاداشتەكەی بەشی من و تۆ بێت؟

وتی: بەڵێ.

ئەدهەم وتی: پاداشتەكەی بۆ تۆ و بێت و ئەگەر گوناحمان دەگات، گوناحەكەی لەئەستۆی مندا بێت.

مالیك كوڕی عەبدوللە یەكێك بوو لەو كەسانەی دوورخرابوونەوە. ئەو، هۆنراوەیەكی هەیە بەم ناوەرۆكە:

((كوڕی ئەروی سەبارەت بەكومەیل ستەمی كرد

كومەیل لێی خۆش بوو

ئەو كەسەی تۆڵەی خۆی دەستێنێتەوە، سەركۆنەی ناكەن

پێی وت: ئەی باوكی عەمرۆ

ئەو كارە ناكەم چوونكە تۆ پێشەوایت

بەخشین هۆكاری ئەمانە

خەڵكان لەپێشی بەخشین دەزانن

تۆڵەسەندنەوەیش گوناح نییە

ئەگەر فاروق دەیزانی چی دەكەیت

بێ گفتوگۆ رێگەی ئەو كارەی لێدەگرتیت؟))

سەحیم كوڕی حەفس دەڵێت: رەبیعە كوڕی حارسە كوڕی عەبدولموتەلیب لەرۆژگاری جاهلییەت شەریكی عوسمان بووە، عەباس كوڕی رەبیعە بەعوسمانی وت: نامە بۆ كوڕی عامر بنووسە تا سەد هەزار درەم وەك پێشەكی بەمن بدات.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران نامەی نووسی و كوڕی عامر سەد هەزار درەمی پێبەخشی وماڵێكی پێدا كەهەنووكە ماڵی عەباس كوڕی رەبیعەیە.

موسا كوڕی تەڵحە دەڵێت: عوسمان كوڕی عەفان پەنجا هەزاری بەقەرز

بەتەڵحەدا. ڕۆژێك سەروەری باوەڕداران هاتە مزگەوت، تەڵحە وتی: قەرزەکەی تۆ ئامادەیە.

وتی: ئەی باوکی محەممەد! چوونکە کەسێکی جوامێرێت، بەخشیم بەخۆت.

حەکیم کوڕی جابر دەڵێت: عەلی بەتەڵحەی وت: سوێندت دەدەم بەخوا خەڵکان لە عوسمان کوڕی عەفان دوور بخەرەوە.

وتی: ئەو کارە ناکەم تا منداڵەکانی ئومەییە بۆ ڕێگەی ڕاست بگەڕێنەوە.

حەسەن دەڵێت: تەڵحە کوڕی عوبەیدالله پارچە زەوییەکی بەحەوتسەد هەزار بە عوسمان کوڕی عەفان فرۆشت و بەهاکەی بۆ نارد. تەڵحە وتی: کەسێك سامانێکی بەو ئەندازەی هەبێت و لەماڵەوە هەڵیگرێت و نەزانیت لەلایەن خواوەندەوە گرفتاری چ تاقیکردنەوەیەك دەبێت، کەسێکی لەخۆباییە. شەوانە نێردراوێك لەناو کۆڵانەکانی مەدینە هاتوچۆی دەکرد و تا بەرەبەیان یەك درەمی لای خۆی نەهێشتەوە.

حەسەن دەڵێت: دوای ئەوەی هاتە لای ئێمە، بەدوای دینار و دڕەمدا دەگەڕا و یا وتی: زەرد و سپی.

لەم ساڵەدا یانی ساڵی سی و پێنج، کوڕی عەباس لەگەڵ خەڵکانی ڕێ و ڕەسمەکانی حەجی ئەنجامدا چوونکە عوسمان کوڕی عەفان فەرمانی پێدابوو.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەوەی بۆ عوسمان کوڕی عەفان

لەم ساڵەدا کوڕی عەباسی کردە سەرپەرەستی حاجییەکان

عێکرەمە لەکوڕی عەباس دەگێڕێتەوە: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان بۆ دووایین جار گەمارۆی خرایە سەر....

دەڵێت: لەکوڕی عەباسم پرسی: مەگەر دووجار گەمارۆی خرایە سەر؟

وتی: بەڵێ گەمارۆی یەکەمجار دەرۆژی خایاند. خەڵکانی میسر هاتن. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەزی خەشەب چاوی پێیان کەوت و لە سەروەری باوەڕداران دووری خستنەوە. سوێند بەخوا عەلی هاوەڵێکی ڕاستگۆی ئەو بوو تا ئەو کاتەی مەروان و سەعید و کەسانی دیکە عوسمان کوڕی عەفانیان دژی عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاندا و ئەو، گوێی لەقسەکانیان گرت و عەلی ڕەنجا.

دەیانوت: عەلی دەخوازێت کەس لەگەڵ تۆ نەپەیڤێت. هۆکارەکەی ئەوە بوو عەلی کوڕی ئەبی تالیب قسەی لەگەڵ دەکرد و مۆجیاری دەدا و سەبارەت بەمەروان و کەسانی بنەماڵەکەی بەشێوەیەکی توند قسەی دەکرد.

بە عوسمان کوڕی عەفانیان دەوت: بەئامادە بوونی تۆ کەپێشەوا و کوڕە پوڕ و ئامۆزای ئەویت، بەمشێوەیە قسە دەکات، نازانی لەپشت سەرت چۆن دەدەوێت!

کوڕی عەباس دەڵێت: ئەوەندە قسەیان کرد تا ئەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بڕیاریدا چیدی بەرگری لێنەکات.

دەڵێت: ئەو ڕۆژەی دەڕۆشتمە مەککە، ڕۆشتمە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتم: عوسمان کوڕی عەفان فەرمانی پێداوم بەرەو مەککە بڕۆم.

وتی: عوسمان کوڕی عەفان ناخوازێت کەس مۆجیاری بکات، کەسانی نزیکی کەسانێکی خراپەکارن و هەرکام دەستیان بەسەر ناوچەیەکدا گرتووەو خەراجەکەی دەخۆن، ئەگەر بەباشت زانی بەرگری لێ بکە و ئەگەر نەتکرد، پاساوت هەیە.

دەڵێت: خۆشویستنی عوسمان کوڕی عەفانم لەروخساری ئەودا دەبینی و دەمزانی ڕووداوێکی گەورە ڕوودەدات.

عێکرەمە دەڵێت: بیستم کوڕی عەباس دەیوت: عوسمان کوڕی عەفان پێی وتم بڕۆ بۆ لای خالید کوڕی عاس لەمەککە و بڵێ: سەروەری باوەڕداران سڵاوت بۆ دەنێرێت و دەڵێت لەفلانە ڕۆژەوە گەمارۆم لەسەرە و تەنیا ئاوی سوێری ناوماڵەکەم دەخۆمەوە و ڕێگە نادەن لەچاڵی ڕومە کە بەسامانی خۆم کڕیومە، ئاو هەڵبگرم، خەڵکان ئاوی لێ دەخۆنەوە و من ناتوانم. تەنیا خواردنەکانی ناو ماڵەکەم دەخۆم و ڕێگە نادەن لەبازار هیچ بکڕم و هەنوکەیش گەمارۆم لەسەرە. پێی بڵێ ڕێ ورەسمەکانی حەج لەگەڵ خەڵکان ئەنجام بدات و ئەگەر ڕازی نەبوو، خۆت ئەو کارە بگرە ئەستۆ.

دەڵێت: لەدێهە پەیوەستی حاجییەکان بووم. ڕۆشتمە لای خالید کوڕی عاس و لەوتەکانی عوسمان کوڕی عەفان ئاگادارم کردەوە.

وتی: ناتوانم بەرگەی دوژمنایەتی ئەو کەسانە بگرم. ڕازی نەبوو سەرپەرەستی ڕێ ورەسمی حەج بێت و وتی: تۆ ئەو کارە بگرە ئەستۆ چوونکە کوڕە مامی ئەو پیاوەیت و خەلافەت تەنیا بەو دەگات – مەبەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو—تۆ

شیاوترین کەسیت بەنوێنەرایەتی ئەو ئەم ئەرکە ئەنجام بدەیت.

دەڵێت: ریٚ ور ەسمەکانی حەجم لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا، لەکۆتاییەکانی ئەو مانگە گەڕامەوە بۆ مەدینە. سەروەری باوەڕداران کوژرابوو و خەڵکان دەستیان بۆ بەیعەت بەستن لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب درێژ کردبوو. کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب منی بینی، خۆی لەخەڵکان دوور خستەوە و هاتە لای من، بەهێواشی وتی: چی دەبینیت؟ وەك دەزانی پێشهاتێکی گەورە روویداوە و کەس ناتوانێت بەرگەی بگرێت.

وتم: دڵنیام ئەم خەڵکە ناتوانن چاو لەتۆ بپۆشن بەڵام دڵنیام لەگەڵ هەر کەسێك بەیعەت بکەن، بەکوشتنی ئەم پیاوە تۆمەتباری دەکەن. بەڵام رازی نەبوو. بەیعەتیان لەگەڵ کرد و کوشتنی عوسمان کوڕی عەفانیان خستە ئەستۆی ئەو.

عێکرەمە دەڵێت: کوڕی عەباس دەیوت: عوسمان کوڕی عەفان پێی وتم خالید کوڕی عاس کوڕی هوشامم وەك کارگوزاری مەککە دەستنیشان کردووە و خەڵکانی مەککە بیستوویانە ئەوان چی دەکەن. دەترسم رێگەی حەج کردنی لیٚ بگرن وئەو بەرگری بکات و لەحەرەم و شوێنی پارێزراوی خواوەند لەگەڵ خەڵکانی مەککە و دەستەیەك کە لەهەر دۆڵێکی قووڵەوە هاتوون تا بینەری بەرژەوەندییەکانی خۆیان بن، بجەنگێت، بەباشی دەزانم کاروباری حەج بەتۆ بسپێرم.

دەڵێت: لەگەڵ ئەودا نامەیەکی بۆ حاجییەکان نووسی و داوای لێکردن مافی ئەو لەنەیارەکانی وەربگرن.

دەڵێت: کوڕی عەباس ڕۆشت و لەسەڵسەڵ لای عایشە گوزەری کرد کەوتی: ئەی کوڕی عەباس، سوێندت دەدەم بەخوا، تۆ زمانێکی پاراوت هەیە، کەسان لەکوشتنی ئەم پیاوە پەشیمان بکەرەوە چوونکە لەشارەکانەوە بۆ ئەنجامدانی کارێکی گەورە هاتوون. تەڵحە کوڕی عوبەیدالله‌م بینی بۆ خەزێنەکان و بیت المال کلیلی تایبەتی ئامادە دەکرد. ئەگەر خەلافەت بگرێتەدەست، شێوازی کوڕە مامەکەی یانی ئەبوبەکر دەگرێتەبەر.

دەڵێت: وتم: دایکە گیان! بێدەنگ دەبم چوونکە ناخوازم لەگەڵ تۆدا مشتومڕ بکەم.

عەبدولمەجید کوڕی سوهەیل دەڵێت: ئەو نامەی سەروەری باوەڕداران نووسیبووی، لای عێکرەمە نوسخەیەکم لێ نووسییەوە. ناوەرۆکەکەی بەمشێوە بوو:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

لە عەبدولله عوسمان، سەروەری باوەڕداران، بۆ باوەڕداران و موسوڵمانان، سڵاو لەئێوە، پاداشتی خوایی بۆ ئێوە دەخوازم چوونکە جگە لەو خوایەك بوونی نییە. بەڵام دواتر: خواوەندتان بیر دێنمەوە کەنیعمەتەکانی پێ بەخشین و بەئیسلام ڕێزی لێگرتن و لەتاریکی بەرەو روناکی بردن و لەکوفر رزگاری کردن و مۆجیزەکانی خۆی نیشاندان و رۆژی ئێوەی فراوان کرد و بەسەر دوژمناندا سەرکەوتنی پێبەخشین. خواوەند دەفەرمێت و فەرموودەکانی ئەو راستە:

((و ان تعدوا نعمة الله لا تحصوها ان الانسان لظلوم كفار.

واتاکەی: ئەگەر دەتوانن نیعمەتەکانی خواوەند بژمێرن، ناتوانن چوونکە مرۆڤ ستەم کار و ناسپاسە.

دەفەرمێت:

(( يا ايها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته و لا تموتن الا و انتم مسلمون. و اعتصموا بحبل الله جميعا و لا تفرقوا و اذكروا نعمة الله عليكم اذ كنتم اعداء فالف بين قلوبكم فاصبحتم بنعمتة اخوانا وكنتم على شفاحفرة من النار فاتقذكم منها كذلك يبين الله لكم آياته لعلكم تهتدون. و لتكنمنكم امة يدعون الى الخير و يأمرون بالمعروف و ينهون عن المنكر و اولئك هم المفلحون. و لا تكونوا كالذين تفرقوا و اختلفوا من بعد ما جائهم البينات و اولئك لهم عذاب عظيم.

واتاکەی: ئێوە کەباوەڕتان هەیە، لەخواوەند بەهەمان شێوە کەشیاوی ترسان لەوە، بترسن و مەمرن مەگەر ئەوەی موسوڵمان بن. هەمووان بەتەناڤ خواوەند خۆتان هەڵواسن و بڵاوەی لێمەکەن و بەخشینەکانی خواوەندتان بۆ خۆتان لەبیر بێت، ئەو ساتانەی دوژمنەکانی بوون و لەنێوان دڵەکانی ئێوە یەکێتی دروست کرد و بەهۆی بەخششەکانی ئەو، بوونە برای یەك. لەسەر لێواری چاڵێك لەئاگر بوون وئێوەی رزگار کرد بەمشێوەیە خواوەند نیشانەکانی خۆی نیشانی ئێوە دەدات ئەگەری هەیە رێگەی رزگاری بدۆزنەوە. دەبێت دەستەیەك لەئێوە خەڵکان بۆ چاکەکاری و رێگرتن لەخراپە هان بدەن. ئەوان خۆیان رزگار بووەکانن. هاوشێوەی ئەو کەسانە مەبن

لەگەڵ ئەوەی بەڵگە و نیشانەکانی خواوەندیان بینی، بلاوەیان لێکرد و جیاوازی لەنێوانیاندا سەری هەڵدا چوونکە ئازابێکی گەورە چاوەڕوانیانە.))

هەروەها دەفەرمێت و فەرموودەکانی ڕەوایە:

((یا ایها الذین آمنوا اذکروا نعمة الله علیکم و میثاقه الذی و اثقکم به انقلتم سمعنا و اطعنا.

واتاکەی: نیعمەتەکانی خواوەند بۆ خۆتان بەو پەیمانەی بەڵێنتان پێی داوە، بیر بێننەوە ئەوساتانەی وتتان بیستمان و فەرمانبرداریـن.

هەروەها دەفەرمێت و فەرموودەکانی ڕەوایە:

یا ایها الذین آمنوا ان جائکم فاسق بنبأفتبینوا ان تصیبوا قوما بجهالة فتصبحوا علی ما فعلتم نادمین. و اعلموا ان فیکم رسول الله لو یطیعکم فی کثیر من الامر لعنتهم و لکن الله حبب الیکم الایمان و زینة فی قلوبکم و کره الیکم الکفر و الفسوق و العصیان اولئك هو الراشدون. فضلا من الله و نعمة و الله علیم حکیم.

واتاکەی: ئێوە کەباوەڕداران ئەگەر ناباوەڕێك هەواڵێکی بۆ هێنان، لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن، نەکەن لەرووی نەزانییەوە زیان لەدەستەیەك بدەن و لەوەی کردووتانە، پەشیمان ببنەوە. بزانن پێغەمبەری خواوەند لەنێوان ئێوەدایە ئەگەر لەزۆر کارەکان گوێرایەڵی ئێوە بکات، گرفتاری ڕەنج دەبن بەڵام خواوەند باوەڕ وئیمانی کردە خۆشەویستی ئێوە و دڵەکانی ئێوەی پێ ڕازاندەوە و حاشا کردن و نافەرمانی ناڕەوا کرد چوونکە ئەو کەسانەی لێکۆڵینەوە دەکەن، خۆیان لەدەستەی رزگاربووانن. بەخشش و نیعمەتەکان لەلایەن خواوەندەوەیە و خواوەند، دانا و فرەزانە.))

هەروەها دەفەرمێت:

((ان الذین یشترون بعهد الله و ایمانهم ثمنا قلیلا اولئك لاخلاق لهم فی الاخرة و لا یکلمهم الله و لا ینظر الیهم یوم القیامة و لایز کیهم و لهم عذاب الیم.

واتاکەی: ئەوکەسانەی پەیمان و سوێندەکانی خۆیان بەبەهایەکی ناگرینگ دەفرۆشن، ئەوان، لەودنیا هیچیان پێ نابڕێت و ڕۆژی پەسڵان خواوەند گفتوگۆیان لەگەڵ ناکات و ئاوڕیان لێ ناداتەوە و پاکیان ناکاتەوە و گرفتاری ئازابێکی دەردهێنەر دەبن.))

هەروەها دەفەرمێت و فەرموودەکانی ڕەوایە:

((فاتقوا الله ما استطعتم و اسمعوا و اطيعوا و انفقوا خير الانفسكم و من يوق شح نفسه فاولئك هم المفلحون.

واتاکەی: تا ئەو جێگەی دەتوانن بترسن و گوێرایەڵ و ملکەچ بن و سامانێك بۆ خۆتان ببەخشن تا لەرژدی خۆتان پارێزراو بێت. ئەوان، خۆیان، رزگاربووانن.))

هەروەها دەفەرمێت و فەرموودەکانی ڕەوایە:

((ولا تنقضوا الايمان بعد توكيدها و قد جعلتم الله عليكم كفيلا ان الله يعلم ما تفعلون. و لا تكونوا كالتى نقضت غزلها من بعد قوة انكاثا تتخذون ايمانكم دخلا بينكم ان تكون امة هى اربى من امة يبلو كم الله بة و ليبينن لكم يوم القيامة ما كنتم فيه تختلفون. و لو شاءالله لجعلكم امة واحدة و لكن يضل من يشاء و يهدى من يشاء و لتسئلن عما كنتم تعملون. و لا تتخذوا ايمانكم دخلا بينكم فتزل قدم بعد ثبوتها و تذوقوا السؤبما صددتم عن سبيا الله و لكم عذاب عظيم. و لا تتشروا بعهد الله ثمنا قليلا انما عند الله هو خير لكم ان كنتم تعملون. ما عند كم ينفد و ما عند الله باق و لنجزين الذين صبرواجرهم باحسن ما كانوا يعملون.

واتاکەی: سوێندەکانی خۆتان مەشکێنن دوای ئەوەی خواوەندتان کردە دەستەبەری خۆتان چوونکە خوا دەزانێت چی دەکەن. و وهاوشێوەی ئەو کەسە مەبن ریسەکەی خۆی بکاتەوە بەخوری و لەت لەتی بکات کەسوێندەکانتان لەنێوان خۆتان لەبەر ئەوەی دەستەیەك زیاتر لەدەستەیەکی دیکەیە، بکەنە هۆکاری فریو. ڕەوایە کەخواوەند بەهۆی سوێندەکانەوە ئێوە تاقی بکاتەوە و رۆژی هەستانەوە ئەو بابەتانەی لەسەری ناکۆك بوون، بۆتان روون بکاتەوە. ئەگەر خواوەند دەیخواست ئێوەی دەکردە یەك ئۆمەت بەلأم هەرکەس بخوازێت، گومڕای دەکات و هەرکەس بخوازێت،ڕێگەی نیشان دەدات. بۆ کردەوەکانتان لێپیچینەوەتان لەگەڵ دەکرێتز سوێندەکانتان مەکەنە هۆکاری فریو کەهەنگاوێك دوای بەهێز بوون، بخلیسکێت و بۆ دوور کەوتنەوەتان لەخوا، خراپەتان پێ ببڕێت و ئازابێکی گەورە چاوەڕوانتان بکات. پەیمانی خواوەند بەبەهایەکی کەم مەفرۆشن. ڕەوایە ئەوەی لەدەستی ئێوەدایە، لەناو بچێت و ئەوەی لەدەستی خواوەندایە، هەمیشەییە. ئەو کەسانەی

خۆڕاگرییان کردۆتە پیشە، پاداشتێکی باشتر لەکردەوەکانی خۆیانیان پێ دەبڕێت.))

هەروەها دەفەرمێت و فەرموودەکانی ڕەوایە:

اطیعوا الله و اطیعوا الرسول و اولی الامر منکم فان تنازعتم فی شیئی فردوه الی الله و الرسول ان کنتم تؤمنون بالله و الیوم الاخر ذلك خیرواحسن تأویلا.

واتاکەی: فەرمانبەرداری خواوەند بن و گوێرایەڵی پێغەمبەر(د.خ) و کاربەدەستانی خۆتان بن و کاتێك لەسەر بابەتێك جیاوازیتان لا دروست بوو، ئەگەر بەخواوەند و ڕۆژی هەستانەوە باوەڕتان هەیە، کێشەکە بۆ خواوەند و پێغەمبەرەکەی بگەڕێننەوە چوونکە باشتر و سەرئەنجامەکەی باشترە.))

هەروەها دەفەرمێت و فەرموودەکانی ڕەوایە:

((وعدالله الذین آمنوامنکم و عملوا الصالحات لیستخلفنهم فی الارض کما استخلف الذین من قبلهم و لیمکنن لهم دینهم الذی ارتضی لهم و لیبدلنهم من بعدخوفهم امنا یعبدوننی لا یشرکون بی شیئا و من کفر بعد ذلك فاولئك هم الفاسقون.

واتاکەی: خواوەند بەکەسانێك لەئێوە کەباوەڕیان هێناوە و کارە شیاو وپەسەندەکانیان ئەنجامداوە، بەڵێنی داوە، لەم سەرزەمینە بیانکاتە جێگری خۆی بەهەمان شێوە کەپێشینانی ئەوانی کردە جێگر و دینەکەیان کەبۆ ئەوان پەسەندە، سەقامگیر بکات و لەدوای ترس، ئارامییان پێ ببەخشێت چوونکە من دەپەرستن و کەس ناکەنە شەریکی من و هەر کەس دوای ئەمە ناباوەڕ بێت، ئەوان، خۆیان، نافەرمانان.

هەروەها دەفەرمێت و فەرموودەکانی ڕەوایە:

((ان الذین یبایعونك انما یبایعون الله، ید الله فوق ایدیهم. فمن نکث فانما ینکث علی نفسه و من اوفی بما عهد علیه الله فسیؤتیه اجرا عظیما.

واتاکەی: ئەو کەسانەی بەیعەت لەگەڵ تۆ دەبەستن لەڕاستیدا لەگەڵ خواوەند بەیعەت دەکەن. لەسەر دەستی ئەوان دەستی خواوەندە. هەرکەس بەیعەتەکەی بشکێنێت، لەزیانی خۆی ئەو کارە دەکات و هەرکەس بەو پەیمانەی لەگەڵ خواوەند بەستوویەتی، ئەمەکدار بێت، پاداشتێکی گەورەی پێدەبڕێت.))

بەڵام دواتر خواوەند لەئێوە گوێرایەڵی و فەرمانبرداری و پەیوەست بوون بەکۆمەڵانی خەڵکی ویست و لەستەم و دووبەرەکی و ئاژاوە ئاگاداری کردنەوە و لەکردەوەی کەسانی پێش خۆتان، چەندین چیرۆکی بۆ گێڕوانەتەوە و سەبارەت بەوان فەرمانیدا بۆ ئەوەی ئەگەر خراپەکاریتان کردەپیشە، بەڵگەکانی بەتەواوی نیشانی ئێوەدابێت. گوێ لەمۆجیارییەکانی خواوەند بگرن و لەئازابەکانی بترسن چوونکە هیچ ئۆمەتێك لەناو نەچوو مەگەر دوای ئەوەی ئاژاوە وجیاوازی لەناویاندا هاتە کایەوە و کەس نەیتوانی کۆیان بکاتەوە. ئەگەر ئەم کارە بکەن چیتر نوێژی جەماعەت ناخوێنن و دوژمنان بەسەرتاندا زاڵ دەبن و حەرامی یەکتر بەحەڵاڵ دەزانن. کاتێك ئەم پێشهاتە روو بدات، دینی خواوەند لەجێگەی خۆی نامێنێتەوە و دەبنە چەندین دەستە. خواوەند بەپێغەمبەر دەفەرمێت:

((ان الذین فرقوا دینهم و کانوا شیعا لست منهم فی شیئی انما امرهم الی الله ثم ینبئهم بما کانوا یفعلون.

واتاکەی: ئەو کەسانەی بلاوەیان بەدینەکەی خۆیان کرد و بوونە چەندین دەستە، کارت بەوان نییە، ئەوان، تەنیا خواوەند لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکات و لەسەر ئەنجامی کردەوەکانیان ئاگاداریان دەکاتەوە.))

منیش هەمان پێشنیاری خواتان پێدەکەم و لەئازابەکانی ئەو، ئاگادارتان دەکەمەوە چوونکە شوعەیب بەخەڵکەکەی خۆی وت:

((ویا قوم لایجر منکم شقاقی ان یصیبکم مثل ما اصاب قوم نوح اوم قوم هود او قوم صالح و ما قوم لوط منکم ببعید.و استغفروا ربکم ثم توبوا الیه ان ربی رحیم ودود.

واتاکەی: ئەی خەڵکینە، دژایەتی من بەرەو ستەمکاریتان نەبات چوونکە ئەو بەڵایەتان بەسەر دێت کە بەخەڵکەکەی نوح یا خەڵکەکەی ساڵح یا خەڵکەکەی هود گەیشت و رۆژگاری خەڵکانی لوت لەئێوە زۆر دوور نییە. داوای بەخشین لەپەروەردگار بکەن و تۆبە بۆ دەرگای بەرز بکەنەوە چوونکە پەروەردگاری من بەخشندە و مێهرەبانە.))

بەڵام دواتر: ئەو دەستانەی لەمبارەوە گفتوگۆیان دەکرد لای خەڵکان دەڵێت پێشنیاری گەڕانەوە بۆ کتێبی خواوەندو رێگەی راست دەکەن و خوازیاری دنیا و جەنگان بۆ دنیا نین و کاتێك راستیمان نیشاندان، بۆچوونی کەسان جیاواز بوو.

دەستەیەکیان رازی و دەستەیەکیان حاشایان لێکرد. دەستەیەکیان راستییان پشتگوێ خست و دەیانەوێت کاروباری خەلافەت بەناڕەوا بزانن چوونکە بەبۆچوونی ئەوان ساڵەکانی تەمەنی من درێژ بۆتەوە و ئارەزووی خەلافەت لەسەردا پەروەردە دەکەن و دەخوازن چارەنوسی من بەرەوپێش بەرن. نامەیان بۆ ئێوە نووسیوە لەو بەڵێنەی بەوانمداوە، پەشیمان بوومەتەوە. بیرم نایێت لەبەڵێنەکەم پەشیمان بووبێتمەوە. گومان دەکەن دەیانوێت سنوورەکان بپارێزن. پێم وتن ئەو کارە بۆ هەرکەس کەدەزانن سنوورەکانی بەزاندووە و بۆ هەکەرس کەس لەنزیك و دوور کەستەمی لەئێوە کردووە، ئەنجامی بدەن.

وتیان: دەبێت قورئان بخوێندرێتەوە.

وتم: هەرکەس دەخوازێت بیخوێنێتەوە و دەغەڵکاری نەکات و بەپێچەوانەی خوێندنەوەی راست، نەیخوێنێتەوە.

وتیان: دەبێت بێ بەش مانگانە وەربگرێت و سامان بەنیازمەندان بگات و سوونەتی چاکەکاری لەبەرچاو بگیرێت و دەستدرێژی نەکرێتە سەر پێنج یەك و زەکات و خەڵکانی برواپێکراو و بەهێز فەرمانڕەوایەتی بگرنەدەست و ستەملێکراوان مافەکانیان بۆ بگەڕێتەوە.

بەهەموو داخوازییەکانیان رازی بووم و خۆراگریم کردە پیشە. ڕۆشتمە لای هاوسەرانی پێغەمبەر(د.خ) و گفتوگۆم لەگەڵ کردن. وتم: دەڵێن فەرمانڕەوایی بەکێ بسپێرم؟

وتیان: عەمرۆ کوڕی عاس و عەبدوللە کوڕی قەیس وەك فەرمانڕەوا دەستنیشان بکە و معاویە لەشوێنەکەی خۆی بهێڵەرەوە چوونکە خەلیفەی پێش خۆت، ئەوی وەك فەرمانڕەوا دەستنیشان کردووە و هەنووکە کاروباری سەرزەمینەکەی خۆی سامان داوە و خەڵکانی ویلایەتەکەی لێی رازین. عەمرۆیش ڕەوانە بکە چوونکە خەڵکی ویلایەتەکەی لێی رازین و فەرمانی پێ بدە کاروباری سەرزمینەکەی ژێردەستی سامان بدات.

هەموو ئەم کارانەم ئەنجامدا بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا دەستدرێژییان کردۆتە سەرم و لەراستییەکان دوور کەوتوونەتەوە. هەنووکە بۆ ئێوە دەنووسم جڵەوی

کاروبارەکان لەدەستی ئەواندایە و دەخوازن قەزای خواوەند پێش بخەن. ڕێگەی نوێژ خوێندنم لیّ دەگرن. لەنێوان من و مزگەوت بوونەتە لەمپەر و هەرچییان بوێت، لەمەدینە هەڵی دەگرن. لەئێستادا کەئەم نامەیە دەنووسم، منیان بۆ هەڵبژاردنی یەکێك لەم کارانە سەرپشك کردووە: یا لەجیاتی هەر هەڵە یا تاوانێك کەزیانم لەکەسێکدا بێت، تۆڵەم لیّ بستێننەوە بیّ ئەوەی هیچ شتێك پشتگویّ بخەن یا دەست لەخەلافەت هەڵگرم تا کەسێکی دیکە وەك خەلیفە دەستنیشان بکەن یا کەس بۆ لای شوێنکەوتەکانی خۆیان لەویلایەتەکان و خەڵکانی مەدینە بنێرن و لەو مافەی خواوەند بۆ ئەوان لەبەرچاوی گرتووە، بێزاری دەرببڕن.

پێم وتوون: ئەوەی تۆڵە لەمن بستێننەوە، پێش منیش خەلیفەکانی دیکە هەڵە و تاوانیان ئەنجام داوە و کەس تۆڵەی لیّ نەسەندوونەتەوە. دەزانم ئەوان مەبەستی کوشتنی منیان هەیە. بەلاّم ئەوەی دەست لەخەلاّفەت هەڵگرم، ئەگەر بمکوژن زیاتر پەسەندی دەکەم لەوەی بێزاری خۆم لەخەلافەت دەرببڕم. بەلاّم ئەوەی دەڵێن: کەس بۆ ویلایەتەکان و لای خەڵکانی مەدینە بنێرن تا بێزاری خۆیان لەمن دەرببڕن، من لەلایەن ئێوەوە دەستنیشان نەکراوم و پێشتر ئەوانم بۆ ملکەچ بوون ناچار نەکردووە. خۆیان گوێڕایەڵ و ملکەچ هاتن چوونکە بەدوای ڕەزامەندی خواوەندەوە بوون. هەرکەس لەئێوە خوازیاری دنیایە، جگە لەوەی خواوەند بۆی دیاری کردووە، دەستی ناکەوێت و هەرکەس خوازیاری نزیك بوونەوە لەخواوەند و بەرژەوەندی ئۆمەت و ڕەزامەندی و ئەنجامدانی سوونەتەکانی پێغەمبەر(د.خ)و دو خەلیفەکەی پێش منە، خواوەند پاداشتی دەداتەوە چوونکە پاداشتی ئێوە لەدەستی مندا نییە و ئەگەر هەمو دنیا بەئێوە ببەخشم، بەهای دینەکەی ئێوە نییە و هیچ سوودێکتان پیّ ناگەیێنێت. لەخوا بترسن و بەپاداشتەکانی ئەو دڵخۆش بن. هەرکەس بەپەیمانشکێنی ڕازی بێت، من ڕازی نابم. خواوەندیش ڕازی نابێت ڕێز لەپەیمانەکەی نەگرن. بەلاّم ئەو کارانەی من هەڵبژاردنی یەکێکیان سەرپشك دەکەن، لابردن و دانانی خەلیفەیەکی دیکەیە. من، هاوڕیّ لەگەڵ هاوەڵانم خۆڕاگریم کردۆتەوە پیشە و چاوەڕوانی فەرمانی خواوەندم و گۆڕینی نیعمەتەکانی ئەو و خوێنڕشتن و دووبەرەکی خەڵکان پەسەند ناکەم. ئێوە بەخوا و موسوڵمانی سوێند دەدەم تەنیا بەدوای ڕاستییەوە بن کە لەلایەن منەوە بەئێوە دەدرێت. ستەم لەراست

کرداران مەکەن و لەنێوان ئێمە بەهەمان شێوە کە خواوەند فەرمانی پێداوە، دادپەروەری بکەن. سوێندتان دەدەم بەپەروەردگار چوونکە خواوەند فەرموویەتی و فەرموودەکەی ڕەوایە:

((و اوفوا بالعهد ان العهد كان مسؤلا، و لعلكم تذكرون.

واتاکەی: ڕێز لەپەیمانەکەی خۆتان بگرن، چوونکە پەیمان لێپێچینەوەی لەسەر دەکرێت و ئەگەری هەیە وانە وەربگرن.))

بەڵام خۆم بەبێ تاوان نازانم چوونکە نەفسی هەر کەسێك بۆ خراپە فەرمانی پێ دەدات مەگەر ئەو کەسەی خواوەند بیبەخشێت و لەخراپەکاری دووری بخاتەوە. ئەگەر سزای کەسانێکم داوە، لەم کارەم تەنیا مەبەستی خێرم لەسەردا بووە، و هەنووکە بۆ هەموو کارە نەشیاوەکانم تۆبە بۆ دەرگای خواوەند بەرز دەکەمەوە و داوای لێخۆش بوون دەکەم چوونکە کەس جگە لەو چاوپۆشی لەگوناحەکان ناکات و ڕەحمەتی پەروەردگار بەهەموو شوێنێك دەگات و تەنیا خەڵکانی نەزان و گومڕا لەڕەحمەتی خواوەند بێ هیوا دەبن. ئەو بەتۆبەی بەندەکانی ڕازی دەبێت و لەخراپەکان خۆش دەبێت و دەزانێت چی دەکەن. داوا لەخوا دەکەم من و ئێوە ببەخشێت و دڵی ئەم ئۆمەتە بۆ هاودەنگی و هاوئاهەنگی لەگەڵ یەك، هان بدات و لەخراپەکاری دووریان بخاتەوە. ئەی موسوڵمانان و باوەڕداران، سڵاو و دروودی خواوەند لەئێوە بێت.))

کوڕی عەباس دەڵێت: ئەم نامەیەم یەك ڕۆژ پێش ترویە بۆ خەڵکان خوێندەوە.

عەبدوللە کوڕی عوتەبە لەکوڕی عەباس دەگێڕێتەوە: عوسمان کوڕی عەففان منی بانگ کرد و بۆ ئەنجامدانی ڕێ و ڕەسمی حەج لەگەڵ خەڵکان ڕایسپاردم. من بەرەو مەککە ڕۆشتم و فەرمانەکەم ئەنجامدا و نامەکەی سەروەری باوەڕدارانم بۆ خوێندنەوە. کاتێك گەڕامەوە بۆ مەدینە، خەڵکان، لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەتیان بەستبوو.

## شوێنی دفنی عوسمان کوڕی عەففان و ئەو کەسی دفنی کرد

کوڕی بەشیری عابدی دەڵێت: عوسمان کوڕی عەففان بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەشوێنەکەی خۆی مایەوە و دفنیان نەدەکرد. دوای ئەوە، حەکیم کوڕی حوزامی قورەشی، لەمناڵەکانی ئەسەد کوڕی عەبدولعوزا، و جوبەیر کوڕی موتعیم کوڕی عودەی کوڕی نەوفل کوڕی عەبدمەناف لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەبارەت بەدفن کردنی ئەو گفتوگۆیان کرد و داوایان لێکرد مۆڵەت بەکەسانی عوسمان کوڕی عەففان بدات تا بەخاکی بسپێرن. عەلی کوڕی ئەبی تالیب مۆڵەتی ئەو کارەیدا و کاتێك هەواڵەکە بلاو بوویەوە، بەرد لەدەست لەسەر ڕێگەکە دانیشتن. چەند کەسێك لەئەندامانی خێزانەکەی جەنازەکەیان هێنایەدەر و دەیانویست بیبەنە یەکێك لەباخەکانی مەدینە بەناوی حەش کەوکەب. جوولەکەکان مردووەکانی خۆیان لەوێ بەخاك دەسپارد. کاتێك ئەویان هێنایە ناو خەڵکان، تابووتەکەیان بەردباران کرد و دەیانویست فڕێبدەن. کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاگادار بوویەوە، کەسی نارد و سوێندیدان تا دەستیان لێ هەڵگرن و ئەو کارەیان کرد. ئەویان برد و لەحەش کەوکەب بەخاکیان سپارد. کاتێك معاویە کوڕی ئەبوسوفیان خەلافەتی گرتەدەست، فەرمانی وێران کردنی باخەکەیدا و پەیوەستی گۆڕستانی بەقیعی کرد و فەرمانی بەخەڵکاندا مردووەکانی خۆیان لەوێ بەخاك بسپێرن تا ئەوەی پەیوەستی گۆڕی موسوڵمانان بوو.

یەسار کوڕی ئەبی کەرب لەباوکی کەکارگوزاری بیت المالی عوسمان کوڕی عەففان بوو، دەگێڕێتەوە: عوسمان کوڕی عەففانیان لەکاتی ڕۆژئاوا و تاریك بوونی شەو بەخاك سپارد. جگە لەمەروان کوڕی حەکەم و سێ کەس لەکۆیلەکانی کەس لەسەر گۆڕەکەی ئامادە نەبوو. کچەکەی دەگریا و دەنگی گریانی بەرز بوویەوە. خەڵکان بەردیان هەڵگرت و وتیان: نەعسەل، نەعسەل، زۆری نەمابوو بەردبارانی بکەن و وتیان: باخەکە، باخەکە، ئەویان لەدەرەوەی باخەکە بەخاك سپارد.

واقدی لەسالح کوڕی کەیسان دەگێڕێتەوە: کاتێك سەروەری باوەڕداران کوژرا، کەسێك وتی لەدێری سەلیع بەخاکی بسپێرن کە گۆڕستانی جوولەکەکانە.

حەکیم کوڕی حوزام وتی: سوێند بەخوا تا یەکێك لەمناڵەکانی قوسەی زیندوو بێت، بەوشێوەیە نابێت. ئەوەندەی نەمابوو ئاژاوە سەر هەڵبدات. کوڕی عەدیسی بەلەوی وتی: ئەی پیرەپیاو، چ زیانێك بەتۆ دەگات لەکوێ دفن بکرێت؟

وتی: دەبێت لەبەقیع ئەسپەردە بکرێت. لەو شوێنەی زاوا و مناڵەکانی بەخاك سپێردراون. حەکیم کوڕی حوزام و دوانزە کەس کەزوبەیر یەکێك بوو لەوان، ئەویان هەڵگرت. حەکیم کوڕی حوزام نوێژی لەسەر خوێند.

واقدی دەڵێت: راستییەکەی ئەوەیە جوبەیر کوڕی موتعیم نوێژی لەسەر خوێند.

مەخریمە کوڕی سلێمانی والبی دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان لەرۆژی هەینی و دوای هەڵاتنی هەتاو کوژرا و نەیانتوانی بەخاکی بسپێرن. نایلە کچی قەرافسە کەسی بەدوای حەویتب کوڕی عەبدولعوزا و جوبەیر کوڕی موتعیم و ئەبی جوهم کوڕی حوزەیفە و حەکیم کوڕی حوزام و نەیاری ئەسلمی نارد کەوتیان: ناتوانین لەکاتی رۆژ ئەو بێنینەدەر چوونکە خەڵکانی میسر لەبەر دەرگان. ئەوان چاوەڕوان بوون تا ئەوەی شەو داهات بەڵام رێگەی ئەو کارەیان لێگرتن. باوکی جوهم وتی: سوێند بەخوا هەرکەس رێگەی ئەو کارەم لێ بگرێت، گیانی خۆم دەکەمە قوربانی، جەنازەکە هەڵبگرن. ئەویان بەرەو بەقیع برد.

دەڵێت: نایلە چرا بەدەست لەگەڵ یەکێك لەکۆیلەکان بەدوای ئەوانەوە بوو. لەبەقیع چراکەیان داگیرساند. بەرێکەوتن تا گەیشتنە باخێکی دارخورما. باخەکە دیواری بوو، دیوارەکەیان شکاند و ئەویان لەناو دارخورماکان دفن کرد. جوبەیر کوڕی موتیعم نوێژی لەسەر خوێند. نایلە ڕۆشتە پێش. دەیویست قسە بکات بەڵام رێگەی ئەو کارەیان لێگرت. وتیان: دەترسین ئەم ئاژاوەچییانە گۆڕەکەی هەڵبدەنەوە. نایلە بۆماڵەکەی گەڕایەوە.

عەبدوللە کوڕی ساعدە دەڵێت: دوای ئەوەی سەروەری باوەڕداران کوژرا، دوو رۆژ جەستەکەی لەشوێنی خۆی مایەوە و نەیانتوانی بەخاکی بسپێرن. دواتر چوار کەس جەنازەکەیان هەڵگرت: حەکیم کوڕی حوزام، جوبەیر کوڕی موتعیم و نەیار کوڕی موکریم و باوکی جوهم کوڕی حوزەیفە. کاتێك جەنازەکەیان دانا بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بخوێنن، چەند کەسێك لەئەنسارییەکان هاتن و رێگەی ئەو کارەیان

لێگرتن. ئەسلەم کوڕی ئەوس کوڕی بوجرەی ساعدی و باوکی حەبیە مازنی لەناو ئەواندا دەبینران. هەروەها ڕێگەیان نەدا لەبەقیع بەخاکی بسپێرن.

باوکی جوهم وتی: بەخاکی بسپێرن چوونکە خواوەند و فریشتەکان دروودیان بۆ ناردووە.

وتیان: سوێند بەخوا هیچ کات لەگۆڕستانی موسوڵمانان بەخاك ناسپێردرێت. ئەویان لەحەش کەوکەب بەخاك سپارد و کاتێك منداڵەکانی ئومەییە دەسەڵاتیان گرتەدەست، حەش کەوکەبیان پەیوەستی بەقیع کرد و هەنووکە گۆڕستانی منداڵەکانی ئومەییەیە.

محەممەد کوڕی موسا مەخزمی دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان کوژرا، دەیانویست سەری جیا بکەنەوە. نایلە و ام البنین خۆیان دابەسەر جەنازەکە و ڕێگەیان لێگرتن. دەستیان بەگریان کرد و لەخۆیان دەدا و جلەکانی خۆیان دڕاند. کوڕی عەدیسی بەلەوی وتی: دەستی لێ هەڵگرن.

ئەوسا بێ ئەوەی بیشۆن و کفنی بکەن، جەنازەکەیان بەرەو بەقیع برد. دەیانویست لەشوێنی جەنازەکان نوێژی لەسەر بخوێنن بەڵام ئەنسارییەکان ڕێگەی ئەو کارەیان لێگرتن. لەم کاتەدا عومەیر کوڕی زابی هات و پەلاماری جەنازەکەیدا و چەند پەراسووێکی عوسمان کوڕی عەفانی شکاند و وتی: زابیت هێشتەوە تا ئەوەی لەزینداندا مرد.

ڕەبیع کوڕی مالیك لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك سەروەری باوەڕداران کوژرا، من یەکێك بووم لەو کەسانەی جەنازەکەی ئەومان خستە سەردەرگایەك. سەری بەر دەرگاکە کەوت و لەبەر ئەوەی پەلەمان بوو چوونکە دەترساین، ئەومان لەحەش کەوکەب بەخاك سپارد.

تەڵحە دەڵێت: کاتێك عوسمان کوژرا، نایلە کەسی بەدوای عەبدولڕەحمان کوڕی عەدیسی بەلەوی نارد و وتی: تۆ لەهەمووان بەمن نزیکتریت و شیاوە کێشەکانی من بەدەستی تۆ چارەسەر بکرێت، ئەم پیاوانەت لەمن دوور خەرەوە.

دەڵێت: عەبدولڕەحمان جوێنی پێدا و بەشێوەیەکی ناشیرین وەڵامی دایەوە. کاتێك شەو داهات، مەروان ڕۆشتەماڵەکەی عوسمان کوڕی عەفان. زەید کوڕی سابت و تەڵحە کوڕی عوبەیداللە و حەسەن و کەعب کوڕی مالك و هەموو هاوەڵانی

عوسمان لەوێ بوون. چەند منداڵ و ژنێك لای جەنازەکان دانیشتبوون. عوسمان کوڕی عەففانیان بردەدەر و مەروان کوڕی حەکەم نوێژی لەسەر خوێند. ئەویان بەرەو بەقیع برد و لەنزیك حەش کەوکەب بەخاکیان سپارد. بەرەبەیانان کۆیلە کوژراوەکانی عوسمانیان برد بۆ ئەوەی ئەوانیش بەخاك بسپێرن بەلاّم کاتێك ئەوانیان بینی، رێگەی ئەو کارەیان لێگرتن. جەنازەکانیان بۆ حەش کەوکەب برد و کاتێك شەو داهات، دووان لەوانیان لەنزیك سەروەری باوەڕداران بەخاك سپارد. هەر کامیان پێنج کەس و یەك ژن، فاتیمە دایکی ئیبراهیم کوڕی عودەی هاورێیەتی دەکردن. گەڕانەوە و ڕۆشتنە لای بیشر کوڕی کەنانە و وتیان: تۆ لەهەموو خەڵکان بەئێمە نزیکتریت. فەرمان بدە ئەو دوو جەنازەیە لەماڵەکە بێننەدەر.

دەڵێت: بیشر گفتوگۆی لەگەڵ کردن بەلاّم رازی نەبوون.

وتی: من تەنیا بنەماڵەی عوسمان کوڕی عەففانم لەمیسرییەکان و هاوپەیمانەکانیان پەنا داوە، دوو جەنازەکە بێنندەر و فڕیان بدەن. قاچی ئەوانیان راکێشا و فڕێیاندایە سەر کێلی گۆڕەکەی و سەگ، جەنازەکانی خوارد.

ئەو دوو کۆیلەی لەماڵەکەی عوسمان کوڕی عەففان کوژران، ناویان نەجیح و سەبیح بوو. بەهۆی رێز و تێکۆشانیان، ناویان گەورەتر لەناوی کۆیلەکان بوو. کەس نەیدەزانی سێیەم کەس ناوی چییە. عوسمان کوڕی عەففانیان نەشۆرد. جلەکانی خوێناوی بوو. دوو کۆیلەکەیش بەهەمان شێوە.

شەعبی دەڵێت: لەشەودا عوسمان کوڕی عەففانیان دفن کرد و مەروان کوڕی حەکەم نوێژی لەسەر خوێند. کچەکەی لەگەڵ نایلە کچی قەرافسە، لەپشت سەری ئەوانەوە دەگریان.

## کاتی کوژرانی عوسمان کوڕی عەففان

لەمبارەوە بۆچوونەکان جیاوازە. هەمووان کۆکن لەسەر ئەوەی کوشتنەکەی لەمانگی زیحەججە روویداوە. دەستەیەك وتوویانە: هەژدە رۆژ لەزیحەججە ساڵی سی و شەشی کۆچ تێپەڕیبوو. بەلاّم زۆرینە بڕوایان وایە دوای هەژدە رۆژ لەزیحەججەی ساڵی سی و پێنجی کۆچ، عوسمان کوڕی عەففان کوژرا.

## ئەو کەسانەی دەڵێن عوسمان کوڕی عەففان لەساڵی سی و شەش کوژرا

یەعقوب کوڕی زەید لەباوکی دەگێڕێتەوە: عوسمان کوڕی عەففان لەرۆژی هەینی هەژدەی زیحەججەی ساڵی سی و شەشەم لەدوواین کاتەکانی رۆژ کوژرا. خەلافەتی ئەو دوانزە ساڵ، دوانزە رۆژ کەمتری خایاند. هەشتا و دوو ساڵ تەمەنی بوو.

کەسانی دیکە وتوویانە: هەژدەی زیحەججەی ساڵی سی و پێنج کوژرا.

شەعبی دەڵێت: عوسمان کوڕی عەففان بۆ ماوەی هەژدە رۆژ لەماڵەکەی گەمارۆی خرایەسەر و بەرەبەیانی رۆژی هەژدەی زیحەججەی ساڵی بیست و پێنج لەکۆچی دووای پێغەمبەر(د.خ)، کوژرا.

باوکی مەعشەر دەڵێت: عوسمان کوڕی عەففان لەرۆژی هەژدەی زیحەججەی ساڵی سی و پێنج کوژرا و ماوەی خەلافەتی دوانزە ساڵ دوانزە رۆژ کەمتر بوو.

باوکی عوسمان دەڵێت: عوسمان کوڕی عەففان لەرۆژی هەینی هەژدەی زیحەججەی ساڵی سی و پێنج، دە ساڵ و یانزە مانگ و بیست و دوو رۆژ دوای کوژرانی عومەر کوڕی خەتاب کوژرا.

تەڵحە دەڵێت: عوسمان کوڕی عەففان هەژدەی زیحەججە لەرۆژی هەینی، دوایین کاژێرەکانی رۆژ کوژرا.

کەسانی دیکە وتوویانە: لەرۆژی هەینی و دوای هەلاتنی هەتاو کوژرا.

هوشامی کەلبی دەڵێت: عوسمان کوڕی عەففان بەرەبەیانی رۆژی هەینی، هەژدەی زیحەججەی ساڵی سی و پێنج کوژرا. ماوەی خەلافەتی ئەو دوانزە ساڵ هەشت رۆژ کەمتر بوو.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە لەرۆژگاری (تشریق) کوژرا. ئەم حەدیسەیان لەزوهری گێڕاوەتەوە.

## ساڵەکانی تەمەنی عوسمان کوڕی عەففان

پێشینان لەمبارەوە بۆچوونەکانیان جیاوازە. دەستەیەک دەڵێت ساڵەکانی تەمەنی هەشتاو دووساڵ درێژەی کێشا. ئەم حەدیسەیان لە محەممەد کوڕی عیمران

گێڕاوەتەوە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: کاتێك کوژرا، نەوەد ساڵ یا هەشتا و هەشت ساڵ تەمەنی بوو. ئەم حەدیسەیان لەقتادە گێڕاوەتەوە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: کاتێك کوژرا، حەفتا و پێنج ساڵە بوو. ئەم حەدیسەیان لەهوشام کوڕی محەممەد گێڕاوەتەوە.

دەستەیەکی دیکە دەڵێن: شەست و سێ ساڵە بوو. ئەم حەدیسەیان لەباوکی حارسە و باوکی عوسمان گێڕاوەتەوە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: هەشتا و شەش ساڵ تەمەنی بوو. ئەم حەدیسەیان لەقتادە گێڕاوەتەوە.

## تایبەتمەندییەکانی عوسمان کوڕی عەففان

حەسەن کوڕی باوکی حەسەن دەڵێت: ڕۆشتمە ناو مزگەوت، عوسمان کوڕی عەفانم بینی، پاڵی بەعاباکەی خۆیەوە دابوو، پیاوێکی جوان ڕوخسار بوو، شوێنەوای ئاوڵە بەڕوخسارییەوە دەبینرا. قژی بەسەر شانەکانی بڵاو ببوویەوە.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: لە عەبدوللە کوڕی عەنبەسە و دوو کەسی دیکە سەبارەت بەتایبەتمەندییەکانی عوسمان کوڕی عەفان پرسیارم کرد کە بێ جیاوازی وتیان: پیاوێك بوو نەکورتە باڵا نە باڵابەرز، جوان ڕوخسار و لەڕ، ڕیشێکی چڕ و درێژ، سەوزە، ئێسك پان، چوارشانە و مووی درێژی سەر، ڕیشی خۆی زەرد دەکرد.

زوهری دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان پیاوێکی چوارشانەی جوان ڕوخساری تاس بوو. دووری نێوان قاچەکانی زۆر بوو.

## کاتی باوەڕهێنان و کۆچی عوسمان کوڕی عەففان

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: باوەڕهێنانی عوسمان کوڕی عەفان لەڕۆژگارانی پێشوو بوو پێش ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) بڕواتە ناو ماڵی ئەرقەم.

دەڵێت: ئەو لەکۆچی یەکەم و دووەم لەمەککەوە بۆ سەرزەمینی حەبەشە، ئامادە بوو. لە هەردوو جارەکەدا، هاوسەرەکەی ڕوقیە کچی پێغەمبەری لەگەڵدا بوو.

## نازناوی عوسمان کوڕی عەففان

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: نازناوی عوسمان کوڕی عەففان لەرۆژگاری جاهلییەت، باوکی عەمرۆ بوو. لەرۆژگاری ئیسلام روقیە کچی پێغەمبەر(د.خ) کوڕێکی بۆ هێنایە دنیا و ناویان نا عەبدوڵلە. موسوڵمانان نازناوی باوکی عەبدوڵلەیان پێبەخشی. عەبدوڵلە شەش ساڵ ژیا، کەڵەشێرێك دەنووکی لەچاویدا، نەخۆش کەوت و لەجومادی الاولی ساڵی چوارەمی کۆچی مرد. پێغەمبەر(د.خ) نوێژی لەسەر خوێند و عوسمان کوڕی عەففان ڕۆشتە ناو گۆڕەکەی.

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: نازناوەکەی باوکی عەمرۆ بوو.

## منداڵ و هاوسەرەکانی عوسمان کوڕی عەففان

روقیە و دایکی کولسوم، هەر دووك کچی پێغەمبەر(د.خ)، هاوسەرەکانی عوسمان کوڕی عەففان بوون. روقیە عەبدوڵلەی هێنایە دنیا.

فاتیمە کچی غەزوان هاوسەری بوو. کوڕێکی بۆ هێنایە دنیا بەناوی عەبدوڵلە. ئەو عەبدوڵلەی بچوك بوو بەڵام نەژیا.

دایکی عەمرۆ کچی جوندەب یەکێك بوو لەهاوسەرەکانی عوسمان کوڕی عەففان کەعەمرۆ و خالید و ئەبان و عومەر و مریەمی بۆ هێنایە دنیا.

فاتیمە کچی وەلید کوڕی عەبدشەمس یەکێك بوو لەهاوسەرەکانی کەوەلید و سەعید و دایکی سەعیدی بۆ هێنایە دنیا.

یەکێکی دیکە لەهاوسەرەکانی ام البنین کچی عویەیینە کوڕی حوسنی فەزاری بوو کە عەبدولمەلیکی بۆ هێنایە دنیا بەڵام نەژیا.

رەملە کچی شەیبە کوڕی رەبیعە یەکێك بوو لەهاوسەرەکانی کەعایشە و دایکی ئەبان و دایکی عەمرۆ و سیانی دیکە لەکچەکانی عوسمان کوڕی عەففان بوو.

نایلە کچی قەرافسەیش هاوسەری بوو کەمریەم کچی عوسمانی هێنایە دنیا.

هوشام کوڕی کەلبی دەڵێت: ام البنین کچی عویەیینە کوڕی حوسن بۆ عوسمان کوڕی عەففان عەبدولمەلیك و عوتبەی هێنایە دنیا.

هەروەها دەڵێت: نایلە، عەنبەسەی هێنایە دنیا.

واقدی دەڵێت: عوسمان لەنایلە کچێکی بوو بەناوی ام البنین کەهاوسەری عەبدوللە کوڕی یەزید کوڕی ئەبی سوفیان بوو.

دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان کوژرا، رەملە کچی شەیبە و نایلە و ام البنین کچی عویەیینە و فاختە کچی غەزوان لەماڵەکەی ئەودا بوون. بەڵام بەوتەی عەلی کوڕی محەممەد، لەکاتی گەمارۆکە، ام البنینی تەڵاقدا.

ژنەکان و منداڵەکانی ئەو لەرۆژگاری جاهلیت و ئیسلام ئەم کەسان بوون.

## ناوی ئەو کەسانەی عوسمان کوڕی عەفان لەدوایین ساڵ وەك کارگوزار دەستنیشانی کردن

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان کوژرا، کارگوزاری مەککە، عەبدوللە حەزرەمی بوو.

کارگوزاری تاییف قاسم کوڕی رەبیعەی سەقەفی بوو.

کارگوزاری سەنعا یەعلی کوڕی ئومەییە بوو.

کارگوزاری جوند عەبدوللە کوڕی رەبیعە بوو.

کارگوزاری بەسرە عەبدوللە کوڕی عامر کوڕی کورەیز بوو کە لەشارەکە هاتبووە دەر بەڵام سەروەری باوەڕداران کەسی دەیکەی دەستنیشان نەکرد.

کارگوزاری کوفە سەعید کوڕی عاس بوو. لەوێ هاتەدەر بەڵام رێگەی گەڕانەوەیان پێنەدا.

کارگوزاری میسر، عەبدوللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح بوو. گەڕایەوە بۆ مەدینە و لەم کاتەدا محەممەد کوڕی ئەبی بەکر دەستی بەسەر میسردا گرت. عەبدوللە کوڕی سەعد سایب کوڕی هوشامی وەك جێگری خۆی لەمیسر دەستنیشان کردبوو بەڵام محەممەد کوڕی حوزەیفە ئەوی دەرکرد.

کارگوزاری شام معاویە کوڕی ئەبوسوفیان بوو.

باوکی عوسمان دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان کوژرا، کارگوزاری شام معاویە کوڕی ئەبوسوفیان بوو، کارگوزاری حمس لەلایەن معاویەوە، عەبدولرەحمان کوڕی خالید کوڕی وەلید بوو.

کارگوزاری قینسرین حەبیب کوڕی موسلیمە بوو.

کارگوزاری ئەردەن باوکی ئەعوەر کوڕی سوفیان بوو.

کارگوزاری فەلەستین عەلقەمە کوڕی حەکیمی کەنانی بوو.

کارگوزاری دەریا عەبدوللە کوڕی قەیسی فەزاری بوو.

سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی شام، باوکی دەردا بوو.

عەتییە دەڵێت: کاتێك سەروەری باوەڕداران کوژرا، کارگوزاری مانگانەکانی کوفە باوکی موسای ئەشعەری بوو.

کارگوزاری خەراجی سواد، جابر کوڕی فولانی موزنی بوو لەگەڵ سەماکی ئەنساری.

کارگوزاری جەنگی کوفە قەعقاع کوڕی عەمرۆ بوو.

کارگوزاری قرقیسیا جەریر کوڕی عەبدوللە بوو.

کارگوزاری ئازەربایەجان ئەشعەس کوڕی قەیس بوو.

کارگوزاری حیلوان عوتەبە کوڕی نەهاس بوو.

کارگوزاری ماه مالك کوڕی حەبیب بوو.

کارگوزاری هەمەدان نەسیر بوو.

کارگوزاری رەی سەعید کوڕی قەیس بوو.

کارگوزاری ئیسفەهان سایب کوڕی ئەقرەع بوو.

کارگوزاری ماسەبزان حەبیش بوو.

کارگوزاری بیت المال عوقەبە کوڕی عەمرۆ بوو.

کارگوزاری دادی عوسمان کوڕی عەفان زەید کوڕی سابت بوو.

## بەشێك لەوتارەکانی عوسمان کوڕی عەفان

عوتەبە دەڵێت: عوسمان کوڕی عەفان دوای ئەوەی خەلافەتی گرتەدەست، وتارێکی پێشکەشی خەڵکان کرد و وتی:(( خەلافەتیان خستە ئەستۆی من و رازی بووم. ئاگاداربن نەشوێنکەوتەم، نە ئەو کەسەم شوێنم کەون. ئێوە لەسەر من دوای کتێبی خواوەند و سوونەتی پێغەمبەر(د.خ)، سێ مافی سەلمێنراوتان هەیە: ئەوەی

لەناو کێشە ودیارەدەکانی ناو ئێوە هاوشێوەی کەسانی پێش خۆم هەڵس و کەوت بکەم و لەهەر شوێنێك نەتوانرا هاودەنگی هەمووان بەدەست بێنین، ڕێگەی چاکەکاران بگرینەبەر و لەهەر شوێنێك پێویست نەبێت، دەست هەڵدەگرم. بزانن دنیا سەرسەوزە و خەڵکان خوازیارن پێی و ژمارەیەکی زۆر لەئێوە باوەشتان بۆ دنیا کردۆتەوە. پشت بەدنیا مەبەستن و باوەڕتان پێی نەبێت چوونکە شیاوی بڕواپێکردن نییە. دنیا تەنیا کەسێك پشتگوێ دەخات کەپشت گوێی خستبێت.))

بەدر کوڕی عوسمان لەمامی خۆی دەگێڕێتەوە: دوواین وتاری عوسمان کوڕی عەفان لەناو خەڵکان بەمشێوە بوو:

((خواوەند دنیای بەئێوە بەخشی تا بەدوای ئەو دنیادا بگەڕێن. دنیای پێنەبەخشین پشتی پێ ببەستن. دنیا لەناو دەچێت و ئاخیرەت دەمێنێتەوە. دنیا نەتانکاتە کەسێکی یاخی و لەو دنیا بێ ئاگاتان نەکات. دنیا پێش ئەو دنیا مەخەن چوونکە کۆتایی دەێت و هەمووان بۆ لای خواوەند دەگەڕێینەوە. لەخواوەند بترسن چوونکە دەبێتە هۆی خۆ پاراستن لەگوناح. لەگۆڕانکارییەکانی خواوەند بترسن و پەیوەستی کۆمەڵانی خەڵك بن و دووبەرەکی لەناو ئێوەدا سەر هەڵنەدات. نیعمەتەکانی خواوەندتان لەبیر بێت چوونکە پێشتر دوژمنی بوون و ئێوەی لەخۆی نزیك کردەوە و بەهۆی بەخشینەکانی بوونە برای یەك))

## لەکاتی گەمارۆکەی عوسمان کوڕی عەفان چ کەسێك لەمزگەوتی پێغەمبەر(د.خ) پێشنوێژی بۆ خەڵکان دەکرد

ڕەبیعە کوڕی عوسمان دەڵێت: ئەو ڕۆژە بانگبێژ، سەعدی قورەزی، ڕۆشتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتی: کێ پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات؟

عەلی وتی: هاوار بکە: خالید کوڕی زەید.

خالیدی بانگ کرد و خالید پێشنوێژی بۆ خەڵکان کرد. ئەمە یەکەم جار خەڵکان بۆیان دەرکەوت ناوی باوکی ئەییووب، خالید کوڕی زەیدە.

دەڵێت: باوکی ئەییووب چەند ڕۆژێك پێشنوێژی بۆ خەڵکان کرد و دوای ئەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەو کارەی گرتە ئەستۆ.

عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر کوڕی حەزم دەڵێت: بانگبێژ هاتە لای عوسمان کوڕی عەفان و لەکاتی نوێژ ئاگاداری کردەوە.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: من نایێمە خوار، برۆ بەکەسێك بڵێ پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات. ئەو، ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئەو بەسەهل کوڕی حەنیفی وت کە ڕۆژی سەرەتای گەمارۆکە پێشنوێژی بۆ خەڵکان کرد و ئەمە یەکەم ڕۆژی مانگی زیحەججە بوو. بۆ ڕۆژی جەژن، عەلی کوڕی ئەبی تالیب نوێژی جەژنی لەگەڵ خەڵکان خوێند و بەردەوام پێشنوێژی دەکرد تا عوسمان کوڕی عەفان کوژرا.

عەبدوللە کوڕی نافیع لەباوکی دەگێڕێتەوە: باوکی ئەییووب چەند ڕۆژێك پێشنوێژی بۆ خەڵکان کرد، دواتر عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەو کارەی گرتە ئەستۆ و لەڕۆژی هەینی و جەژن نوێژی خوێند تا سەروەری باوەڕداران کوژرا.

## ئەو هۆنراوانەی بۆ کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان هۆنرانەوە

شاعیرەکان دوای کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان بۆ دەربڕینی خەم و گەورەیی کارەساتەکە چەندین هۆنراوەیان هۆنییەوە. لەناو شاعیرەکان حەسان کوڕی سابت و کەعب کوڕی مالك، هەردووك ئەنساری و تەمیم کوڕی ئەبی کوڕی مەقبەل و کەسانی دیکە دەبینران.

یەکێك لەو هۆنراوانەی حسان بۆ وەسفی عوسمان کوڕی عەفان و سەرکۆنە کردنی بکوژەکانی هۆنییەوە، بەمشێوەیە:

((غەزای سنوورەکانتان پشتگوێ خست

و لەنزیك گۆڕی محەممەد بۆ غەزای ئێمە هاتن

دەڵێی هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ)

وشترەکان بوون کەدەبێت لەبەر دەرگای مزگەوتا بکوژرێن))

هەروەها دەڵێت:

((ئەگەر ماڵی کوڕی ئەروی چیتر خاڵی بووە

و دەرگاکەی کەوتووە و ماڵەکەی وێران بووە

هێشتا خوازیاری خێر لەوێ بەدوای نیازەکانی خۆیدا دەگەڕێت

پێگە و ڕێز هێشتا لەوێیە))

کەعب کوڕی مالکی ئەنساری دەڵێت:

((کوشتنی خەلیفە کارەساتێکی قێزەون بوو

بەڵای ترس لێرەوە سەری هەڵدا

سەرئەنجامی ئەو کەسانەی پێشەوای خۆیان کوشت

جەهەننەمە))

فەزل کوڕی عەباس لەوەڵامی هۆنراوەکەی حسان بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوسمان بەمشێوەیە دەڵێت:

((داوای تۆڵەیەك دەکەیت پەیوەندی بەتۆوە نییە

کوڕی زەکوانی سەفووری چ پەیوەندییەکەی لەگەڵ عەمرۆدا هەیە

بێووی مێچکە کەر لەکاتی شانازی کردن

باوکی لەبیر دەکات

لەدوایی محەممەد باشترینی کەسان

جێگرەکانی پێغەمبەرە

یەکەم کەس کەنوێژی کرد

و یەکەم کەس کەگومڕاکانی لەنزیك بەدر کوشت

هەر ئەم ڕەخنەیە بەسە کە لەکوشتنی عوسمان دەدوێن

چوونکە ئەویان تەسلیم بەحەبەشییەکانی میسر کرد))

جوباب کوڕی یەزیدی موجاشعی مامی فەرزدق دەڵێت:

((بۆ گیانی باوکت بگری

چوونکە چاکە کۆچی کرد مەگەر کەمێك

خەڵکان لەکاروباری دین گیرۆدەی نەزانی بوون

و کوڕی عەفان شەڕێکی درێژی دوای خۆی بەجێهێشت

ئەی سەرکۆنەکەر هەموو کەسێك لەناو دەچێت

وەك چاکەکاران بۆ لای خواوەند بگەڕێرەوە))

## خەلافەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

لەم ساڵەدا، لەمەدینە لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب وەك خەلیفە بەیعەتیان بەست.

## بەیعەت لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب و کاتی بەیعەتەکە

مێژوو نووسان لەمبارەوە بۆچوونیان جیاوازە. دەستەیەك وتوویانە هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) داوایان لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد کاروباری موسوڵمانان لەئەستۆ بگرێت. وتیان: ئەم پیاوە کوژرا، خەڵکان پێشەوایان دەوێت. کەس لەتۆ بۆ ئەم کارە شیاوتر نییە چوونکە پێشینەت لە هەمووان زیاترە و پەیوەندی خزمایەتیت لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) نزیکتر.

وتی: ئەو کارە مەکە، ئەگەر وەزیر بم باشترە لەوەی ئەمیر بم.

وتیان: نا، سوێند بەخوا دەست هەڵناگرین تا بەیعەت لەگەڵ تۆ دەبەستین.

وتی: دەبێت لەمزگەوت ئەو کارە بکەن و نابێت بەشێوەیەکی نهێنی لەگەڵ من بەیعەت ببەستن. دەبێت هەموو موسوڵمانان رازی بن.

عەبدوللە کوڕی عەباس دەڵێت: حەزم نەدەکرد بڕواتە مزگەوت چوونکە دەترسام دەنگەدەنگ سەر هەڵبدات بەڵام ئەو، جگە لەمزگەوت بەهیچ شوێنێکی دیکە رازی نەبوو. کاتێك ڕۆشتە ناو مزگەوت، موهاجیر و ئەنسارەکان ڕۆشتن و دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد. دوای ئەوان، خەڵکان بەیعەتیان کرد.

باوکی بیشر عابدی دەڵێت: لەمەدینە بووم ئەو کاتەی عوسمان کوڕی عەففان کوژرا. موهاجیر و ئەنسارەکان و لەناو ئەوان تەڵحە و زوبەیر کۆبوونەوە و ڕۆشتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتیان: ئەی باوکی حەسەن، بەیعەت لەگەڵ تۆ دەبەستین.

وتی: پێویستم بەخەلافەتی ئێوە نییە. هەر کەس هەڵبژێرن رازیم و بەیعەتی لەگەڵ دەبەستم. سوێندتان دەدەم بەخوا کەسێکی دیکە هەڵبژێرن.

وتیان: سوێند بەخوا جگە لەتۆ کەسی دیکە هەڵنابژێرین.

دەڵێت: دوای کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان چەندین جار سەردانیان کرد و دووایین جار وتیان: کاروباری خەڵك بێ خەلیفە سامان نادرێت، ئەم خەڵکە پێویستیان بەپێشەوایە.

وتی: چەندین جار سەردانی منتان کردووە و گەڕاونەتەوە. هەنووکە هاتوونەوە. چەندین داواکاریم هەیە ئەگەر رازی بوون، رازی دەبم و گەرنە پێویستم پێی نییە.

وتیان: هەرچی بڵێی پێی رازی دەبین.

دەڵێت: عەلی هات و ڕۆشتە سەر مینبەر. خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە. وتی: حەز بەخەلافەتی ئێوە ناکەم بەلأم پێداگری دەکەن بۆ ئەوەی ئەو کارە لەئەستۆ بگرم. دڵنیابن بێ ڕەزامەندی ئێوە هیچ کارێك ناکەم، کلیلی سامانی ئێوە لەدەستی مندایە، بەلأم بێ پرسی ئێوە یەك درەمی لێ هەڵناگرم، رازی دەبن؟

وتیان: بەڵێ.

وتی: خواوەندا، شایەت بە. دواتر لەسەر ئەم بنەمایە بەیعەتی لەگەڵ بەستن.

باوکی بەشیر دەڵێت: ئەو رۆژە لەنزیك مینبەری پێغەمبەر(د.خ) وەستابوون و ئەوەی دەیوت، دەمبیست.

باوکی مەلیح دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان کوژرا، عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەرۆژی شەممە هەژدی زیحەججە ڕۆشتە بازار. خەڵکان شوێنی کەوتن و ڕەزامەندییان نیشاندا. ئەو ڕۆشتە ناو باخەکەی منالەکانی عەمرۆ کوڕی جەندول و بە باوکی عەمرە کوڕی عەمرۆی وت: دەرگاکە دابخە.

دەڵێت: خەڵکان هاتن و لەدەرگایاندا و ڕۆشتنە ژوور. تەڵحە و زوبەیر لەناویاندا دەبینران و وتیان: ئەی عەلی، دەستت بێنە پێش تا بەیعەت ببەستین. تەڵحە و زوبەیر بەیعەتیان لەگەڵ بەست. کاتێك تەڵحە بەیعەتی کرد، حەبیب کوڕی ئەبی زوەیب پێی وت: بەیعەت لەکەسێکەوە دەستی پێکرد کەگۆجە، ئەم کارە بەکۆتایی ناگات.

دەڵێت: عەلی رووی کردە مزگەوت و ڕۆشتە سەر مینبەر. عابایەکی بێ گیرفان و دەستارێکی خەزی لەسەردا بوو، پێلاوەکانی خۆی بەدەستەوە گرتبوو، پشتی بەکەوانێکەوە دەبەست. خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ کرد. سەعدیان هێنا و وتیان:

بەیعەت لەگەڵ عەلی بکە.

وتی: بەیعەت ناکەم تا ئەوەی هەموو خەڵکان بەیعەت دەکەن. سوێند بەخوا هیچ کێشەیەکی بۆ دروست ناکەم.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ڕێگەی بدەن بڕوات.

دەڵێت: دوای ئەو کوڕی عومەر کوڕی خەتابیان هێنا و وتیان: بەیعەت بکە.

وتی: بەیعەت ناکەم تا خەڵکان هەموو بەیعەت بکەن.

وتیان: دەستەبەرێك بێنە.

وتی: نیمە.

ئەشتەر وتی: با بیکوژم.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: دەستی لیٚ هەڵبگرن، من دەبمە دەستەبەری ئەو. دڵنیام تۆ لەمنداڵی و لەگەورەییدا کەسێکی توڕە و توند و تیژ بوویت.

حەسەن دەڵێت: زوبەیر کوڕی عەوامم بینی لەیەکێك لەباخەکانی مەدینە لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەتی بەست.

زوهری دەڵێت: خەڵکان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەتیان بەست. دواتر کەسی بەدوای تەڵحە و زوبەیردا نارد و پێشنیاری بەیعەتی پێکردن بەڵام تەڵحە خۆی دوا دەخست.

دەڵێت: مالکی ئەشتەر شمشێری دەرهێنا و وتی: سوێند بەخوا یا بەیعەت دەبەستیت یا دەتکوژم.

تەڵحە وتی: هیچ ڕێگەیەك نەماوەتەوە. بەیعەتیان بەست. زوبەیر و کەسانی دیکەیش بەهەمان شێوە.

دەڵێت: تەڵحە و زوبەیر مەبەستی ئەوەیان کرد فەرمانڕەوایەتی کوفە و بەسرە بەوان بسپێرێت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: لای من بمێننەوە چوونکە بەبوونی ئێوە شادمانم و لەدووری ئێوە خەمبار دەبم.

زوهری وتی: بیستم پێی وتن: ئەگەر دەخوازن بەیعەت لەگەڵ من ببەستن و ئەگەر دەخوازن من بەیعەت لەگەڵ ئێوە دەبەستم.

وتیان: ئێمە بەیعەت لەگەڵ تۆ دەبەستین.

دەڵێت: دوای ئەوە وتیان: لەبەر ئەوە بەیعەتمان کرد چوونکە لەگیانی خۆمان دەترساین. دەمانزانی ئەو هیچ کات بەیعەت لەگەڵ ئێمە ناکات. چواردەمانگ دووای کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان روویان لەمەککە کرد.

محەممەد کوڕی حەنیفە دەڵێت: ئەو کاتەی عوسمان کوڕی عەفانیان کوشت، لەگەڵ باوکم بووم. لەکاتی شەودا گەڕایەوە بۆ ماڵ و چەند کەسێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتنە لای و وتیان: ئەم پیاوە کوژرا و خەڵکان پێویستیان بەخەلیفەیە.

وتی: کاروباری خەڵکان بەشورا بەڕێوە ببەن.

وتیان: بەتۆ رازین.

وتی: کەواتە بڕۆنە مزگەوت تا خەڵکان هەموو رازی بین.

دەڵێت: بەرەو مزگەوت ڕۆشت و ئەو کەسانەی دەبوا بەیعەت بکەن، بەیعەتیان لەگەڵ بەست. ئەنسار جگە لەچەند کەس بەیعەتیان بەست. تەڵحە وتی: ئێمە لەم کارە زیاتر لەبۆن کردنی سەگێك، پشکمان نییە.

عەبدوللە کوڕی حەسەن دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان کوژرا، ئەنسار جگە لەچەند کەس و لەناو ئەوان حەسان کوڕی سابت و کەعب کوڕی مالك و موسلیمە کوڕی موخەلید و باوکی سەعیدی خدری و محەممەد کوڕی موسلیمە و نەعمان کوڕی بەشیر و زەید کوڕی سابت و رافیع کوڕی خودەیج و فوزالە کوڕی عوبەید و کەعب کوڕی عەجرەد کەشوێنکەوتە و لایەنگری عوسمان کوڕی عەفان بوون، بەیعەتیان بەست.

کەسێك بە عەبدوللەی وت: بۆ ئەو کەسانە بەیعەتیان لەگەڵ عەلی نەبەست و شوێن عوسمان کەوتن؟

وتی: حەسان شاعیر بوو و گرنگی بەکار و کردەوەکانی نەدەدا، زەید کوڕی سابت لێپرسراوی دیوان و بیت المال بوو و کاتێك عوسمان کوڕی عەفان گەمارۆی خرایە سەر وتی: ئەی ئەنسارییەکان دوو جار ببنە ئەنساری خواوەند.

باوکی ئەیووب وتی: هاوکاری دەکەیت لەبەر ئەوەی سوودی پێ گەیاندوویت.

دەڵێت: کەعب کوڕی مالك لەلایەن عوسمان کوڕی عەفانەوە لێپرسراوی زەکاتی

تایەفەی موزەینە بوو و هەرچی لەوان کۆدەکرایەوە، بەخۆی دەگەیشت.

زوهری وتبووی: دەستەیەك لەمەدینەوە بەرەو شام هەڵاتن و بەیعەتیان نەبەست.

دەستەیەك وتوویانە: تەڵحە و زوبەیر بەناچاری بەیعەتیان بەست. دەستەیەکی دیکە وتوویانە: زوبەیر بەیعەتی لەگەڵ نەبەست.

هوشام کوڕی ئەبی هوشام موالی عوسمان لەیەکێك لەپیرەکانی خەڵکەکەی دەگێڕێتەوە: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان گەمارۆی خرایەسەر، عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەخەیبەر بوو، کاتێك گەڕایەوە، عوسمان کوڕی عەفان کەسی نارد بەشوێنیدا. عەلی ڕۆشت و بەخۆم وت لەگەڵی بڕۆم و گوێ لەگفتوگۆی ئەوان بگرم. کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتە لای عوسمان کوڕی عەفان ، ئەو، دەستی بەقسە کرد و وتی: چەندین مافم بەسەر تۆوە هەیە، ماف ئیسلام و برایەتی، دەزانی کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ئێمەی کردە برای یەك، منی کردە برای تۆ. ماف خزمایەتیشم هەیە و ماف پەیمان و بەڵێن کە لەئەستۆت گرتووە. سوێند بەخوا ئەگەر هیچ یەك لەم مافانە نەبێت و لەرۆژگاری جاهلییەتدا بژین بۆ یەکێك لەمناڵەکانی مەناف شیاو نییە یەکێك لەمناڵەکانی تەمیم دەست بەسەر پاشایەتی ئەواندا بگرێت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب قسەی کرد و وتی: هەمووی ئەوەی باسی دەکەیت، راستە بەڵام ئەوەی دەڵێی ئەگەر لەرۆژگاری جاهلییەتدا دەژیاین بۆ مناڵەکانی مەناف شیاو نەبوو یەکێك لەمناڵەکانی تەمیم دەست بەسەر پاشایەتی ئەواندا بگرێت، راست دەکەیت و ئاگادار دەبیتەوە.

دەڵێت: عەلی ڕۆشتە ناو مزگەوت. چاوی بەئوسامە کەوت دانیشتبوو، ئەوی بانگ کرد و بەرەو لای تەڵحە بەرێکەوتن. منیش بەدوایاندا. ڕۆشتینەماڵی تەڵحە کوڕی عوبەیدالله. تەڵحە هەستایە سەرپێ.

عەلی وتی: ئەی تەڵحە مەبەستی چ کارێکت هەیە.

وتی: ئەی باوکی حەسەن، کار لەکار ترازاوە.

عەلی هیچی نەوت و هاتەدەر و رووی کردە بیت المال، وتی: ئەم دەرگایە بکەنەوە. بەڵام کلیلەکانی دەست نەکەوت و فەرمانی شکاندنی دەرگاکەی دا. وتی: سامانەکان بێننەدەر. مەبەستی ئەوەی کرد لەناو خەڵکاندا دابەشی بکات. ئەوانەی لەماڵی تەڵحە بوون لەکارەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاگادر بوونەوە و بەرێکەوتن.

بەشێوەیەك تەڵحە بەتەنیا مایەوە و کاتێك عوسمان کوڕی عەفان لەم ڕووداوە ئاگادار بوویەوە، شادمان بوو. تەڵحە بەرێکەوت و ڕووی کردە ماڵی سەروەری باوەڕداران و کاتێك ڕۆشتە لای وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، داوای بەخشین دەکەم و تۆبە بۆ پێشگای خواوەند بەرز دەکەمەوە، مەبەستی ئەنجامدانی کارێکم بوو بەڵام خواوەند ڕێگەی ئەو کارەی لێگرتم.

سەروەری باوەڕداران وتی: سوێند بەخوا مەبەستی تۆبە کردنت نییە بەڵکو شکستت خوارد. ئەی تەڵحە، خواوەند پاداشتی تۆ دەداتەوە!.

محەممەد کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاس دەڵێت: تەڵحە دەیوت: کاتێك بەیعەتم کرد شمشێریان لەسەر سەرم دانابوو.

دەڵێت: نازانم شمشێر لەسەر سەری بوو یا نە، بەڵام دەزانم بەناچاری بەیعەتی کرد.

دەڵێت: هەموو خەڵکانی مەدینە بەیعەتیان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەست جگە لەحەوت کەس کەچاوەڕوان بوون و بەیعەتیان نەکرد: سەعد کوڕی ئەبی وەقاس، عەمرۆ و سوهەیب و زەید کوڕی سابت، محەممەد کوڕی موسلیمە، سەلمە کوڕی وەقش و ئوسامە کوڕی زەید. تا ئەو جێگەی دەزانین ئەنسارییەکان هەموو بەیعەتیان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەست.

باوکی حەبیبە موالی زوبەیر دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان کوژرا و لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەتیان بەست، عەلی ڕووی کردە ماڵەکەی زوبەیر و داوای مۆڵەتی کرد. من ئاگادارم کردەوە. زوبەیر شمشێری لەکالان دەرهێنا و لەژێر دۆشەکەکەی داینا، وتی: مۆڵەتی پێبدە. مۆڵەتم پێدا و هاتە ژوور. سڵاوی لەزوبەیر کرد و لای ئەو وەستا. کاتێك ڕۆشت زوبەیر وتی: ئەم پیاوە هەستی بەشتێك کرد و ڕۆشت، لەشوێنەکەی ئەودا بێستە بزانە چی دەبینیت؟.

دەڵێت: لەشوێنەکەی ئەودا وەستام و نووکی شمشێرەکەم بینی. بەزوبەیرم وت: ئەمە بوو ئەم پیاوەی ناچار بەڕۆشتن کرد.

دەڵێت: کاتێك عەلی هاتەدەر، کەسان پرسیاریان لێکرد. وتی: ئەو باشترین خزمە. خەڵکان گومانی چاکەیان لێکرد و عەلی وتی: زوبەیر بەیعەتی کردووە.

باوكی عوسمان دەڵێت: دوای كوژرانی عوسمان كوڕی عەفان تا پێنج ڕۆژ ئەمیری مەدینە غافقی كوڕی حەرب بوو. بەدوای كەسێكدا دەگەڕان بەخەلافەت رازی ببێت و كەسیان دەست نەدەكەوت. خەڵكانی میسر ڕۆشتنە لای عەلی كوڕی ئەبی تالیب بەلأم خۆی لەوان دادەشارد و پەنای بۆ باخەكانی مەدینە دەبرد. كاتێك دەیانبینی، خۆی لێ دوور دەخستنەوە و لەوتەكانی ئەوان بێزاری خۆی دەردەبڕی. خەڵكان بۆ كوشتنی عوسمان كوڕی عەفان هاوڕا بوون بەلأم سەبارەت بەخەلیفەی داهاتوو بۆچوونەكان جیاواز بوو. كاتێك كەسیان دەست نەكەوت جێگەی ڕەزامەندی هەمووان بێت بڕیاریاندا لەترسی كارەكەی خۆیان، هەركەسێك بەخەلافەت رازی بوو، رازی بن. وتیان: كەس جگە لەم سێ كەسە وەك خەلیفە دەستنیشان ناكەین. كەسیان بۆ لای سەعد كوڕی ئەبی وەقاس نارد و وتیان: تۆ یەكێك لەو شەش كەسە بوویت عومەر كوڕی خەتاب دیاری كردیت، بڕیارمانداوە لەگەڵ تۆ بەیعەت بكەین.

سەعد وەلأمی ناردەوە كەمن و كوڕی عومەر ناتوانین ئەو ئەركە لەئەستۆ بگرین. بەهیچ شێوەیەك نیازمان پێی نییە. هۆنراوەیەكی بۆ نموونە خوێندەوە بەم ناوەرۆكە:

((ناپاك تێكەڵ بەپاك مەكە

جلەكانی خۆت فڕێبدە

و رووت و قووت هەڵبێ)).

دەڵێت: ڕۆشتنە لای عەبدوڵلە كوڕی عومەر كوڕی خەتاب و وتیان: تۆ كوڕی عومەر كوڕی خەتابیت، خەلافەت لەئەستۆ بگرە.

وتی: ئەم كارە تۆڵەی بەدواوەیە و من خۆم گرفتار ناكەم. بەدوای كەسێكی دیكەدا بگەڕێن. خەڵكان سەرگەردان بوون و نەیاندەزانی چی بكەن.

قاسم كوڕی محەممەد دەڵێت: كاتێك تەڵحەیان دەبینی، رازی نەدەبوو و هۆنراوەیەكی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆكە:

((لەشتە سەرسوڕهێنەرەكانی ژیان ئەوەی من تەنیا ماومەتەوە

تاڵ و شیرین كاریگەری لەسەر من دانانێت.))

دەیانوت: هەڕەشەمان لێدەكەیت؟ هەڵدەستان و دەڕۆشتن و كاتێك زوبەیریان دەبینی، داوایان لێدەكرد بەخەلافەت رازی ببێت بەلأم رازی نەدەبوو، هۆنراوەیەكی

دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((چ کاتێك لەماڵەکەی فەیحان

و ئەو ماملە گرانەی خەڵکان لەدەوری تۆ کۆدەکاتەوە

کۆچ دەکەیت؟))

دەیانوت: هەڕەشەمان لێدەکەیت؟

کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان دەبینی، داوایان دەکرد و رازی نەدەبوو و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەگەر گەورەکانی خەڵك گوێرایەڵم دەبوون

پێشنیاری کارێکم پێدەکردن دوژمنان لەناو ببات.))

دەیانوت: هەڕەشەمان لێدەکەیت؟ هەڵدەستان و دەڕۆشتن.

شەعبی دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان کوژرا، خەڵکان لەبازار لەدەوری عەلی کوڕی ئەبی تالیب کۆبوونەوە و وتیان: بەیعەت لەگەڵ تۆ دەکەین.

وتی: پەلە مەکەن. عومەر پیاوێکی پیرۆز بوو کەکاروباری خەلافەتی بەشۆرا سپارد. چاوەڕوان بن تا خەڵکان کۆببنەوە و راوێژ بکەن. کەسان ڕۆشتن. دواتر دەستەیەکیان وتیان: ئەگەر ئەم خەڵکە هەواڵی کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان بۆ شارەکانیان ببەنەوە و هێشتا خەلیفە دەستنیشان نەکرابێت، لەجیاوازی و گەندەڵی خەڵکان پارێزراو نابین. دووبارە ڕۆشتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب. ئەشتەر دەستی ئەوی گرت و عەلی دەستی کێشایەوە.

عەلی وتی: دوای ئەو سێ کەسە؟

ئەشتەر وتی: سوێند بەخوا ئەگەر خەلافەت نەگریتە ئەستۆ، تا ماوەیەکی زۆر ئەو کارە لەئەستۆ ناگریت.

هەمووان بەیعەتیان لەگەڵ کرد. دەڵێن: یەکەم کەس بەیعەتی لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەست، ئەشتەر بوو.

باوکی عوسمان دەڵێت: رۆژی پێنج شەممە پێنج رۆژ دوای کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان، خەڵکانی مەدینەیان کۆکردەوە، سەعد و زوبەیر شارەکەیان بەجێهێشتبوو. تەڵحەیان لەناو باخەکەیدا گرت. منداڵەکانی ئومەییە هەڵاتبوون مەگەر

ئەوانەی نەیانتوانیبوو. وەلید و سەعید لەگەڵ یەکەم دەستەکان بۆ مەککە هەڵاتن. مەروان و کەسانی دیکەیش بەدوای ئەواندا مەدینەیان بەجێهێشت. کاتێك خەڵکانی مەدینەیان کۆکردەوە، خەڵکانی میسر وتیان: ئێوە کەسانی بەشدار لەشۆرا بوون، پێشەوا دەستنیشان دەکەن و فەرمانەکانتان لەلایەن خەڵکانەوە جێبەجێ دەکرێت، یەکێك هەڵبژێرن تا ببینە شوێنکەوتەی ئێوە.

هەمووان وتیان: عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

عەوف دەڵێت: شایەتی دەدەم لە محەممەد کوڕی سیرینم بیست کەدەیوت: عەلی هات و بەتەڵحەی وت: دەستت بێنە پێش تا بەیعەتت لەگەڵ ببەستنم.

تەڵحە وتی: تۆ شیاوتریت، دەستت بێنە پێش.

دەڵێت: عەلی دەستی بردە پێش و تەڵحە بەیعەتی لەگەڵ کرد.

دەڵێت: خەڵکانی میسر وتیان: ئەی خەڵکانی مەدینە پەلە بکەن، ئێمە دوو رۆژ مۆڵەتتان پێدەدەین، سوێند بەخوا ئەگەر کۆتایی بەم کارە نەهێنن، بەیانی عەلی و تەڵحە و زوبەیر و ژمارەیەکی دیکە لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دەکوژین.

خەڵکان لەدەوری عەلی کۆبوونەوە و وتیان: بەیعەت لەگەڵ تۆ دەبەستین، ئەم پێشهاتانەی لەئیسلامدا روودەدەن، دەبینی و دەزانی لەدەست میسرییەکان چ بەڵایەکمان بەسەردا دێت.

عەلی وتی: من لەبیر بکەن و بەدوای کەسێکی دیکەدا بگەڕێن. کارێکمان لەپێشە کەس دەرئەنجامەکەی نازانێت. هیچ دڵێك ئۆقرە ناگرێت و هیچ ئاوزێك ناتوانێت دڵنیا بێت.

وتیان: سوێندت دەدەین بەخوا مەگەر ئەوەی ئێمە دەیبینین، نایبینی؟ مەگەر بارودۆخی ئیسلام نابینی؟ مەگەر ئاژاوە نابینی؟ مەگەر لەخوا ناترسیت؟

وتی: بۆ ئەوەی دەیبینم، وەڵامم هەیە، ئەگەر بەوتەکەی ئێوە رازی ببم، چەندین پێشهاتی دیکە روودەدەن، ئەگەر من لەبیر بکەن دەبمە کەسێك وەك ئێوە و زیاتر لەئێوە ملکەچی فەرمانەکانی خەلیفە دەبم.

دەڵێت: بڵاوەیان لێکرد و بەڵێنیاندا بەیانی دووبارە کۆببنەوە. کەسان لەنێوان خۆیان راوێژیان کرد و وتیان: ئەگەر تەڵحە و زوبەیر بێن، ئەم کارە سامان دەدرێت.

خەڵکانی میسر کەسێکیان بۆ لای زوبەیر نارد و پێیان وت: ئاگاداربە

بەشێوەیەکی نەرم هەڵس و کەوتی لەگەڵ نەکەیت. نێردراوەکە حەکیم کوڕی جەبەلەی عەبدی بوو. لەگەڵ دەستەیەکی دیکە بەشمشێر زوبەیریان هێنا. یەکێك لەخەڵکانی کوفەیان بەدوای تەڵحەدا نارد و وتیان: بەشێوەیەکی نەرم لەگەڵی مەدوێ. نێردراوەکە ئەشتەر بوو. بەزۆری شمشێر تەڵحەیان هێنا. خەڵکانی کوفە وبەسرە جوێنیان بەهاوەڵەکەی خۆیان دەدا. خەڵکانی میسر لەهاودەنگی خەڵکانی مەدینە شادمان بوون. خەڵکانی کوفە و بەسرە خەمبار لەبەر ئەوەی ناچار بوون شوێن خەڵکانی میسر بکەون. بەمشێوەیە ڕق و کینەی ئەوان بەرابەر بەتەڵحە و زوبەیر زیادی کرد.

دەڵێت: بەرەبەیانی هەینی، خەڵکان لەمزگەوت ئامادە بوون. عەلی کوڕی ئەبی تالیب هات و ڕۆشتە سەر مینبەر و وتی: ئەی خەڵکینە، بەرەزامەندی و مۆڵەتی ئێوە، ئەمە کارە تایبەتە بەئێوە و کەس بێ مۆڵەتی ئێوە هیچ مافێکی بەسەریەوە نییە، دوێشەو بڕیارماندا ئەمڕۆ کۆببینەوە. ئەگەر دەخوازن کارەکەی ئێوە لەئەستۆ دەگرم و ئەگەر ناخوازن لەکەس دڵگیر نابم.

وتیان: ئێمە ڕێز لەبەڵێنەکەی خۆمان دەگرین. خەڵکان تەڵحەیان هێنا و وتیان: بەیعەت بکە.

وتی: بەناچاری بەیعەت دەکەم. دەستی گۆج بوو و پێش هەمووان بەیعەتی کرد.

لەناو خەڵکان کەسێك بوو پێشهاتەکانی پێشبینی دەکرد. لەدوورەوە دەیبینی و کاتێك بینی تەڵحە یەکەم کەسە بەیعەتی بەست، وتی: انا لله و انا الیه راجعوان. یەکەم کەس دەستی خستە ناو دەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، گۆج بوو، ئەم کارە دەرئەنجامی نابێت.

زوبەیریان هێنا و هاوشێوەی تەڵحە بەیعەتی بەست. سەبارەت بەزوبەیر بۆچوونەکان جیاوازە. دواتر ئەو کەسانەیان هێنا کەهێشتا بەیعەتیان نەبەستبوو، وتیان: بەیعەت دەکەین تا فەرمانەکانی خواوەند سەبارەت بەهەمووان ئەنجام بدرێت. خەڵکان بەگشتی هەستان و بەیعەتیان بەست.

عەبدولرەحمان کوڕی جوندەب لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك عوسمان کوڕی عەفان کوژرا و خەڵکان عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان وەك خەلیفە هەڵبژارد، ئەشتەر

پۆشت و تەڵحەی هێنا، وتی: رێگە بدە بزانم خەڵکان چی دەکەن. بەڵام مۆڵەتی پێنەدا و ئەوی بەدوای خۆیدا رادەکێشا. تەڵحە بەمینبەرەکەدا سەرکەوت و بەیعەتی بەست.

حارسی والبی دەڵێت: حەکیم کوڕی جەبەلە زوبەیری هێنا و بەیعەتی کرد. دواتر زوبەیر دەیوت: یەکێك لەدزەکانی عەبدقەیس منی برد و بەیعەتم بەست لەکاتێکدا شمشێر لەسەر ملم بوو.

تەڵحە دەڵێت: هەموو خەڵك بەیعەتیان بەست.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ئەو کەسانەی بۆ بەیعەت کردن مەرجیان دانا، لەکەس دڵگیر نەبوون، کارەکە لەدەستی خەڵکانی مەدینەدا بوو. بۆ بارودۆخی پێشتر گەڕانەوە و روویان لەماڵەکانی خۆیان کرد. بەڵام ئاژاوەچییەکان هێشتا لەمەدینەدا بوون.

## سەقامگیر بوونی بەیعەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەرۆژی هەینی پێنج رۆژ بۆ کۆتایی زەحەججە بەیعەیتان بەست. کەسانی دیکە پێنج رۆژ دوای کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان بەرۆژی بەیعەت کردن لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەزانن. یەکەم وتاری عەلی کوڕی ئەبی تالیب دوای لەدەست گرتنی خەلافەت بەمشێوە بوو، سەرەتا سپاسی خواوەندی کرد و وتی:

((خواوەند کتێبێکی رێنیشاندەری ڕەوانە کرد و چاکە و خراپەی روون کردۆتەوە. چاکەکاربن و پشت بکەنە خراپەکاری، ئەرکە دینییەکانتان ئەنجام بدەن چوونکە بەهەشت چاوەڕوانتان دەکات، خواوەند شتە دیاریکراوەکانی حەرام کردووە و رێز گرتن لە موسوڵمانانی پێش هەموو شتێك خستووە و موسوڵمانان بەئیسلام و یەکگرتووی بەهێز کردووە. موسوڵمان کەسێکە موسوڵمانان لەدەست و زمانی ئاسوودەبن مەگەر لەسەر حەق. ئازاری موسوڵمانان تەنیا لەکاتی پێویستدا شیاوە. کاروباری خەڵکان ئەنجام بدەن، مەرگ بەهەمووان دەگات، کەسانی پێش ئێوە ڕۆشتوون و رۆژی پەسڵان داوای هەوڵ و تێکۆشینتان لێدەکات. بارتان سووك بێت تا بەشوێنی مەبەست بگەن چوونکە کەسان چاوەڕوانی چارەنووسی خۆیان

دەکەن. بەندەکانی خوا، لەکاروباری تایبەت بەخەڵکان لەخوا بترسن، پرسیاری شوێنەکان و خزۆکەکانیشتان لێدەکەن، فەرمانەکانی خواوەند ئەنجام بدەن و نافەرمانی مەکەنە پیشە. کاتێك چاکە رووی تێکردن، باوەشی بۆ بکەنەوە و کاتێك رووبەرووی خراپە بوونەوە، پشتگوێی بخەن. بیرتان بێت دەستەیەکی کەم بوون و لەسەر زەوی ریسوا و لاواز.))

عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕایەوە بۆماڵەکەی. تەڵحە و زوبەیر و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لەدەوری کۆبوونەوە و وتیان: ئەی عەلی، ئێمە بەمەرجی رێز گرتن لەفەرمانەکانی خواوەند بەیعەتمان بەستووە، ئەم دەستەیە بەشداری کوشتنی ئەو پیاوەیان کردووە و خوێنیان حەڵاڵە.

وتی: ئەی برایان، لەوەی دەیزانن، بێ ئاگا نیم، بەڵام لەگەڵ ئەو دەستەی بەسەر ئێمەدا زاڵن، دەتوانین چی بکەین. کۆیلەکانی ئێوە پەیوەستی ئەوان بوون و بەدەوییەکانیش بەهەمان شێوە. هەنووکە لەناو ئێوەدان و ئەوەی بخوازن ئەنجامی دەدەن. گومان دەکەن بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە بەتوانان.

وتیان: نە.

وتی: سوێند بەخوا بۆچوونی منیش هاوشێوەی ئێوەیە، بەخواستی خوا. ئەم کارە کاری جاهلییەتە. ئەم دەستەیە رەگ وریشەیان داکوتاوە، لەبەر ئەوەی کاتێك شەیتان دیاردەیەکی تازە دەهێنێتە ئاراوە، شوێنکەوتەکانی لەدنیادا کەم نین. ئەگەر ئەم کارە ئەنجام بدەین، خەڵکان دەبن بەچەندین دەستە، دەستەیەك هاوڕای ئێوە و دەستەیەکی دیکە بۆچوونیان جیاوازە، دەستەیەکی دیکەیش بێ لایەن دەمێننەوە. خۆڕاگر بن تا دڵەکان ئارام بگرێت و مافەکان بگەڕێتەوە. چاوەڕوانی داهاتوو بن بزانین چی روودەدات.

عەلی بارودۆخی لەقوڕەیشییەکان دژوار کرد. هۆکارەکەی هەڵاتنی مناڵەکانی ئومەییە بوو.

ئەوان لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتن. دەستەیەکیان دەیانوت: سوێند بەخوا ئەگەر بەمشێوە بێت ناتوانین تۆڵە لەو ئاژاوەچییانە بستێنین. بۆچوونەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب پەسەندترە. دەستەیەکی دیکە دەیانوت: ئەوەی لەئەستۆی

ئێمەدایە ئەنجامی دەدەین و چاوەڕوان نابین. عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێویستی بەبۆچوون و کاری ئێمە نییە و زیاتر لەهەمووان بارودۆخ لەقوڕەیشییەکان دژوار دەکات.

کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاگادار بوویەوە، وتارێکی خوێندەوە، چاکییەکانی خەڵکەکەی باس کرد و وتی پێویستی بەوانە و بۆچوونی هاوشێوەی ئەوانە و پارێزگارییان لێدەکات و لەدەسەلاتی ئەوان تەنیا ئەمەی دەوێت و خواوەند پاداشت دەداتەوە.

دواتر جاڕیدا: هەر کۆیلەیەك بۆ لای خاوەنەکەی نەگەڕێتەوە خوێنی حەلاڵە. سەبەئییەکان و بەدەوییەکان هاواریان بەرز کردەوە و وتیان: بەیانی بڕیارێکی لەو شێوەیە سەبارەت بەئێمە دەردەکرێت بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکمان هەبێت.

تەڵحە دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەڕۆژی سێیەم هاتە ناو خەڵکان و وتی: ئەی بەدەوییەکان، بۆ لای ئاوەکانی خۆتان بگەڕێنەوە. سەبەئییەکان ڕازی نەبوون بەلاّم بەدەوییەکان گەڕانەوە.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و دەستەیەك لەهاوەلانی پێغەمبەر(د.خ) لەدەوری کۆبوونەوە. وتی: هەنووکە خوێنی کەسەکەی خۆتان بگرن و تۆڵەی خۆتان بستێننەوە.

وتیان: بەتەواوی شارەزای ئەم بابەتە نین.

وتی: سوێند بەخوا ئەوان بێ ئاگاترن.

تەڵحە وتی: مۆڵەتم پێبدە بەرەو بەسرە بڕۆم و بەخێرایی لەگەڵ سوپایەك بگەڕێمەوە.

وتی: با بزانم.

زوبەیر وتی: من بۆ کوفە ڕەوانە بکە و بەخێرایی لەگەڵ سوپایەك دەگەڕێمەوە.

وتی: با بزانم.

دەڵێت: موغەیرە لەم کۆبوونەوە ئاگادار بوویەوە، ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتی: دەبێت چاکەخوازی تۆ بین، بەبۆچوونی ڕاست و پەسەندی ئەمڕۆ دەتوانی کاروبارەکانی سبەی، سامان بدەیت و بەکاری ناپەسەندی ئەمڕۆ، کاروبارەکانی سبەی بەرەو فیڕۆیی دەبەیت. معاویە لەسەر کارەکەی بهێڵەرەوە،

هەموو کارگوزاران بۆ شوێنی کارەکانی بگەڕێنەرەوە و کاتێك ملکەچی فەرمانەکان بوون و بەیعەتیان لەسوپاییەکان وەرگرت، بیانگۆڕە.

وتی: با بزانم.

دەڵێت: موغەیرە ڕۆشت و ڕۆژی دواتر گەڕایەوە و وتی: دوێنێکە بۆچوونێکم بوو بەڵام بۆچوونی راست ئەوەیە لەزووترین کات لەسەر کار لایان ببەیت تا خەڵکان ببیستن و فەرمانەکانی تۆ جێبەجێ بکەن.

دەڵێت: کاتێك دەڕۆشتەدەر، کوڕی عەباس هات و چاوی پێی کەوت. کاتێك گەیشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: موغەیرەم بینی لێرە دەڕۆشتەدەر، بە چ مەبەستێك هاتبوو؟

وتی: دوێنێکە هات و بەو شێوەیە قسەی دەکرد و ئەمڕۆ بەمشێوەیە.

کوڕی عەباس وتی: دوێنێکە چاکەخوازی تۆ بوو بەڵام ئەمڕۆ نا.

وتی: کەواتە بۆچوونی پەسەند و راست چییە؟

وتی: بۆچوونی پەسەند ئەوەبوو کاتێك عوسمان کوڕی عەفان کوژرا یا پێش کوژرانەکە بەرەو مەککە دەڕۆشتیت و لەماڵەکەی خۆت دادەنیشت و دەرگات دادەخست چوونکە عەرەبەکان بەدوای تۆدا دەگەڕان. بەڵام ئەمڕۆ منداڵەکانی ئومەییە هەوڵ دەدەن بەشێك لەم کارەساتە بخەنە ئەستۆی تۆ و گومان لای خەڵکان دروست بکەن. دەخوازیت تۆڵەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان بستێنیت بەهەمان شێوە کەخەڵکانی مەدینە دەخوازن بەڵام توانای ئەو کارەت نییە، ئەوانیش دەسەڵاتیان نییە، ئەگەر ئەوان دەسەڵات و کاروبارەکان بگرنە دەست، بەئاسانی دەستبەرداری مافەکانی خۆیان دەبن مەگەر ئەوەی بەخێرایی ئەنجامیان دابێت.

دەڵێت: کاتێك موغەیرە ڕۆشتەدەر، وتی: سوێند بەخوا مۆجیاریم کرد و چوونکە رازی نەبوو، دەغەڵکاریم کردەپیشە.

عەبدوللە کوڕی عوتبە لەکوڕی عەباس دەگێڕێتەوە: عوسمان کوڕی عەفان منی کردە سەرپەرەستی ئەنجامدانی رێ و رەسمەکانی حەج. رووم کردە مەککە و فەرمانەکەم ئەنجامدا. نامەکەی عوسمان کوڕی عەفانم بۆ خەڵکان خوێندەوە. دواتر گەڕامەوە بۆ مەدینە، خەڵکان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەتیان بەستبوو.

لەماڵەکەی خۆی ڕۆشتمەی لای، موغەیرە کوڕی شوعبە لەویٚ بوو، بەتەنیا لەگەڵ ئەو قسەی دەکرد. مۆڵەتی بەمن نەدا تا ئەو کاتەی موغەیرە هەستا. دوای ڕۆشتنی موغەیرە ڕۆشتمە لای و وتم: موغەیرە چی دەوت:

وتی: جاری پێشوو پێی وتم عەبدوللە کوڕی عامر و معاویە و کارگوزارەکانی عوسمان کوڕی عەفان ڕەوانەی ویلایەتەکانیان بکەرەوە و لەسەر کار لایان مەبە تا بەیعەت لەخەڵکان وەربگرن و کاروباری ویلایەتەکان سامان بدەن. بەمە ڕازی نەبووم و وتم: سوێند بەخوا ئەگەر تەنانەت بۆ بەشێکی ڕۆژ ئەم کارە لەدەستی مندا بێت، بۆچوونی خۆم بەکار دەبەم و کاروبارەکان بەکەسانی وەك ئەوان ناسپێرم. دواتر ڕۆشت و دڵنیام گومان دەکات من کاری هەڵە ئەنجام دەدەم. ئەمڕۆ هات و وتی: دوێنێ پێشنیارێکم پێکردیت بەڵام دژایەتیت کردم. هەنووکە بۆچوونێکی دیکەم هەیە، بۆچوونم هاوشێوەی بۆچوونی تۆیە. ئەوان لەسەر کار لابەرە و کەسانی بڕواپێکراوی خۆت بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکان دەستنیشان بکە چوونکە هەموو شتێك لەدەستی خوادایە و گەورەیی و شکۆی ئەوان کەمتر لەوەیە کەگومان دەکەن.

کوڕی عەباس دەڵێت: بە عەلی کوڕی ئەبی تالیبم وتی: دوێنێ چاکەخوازی تۆ بوو بەڵام ئەمڕۆ نا.

وتی: چۆن؟

وتم: دەزانی معاویە و هاوەڵانی باوەشیان بۆ دنیا کردۆتەوە و ئەگەر لەسەر کار لایان نەبەیت، گرنگی نادەن بەوەی کێ خەلیفەیە بەڵام ئەگەر لەسەر کار لایان بەریت دەڵێن: بیٚ ڕاوێژ کردن دەستی بەسەر خەلافەتدا گرتووە، عوسمان کوڕی عەفانی کوشتووە و کەسان هاندەدەن و خەڵکانی شام و عێراق دژی تۆ ئاڵای شۆڕش بەرز دەکەنەوە. دڵنیام تەڵحە و زوبەیریش دژی تۆ دەوەستنەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەوەی دەڵێی ئەوان لەسەر کار لانەبەم، سوێند بەخوا دڵنیام ئەم کارە لەڕوانگەی کاروباری دنیاوە پەسەندە و لەبەرژەوەندیدایە. بەڵام ئەرکێکم لەسەر شانە و بەو زانستەی لەکارگوزارانی عوسمان کوڕی عەفان هەمە، هیچ کام لەوان بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکان ڕاناسپێرم. ئەگەر ڕازی بوون بۆ خۆیان باشترە و ئەگەر دژایەتییان کرد، بەشمشێر وەڵامیان دەدەمەوە.

کوڕی عەباس وتی: بۆچوونی من بەکار ببە و بۆ ماڵەکەت یا یەنبەع بڕۆ، لەناو

ماڵ و حاڵی خۆت بمێنەرەوە و دەرگا دابخە تا کاروباری عەرەبەکان پەرێشان ببێت. کەسیان جگە لەتۆ دەست ناکەوێت. سوێند بەخوا ئەگەر ئێستا لەگەڵ ئەوان هاوئاهەنگ نەبیت، سبەی، خوێنی عوسمان کوڕی عەفان دەخەنە ئەستۆی تۆ.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕازی نەبوو، بەکوڕی عەباسی وت: بەرەو شام بەرێکەوە چوونکە وەك کارگوزاری ئەو ناوچەیە دەستنیشانم کردوویت.

کوڕی عەباس وتی: ئەمە بۆچوونێکی پەسەند نییە، معاویە یەکێکە لەمناڵەکانی ئومەییە، ئامۆزای عوسمان کوڕی عەفانە و کارگوزاری ئەو لەشامە، دەترسم لەتۆڵەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان من بکوژێت یا زیندانیم بکات و بمکاتە گاڵتەجاری خەڵکان.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بۆچی؟

وتم: لەبەر ئەوەی من خزمی تۆم و ئەوەی بیخەنە پاڵ تۆ، منیش دەگرێتەوە. نامە بۆ معاویە بنووسە و بەڵێنی پێبدە.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕازی نەبوو، وتی: سوێند بەخوا هەرگیز ئەوە ڕوونادات.

کوڕی هیلال دەڵێت: کوڕی عەباس دەیوت: پێنج ڕۆژ دوای کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان لەمەککەوە گەیشتمە مەدینە، ڕۆشتمە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب. وتیان: موغەیرە کوڕی شوعبە لای ئەوە. لەبەردەرگا دانیشتم تا موغەیرە هاتەدەر، سڵاوی کرد و وتی: کەی گەڕایتەوە؟

وتم: هەر ئێستا.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب، سڵاوم لێکرد و بەمنی وت: زوبەیر و تەڵحەت بینی؟

وتم: لەنەواسف ئەوانم بینی.

وتی: کێیان لەگەڵ بوو؟

وتم:" باوکی سەعید کوڕی حارس لەگەڵ دەستەیەك لەقورەیشییەکان.

وتی: ئەوان بەرێکەوتوون و دەڵێن تۆڵەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان دەستێنین، سوێند بەخوا دڵنیام خۆیان بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفانن.

کوڕی عەباس وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەگفتوگۆی موغەیرە ئاگادارم بکەرەوە، بۆ لەگەڵ تۆ بەتەنیا کۆبوویەوە؟

وتی: دوو ڕۆژ دووای کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان هاتە لای من و وتی: ڕاوێژ بکەین. ڕازی بووم و وتی: چاکەخوازی کەم بەهایە و تۆ پاشماوەی سەرکردەکانیت و من چاکەخوازی تۆم. بۆچوونی من ئەوەیە ئەمساڵ کارگوزارەکانی عوسمان کوڕی عەفان لەسەر کار لانەبەیت و نامەیان بۆ بنووسی تا لەشوێنەکانی خۆیان بمێننەوە و کاتێك بەیعەتیان لەگەڵ تۆ کرد و بارودۆخ سەقامگیر بوو، ئەو کەسانەی پەسەندیان ناکەیت، لەسەر کار لایانبەرە.

وتم: سوێند بەخوا هیچ کات لەکاروباری دین ئاسانکاری و سازش ناکەم و لەکارەکانی خۆم، بەریسوایی ڕازی نابم.

وتی: ئەگەر بەبۆچوونی من ڕازی نابیت، جگە لەمعاویە ئەوانی دیکە لەسەر کار لابەرە چوونکە پیاوێکی پێداگر و بوێرە و خەڵکانی شام شوێنکەوتەی ئەون. بۆ هێشتنەوەی ئەو بەڵگەت هەیە چوونکە عومەر کوڕی خەتاب هەمو ویلایەتی شامی بەو سپاردووە.

وتم: نا، سوێند بەخوا بۆ ماوەی دوو ڕۆژیش معاویە لەسەر کارەکەی ناهێڵمەوە.

دەڵێت: موغەیرە ڕۆشت و ڕۆژی دواتر گەڕایەوە و وتی: پێشنیارێکم کرد و ڕازی نەبوویت، کاتێك تێڕوانینم بۆ کرد دڵنیابووم بۆچوونەکەی تۆ پەسەندە و ڕەوا نییە لەکارەکانی خۆت پشت بەفرت و فێڵ ببەستیت چوونکە ئەو کارە لەتۆ ناوەشێتەوە.

کوڕی عەباس دەڵێت: وتم: لەپێشنیاری یەکەمدا چاکەخوازی تۆ بووە بەڵام دواجار نە، منیش بۆچوونم وایە معاویە لەسەر کار لانەبەیت، ئەگەر بەیعەتی بەست، بەڵێن دەدەم ئەو لەسەر کارەکەی دوور بخەمەوە.

وتی: نا، سوێند بەخوا تەنیا شمشێر لەنێوان ئێمە داوەری دەکات. هۆنراوەیەکی بۆ نمونە خوێندەوە کەناوەڕۆکەکەی بەمشێوەیە:

((نەنگ نییە ئەگەر بوێرانە بمرم

و هەوڵی خۆمدابێت.))

دەڵێت: وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆ پیاوێکی بوێریت بەڵام شارەزای

کاروباری جەنگ نیت، مەگەر نەتبیست پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو، جەنگ یانی فرت و فێڵ.

وتی: بۆنا.

کوڕی عەباس وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بۆچوونەکەی من بەکار ببەیت، دەیانبەمە سەر کانی و ئاویان دەدەم و دەیانگەڕێنمەوە بێ ئەوەی بزانن چی روویداوە و هیچ کەم وکورییەك لەکارەکانی تۆ روونادات و هیچ گوناحێکت ناکەوێتە سەرشان.

وتی: ئەی کوڕی عەباس، من لەم کارانەی تۆ و کارەکانی معاویە بەدوورم، پێشنیارێکت کردووە و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەم بەڵام ئەگەر دژی بۆچوونەکەی تۆبووم، شوێنکەوتەی منبە.

وتم: ئەو کارە دەکەم. ئاسانترین ئەرکی سەرشانی من گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی تۆیە.

## بەرێکەوتنی قوستەنتین، پاشای رۆم بەمەبەستی هێرش کردنە سەر موسوڵمانان

لەم ساڵە یانی ساڵی پانزەیەم، قوستەنتین کوڕی هێرقل، بەهەمان شێوەی واقدی ئاماژەی پێداوە، لەگەڵ هەزار کەشتی هێرشی کردە سەر سنووری موسوڵمانان و خواوەند تۆفانێکی کوشندەی بەسەردا زاڵ کردن و هەموویان لەناچوون. قوستەنتین کوڕی هێرقل رزگاری بوو و گەڕایەوە بۆ سەقلییە. گەرماوێکیان بۆ دروست کرد. ڕۆشتە ناو گەرماوەکە و لەوێدا کوشتیان و وتیان: پیاوەکانی ئێمەت بەکوشتدا.

ساڵی سی و شەش دەستی پێکرد.

## عەلی کوڕی ئەبی تالیب کارگوزارەکانی خۆی بۆ ویلایەتەکان ڕەوانە کرد

کاتێك ساڵی سی و شەش دەستی پێکرد، عەلی کوڕی ئەبی تالیب کارگوزارەکانی خۆی بۆ ویلایەتەکان ڕەوانە کرد.

تەڵحە دەڵێت: عەلی عوسمان کوڕی حەنیفی بۆ بەسرە نارد.

عەمارە کوڕی شەهابی بۆ کوفە نارد، ئەو یەکێك بوو لەکۆچکەران.

عوبەیدالله کوڕی عەباسی بۆ یەمەن نارد.

قەیس کوڕی سەعدی بۆ میسر نارد.

سەهل کوڕی حەنیفی بۆ مسر نارد.

دەڵێت: سەهل ڕۆشت و کاتێك گەیشتە تەبوك، دەستەیەك سواری بینی کەوتیان: کێیت؟

وتی: ولایەتدارم.

وتیان: ویلایەتداری کوی؟

وتی: شام.

وتیان: ئەگەر عوسمان کوڕی عەفان تۆی ڕەوانە کردووە، وەرە و ئەگەر کەسێکی دیکە ڕەوانەی کردوویت، بگەڕێرەوە.

وتی: مەگەر نەتانبیستووە چی روویداوە؟

وتیان: بۆنا.

دەڵێت: سەهل بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕایەوە.

دەڵێت: قەیس کوڕی سەعدیش کاتێك گەیشتە ئیلیە، چاوی بەسوارەکان کەوت. وتیان: کێیت؟

وتی: لەپاشماوەی هاوەڵانی عوسمان کوڕی عەفان و بەدوای کەسێکدا دەگەڕێم پەنای بۆ ببەم بۆ ئەوەی تۆڵەی سەروەری باوەڕداران بکەمەوە.

وتیان: کێیت؟

وتی: قەیس کوڕی سەعد.

وتیان: بڕۆ.

دەڵێت: ئەو ڕۆشتە ناو میسر. خەڵکانی میسر چەندین دەستە بوون. دەستەیەك پەیوەستی بوون و دەستەیەك دوودڵ بوون و روویان کردە خەربتا و وتیان: ئەگەر بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان بکوژرێن، پەیوەستی ئێوە دەبین و گەرنە لەشوێنی خۆمان دەمێنینەوە تا دەرمان نەکەن یا ئەوەی بەمەبەستی خۆمان دەگەین. دەستەیەکیش دەیانوت: ئەگەر عەلی تۆڵە لەبراکانمان نەستێنێت، بەیعەتی لەگەڵ دەبەستین.

دەڵێت: قەیس عەلی کوڕی ئەبی تالیبی لەم پێشهاتانە ئاگادار کردەوە.

دەڵێت: کەس ڕێگەی لەعوسمان کوڕی حەنیف نەگرت چوونکە کوڕی عامر بۆچوون و چارەسەری لانەبوو و نەیدەتوانی کاروباری جەنگ ڕاپەڕێنێت و خەڵکانی ئەو شارەیش بوون بەچەندین دەستە. دەستەیەك لەگەڵ نەیارەکان بوون، دەستەیەك لەگەڵ خەڵکان و دەستەیەکیش دەیانوت: چاوەڕوان دەبین بزانین خەڵکان چی دەکەین، ئێمەیش شوێنیان دەکەوین.

دەڵێت: عەمارەیش بەڕکەوت و کاتێك گەیشتە زوبارە، تەڵحە کوڕی خوەیلدی بینی. ئەو، هەواڵی عوسمان کوڕی عەفانی بیستبوو، ئالآی شۆڕشی بەرز کردبوویەوە و داوای تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوسمانی دەکرد و دەیوت: ئەی هاوار، بەداخەوە لەوێ نەبووم.

دەڵێت: کاتێك قەعقاع و هاوەڵانی لەهاوکاری کردنی سەروەری باوەڕداران گەڕانەوە و گەیشتنە کوفە، عەمار دەرکەوت. قەعقاع پێی وت: بگەڕێرەوە چوونکە خەڵکان جگە لەفەرمانڕەواکەی خۆیان کەسی دیکەیان ناوێت و ئەگەر ڕازی نەبیت، دەتکوژم.

دەڵێت: عەمارە گەڕایەوە و دەیوت: لەمەترسی خۆت بپارێزە چوونکە ڕێگە لەخراپە ناگرێت مەگەر خراپەی خراپتر لەو. گەڕایەوە بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئەم پەندە لەو کاتەوەی کاروبارەکان بۆ عەمارە ئاڵۆز بوو تا کاتی مردنی، لەگەڵ ناوەکەی مایەوە.

دەڵێت: عوبەیداللە کوڕی عەباس ڕوویکردە یەمەن، یەعلی کوڕی ئومەییە خەراجی کۆکردەوە و یەمەنی بەجێهێشت و بەرهەمی خەراجی لەگەڵ خۆی برد و لەگەڵ پاسەوانەکانی خۆی گەیاندە مەککە.

دەڵێت: کاتێك سەهل کوڕی حەنیف لەڕێگەی شام دەگەڕایەوە و هەواڵەکان بەگوێی عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشت و نێردراوەکانی گەڕانەوە، تەڵحە و زوبەیری بانگ کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، ئەوەی ئێوەم لێ ئاگادار دەکردەوە، ڕوویدا. بۆ ڕێگرتن لەم ڕووداوانە پێویستە سەرکوت بکرێن. ئەمە فیتنەیە و هاوشێوەی ئاگر بڵێسە دەسەنێت و بەرز دەبێتەوە.

وتیان: مۆڵەتمان پێبدە لەمەدینە بڕۆین یا زاڵ دەبین یا چاو لەئێمە بپۆشە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: تا ئەو کاتەی دەتوانم، دەیپارێزم و کاتێك ڕێگە چارەم نەما، بەدووایین چارەسەرەوە سەرقاڵ دەبم.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب نامەی بۆ معاویە و باوکی موسا نووسی. باوکی موسا وەڵامی دایەوە: خەڵکانی کوفە گوێرایەڵن و بەیعەتیان بەستووە، باسی خەڵکانی ڕازی و نارازی کرد بەشێوەیەك عەلی کوڕی ئەبی تالیب کاری خەڵکانی کوفەی پەسەند کرد.

نێردراوی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ لای باوکی موسا، سەعیدی ئەسلەمی بوو. نێردراوی ئەو بۆ لای معاویە سەبرەی جوهەنەی بوو. ڕۆشتە لای معاویە بەلاَم ئەو نەهیچی نووسی نە وەلاَمی دایەوە، نێردراوەکەیشی نەگەڕاندەوە و هەرکاتێك داوای وەلاَمی دەکرد، معاویە هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە و ئاماژەی بەکوژرانی عوسمان کوڕی عەفان و جەنگ دەکرد و زیاتری نەدەهێنایە سەرزمان تا ئەوەی سێ مانگ بەسەر کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان تێپەری. ئەوکات معاویە یەکێك لەمناڵەکانی عەبس لەتیرەی مناڵەکانی ڕەواحە بەناوی قەبیسەی بانگ کرد و تۆمارێکی مۆرکراوی پێدا کەناونیشانەکەی بەمشێوە بوو: لەمعاویە بۆ عەلی. ئەو و نێردراوەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی ڕەوانە کرد. هەردووکیان بەرێکەوتن و لەمانگی رەبیع الاول گەیشتنە مەدینە. پیاوی عەبەسی بەهەمان شێوە کەمعاویە فەرمانی پێدابوو، تۆمارەکەی بەرز کردەوە، خەڵکان هاتنەدەر و سەیریان دەکرد. دواتر گەڕانەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان و ئاگادار بوونەوە کەمعاویە دژی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە.

پیاوی عەبەسی ڕۆشت تا گەیشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب، تۆمارەکەی تەسلیم کرد، مۆرەکەی لابرد بێ ئەوەی نووسراوی تیا بێت. عەلی بەنێردراوەکەی وت: چی ڕوویداوە؟

وتی: پارێزراوم؟

وتی: بەڵێ، نێردراوەکان پارێزراون و ناکوژرێن.

وتی: ڕاستییەکەی ئەوەیە لای خەڵکانێکەوە دێم تەنیا بەتۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان ڕازی دەبن.

وتی: لەکێ.

وتی: لەتۆ. شەست هەزار پیرم بەجێهێشت کە لەژێر کراسەکەی عوسمان کوڕی عەفان دەگرین، کراسەکەی ئەویان خستۆتە سەر مینبەرەکەی دیمەشق.

وتی: داوای خوێنی عوسمان کوڕی عەفان لەمن دەکەن؟ مەگەر من هاوشێوەی عوسمان کوڕی عەفان خوێنم نەڕژاوە، خواوەند لەپێشگای تۆ لەخوێنی عوسمان کوڕی عەفان بێزاری خۆم دەردەبڕن، سوێند بەخوا دەستمان بەبکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان ناگات مەگەر ئەوەی خواوەند مەبەستی لەناو بردنی ئەوان بکات.

وتی: پارێزراوم.

وتی: پارێزراویت؟

پیاوی عەبەسی ڕۆشتەدەر، سەبەئییەکان هاواریان کرد و وتیان: ئەمە سەگە، ئەمە نێردراوی سەگەکانە، بیکوژە.

نێردراو هاواری کرد: ئەی بنەماڵە موزێر، ئەی قەیسییەکان، سوێند بەخوا چوار هەزار کۆیلەی خەساو تۆڵەی ئەمە دەستێننەوە، بزانن سوارکاری و ئازایەتی چۆنە.

موزێرییەکان ڕێگەیان لێگرت و وتیان: بێدەنگ بە. ئەو دەیوت: نا، سوێند بەخوا ئەوان هیچ کات ڕزگارییان نابێت، بەڵێنەکانی خواوەند دێتەدی.

پێیان دەوت: بێدەنگ بە. دەیوت: گرفتاری بەڵایەك بوون کەلێی دەترسان، سوێند و هێز و دەسەڵاتی خۆیان لەدەستدا. سوێند بەخوا پێش ئەوەی شەو دابێت، ڕیسوایی ئەوان دەردەکەوێت.

## تەڵحە و زوبەیر داوای مۆڵەت لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەکەن

محەممەد دەڵێت: تەڵحە و زوبەیر داوای مۆڵەتی حەجی عەمرەیان لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد، مۆڵەتی پێدان و ئەوان ڕوویان کردە مەککە.

دەڵێت: خەڵکانی مەدینە دەیانویست بزانن بۆچوونی عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەبارەت بەمعاویە چییە و بەم پێیە بۆچوونی ئەو سەبارەت بەجەنگ لەگەڵ دانیشتووانی قیبلە بزانن کەئایا بوێری ئەو کارەی هەیە یا نە. بیستبوویان حەسەن ڕۆشتۆتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و داوای لێکردبوو، دەست لەخەلافەت

هەڵگرێت و کاری خەڵکان بەخۆیان بسپێرێت.

دەڵێت: بۆ ئەم مەبەستە زیاد کوڕی حەنزەلەی تەمیمییان ڕەوانە کرد کەیەکێك لەکەسە نزیکەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو، زیاد ڕۆشتە لای سەروەری باوەڕداران و ماوەیەك لەگەڵی دانیشت. دواتر عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێی وت: ئەی زیاد خۆت ئامادە بکە.

وتی: بۆچی؟

وتی: بۆ جەنگی خەڵکانی شام دەڕۆیت.

زیاد وتی: چاوەڕوان بوون و سازان پەسەندترە. هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(هەرکەس لەزۆر لەکارەکان ڕێگەی سازان نەگرێتەبەر

بەددانەکان هەڵیدەدڕن و لەژێر سمی ئەسپەکان دەیشێلن)

عەلی کوڕی ئەبی تالیب هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( کاتێك دڵی وشیار و شمشێر و مێشك و جوامێری

کۆببنەوە، لەستەمکارییەکان دەتپارێزن))

زیاد بۆ لای خەڵکان گەڕایەوە، چاوەڕوان بوون، وتیان: باس و خواس چییە؟

وتی: ئەی خەڵکینە، شمشێر. بەمشێوەیە لەمەبەستەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاگادار بوونەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب محەممەد کوڕی حەنیفەی بانگ کرد و ئالآیەکی بۆ بەست. عەبدوللە کوڕی عەباسی وەك فەرماندەی باڵی راست و عەمرۆ کوڕی ئەبی سەلمە یا عەمرۆ کوڕی سوفیان کوڕی عەبدولئەسەدی وەك فەرماندەی باڵی چەپ دەستنیشان کرد. باوکی لەیلی عومەر کوڕی جەراحی کردە فەرماندەی پێشەنگەکانی و قیسەم کوڕی عەباسی کردە جێگری خۆی لەمەدینە. هیچ کام لەو کەسانەی لەکوشتنی عوسمان کوڕی عەفان بەشدار بوون، بۆ کاروبارەکان ڕانەسپارد. نامەی بۆ قەیس کوڕی سەعد نووسی تا خەڵکانی شام ڕەوانە بکات، عوسمان بۆ کوڕی حەنیف و باوکی موسای نووسی وسەرقاڵی خۆئامادە کردن بوو. وتارێکی پێشکەشی خەڵکانی مەدینە کرد و بانگێشتی کردن تا بۆ جەنگی ئاژاوەچییەکان خۆیان ئامادە بکەن، وتی: خواوەند پێغەمبەرێکی ڕێنیشاندەری

ڕەوانە کرد هاوریّ لەگەڵ کتێبێکی پاراوا کەتەنیا گومڕاکان لێی بیّ ئاگا دەبن— دیاردە و گومانەکان هۆکاری لەناچوونە، مەگەر ئەو کەسەی خواوەند بیپارێزێت، پاراستنی کاروباری ئێوە پەیوەستی بەهێزی خواوەند، بیّ گومان و دوودڵی شوێنکەوتەی فەرمانەکانی بن، سوێند بەخوا ئەگەر ئەوکارە نەکەن، هێزی ئیسلام لەئێوە دەستێنێتەوە و هیچ کات دەسەڵاتتان بۆ ناگەڕێنێتەوە، بۆ جەنگی ئەو خەڵکەی دەخوزان پەیوەست بوونی کۆمەڵانی خەڵك بشێوێنن، بەرێکەون، هیودارام خواوەند بەهۆی ئێوەوە چاکسازی لەناو خەڵکانی هەموو شوێنەکان دروست بکات و بتوانن ئەرکەکانی خۆتان بەباشترین شێوە ئەنجام بدەن.

لەمکاتەدا هەواڵیان بۆ هات کەهەموو خەڵکانی مەدینە ئاڵای دژایەتییان بەرز کردۆتەوە، لەناو خەڵکاندا قسەی کرد و وتی: خواوەند بۆستەمگەری ئەم خەڵکە بەخشش و لێخۆشبوونی داناوە و بۆ ئەو کەسەی لەرێگە دەرنەچێت و خۆڕاگری بکاتە پیشە، رزگاری، هەرکەس لەراستییەکان بێزار بێت، رووداکاتە خراپییەکان، ئاگادار بن تەڵحە و زوبەیر و دایکی باوەڕداران دژی خەلافەتی منن و پێشنیاری ئاشتی بەخەڵکان دەکەن. تا ئەو کاتەی ترسی بڵاوبوونەوەی ئێوەم نەبێت، خۆڕاگری دەکەم و ئەگەر دەست هەڵگرن و تەنیا بەم کارەیان بەسەندە بکەن، دەستیان لیّ هەڵدەگرم.

دواتر ئاگادار بوونەوە کەئەوان بەمەبەستی ئاژاوەنانەوە دەیانەوێت بەرەو بەسرە بڕۆن. عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوان خۆی ئامادە کرد و وتی: ئەگەر ئەم کارە بکەن، کاروباری موسوڵمانان دەشێوێت، مانەوەیان لەناو ئێمە نەئەرك بوو، نە ناخۆش، بەڵام ئەم بابەتە بۆ خەڵکانی مەدینە سەخت بوو.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب کومەیلی نەخەعی بەدوای عەبدوللە کوڕی عومەر کوڕی خەتاب ڕەوانە کرد، ئەوی هێنا و پێی وت: لەگەڵ من وەرە.

وتی: من لەگەڵ خەڵکانی مەدینەم، بەیعەتیان کرد و بەیعەتم کرد، لێیان جیانابمەوە، ئەگەر بەرێکەوتن، منیش بەرێدەکەوم و ئەگەر مانەوە، منیش دەمێنمەوە.

وتی: دەستبەرێك بدە کە لەمەدینە ناڕۆیتەدەر.

وتی: ئەو کارە ناکەم.

وتی: ئەگەر توندوتیژی تۆم لەمناڵی و لەئێستادا نەزانی، سەرمسوڕدەما، ئازادی بکەن، من دەستەبەری ئەوم.

عەبدوڵلە کوڕی عومەر بۆ مەدینە گەڕایەوە و بیستی خەڵکان دەڵێن: سوێند بەخوا نازانین چی بکەین، گومانمان لەم کارە هەیە. دەمێنینەوە تا ئەو کاتەی دڵنیا دەبین.

هەمان شەو عەبدوڵلە کوڕی عومەر ڕۆشت و دایکی کولسوم کچی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی لەوەی لەخەڵکانی مەدینەی بیستبووی ئاگادار کردەوە و وتی بەمەبەستی عەمرە ڕوو لەمەککە دەکات و شوێنکەوتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب جگە لەشۆڕش کردن. و ڕاستی دەوت.

ئەو شەوە عەبدوڵلە لای دایکی کولسوم مایەوە، بەرەبەیانان بە عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان وت: ئەمشەو پێشهاتێك ڕوویداوە خراپتر لەڕۆشتنی تەڵحە و زوبەیر و دایکی باوەڕداران و معاویە.

وتی: چی ڕوویداوە؟

وتیان: کوڕی عومەر ڕووی کردۆتە شام.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاتە ناو بازار و داوای چوارپێی کرد، پیاوانی ئامادە کرد و بۆ هەر ڕێگەیەك چەندین کەسی دەستنیشان کرد. خەڵکانی مەدینە کەوتنە جموجۆڵ.

دایکی کولسوم ئاگادار بوویەوە، سوار ئێسترەکەی خۆی بوو، ڕۆشتە لای باوکی. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبازاردا وەستابوو و سوارکارانی بۆ گەڕان بەشوێن عەبدوڵلە کوڕی عومەر دەنارد. بەباوکی وت: لەم پیاوە توڕە مەبە، ڕووداوەکە بەپێچەوانەی ئەوەیە بۆتۆیان باس کردووە، تۆمەتیان بۆ هەڵبەستووە.

بەباوکی وت: من دەستەبەری ئەوم.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب شادمان بوو و وتی: بگەڕێنەوە بۆ سەر کارەکانی خۆتان، سوێند بەخوا دایکی کولسوم درۆ ناکات، کوڕی عومەریش درۆی نەوتووە، من باوەڕم پێی هەیە. خەڵکان گەڕانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان.

تەڵحە دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب گوێرایەڵی و ملچکەی خەڵکانی

مەدینەی بەشێوەی پێویست و شیاو نەبینی، سەرکردەکانی مەدینەی کۆکردەوە و قسەی بۆ کردن، وتی: ئەم کارە لەکۆتاییدا بەهەمان شێوە سامان دەدرێت کە لەسەرەتاوە ساماندرا، ئەنجامی قەزای خواوەندتان سەبارەت بەکەسانی پێش خۆتان بینیوە، هاوکاری خواوەند بکەن تا هاوکاریتان بکات.

دووکەس لەئەنسارییەکان وەڵامی بانگێشتەکەیان دایەوە، باوکی هەیسەم تیهان کەیەکێك بوو لەجەنگاوەرانی بەدر و خەزیمە کوڕی سابت، ئەم خەزیمەیە جیاوازە لەخەزیمەی ذو الشهادتین چوونکە ئەمەیان لەرۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان کۆچی دووای کرد.

لەگێڕانەوەی عەبدوللەدا هاتووە، بەحەکەمیان وت: خەزیمە کوڕی سابت ذو الشهادتین لە شەری (جمل) وشتر ئامادە بوو؟ وتی: ذوالشهادتین نەبوو، یەکێکی دیکە لەئەنسارییەکان بوو، ئەو لەرۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان کۆچی دووای کرد.

موجالید لەشەعبی دەگێڕێتەوە: سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، لەم ئاژاوەدا تەنیا شەش لەجەنگاوەرانی بەدر ئامادە بوون.

عەمرۆ کوڕی محەممەد لەشەعبی دەگێڕێتەوە: سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، لەم جەنگەدا تەنیا شەش بەدری ئامادە بوون. بێژەر دەڵێت: جیاوازی لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کەشەعبی لەکاری باوکی ئەیووب گومانی هەیە کەئایا ڕۆشتبوو یا نە چوونکە دایکی سەلمە دوای سەفین ئەوی بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب نارد، بەهەرحاڵ کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەنەهرەوان بوو، ڕۆشتە لای.

سەعید کوڕی زەید دەڵێت: هەرگیز چوار لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) پێکەوە کۆنەبوونەوە تا بۆ خەڵکان ببنە هۆکاری خێر مەگەر ئەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب یەکێك بووبێت لەوان. کاتێك زیاد کوڕی حەنزەلە بینی، خەڵکان لەهاوکاری کردنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب خۆیان بەدوور دەگرن، ڕۆشتە لای و وتی: هەرکەس خۆی لەتۆ بەدوور بگرێت، ئێمە لەگەڵ تۆداین و لەبەردەم تۆدا دەجەنگین. کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەکۆڵانەکانی مەدینەدا دەگەڕا، بیستی زێنەب کچی ئەبوسوفیان دەیوت: ستەملێکراوی ئێمە لای موزەممەمە و لای مەکحەلە.

دەڵێت: دەزانێت هیچ کام لەوان خوێنی ئەو نین.

تەڵحە دەڵێت: عوسمان لەمانگی زیحەججە، هەژدەی ئەو مانگە، کوژرا. لەو کاتەدا کارگوزاری مەککە عەبدوللە کوڕی عامری حەزرەمی بوو. سەرەپەرەستی حەج عەبدوللە کوڕی عەباس چوونکە کاتێك عوسمان کوڕی عەفان گەمارۆی خرایەسەر، ئەوی ڕەوانە کرد. خەڵکان پەلەیان کرد و لەماوەی دوو ڕۆژدا خۆیان گەیاندە مەککە و لەگەڵ کوڕی عەباس حەجیان کرد و دوای کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان و بەیعەت بەستن لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕانەوە بۆ مەدینە. مناڵەکانی ئومەییە هەلاتن و ڕوویان لەمەککە کرد. بەیعەت کردن لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێنج ڕۆژ بۆ کۆتایی مانگی زیحەججە بوو. هەلاتووان لەمەککە فراوان بوون، عایشەی هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) لەوێ بوو، مەبەستی حەجی عەمرەی لەسەردا بوو و کاتێك هەلاتووان هاتنە مەککە، هەواڵەکانی لەوان پرسی، پێیان وت: عوسمان کوڕی عەفان کوژرا و کەس بەخەلافەت رازی نەبوو.

عایشە وتی: ئەوان وشیارن بەتایبەت دوای ئەو گفتوگۆیانەی سەبارەت بەئاشتی لەناو ئێوەدا لەئارادایە.

دەڵێت: کاتێك کۆتایی بەعەمرەکەی هێنا، بەرێکەوت و گەیشتە سێرف، یەکێك لەخزمەکانی ئەو لەتایەفەی مناڵەکانی لەیس بەناوی عوبەید کوڕی ئەبی سەلمە کەهاتوچۆی بنەماڵەی ئەبوبەکری دەکرد، چاوی پێی کەوت و وتی: دەنگ و باس چییە؟

ئەو بێدەنگ و منگە منگی کرد.

عایشە وتی: هاوار، خوایە تۆبە، لەبەرژەوەندی ئێمەدایە یا زیانی ئێمە؟

وتی: نازانی، عوسمان کوڕی عەفان کوژرا و هەشت ڕۆژ مانەوە.

وتی: دووای چییان کرد؟

وتی: خەڵکانی مەدینەیان ناچار کرد لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەت ببەستن چوونکە ئەو خەڵکە بەسەر مەدینەدا زاڵ بوون.

عایشە بۆ مەککە گەڕایەوە، هیچی نەدەوت و کەس نەیدەتوانی هەست بەهیچ بکات تا ئەو کاتەی لەبەردەرگای مسجد الحرام دەرکەوت و ڕووی کردە حوجر و لەوێ جێگەی گرت. کاتێك خەڵکان کۆبوونەوە، قسەی کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، ئاژاوەچییەکانی ویلایەتەکان و بەدەوییەکان و بەندەکانی دانیشتووی مەدینە

کۆبوونەتەوە، رەخنەی لە عوسمان کوڕی عەففانیان دەگرت، لێدانی کەسان بوو و کار کردن بەگەنجەکان چوونکە پێشتر کاریان بەپیاوە بەتەمەنەکان دەکردو دەستەیەك لەشوێنەکان کەتایبەتی کردبوو، ئەم کارانە پێشینەی هەیە و لەبەرژەوەندی خەڵکاندا بوو، بەلاًم چاوپۆشی لەوان کرد تا بۆ رێگەی راستیان بگەڕێنێتەوە و کاتێك هیچ بەڵگە و پاساوێکیان دەستنەکەوت، کەوتنە جموجۆڵ و دەستدرێژییان کردەسەر کردەوەکانیان دوور بوو لەوتەکانیان و خوێنی حەرام و نارەوایان ڕشت و رێزی شاری حەرامیان شکاند و ماڵی حەرامیان کۆکردەوە و رێزی مانگی حەرامیان نەگرت. سوێند بەخوا یەك پەنجەی عوسمان کوڕی عەففان لەهەموو کەسانی هاوشێوەی ئەوان باشتر بوو. دەبێت کۆببنەوە تا ئەم خەڵکانە دوور بکەنەوە و بڵاوەیان پێ بکەن. سوێند بەخوا ئەگەر ئەو کارانەی بەهۆیەوە رەخنەیان لە عوسمان کوڕی عەففان دەگرت، گوناح بوو، لەو گوناحانە پاك بوویەوە بەهەمان شێوە کەزێر لەپیسی پاك دەبێتەوە و جل و بەرگ لەچڵك، ئەویان پاك کردەوە بەهەمان شێوە کەجل و بەرگ بەئاو پاك دەبێتەوە.

عەبدوللە کوڕی حەزرەمی وتی: هەنووکە یەکەم کەسم داوای خوێنی ئەو دەکەم. ئەو یەکەم کەس بوو رازی و ئامادەیی خۆی نیشاندا.

عوبەید کوڕی عەمرۆ قورەشی دەڵێت: عوسمان کوڕی عەففان گەمارۆی خرابوویە سەر کەعایشە بەرێکەوت، لەمەککە کەسێك بەناوی ئەخزەر ڕۆشتە لای و لێی پرسی: خەڵکان چییان کرد؟

وتی: عوسمان کوڕی عەففان میسرییەکانی کوشت.

وتی: انا لله و انا الیه راجعوان، ئەو خەڵکانەی بۆ سەندنی مافەکانیان روو لەمەدینە بکەن، دەیانکوژن، ئێمە بەمە رازی نابین.

دەڵێت: کەسێکی دیکە هات و عایشە پرسی: خەڵکان چییان کرد؟ وتی: خەڵکانی میسر عوسمان کوڕی عەففانیان کوشت.

وتی: سەیرە ئەخزەر گومانی دەکرد کوژراو بکوژە. و ئەمە بوو بەپەند: درۆزنتر لەئەخزەر.

شەعبی دەڵێت: دوای کوژرانی عوسمان کوڕی عەففان، عایشە لەمەککەوە بەرەو

مەدینە بەرێکەوت. یەکێك لەخزمەکانی لەرێگەی ئەوی بینی، دایکی باوەڕداران پرسی: دەنگ و باس چییە؟

وتی: عوسمان کوڕی عەفان کوژرا و خەڵکان عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان وەك خەلیفە هەڵبژارد و هەنووکە دەسەلاّت لەدەست ئاژاوەچییەکاندایە.

وتی: گومانم نییە، ئەمە راست بێت، بۆ مەککە بگەڕێنەوە.

دەڵێت: دایکی باوەڕداران بەرەو مەککە گەڕایەوە و کاتێك گەیشتە شارەکە، عەبدوللە کوڕی حەزرەمی کارگوزاری مەککە هات و وتی: ئەی دایکی باوەڕداران بۆ گەڕایتەوە؟

وتی: بۆیە گەڕامەوە چوونکە عوسمان کوڕی عەفان بەناڕەوا کوژرا و تا ئەو کاتەی دەسەلاّت لەدەستی ئاژاوەچییەکاندا بێت، ئەم کارە سامان نادرێت، بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان ئالاّی شۆڕش بەرز بکەنەوە و رێز لەئیسلام بگرن.

دەڵێت: یەکەم کەس کەبەدواکارییەکەی رازی بوو، عەبدوللە کوڕی حەزرەمی بوو، ئەمە یەکەم جار بوو منداڵەکانی ئومەیە لەحیجاز قسەیان کرد و سەریان بەرز کردەوە. عەبدوللە کوڕی عامر لەبەسرەوە هات و یەعلی کوڕی ئومەییە لەیەمەن و تەڵحە و زوبەیر لەمەدینەوە روویان لەمەککە کرد. دوای ئەوەی ماوەیەك لێکۆڵینەوەیان لەبارودۆخی خۆیان کرد بڕیاریاندا رووبکەنە بەسرە.

عایشە وتی: ئەی خەڵکینە، کارەساتێکی گەورەیە و کارێك نەشیاو بۆ بەخشین، روو بکەنە بەسرە بۆ لای براکانی خۆتان و دژی ئەوان بجەنگن، خواوەند خەڵکانی شامی ئامادە کردووە، ئەگەری هەیە خواوەند تۆڵەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان و موسوڵمانان بستێنێت.

تەڵحە دەڵێت: یەکەم کەسان بەمپێشنیارە رازی بوون، عەبدوللە کوڕی عامری حەزرەمی و منداڵەکانی ئومەییە بوون کەدوای کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان، شوێن دایکی باوەڕداران کەوتن. دووای ئەوە عەبدوللە کوڕی عامر هات، دوای ئەو یەعلی کوڕی ئومەییە و لەمەککە پەیوەستی یەك بوون، یەعلی سێسەد وشتر و سێسەد هەزاری پێبوو، لەئەبتەح ئوردووی لێدا، تەڵحە و زوبەیریش پەیوەستیان بوون و کاتێك دایکی باوەڕدارانیان بینی، وتی/ باس و خواس چییە؟

وتیان: لەدەستی ئاژاوەچییەکان و بەدەوییەکانی مەدینە هەڵاتین. لەخەڵکانێك جیابووینەوە سەرگەردان بوون، نەراستییەکان دەناسن و نە لەناڕاستییەکان خۆیان بەدوور دەگرن.

وتی: ڕێگە چارەیەك بدۆزنەوە و دژی ئەم ئاژاوەچییانە بجەنگن.

لەکاتی گفتوگۆ باسی شامیان کرد، عەبدوللە کوڕی عامر وتی: معاویە دەستی بەسەر ئەو ناوچەدا گرتووە.

تەڵحە و زوبەیر وتیان: کەواتە دەبێت بۆ کوێ بڕۆین؟

وتی: بەسرە، پیاوەکانی من لەوێن و خەڵکانی ئەو شارە خوازیاری خەلافە تی تەڵحەن.

وتیان: خواوەند روخسارت قێزەون بکات چوونکە نەئاشتی خوازی نەجەنگاوەر، بۆ تۆیش هاوشێوەی معاویە لەشوێنەکەی خۆت نەمایتەوە تا دەسەڵاتت بەسەر ئەو شارەدا بگرتایە، ئەوسا ئێمەیش روومان لەکوفە دەکرت و ڕێگەمان لەو دەستەیە دەگرت.

بەڵام عەبدوللە کوڕی عامر وەڵامی راستی نەدانەوە، کاتێك بڕیاریاندا روو لەبەسرە بکەن، وتی: ئەی دایکی باوەڕداران، چاو لەمەدینە بپۆشە، کەسانی ئێمە لەو شارە ناتوانن رووبەرووی ئاژاوەچییەکان ببنەوە، لەگەڵ ئێمە بۆ بەسرە وەرە چوونکە دەڕۆینە ویلایەتێکی بێ خاوەن و ئەگەر باسی بەیعەت لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بکەن، ئەوان بۆ شۆڕش ناچار دەکەیت و دواتر خۆت لەو شارە نیشتەجێ دەبیت. ئەگەر خواوەند کاروبارەکانی ساماندا بەو شێوەیە کەدەخوازیت و گەرنە خۆڕاگری دەکەینە پیشە تا خواوەند فەرمانەکانی خۆی ڕەوانە بکات.

دەڵێت: کاتێك ئەم پێشنیارەیان کرد و کارەکەیان بێ ئەو ئەنجامی نەبوو، وتی: رازیم. هاوسەرەکانی پێغەمبەر(د.خ) هاورێیەتیان دەکرد و مەبەستی گەڕانەوە بۆ مەدینەیان کرد و کاتێك بۆچوونی گۆڕا و مەبەستی ڕۆشتن بۆ بەسرەی کرد، ئەوان لەم کارە چاوپۆشییان کرد. دوای ئەوە خەڵکان ڕۆشتنە لای حەفسە کەدەیوت: بۆچوونی من هاوشێوەی بۆچوونی عایشەیە.

کاتێك ویستیان بەرێکەون، وتیان: چۆن بەرێکەوین لەکاتێکدا سامانمان پێ نییە

تا خەڵکانی پێ ئامادە بکەین؟

یەعلی کوڕی ئومەییە وتی: من شەشسەد هەزار و شەشسەد وشترم پێیە، سواریان بن.

کوڕی عامر وتی: منیش فلانە و فیسارەم هەیە. بەمشێوەیە خۆیان تەیار کرد.

جارچی جاریدا: دایکی باوەڕداران و تەڵحە و زوبەیر بەرەو بەسرە دەڕۆن، هەرکەس دەخوازێت بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و شەڕ لەگەڵ ئاژاوەچییەکان و تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان بەرێکەوێت و چوارپێ و کەرەستەی نییە، ئەوە چوارپێ و خەرجی. شەسەد کەسیان سوار شەشسەد وشتر کرد جگە لەو کەسانەی خۆیان چوارپێیان بوو. ژمارەیان گەیشتە هەزار کەس، کەرەستەکانی جەنگیان ئامادە کرد و بەرێکەوتن.

دەڵێت: حەفسەی هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) مەبەستی ڕۆشتنی کرد بەڵام عەبدوللە کوڕی عومەر ڕۆشتە لای و وتی لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە و مایەوە. ئەو کەسی بۆ لای عایشە نارد و وتی عەبدوللە ڕێگەی نەدام لەگەڵ ئێوە بێم.

عایشە وتی: خواوەند عەبدوللە ببەخشێت.

دەڵێت: دایکی فەزل کچی حارس یەکێك لەخەڵکانی جوهەینە بەناوی زەفەری ئاگادار کردەوە تا بەپەلە بڕوات و نامەکەی بەدەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بگەیێنێت. ئەو بەرێکەوت و نامەکەی دایکی فەزلی گەیاندە مەدینە.

عەبدولرەحمان کوڕی عومرە لەباوکی دەگێڕێتەوە: باوکی قتادە بەعەلی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، پێغەمبەر(د.خ) ئەم شمشێرەی بەمن بەخشی، کردمە کالان و لەکالاندا مایەوە، هەنووکە کاتی ئەوە هاتووە لەگەڵ ئەو خەڵکە ستەمگەری دژی موسوڵمانان وەستاونەتەوە، لەکالان دەربێت، ئەگەر دەخوازی لەگەڵ خۆت بمبە.

دەڵێت: باوکی سەلمەیش هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر نافەرمانی خواوەند نەدەبوو و ڕازی دەبووی هاوڕێتیم دەکردیت. کوڕەکەم عومەر کەسوێند بەخوا لەگیانم ئازیزترە هاوڕێیەتی تۆ دەکات تا لەجەنگەکاندا بەشدار بێت.

دەڵێت: عومەر لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرێکەوت و بەردەوام لەگەڵی بوو.

عەلی ئەوی کردە کارگوزاری بەحرەین، دواتر لەسەر کار لایبرد و نەعمان کوڕی عیجلانی زورەقی لەوێ دانا.

عەوف دەڵێت: یەعلی کوڕی ئومەییە چوارسەد هەزار هاوکاری زوبەیری کرد و چوارپێی بەحەفتا کەس لەقورەیشییەکاندا. عایشەی سوار وشترێك کرد بەناوی عەسکەر کە بەهەشتا دینار کڕیبووی. کاتێك بەرێکەوتن، عەبدوللە کوڕی زوبەیر سەیری کەعبەی کرد و وتی: هەرگیز هاوشێوەی تۆم نەبینیوە هۆکاری خێر و هەڵاتن لەشەڕ بێت.

محەممەد دەڵێت: موغەیرە و سەعد کوڕی عاس تا یەك مەنزڵ دوور لەمەککە هاورێیەتی ئەوانیان کرد. دواتر سەعید بەموغەیرەی وت: بۆچوونی راست چییە؟

موغەیرە وتی: بۆچوونی راست خۆ دوورخستنەوەیە چوونکە کارەکەیان هیچ سەرئەنجامێکی نییە ئەگەر خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشی، دەڕۆینە لای ودەڵێین دڵمان لەگەڵ تۆدا بوو. خۆیان جیا کردەوە و نەڕۆشتن. سەعید گەڕایەوە بۆ مەککە و لەوێ مایەوە. عەبدوللە کوڕی خالید کوڕی ئەسید لەگەڵ ئەوان گەڕایەوە.

زوهری دەڵێت: تەڵحە و زوبەیر چوار مانگ دوای کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان روویان لەمەککە کرد، لەو کاتەدا کوڕی عامر بەردەوام هەوڵی دەدا. یەعلی کوڕی ئومەییە لەگەڵ سامانێکی زۆر و چوارسەد وشتر رووی لەمەککە کرد. هەموویان لەماڵی دایکی باوەڕداران کۆبوونەوە و وتیان: هێرش دەکەینە سەر عەلی و دەجەنگین.

یەکیان وتی: ئێوە ناتوانن لەبەرابەر خەڵکانی مەدینە خۆڕاگری بکەن، بەرەو بەسرە و کوفە دەڕۆین چوونکە تەڵحە لەکوفە و زوبەیر لەبەسرە شوێنکەوتەی زۆریان هەیە.

دەڵێت: رێککەوتن لەسەر ئەوەی روو لەبەسرە و کوفە بکەن. عەبدوللە کوڕی عامر سامان و وشتری زۆری خستنە بەردەست. لەگەڵ حەوتسەد کەس لەخەڵکانی مەککە و مەدینە بەرێکەوتن. خەڵکانی دیکە پەیوەستیان بوون و ژمارەیان گەیشتە سێ هەزار کەس.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبەرێکەوتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە، سەهل کوڕی

حەنیفی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دەستنیشان کرد و رووی کردە زیقار. هەشت رۆژە گەیشتە ئەو ناوچەیە و دەستەیەك لەخەڵکانی مەدینە هاورێیەتیان دەکرد.

عەلقەمە کوڕی وەقاسی لەیسی دەڵێت: کاتێك تەڵحە و زوبەیر و دایکی باوەڕداران بەرێکەوتن، لەزات عەرەق بەناو خەڵکاندا گەڕان. عوروە کوڕی زوبەیر و ئەبوبەکر کوڕی عەبدولرەحمانیان بەمناڵ زانی وئەوانیان گەڕاندەوە.

عوقبە کوڕی موغەیرە کوڕی ئەخنەس دەڵێت: سەعید کوڕی عاس مەروان کوڕی حەکەم و هاوەڵانی ئەوی لەزات عەرەق بینی و وتی: بۆ کوێ دەڕۆن، خوێنی ئێوە لەسەر پشتی وشترەکانە، بیانگەڕێننەوە بۆ ماڵەکانتان و خۆتان بەکوشتن مەدەن.

وتیان: دەڕۆین ئەگەری هەیە هەموو بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان بکوژین.

دەڵێت: سەعید بەتەنیا لەگەڵ تەڵحە و زوبەیر دانیشت و وتی: ئەگەر سەرکەوتنتان بەدەست هێنا، خەلافەت بەکێ دەسپێرن؟ راستییەکەی بەمن بڵێن.

وتیان: یەکێك لەئێمە دووانە، هەرکام موسوڵمانان هەڵیبژێرن.

وتی: باشترە خەلافەت بەمناڵەکانی عوسمان کوڕی عەفان بسپێرن چوونکە داوای خوێنی ئەو دەکەن.

وتیان: پیرەکانی موهاجیر پشتگوێ بخەین و خەلافەت بەمناڵەکانی ئەوان بسپێرین.

وتی: مەگەر نابینن هەوڵ دەدەم خەلافەت لەدەست مناڵەکانی عەبدمەناف دەربێنم؟ ئەمەی وت و گەڕایەوە. عەبدوللە کوڕی خالید کوڕی ئەسید لەگەڵ ئەو گەڕایەوە.

دەڵێت: موغەیرە بەشوعبەی وت: بۆچوونەکەی سەعید راست بوو، هەرکەس لەسەقەفییەکان لێرەیە، بگەڕێتەوە. خۆی گەڕایەوە.

خەڵکان بەرێکەوتن، ئەبان کوڕی عوسمان و وەلید کوڕی عوسمان لەناویاندا دەبینران. لەرێگەدا کێشەیان بۆ دروست بوو و وتیان: بەناوی کێ پێشنیار بەخەڵکان بکەین.

زوبەیر لەگەڵ عەبدوللەی کوڕی کۆبوویەوە، تەڵحە لەگەڵ عەلقەمە کوڕی وەقاسی لەیسی کۆبوویەوە چوونکە ئەوی پێش مناڵەکانی خۆی دەخست. یەکیان وتی:

بەرەو شام برۆ. ئەوی دیکە وتی: بەرەو عێراق برۆ. هەرکام بەشێوەیەك توند لەگەڵ ئەوی دیکە ئاخاوت. دواتر لەسەر بەسرە رێککەوتن.

ئەغور دەڵێت: کاتێك منداڵەکانی ئومەییە و یەعلی کوڕی ئومەییە و تەڵحە و زوبەیر لەمەککە کۆبوونەوە، راوێژیان کرد و بڕیاریاندا بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان و کوشتنی سەبەئییەکان بکەونە جموجۆڵ و تۆڵە بستێننەوە. دایکی باوەڕداران وتی: روو بکەنە مەدینە. بەڵام لەسەر بەسرە رێککەوتن و بۆچوونی عایشەیان گۆڕی.

تەڵحە و زوبەیر پێیان وت: ئەو شارە سەرزەمینێکە لەسنووری دەسەڵاتی عەلی کوڕی ئەبی تالیبدایە، ئەو ئێمەی ناچار کرد بەیعەتی لەگەڵ ببەستین، ئەمە دەکەنە بەڵگە و پشتگوێمان دەخەن مەگەر ئەوەی بڕۆیتە ئەو شارە و خەڵکانی مەدینە دژی عەلی کوڕی ئەبی تالیب هان بدەیت و بگەرێیتەوە.

دەڵێت: کەسێك جاڕیدا عایشەی دایکی باوەڕداران مەبەستی ڕۆشتن بۆ بەسرەی کردووە بەڵام بەم شەشسەد وشترە ناتوانرێت هێرش بکرێتە سەر ئاژاوەچییەکان و بەدەوی و کۆیلەکان. چوونکە لەهەموو شوێنێکدا بڵاو بوونەتەوە و دەستیان بەسەر هەموو ناوچەکاندا گرتووە.

دایکی باوەڕداران کەسی بۆ لای حەفسە نارد کەدەیویست بەرێکەوێت بەڵام کوڕی عومەر سوێندیدا و پەشیمانی کردەوە. تەڵحە و زوبەیر هاورێیەتیان دەکرد. عەبدوللە کوڕی عەتاب کوڕی ئەسیدی بۆ پێشنوێژی کردنی خەڵکان راسپارد کە لەرێگەی بەسرە پێشنوێژی بۆ خەڵکان دەکرد تا ئەو کاتەی کوژرا. مەروان و منداڵەکانی ئومەییە لەگەڵ عایشە بەرێکەوتن جگە لەوانەی ترسان. عایشە لەئەوتاسەوە رووی کردە لای راست. هاوەڵانی ئەو شەشسەد سوار بوون جگە لەوانەی چوارپێی خۆیان هێنابوو. شەوانە رێگەکەی بۆ لای راست گۆڕی. دەتوت کاروانی خواردەمەنییە کە لەنزیك بەستێنەوە گوزەری دەکرد. کەس لەوان لەمەنکەدەر و واست و فەلەج نزیك نەکەوتەوە تا گەیشتنە بەسرە. ساڵێکی بەپیت و داهات بوو.

کوڕی عەباس دەڵێت: هاوەڵانی دایکی باوەڕداران شەشسەد کەس بوون و

بەرێکەوتن. عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر و عەبدوللە کوڕی سەفوانی جومەحی لەناویاندا دەبینران. کاتێك لەچاڵی مەیمون گوزەریان کرد وشترێکی کوژراویان بینی و خوێنەکەی دەپرژا. بەشێوەیەکی خراپ لێکدانەوەیان بۆ ئەم دیمەنەکرد.

ئەو کاتەی مەروان لەمەککەوە بەرێکەوت بانگیدا. دواتر هات و لای تەڵحە و زوبەیر وەستا و وتی: بۆ کامتان وەك خەلیفە سلاو بنێرم و بەناوی کێیتانەوە بانگ بڵێم.

عەبدوللە کوڕی زوبەیر وتی: بۆ باوکی عەبدوللە.

محەممەد کوڕی تەڵحە وتی: بۆ باوکی محەممەد.

دەڵێت: عایشە کەسی بۆ لای مەروان نارد و وتی: چی دەکەیت؟ دەتەوێت دووبەرەکی لەناو ئێمەدا بێتە ئاراوە؟ خوشکەزاکەی من ببێتە پێشنوێژی خەڵکان.

عەبدوللە کوڕی زوبەیر پێشنوێی بۆ خەڵکان کرد تا ئەو کاتەی گەیشتنە بەسرە. مەعاز کوڕی عەبدوللە دەیوت: سوێند بەخوا ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنین گرفتاری فیتنە و ئاژاوە دەبین چوونکە زوبەیر خەلافەت بەتەڵحە ناسپێرێت و تەڵحەیش بەهەمان شێوە.

## بەرێکەوتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لە رەبزەوە بەمەبەستی بەسرە

قاسم کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمەبەستەکەی تەڵحە و زوبەیر و دایکی باوەڕداران ئاگادار بوویەوە، کوڕی عەباسی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا و قیسەم کوڕی عەباسی بەرەو مەککە نارد و خۆی بەرێکەوت و هیوادار بوو لەرێگەدا ئەوان بگرێت. دەیویست رێگەیان لێبگرێت بەڵام لەرەبزە بۆی دەرکەوت ئەوان دوور کەوتوونەتەوە. عەتا کوڕی رەباب موالی حارس کوڕی حوزن ئەم هەواڵەی بۆ هێنا.

محەممەد دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمەدینە بوو کاتێك هەواڵی بۆ هات تەڵحە و زوبەیر وعایشە و هاوەڵانی بڕیاریانداوە بەرەو بەسرە بەرێکەون. لەوتەکانی عایشەی دایکی باوەڕداران ئاگادار بوویەوە و بەهەمان سوپا کە بۆ بەرێکەوتن بەرەو شام ئامادەی کردبوو، بەرێکەوت تا رێگەیان لێ بگرێت. دەستەیەك لەخەڵکانی کوفە

و میسریش بارسووك لەگەڵی بەرێکەوتن. ژمارەیان حەوتسەد کەس بوو. هیوادار بوو لەرێگەدا بیانگرێت و لەمەبەستەکەیان دووریان بخاتەوە.

دەڵێت: عەبدوللە کوڕی سەلام پێیگەیشتەوە، جڵەوی ئەسپەکەی گرت و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، مەدینە بەجێمەهێڵە، سوێند بەخوا ئەگەر بڕۆیت چیتر ناگەڕێیتەوە و چیتر دەسەلاتی موسوڵمانان بۆ ئەم شارە ناگەڕێتەوە.

خەڵکان ئیهانەیان کرد بەلاّم عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: کارتان پێی نەبێت چوونکە یەکێکە لەچاکەکاری هاوەڵی پێغەمبەر(د.خ) .

بەرێکەوت تا گەیشتە رەبزە و لەڕۆشتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە. کاتێك ئەوانی نەبینی، لەرەبزە مایەوە و راوێژی کرد.

تارق کوڕی شەهاب دەڵێت: کاتێك هەواڵی کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان بلاّوبوویەوە، لەکوفەوە بەمەبەستی حەجی عەمرە بەرێکەوتن و کاتێك گەیشتینە رەبزە، لەکاتی بەرەبەیاندا، بینیمان هاورێکانمان پێش یەك دەکەون. وتم: چی روویداوە؟

وتیان: عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

وتم: چی بووە؟

وتیان: تەڵحە و زوبەیر ئالاّی دژایەتی کردنیان بەرز کردۆتەوە و ئەویش بەرێکەوتووە تا رێگەیان لێ بگرێت و ئاگادار بۆتەوە ڕۆشتوون و دەخوازێت بەدوایاندا بڕوات.

وتم: انا لله و انا الیه راجعون. پەیوەستی ببم و شان بەشانی ئەم پیاوە شەڕی ئەو دووانەی دیکە بکەم یا دژایەتی نەکەم؟ کارێکی دژوارە.

دەڵێت: ئەو ڕۆژە ڕۆشتمە لای، بۆ نوێژی بەیانی ریزیان بەست. عەلی کوڕی ئەبی تالیب هات و نوێژیان خوێند و کاتێك ڕۆشت، حەسەنی کوڕی هات و دانیشت، وتی: پێم وتیت بەلاّم گوێت نەگرت، بەیانی دەکەویتە گێژاوە و کەس هاوکاریت ناکات.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بەردەوام هاوشێوەی ژنەکان دەبۆڵێنیت، چیت وت گوێم لێ نەگرتیت؟

وتی: کاتێك گەمارۆیان خستە سەر عوسمان کوڕی عەفان، پێم وتیت لەمەدینە بڕۆیت تا لەکاتی کوشتنەکەی لەوێ نەبیت. دوای ئەو ڕۆژەی کەکوژرا، پێم وتی بەیعەت نەکەیت تا ئەو کاتەی نێردراوی هۆز و ویلایەتەکان دێن و لەبەیعەتی خەڵکان ئاگادارت دەکەنەوە. کاتێك لەمەبەستی ئەو دوو پیاوە ئاگادار بوویتەوە، پێم وتیت لەماڵەکەت بمێنیتەوە تا پەشیمان ببنەوە و ئەگەر خراپەکاری هاتە ئاراوە لەسەر دەستی کەسێکی دیکە بێت، بەڵام گوێت لەوتەکانی من نەگرت.

وتی: کوڕی خۆم، ئەوەی دەڵێی کاتێك گەمارۆیان خستە سەر عوسمان کوڕی عەفان، دەبوا لەمەدینە بڕۆشتمایە، سوێند بەخوا هاوشێوەی عوسمان کوڕی عەفان گەمارۆیان خستە سەر ئێمەیش، بەڵام ئەوەی دەڵێی نەدەبوا بەیعەت بکەم تا ئەو کاتەی بەیعەتی شار و ویلاتەکان دەهات، ئەم کارە لەدەستی خەڵکانی مەدینەدا بوو و نەمویست ئەم کارە بەفیڕۆ بڕوات، ئەوەی سەبارەت بەکردەوەکانی تەڵحە و زوبەیر باسی دەکەیت، ئەمە بۆ موسوڵمانان گومانێك بوو، سوێند بەخوا لەو کاتەوەی بوومەتە خەلیفە، بەردەوام بەسەر مندا زاڵ بوون و دەسەڵات لەدەستی خۆمدا نەبووە، ئەوەی دەڵێی دەبوا لەماڵەوە دانیشم، چۆن دەمتوانی وەڵامی خۆم و ئەو خەڵکانەی ڕوویان لەماڵەکەم دەکرد، بدەمەوە؟ دەتویست هاوشێوەی کەمتیار بم تا گەمارۆم بخەنەسەر و بڵێن، بوونی نییە، بوونی نییە، لێرە نییە، تا ئەو کاتەی قاچەکانی ببەستنەوە و بیکێشنەدەر. ئەگەر من لێکۆڵینەوە لەکاروبارەکانی تایبەت بەخەلافەت نەکەم، کێ ئەو کارە دەکات، کوڕی خۆم تەواوی کە.

## کڕینی وشتر بۆ عایشە و گێڕانەوەی بەسەرهاتی سەگەکانی حوئەب

عورنی وشتردار دەڵێت: سوار لەسەر وشترێك دەڕۆشتم، سوارکارێك سەرە ڕێگەی لێگرتم و وتی: ئەی وشتردار، وشترەکەت دەفرۆشیت؟

وتم: بەڵێ.

وتی: بەچەند؟

وتم: هەزار درەم.

وتی: شێت بوویت، هیچ وشترێك هەیە بەهاکەی هەزار درەم بێت؟

وتم: بەڵێ، وشترەکەی من.

وتی: بۆ؟

وتم: لەبەر ئەوەی هیچ کات سوار لەسەر ئەم وشترە شوێن کەسێك نەکەوتووم کە پێی نەگەمەوە، کاتێك سوار لەسەر ئەم وشترە بووم، کەس نەیتوانیوە بمگرێت.

وتی: ئەگەر بزانیت، ئەو وشترەمان بۆ کێ دەوێت، بەهاکەی دێنیتەخوار.

وتم: بۆ کێت دەوێت؟

وتی: بۆ دایکت.

وتم: دایکم لەماڵەوەیە و مەبەستی سەفەر کردنی نییە.

وتی: بۆ عایشەی دایکی باوەڕدارانم دەوێت.

وتم: بۆ تۆ، بەهاکەیم ناوێت.

وتی: نا، لەگەڵ ئێمە بۆ ناو کاروانەکە وەرە تا وشترێك بەتۆ بدەین و بەهاکەی زیاد بکەین.

دەڵێت: گەڕامەوە و وشترەکەی عایشەیان بەمندا لەگەڵ چوارسەد یا شەشسەد درەم.

پێی وتم: ئەی برای عورنی، شارەزای ڕێگەیت؟

وتم: بەڵێ، لەهەمووان زیاتر شارەزام.

وتی: کەواتە ڕێگەمان نیشان بدە.

دەڵێت: لەگەڵ ئەوان بەرێکەوتم و دەگەشتینە هەر دۆڵ و ئاوێك، پرسیاریان دەکرد تا ئەوەی گەیشتینە ئاوی حوئەب و سەگەکانی ئەوێ، دەستیان بەوەڕین کرد.

وتیان: ئەمە چ ئاوێکە؟

وتم: ئاوی حوئەب.

دەڵێت: عایشە بەدەنگی بەرز هاواری کرد، لەشانی وشترەکەی خۆیدا و خەوت، وتی: سوێند بەخوا بەسەرهاتی سەگەکانی حوئەب تایبەتە بەمن، بگەڕێنەوە. سێ جار وتەکەی دووبارە کردەوە.

دەڵێت: وشترەکەی خەوت و ئەوانیش لەدەوری وشترەکەی ئەو، وشترەکانیان

خەواند، بەمشێوەیە مانەوە. عایشە بەڕۆشتن رازی نەدەبوو تا رۆژی دواتر ئەو کاتەی وشترەکانیان خەواند.

دەڵێت: زوبەیر هات و وتی: هەڵبێن، هەڵبێن، سوێند بەخوا عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێتان گەیشتەوە.

دەڵێت: بەرێکەوتن و جوێنبارانی منیان کرد. گەڕامەوە. کەمێك بەرێگەدا ڕۆشتم کە عەلی کوڕی ئەبی تالیبم لەگەڵ سێسەد سوار بینی، پێی وتم: ئەی سوار، بەرەو لای ڕۆشتم و وتی: ئەو ژنەت لەکوێ بینی؟

وتم: لەفلانە شوێن و فیسارە شوێن، ئەمە وشترەکەی ئەوە بەمنە و من وشترەکەی خۆم پێفرۆشت.

وتی: سوار وشترەکە بوو؟

وتم: بەڵێ، من لەگەڵیان ڕۆشتم تا گەیشتینە ئاوەکەی حوئەب، سەگەکانی ئەوێ دەستیان بەوەڕین کرد و عایشە بەمشێوەیە قسەی کرد و کاتێك کاروبارەکانی ئەوانم بەئاڵۆز بینی، گەڕامەوە و ئەوان درێژەیان بەرێگەکەیاندا.

وتی: زوقار دەزانیت؟

وتم: لەهەمووان زیاتر شارەزام.

وتی: لەگەڵمان وەرە.

دەڵێت: بەرێکەوتین و لەزوقار دابەزین. عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی و دوو کیسەیان هێنا و لای یەك داینان. ئەوان کۆپانی وشترەکەیان هێنا و خستیانە سەر کیسەکان. عەلی کوڕی ئەبی تالیب هات و ڕۆشتەسەر، هەردوو قاچی لەم و لای کۆپانەکەوە شۆڕ کردەوە، ئەوسا سوپاسی خوای کرد و سڵاوتی بۆ محەممەد نارد، وتی: بینیتان ئەم خەڵکە و ئەم ژنە چییان کرد.

دەڵێت: حەسەن هەستا و دەستی بەگریان کرد.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: هاتوویت وەك ژنەکان بگریت؟

وتی: بەڵێ، پێم وتیت و گوێت لێ نەگرتم، ئێستا کەوتیتە ناو گێژاو و کەس هاوکاریت ناکات.

وتی: ئەو قسانەی بەمنی دەڵێیت، بۆ ئەو خەڵکەیش باسی بکە.

وتی: کاتێك گەمارۆیان خستە سەر عوسمان کوڕی عەفان، پێم وتی دەستی

بەیعەت بەکەس نەدەیت تا عەرەبەکان لێکۆڵینەوە لەکارەکانی خۆیان بکەن چوونکە بەبێ تۆ ناتوانن کۆتایی بەم کارە بێنن بەڵام رازی نەبوویت. کاتێك دایکی باوەڕداران بەرێکەوت و ئەم خەڵکە ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە، پێم وتیت لەمەدینە بمێنیتەوە و داوای هاوکاریت لەهاوەڵانت بکەیت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: سوێند بەخوا راست دەکات، بەڵام سوێند بەخوا هاوشێوەی کەمتیار نیم کەگوێ لەدەنگ بگرم، کاتێك پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دووای کرد، کەس لەئێوە لەمن زیاتر بۆ خەلافەت شیاوتر نەبوو، بەڵام خەڵکان لەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەتیان بەست، منیش هاوشێوەی ئەوان دەستی بەیعەتم درێژ کرد. ئەبوبەکر مرد و کەس لەمن بۆ خلافەت شیاوتر نەبوو بەڵام خەڵك بەیعەتیان لەگەڵ عومەر کوڕی خەتاب کرد و منیش هاوشێوەی ئەوان بەیعەتم کرد. عومەر کوڕی خەتاب مرد وکەس بۆ خەلافەت لەمن شیاوتر نەبوو بەڵام منی کردە یەکێك لەو شەش کەسە و دواتر خەڵکان لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان بەیعەتیان کرد، منیش هاوشێوەی ئەوان بەیعەتم کرد. خەڵکان گەمارۆیان خستە سەر عوسمان کوڕی عەفان و کوشتیان. ئەوسا لەدەوری من کۆبوونەوە تا بەدڵخواز بەیعەت لەگەڵ من بکەن و من لەگەڵ ئەو کەسانەی شوێنکەوتەی منن، لەگەڵ نەیارەکان دەجەنگم تا خواوەند لەنێوان ئێمە داوەری بکات چوونکە لەهەموو داوەرەکان باشترە.

### وتاری عایشە :

تۆڵەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان دەستێنمەوە

ڕۆشتنی ئەو بەرەو بەسرە لەگەڵ تەڵحە و زوبەیر

ئەسەد کوڕی عەبدوللە دەڵێت: کاتێك عایشە لەرێگەی گەڕانەوە لەمەککەوە گەیشتە سرف، عەبد کوڕی دایکی کەلاب کوڕی ئەبی سەلمەی بینی، وتی: دەنگ و باس چییە؟

وتی: عوسمان کوڕی عەفانیان کوشت و هەشت رۆژ مانەوە.

وتی: دواتر چییان کرد؟

وتی: خەڵکانی مەدینە رێککەوتن و کارەکەیان سەرئەنجامێکی باشی لێکەوتەوە

و عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان وەك خەلیفە هەڵبژارد.

وتی: ئەگەر خەلافەت بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەقامگیر ببێت، خۆزگە ئاسمان بکەوێتە خوار، بمگەڕێننەوە، بمگەڕێننەوە. بەرەو مەککە گەڕایەوە و بەردەوام دەیوت: سوێند بەخوا عوسمان کوڕی عەفان بەستەم کوژرا، سوێند بەخوا تۆڵەی ئەو دەستێنمەوە.

کوڕی دایکی کەلاب وتی: یەکەم کەس لەوتەکانی خۆی پەشیمان بوویەوە، تۆیت، تۆ بوویت دەتوت نەعسەل بکوژن چوونکە کافر بووە.،

کوڕی دایکی کەلاب سەبارەت بەعایشە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((سەرەتا لەتۆوە بوو، پەشیمان بوونەوەیش لەتۆ

با لەتۆوە بوو، بارانیش لەتۆ

تۆ وتت پیشەوا بکوژن

بەئێمەت وت کافر بووە

ئێمە بۆ کوشتنی ئەو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی تۆ بووین

بکوژی ئەو لای ئێمە کەسێکە کەفەرمانی پێداوین

بەڵام ئاسمان بەسەر ئێمەدا نەکەوتە خوار

و هەتاو و مانگ نەگیران

بەیعەتیان لەگەڵ کەسێك بەست کە

کاروبارەکان رێك دەخات

و کاروبارەکانی تایبەت بەجەنگ

کەسێك کەرێز لەپەیمانەکەی بگرێت

هاوشێوەی خیانەتکارەکان نییە.))

دەڵێت: عایشە گەڕایەوە بۆ مەککە و لەبەر دەرگای مزگەوتا دابەزی، بەرەو حیجر بەرێکەوت و لەوێ خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە. وتی: ئەی خەڵکینە، سوێند بەخوا عوسمان کوڕی عەفان بەستەم کوژرا، سوێند بەخوا تۆڵەی خوێنی ئەو دەستێنمەوە.

محەممەد دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب نیگەرانی مەبەستی ئەوان بوو و نەیدەزانی بەرەو کوێ دەڕۆن، دەیخواست رێگەی میسر بگرنەبەر و کاتێك دڵنیا بوویەوە لەوەی بەرەو بەسرە دەڕۆن، رازی بوو، وتی: پیاو و بنەماڵەکانی عەرەب

لەکوفەن.

کوڕی عەباس وتی: ئەوەی تۆی شادمان کردووە، من پەرێشان دەکات. کوفە خێوەتگەیێکە سەرکردەکانی عەرەب لەوێ کۆبوونەتەوە و توانای لەخۆگرتنی خەڵکانی نییە، بەردەوام کەسێك لەوێ دەژیت نیگەرانی شتێکە وپێی ناگات و ئەگەر بەم شێوە بێت دژی ئەو کەسەی بەدەستی هێناوە، ئاژاوە دەنێتەوە تا تێکی بشکێنێت.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بەوشێوەیە تۆ باسی دەکەیت، لەپێشی و ماف خەڵکانی شوێنکەوتە لەرووی پێشینەوەیە، ئەگەر خۆڕاگر بوون، دەیانبەخشین و قەرەبوویان بۆ دەکەینەوە، ئەگەر بەمە بەسەندەیان کرد، چاکەیان لەگەڵ دەکەین و ئەگەر نا، ناچارین ناچارییان بکەین و ئەمە بۆ ئەو کەسەی گرفتاری خراپە دەبێت، خراپە.

کوڕی عەباس وتی: تەنیا بەخۆڕاگری و رەزامەندی دەکرێت چارەسەری ئەم ئاریشەیە بکرێت.

سەیف دەڵێت: کاتێك تەڵحە و زوبەیر و دایکی باوەڕداران لەمەککە بڕیاریاندا بەرەو بەسرە بڕۆن و لەبکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان تۆڵە بستێننەوە، زوبەیر و تەڵحە ڕۆشتنە لای کوڕی عومەر و ویستیان هاورێیەتیان بکات.

کوڕی عومەر وتی:من یەکێك لەخەڵکانی مەدینەم، ئەگەر بڕیاریاندا ئاڵای شۆڕش بەرز بکەنەوە، منیش شان بەشانی ئەوان شۆڕش دەکەم وئەگەر بڕیاریاندا لەشوێنەکانی خۆیان بمێننەوە، منیش دەمێنمەوە. بەمشێوەیە لەو بێ هیوا بوون.

باوکی مەلیکە دەڵێت: کاتێك مەبەستی بەرێکەوتنیان کرد، زوبەیر کورەکانی خۆی کۆکردەوە و لەگەڵ دەستەیەکیان ماڵئاوایی ودەستەیەکیانی لەگەڵ خۆیان برد، دوو کوڕەکەی ئەسمای برد، وتی: فلان کەس بمێنەرەوە، عەمرۆ بمێنەرەوە.

کاتێك عەبدوللە کوڕی زوبەیر ئەمەی بینی، وتی: عورووە بمێنەرەوە، مونزەر بمێنەرەوە.

زوبەیر وتی: هاوار لەتۆ، دەمەوێت ئەو کوڕانە لەگەڵ خۆم ببەم کەکەڵکیان بۆم دەبێت.

وتی: ئەگەر هەموویان دەبەیت، بیانبە و ئەگەر کەسێك بەجێ دەهێڵیت، ئەم دووانەیش بەجێبێڵە و لەناو هاوسەرەکانی خۆت تەنیا ئەسما رووبەرووی مەترسی کوژرانی کوڕەکانی مەکەرەوە.

دەڵێت: زوبەیر دەستی بەگریان کرد. ئەو دووانەیشی بەجێهێشت. بەرێکەوتن و کاتێك گەیشتنە کێوەکانی ئەوتاس، لەلای راستەوە بەرەو بەسرە بەرێکەوتن و لەرێگەی چاوپۆششیان کرد و کاتێك نزیك کەوتنەوە و ڕۆشتنە ناو شارەکە، لەمونکەدەر گوزەریان کرد.

هەروەها باوکی مەلیکە لەگێڕانەوەیەکی دیکە دەڵێت: زوبەیر و تەڵحە بەرێکەوتن. دایکی باوەڕدارانیش بەرێکەوت و هاوسەرەکانیان بەدوای ئەوان تا زات عەرەق هاتن. کەس ڕۆژێکی نەبینیبوو کەپێشتر بۆ ئیسلام گریابێتن. ئەو ڕۆژەیان بەڕۆژی گریان ناوبرد. عایشە بە عەبدولرەحمان کوڕی عەتابی وت پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات چوونکە پیاوێکی چاکەکار بوو.

یەزید کوڕی مەعنی سولەمی دەڵێت: کاتێك ئوردووی دایکی باوەڕداران لەئەوتاسەوە بەرەو لای ڕاست بەرێکەوت، لای مەلیح کوڕی عەوف سولەمی گوزەریان کرد کە لەمڵکەکەی خۆیدا بوو، سڵاوی لەزوبەیر کردو وتی: ئەی باوکی عەبدوللە، چی روویداوە؟ وتی: هێرشیان کردە سەر سەروەری باوەڕداران و بێ هۆ خوێنیان ڕشت. وتی: کێ؟

وتی: ئاژاوەچییەکانی ویلایەتەکان و سەرسەرییەکان، بەدەوییەکان و کۆیلەکان و ئەوانەی پشتیوانییان لێ کردن؟

وتی: دەتانەوێت چی بکەن؟

وتی: خەڵکان هان دەدەین تا ئەو خوێنە بەفیڕۆ نەڕوات چوونکە بەفیڕۆچوونی دەبێتە هۆی ئەوەی دەسەڵاتی خواوەند لەناو ئێمەدا لاواز بێت و ئەگەر خەڵکان ئەو کەسانە پشتگوێ بخەن هیچ پێشەوایەك نامێنێتەوە مەگەر ئەوەی بەدەستی ئەوان بکوژرێت.

وتی: سوێند بەخوا ئازاد کردنی ئەمە مەترسیدارە و کەس نازانێت دەرئەنجامەکەی چی دەبێت.

دەڵێت:ماڵئاواییان لەیەك کرد و جوێ بوونەوە.

## گەشتنی سوپاکەی تەڵحە و زوبەیر بەبەسرە وجەنگ لەگەڵ عوسمان کوڕی حەنیف

محەممەد دەڵێت: کاتێك ڕێگەیان بڕی و گەیشتنە دەرەوەی بەسرە، عومەیر کوڕی عەبدوڵلەی تەمیمی ئەوانی بینی و وتی: ئەی دایکی باوەڕداران، سوێندت دەدەم مەڕۆ لای ئەو کەسانەی کەست بۆ ئامادە کردن و حازر کردنی ئەوان ڕەوانە نەکردووە.

وتی: بۆچوونەکەت پەسەندە و پیاوێکی خۆپارێزیت.

وتی: بەکوڕی عامر بڵێ بەخێرایی بڕوات تا لەبەسرە بڕواتە لای خەڵکان و سەردانیان بکات، دواتر تۆ بڕۆ تا بزانن بۆ چی هاتوویت.

عایشە کوڕی عامری ڕەوانە کرد و ئەو بەنهێنی ڕۆشتە ناو بەسرە. دایکی باوەڕداران نامەی بۆچەند لەسەر کردەکانی بەسرە نووسی. بۆ ئەحنەف کوڕی قەیس، سەبرە کوڕی شەیمان و کەسانی هاوشێوەی ئەوان. دواتر بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە حەفیر، چاوەڕوانی وەڵامەکان مایەوە.

کاتێك خەڵکانی بەسرە ئاگادار بوونەوە، عوسمان کوڕی حەنیف، عیمران کوڕی حوسەینی بانگ کرد و لەگەڵ باوکی ئەسوەدی دوئەلی ڕەوانەی کردن و وتی: بڕۆنە لای ئەو ژنە و بزانن مەبەستی خۆی و هاوەڵانی چییە.

ئەوان ڕۆشتن و لەحەفیر بەعایشە و هاوەڵانیان گەیشتنەوە و داوای مۆڵەتیان کرد. عایشە مۆڵەتی پێدان و ڕۆشتنە ژوور، سڵاویان کرد و وتیان: سەرکردەکەمان ئێمەی ڕەوانە کردووە تا لەهۆکاری هاتنت بپرسین، ئایا ئاگادارمان دەکەیتەوە؟

وتی: سوێند بەخوا کەسێکی هاوشێوەی من بۆ کارێکی نهێنی ناڕوات و هەواڵەکان لەمناڵەکانی خۆی ناشارێتەوە. ئاژاوەچییەکانی ویلایەتەکان هێرشیان کردە سەر حەرەمی پێغەمبەر(د.خ) و لەوێ چەندین کارەساتیان خولقاند و ئاژاوەچییەکانیان لەوێ کۆکردەوە وخۆیان خستە بەر نەحلەتی خوا و پێغەمبەر(د.خ) بەهۆی ئەوەی پێشەوای موسوڵمانانیان کوشت بێ ئەوە هۆکار یا قیساس لەئارادا بێت. خوێنی حەرامیان بەحەڵاڵ زانی و ماڵی حەرامیان تالان کرد.

ڕێزیان لەشاری حەرام و مانگی حەرام نەگرت، ڕێزی جەستە و موسوڵمانانیان نەگرت، لەماڵی کەسان بێ مۆڵەت وەرگرتن لەخۆیان نیشتەجێ بوون، ماڵی ئەو کەسانەی توانای بەرگری کردنیان نەبوو، زیانیان گەیاند و سوودیان نەبوو، لەخوا نەترسان، هاتووم تا خەڵکان لەکار و کردەوەی ئەو کەسانە ئاگادار بکەمەوە و ئەم ئایەی خوێندەوە:

((لاخیر فی کثیر من نجوا هم الامن امر بصدقة او معروف او اصلاح بین الناس.

واتاکەی: لەزۆری چپەچپەکانیان هیچ شتێك نییە مەگەر ئەوەی بەخێر کردنێك یا چاکە کردنێك یا چاکسازی لەنێوان خەڵکان فەرمان بدات.))

دەمانەوێت ئەو کەسانەی خواوەند فەرموویەتی و پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێداوە، لەگەورە و بچوك و ژن و پیاو بۆ چاکسازی هان بدەین، ئەمە کاری ئێمە و پێشنیاری چاکەکاریتان پێ دەکەین و لەخراپەکاری دوورتان دەخەینەوە و بۆ گۆڕانکاری هانتان دەدەین.

محەممەد دەڵێت: باوکی ئەسوەد و عیمران دایکی باوەڕدارانیان بەجێهێشت و ڕۆشتنە لای تەڵحە و وتیان: مەبەستی ئێوە لەهاتن چییە؟

وتی: بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان.

وتیان: مەگەر بەیعەتتان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نەبەست؟

وتی: بۆنا، بەڵام شمشێر لەسەر گەردنم بوو، ئەگەر عەلی کوڕی ئەبی تالیب نەبێتە لەمپەر لەنێوان ئێمە و بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان، خوازیاری لەسەر کار لابرانی ئەو نین.

ئەو دوو کەسە گەڕانەوە بۆ لای دایکی باوەڕداران و ماڵئاواییان لێکرد. عایشە ماڵئاوایی لەعیمران کرد و وتی: ئەی باوکی ئەسوەد، ئاگادار بە هەوەس تۆ بەرەو جەهەننەم نەبات، ئەم ئایەی خوێندەوە:

((کونوا قوامین لله شهدا بالقسط

واتاکەی: بۆ خواوەند شۆڕش بکەن و دادپەروەرانە شایەتی بدەن.))

ئەوانی ڕەوانە کرد و جارچییەکەی جاری بەڕێکەوتنیدا، ئەو دوو کەسە گەڕانەوە بۆ لای عوسمان کوڕی حەنیف، باوکی ئەسوەد پێش عیمران دەستی بەقسە کردن کرد و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەی باوکی حەنیف! ئەم خەڵکە بۆ دژایەتی کردن هاتوون

ڕووبەڕوویان ببەرەوە و خۆڕاگری بکەرە پیشە))

عوسمان وتی: انا لله و انا الیه راجعون، سوێند بەخوای کەعبە جەنگ لەناو موسوڵمانان سەری هەڵدا.

عیمران وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا بۆ ماوەیەکی دوور ودرێژ ئێوە دەکوتێت بەو رادەی شتێکی ئەوتۆ لەئێوە نامێنێتەوە.

عوسمان وتی: ئەی عیمران بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: من لەماڵەکەی خۆم دادەنیشم، تۆیش ئەو کارە بکە.

وتی: ڕێگەیان لێدەگرم تا سەروەری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبی تالیب بێت.

عیمران وتی: خواوەند چی پێخۆش بێت، ئەنجامی دەدات. گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی.

عوسمان سەرقاڵی ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی خۆی بوو، هوشام کوڕی عامر ڕۆشتە لای و وتی: ئەی عوسمان، ئەم کارەی تۆ دەبێتە هۆی جەنگ، ئەم دڕانە پینە ناکرێت و ئەم کەلێنە پڕ نابێتەوە، لەگەڵ ئەم کەسانە ڕێگەی سازگاری بگرەبەر تا ئەو کاتەی فەرمانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دێت و دژایەتی ئەوان مەکە.

بەڵام عوسمان رازی نەبوو، فەرمانی خۆئامادە کردنی بەکەسەکانیدا، سیلاحیان هەڵگرت و لەمزگەوت کۆبوونەوە، عوسمان هات و فێڵی کرد تا لەئەندێشە و بیری خەڵکان ئاگادار ببێتەوە و فەرمانی خۆ ئامادە کردنی پێدان. پیاوێکی کوفی قەیسی راسپارد کەڕۆشتە ناو خەڵکان و دەستی بەقسە کرد، وتی: ئەی خەڵکینە، من قەیس کوڕی عەقدییەی حەمیسیم، ئەم خەڵکە هێرشیان کردۆتە سەر ئێوە، ئەگەر لەترسا هاتوون، لەشوێنێکەوە هاتوون تەنانەت باڵندەکانیش ترسیان نییە، ئەگەر بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان هاتوون، ئێمە بکوژەکانی سەروەری باوەڕداران نین، سەبارەت بەوان گوێ لەبۆچوون و پێشنیارەکانی من بگرن و ناچاریان بکەن بۆ شارەکانیان بگەڕێنەوە.

ئەسوەد کوڕی سەریعی سەعدی هەستا و وتی: ئەوان دەزانن ئێمە بکوژی عوسمان کوڕی عەفان نین، هاتوون لەئێمە دژی بکوژەکانی عوسمان چ لێرە بن یا

لەشوێنێکی دیکە، هاوکاری وەربگرن، ئەگەر ئەم خەڵکە وەك باست کرد لەدیاری خۆیان دەرکراون، کێ دەبێت ڕێگە لەدەرکران و دوورخرانەوەی خەڵکان بگرێت؟

دەڵێت: خەڵکان ئەو کەسەیان بەردباران کرد. عوسمان کوڕی حەنیف هەستی کرد تەڵحە و زوبەیر و دایکی باوەڕداران لەبەسرە پشتیوان و هاودەستیان هەیە، خەمبار بوو.

عایشە و هاوەڵانیان هاتن و گەیشتنە مەربەد، لەوێ مانەوە تا ئەو کاتەی عوسمان و هاوەڵانی هاتن. لەخەڵکانی بەسرە ئەو کەسانەی خوازیار بوون، لەگەڵی ڕۆشتن و لەمەربەد کۆبوونەوە. بەردەوام خەڵك پەیوەستیان دەبوون تا ئەوەی مەربەد لێوانلێو بوو لەخەڵکان. تەڵحە لەلای ڕاستی مەربەد جێگیر ببوو، زوبەیریش هاوڕێیەتی دەکرد، عوسمان لای چەپ جێگیر ببوو. خەڵکان گوێیان لەتەڵحە دەگرت، ئەو، سوپاس و ستایشی خواوەندی دەهێنایە سەرزمان، باسی چاکی و لەپێشییەکانی عوسمان کوڕی عەفانی کرد و کوشتنی ئەوی بەقێزەون و ناڕەوا لەقەڵەمدا و خەڵکانی بۆ تۆڵەسەندنەوەی ئەو، هاندەدا، وتی: ئەم کارە، هێز بەدەسەڵات و دینی خواوەند دەدات چوونکە تۆڵەسەندنەوەی خوێنی خەلیفەی ستەملێکراو، پاراستنی سنوورەکانی خواوەندە، ئێوەیش ئەگەر ئەو کارە بکەن، چاکەتان کردووە و چاکەکەتان بۆ خۆتان دەگەڕێتەوە و ئەگەر ئەنجامی نەدەن، دەسەڵات نامێنێتەوە و سەقامگیر لەناو ئیسلامدا هەڵدەوەشێتەوە.

زوبەیریش هاوشێوەی ئەو وتەی هێنایە سەرزمان، ئەوانەی لای ڕاستی مەربەد جێگیر ببوون، وتیان: ڕاست و ڕەوایە، ڕاستیتان هێنایە سەرزمان و پێشنیاری ڕاستی چاکەکاری دەکەن.

ئەوانەی لای چەپ جێگیر ببوون، وتیان: خراپەکارییە و خیانەت، ناڕەواتان هێنایە سەرزمان و پێشنیاری ناڕەوا دەکەن، بەیعەتتان بەستووە و بەمشێوەیە دەدوێن. خەڵك یەکتریان بەردباران و خۆڵباران کرد و تەپ و تۆزیان بەرز کردەوە.

دایکی باوەڕداران قسەی کرد، دەنگێکی گەورەی هەبوو، هاوشێوەی ژنێکی شکۆدار، بەگوێی هەموو خەڵکان دەگەیشت، ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان و وتی: بەوشێوەیە بوو، خەڵکان سکاڵایان لە عوسمان کوڕی عەفان دەکرد و کارگوزارەکانی ئەویان نەدەویست، لەمەدینە دەهاتنە لای ئێمە و سەبارەت

بەکارگوزارەکانی ئەو گازندەیان دەکرد، راوێژیان لەگەڵ دەکردین و قسەی چاکەیان لەئێمە دەبیست، لێکۆڵینەوەمان کرد و بۆمان دەرکەوت عوسمان کەسێکی پاك و خۆپارێزە و ئەوان خراپەکار و خیانەتکار و درۆزنن، مەبەستیان لەگەڵ داواکارییەکەیان یەك نەبوو، کاتێك دەسەلاتیان زیادی کرد ڕژانە ناو ماڵەکەی و خوێنی حەرام و شاری حەرام و مانگی حەڕامیان بەحەلاڵ زانی، ئاگاداربن ئەرکی سەرشانی ئێوەیە و جگە لەمە ڕەوا نییە کە بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان بگرن و فەرموودەکانی قورئان ئەنجام بدەن. ئەم ئایەی خوێندەوە:

((الم تر الى الذين اوتوانصيبا من الكتاب يدعون الى الكتاب الله ليحكم بينهم ثم يتولى فريق منهم و هم معرضون.

واتاکەی: مەگەر ئەو کەسانەی لەتەورات بەهرەیان وەرگرتووە، نابینی پێشنیاری کتێبی خواوەندیان پێدەکرێت تا لەنێوانیاندا داوەری بکات، ئەوسا دەستەیەك پشتیان تێدەکەن و دەستدرێژیکەرانن.))

هاوەڵانی عوسمان کوڕی حەنیف بوون بەدوو دەستە: دەستەیەکیان وتیان: سوێند بەخوا ڕاستی وت و چاکەی هێنایە سەرزمان و بۆ مەبەستێکی چاکە هاتووە. کەسانی دیکە وتیان: سوێند بەخوا دەرۆ دەکەن، نازانین باسی چی دەکەن. یەکتریان خۆڵباران کرد و تەپ و تۆزیان بەرز کردەوە.

دەڵێت: کاتێك دایکی باوەڕداران ئەمەی بینی، سەرەو خواربوویەوە و خەڵکانی لای ڕاست سەرەوخوار بوونەوە و لەمەربەد لەشوێنی پێستەخۆشکەرەکان جێگیر بوون. هاوەڵانی عوسمان کوڕی حەنیف لەشوێنی خۆیان مانەوە و قسەیان دەکرد تا ئەو کاتەی جیابوونەوە: دەستەیەکیان پەیوەستی سوپاکەی دایکی باوەڕداران بوون و دەستەیەکیان لەگەڵ عوسمان کوڕی حەنیف لەسەر دەروازەی کۆڵانەکان مانەوە. عوسمان لەگەڵ هاوەڵانی خۆی هات و لەسەر دەروازەی کۆڵانی مزگەوت، لای ڕاستی پێستەچییەکان ڕووبەڕوویان بوویەوە و کۆڵانەکەیان گرت.

قاسم کوڕی محەممەد دەڵێت: جاریە کوڕی قودامەی سەعدی هات و وتی: ئەی دایکی باوەڕداران! کوژرانی عوسمان کوڕی عەفان کەم بەهاتر لەکارەکەی تۆیە کەماڵەکەی خۆتت بەجێهێشتووە و سوار لەسەر ئەم وشترە خۆت کردۆتە ئاماجی تیر

و شمشێرەکان، لەناو پەردە و رێزی خواوەنددا بوویت، پەردەی خۆتت دڕاند و رێزی خۆتت شکاند، هەرکەس شەڕ کردن لەگەڵ تۆ بەرەوا بزانێت، کوشتنی تۆ بەرەوا دەزانێت، ئەگەر بەخواستی خۆت بۆ لای ئێمە هاتوویت، بۆ شوێنەکەی خۆت بگەڕێرەوە و ئەگەر نابەدڵخواز هاتوویت، داوای هاوکاری لەخەڵکان بکە.

دەڵێت: گەنجێك لەمناڵەکانی سەعد ڕۆشتە لای تەڵحە و زوبەیر و وتی: ئەی زوبەیر، تۆ هاوەڵی پێغەمبەر(د.خ) بوویت و ئەی تەڵحە، تۆ پێغەمبەرت لەسەر دەستی خۆت پاراست، دایکتان لەگەڵ ئێوەدا دەبینم، ئایا ژنەکانتان لەگەڵ خۆتان هێناوە؟

وتیان: نە.

وتی: کەواتە من کارم بەئێوە نییە، خۆی لەوان دوور خستەوە.

گەنجی سەعدی هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە خوێندەوە:

((هاوسەرەکانی خۆتان پاراستووە

و دایکتان هێناوەتە ئێرە

بەراستی ئەمە لەبێ ویژدانییەوەیە

فەرمانی پێدرابوو لەماڵەکەی خۆی بمێنێتەوە

بەڵام ڕێگەی بیابانەکانی گرتەبەر و کرایە ئاماج

تا مناڵەکانی لەبەردەم ئەو

بەشمشێر و ڕم وتیر بجەنگن

ئەم پشتیوانەی تەڵحە و زوبەیر

لەبەر ئەوان

پەردەی رێزی خۆی دڕاند.))

گەنجێك لەهۆزی جوهەینە ڕۆشتە لای محەممەد کوڕی تەڵحە کەپیاوێکی خۆپارێز بوو، وتی: سەبارەت بەخوێنی عوسمان کوڕی عەفان قسە بکە.

وتی: بەڵێ، خوێنی عوسمان کوڕی عەفان سێ بەشە، بەشێکی لەئەستۆی خاوەنی کەژاوەکەیە، یانی عایشە، بەشێکی لەئەستۆی خاوەنی وشترە سوورەکەیە، یانی تەڵحە، بەشێکی لەئەستۆی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە.

گەنجەکە پێکەنی و وتی: گرفتاری گومڕایی نەبم. پەیوەستی سوپاکەی عەلی

کوڕی ئەبی تالیب بوو، هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((لەکوڕی تەڵحە سەبارەت بەکوژراوەکەی مەدینە

کەدفن نەکرا، پرسیارم کرد:

وتی: سێ دەستە بوون

کوڕی عەفانیان بەکوشتندا

یەك لەسەر سێی لەئەستۆی ئەو کەسەدایە کە لەناو پەردەکەدایە

یەك لەسەر سێی لەئەستۆی خاوەنی وشترە سوورەکەیە

و یەك لەسەر سێی لەئەستۆی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە

وتم: سەبارەت بەدوو کەسی یەکەم راستت وت

بەڵام سەبارەت بەسێیەم کەس گرفتاری هەڵە و گومڕایی بوویت))

محەممەد دەڵێت:باوکی ئەسوەد و عیمران بەرێکەوتن، حەکیم کوڕی جەبەلە لەگەڵ دەستەیەك سوار هات و جەنگی دەستپێکرد، هاوەڵانی عایشە ڕمەکانیان بەرز کردەوە تا شەڕ دەست پێنەکات بەڵام حەکیم کوڕی جەبەلە بەسەندەی نەکرد و نەگەڕایەوە، هاوەڵانی دایکی باوەڕداران شەڕیان نەدەکرد مەگەر بۆ بەرگری کردن لەخۆیان، حەکیم سوارەکانی خۆی هاندەدا و دەیوت: ئەوان قورەیشییەکانن، ترس و لەخۆبایی بوونیان لەناویان دەبات. لەسەر دەروازەی کۆڵانەکان جەنگان و دانیشتووانی ناو ماڵەکان هاتنە سەر بانەکان و بەردبارانی یەکیان دەکرد.

دەڵێت: دایکی باوەڕداران بەهاوەڵانی خۆی وت و لەلای چەپ جێگیر بوون. گەیشتنە گۆڕستانی مناڵەکانی مازن و ماوەیەك لەوێ مانەوە. خەڵك هێرشیان کردنەسەر و شەو ئەوانی لەیەك جیا کردەوە. عوسمان بۆ میسر گەڕایەوە و خەڵکان گەڕانەوە بۆ ناو هۆزەکانی خۆیان.

باوکی حیجر لەگەڵ یەکێك لەمناڵەکانی عوسمان کوڕی مالك پۆشتە لای عایشە و تەڵحە و زوبەیر و پێی وتن بڕۆنە شوێنێکی باشتر و گونجاوتر. لەگۆڕستانی مناڵەکانی مازنەوە بەرێکەوتن و لەلای گۆڕستانەکەوە لەئاو بەندی(سەد) شاری بەسرە گوزەریان کرد و تا زابوقە رێگەیان بڕی. لەوێوە گەیشتنە گۆڕستانی مناڵەکانی حوسن کەدەگەیشتە دارالرزق. شەویان بەخۆئامادە کردن بەسەر برد،

خەڵکانیش بەدوایاندا دەڕۆشتن. بەرەبەیان لەگۆڕەپانی دار الرزق ئامادە و عوسمان کوڕی حەنیف رووبەروویان بوویەوە. حەکیم کوڕی جەبەلە بەدەم جوێندانەوە هات و ڕمی بەدەستەوە بوو. یەکێك لەمناڵەکانی عەبدقەیس پێی وت: ئەوە کێیە جوێنی پێ دەدەیت و ئەو قسانەی دەیبیستم سەبارەت بەکێ دەیهێنیتە سەرزمان؟

وتی: عایشە.

وتی: ئەی ناپاك زادە، بەمشێوەیە جوێن بەدایکی باوەڕداران دەدەیت؟

حەکیم ڕمەکەی لەنێوان دوو مەمکی ئەو چەقاند و کوشتی. دواتر گەیشتە لای ژنێك و بەهەمان شێوە جوێنی بەعایشە دەدا.

ژن وتی: جوێن بەچ کەسێك دەدەیت؟

وتی: عایشە.

وتی: ئەی ناپاك زادە، جوێن بەدایکی باوەڕداران دەدەیت؟

حەکیم ڕمێکی لەنێوان مەمکی ژنەکەدا و خوێنی ڕشت و ڕۆشت.

دەڵێت: کاتێك کۆبوونەوە، رووبەرووی هاوەڵانی عایشە بوونەوە و لەدار الرزق جەنگیان ئەزمون کرد. جەنگ لە کاتی هەڵاتنی خۆر تا نیمەڕۆ بەردەوام بوو. ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵانی عوسمان کوڕی حەنیف کوژران. لەهەردوولا ژمارەیەکی زۆر بریندار بوون.

جاڕچی عایشە هاواری دەکرد و سوێندی دەدان بۆ ئەوەی کۆتایی بەجەنگەکە بێنن بەڵام رازی نەدەبوون و کاتێك گرفتاری سەختی بوون، پێشنیاری ئاشتییان بەهاوەڵانی عایشە کرد. ڕێککەوتن و نوسراوێکیان نووسی تا کەسێك بۆ مەدینە بنێرن و دەست لەجەنگ هەڵگرن تا ئەو کاتەی نێردراو دەگەڕێتەوە، ئەگەر ئاشکرا بوو زوبەیر و تەڵحەیان ناچار بەبەیعەت بەستن کردووە، عوسمان کوڕی حەنیف بڕوات و بەسرە بەوان بسپێرێت و ئەگەر بەو کارە ناچار نەکراون، تەڵحە و زوبەیر بڕۆن. نووسراوەکە بەمشێوە بوو:

((ئەمە پەیمانێکە تەڵحە و زوبەیر و باوەڕدارانی هاورێی ئەوان لەگەڵ عوسمان کوڕی حەنیف و موسوڵمانانی هاورێی ئەوان دەیبەستن کەعوسمان کوڕی حەنیف لەشوێنەکەی خۆی و تەڵحە و زوبەیر لەشوێنەکەی خۆیان بمێننەوە تا بڕواپێکراوی هەردوولا و نێردراوەکەیان، کەعب کوڕی سور لەمەدینە بگەڕێتەوە. هیچ کام لەم دوو

دەستەیە لەمزگەوت و بازار و ڕێگە و لەسەر ئاوەکان نەبێتە ئەرك بۆ بەرامبەرەکەی، ئارامی سەقامگیرە تا کەعب دەگەڕێتەوە. ئەگەر هەواڵی هێنا کەخەڵکان زوبەیر و تەڵحەیان بۆ بەیعەت بەستن لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب ناچار کردووە، فەرمان، فەرمانی ئەوانە. ئەگەر هەواڵەکە بەپێچەوانەوە بوو، فەرمان فەرمانی عوسمان کوڕی حەنیفە. ئەگەر تەڵحە و زوبەیر ویستیان بمێننەو و ملکەچی فەرمانەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بن، بمێننەوە و ئەگەر بخوازن بەرەو مەبەستەکەی خۆیان بڕۆن و باوەڕداران شوێن کەسی سەرکەوتوو کەون.))

دەڵێت: کەعب ڕۆشت و گەیشتە مەدینە، خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە. ڕۆژی هەینی بوو. کەعب قسەی کرد و وتی: ئەی خەڵکانی مەدینە، خەڵکانی بەسرە منیان بۆ لای ئێوە ڕەوانە کردووە تا بزانم ئایا ئەو دوو پیاوەیان بۆ بەیعەت بەستن لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب ناچار کردووە یا بەخواستی خۆیان بەیعەتیان کردووە؟

کەس وەڵامی نەدایەوە، جگە لەئوسامە کوڕی زەید کەوتی: بەیعەتیان نەکرد مەگەر بەزۆر.

سەهل کوڕی حەنیف و دەستەیەکی دیکە پەلاماری ئوسامەیاندا. سوهەیب کوڕی سەنان هەستا و هاوڕێ لەگەڵ باوکی ئەیووب کوڕی زەید و دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) و لەناو ئەوان محەممەد کوڕی موسلیمە لەترسی کوژرانی ئوسامە کوڕی زەید وتیان: سوێند بەخوا ڕاست دەکات، وازی لێ بێنن.

ئەویان ئازاد کرد، سوهەیب دەستی گرت و لەمزگەوت بردییەدەر، وتی: مەگەر نەتدەزانی دایکی عامر ئەحمەق بوو، ناتوانی وەك ئەو بێدەنگ بیت؟

وتی: نا، سوێند بەخوا نەمدەزانی دەرئەنجامەکەی ئەمە دەبێت، کارەساتێکی ترسێنەر بوو.

کەعب گەڕایەوە. لەم ماوەدا چەندین پێشهات ڕوویاندا، تەڵحە و زوبەیر گرنگییان پێدەدا. یەکێك لەپێشهاتەکان ئەوە بوو کە محەممەد کوڕی تەڵحە بەردەوام نوێژی دەخوێند، لەشوێنێك لەنزیك عوسمان کوڕی حەنیف وەستا. دەستەیەك لەخەڵکانی زەت و سەیابجە ترسان لەوەی نەکا مەبەستێکی دیکەی لەسەردا بێت و ئەویان لەو شوێنە دوور خستەوە. تەڵحە و زوبەیر کەسیان بۆ لای عوسمان نارد و

وتیان: ئەمە یەکەم پەیمان شکێنی. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبەسەرهاتەکەی مەدینە ئاگادار بوویەوە و نامەیەکی بۆ عوسمان کوڕی حەنیف نووسی و ئەوی بەکەسێکی بێ توانا لەقەڵەمدا، وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ناچار کران بۆ رێگرتن لەدوو بەرەکی بوو و بەزۆر پەیوەستی کۆمەڵانی خەڵك کران، ئەگەر مەبەستیان رزگار بوون لەبەیعەتە هیچ پاساوێکیان نییە، ئەگەر مەبەستێکی دیکەیان لەسەردایە، دەبێت ببینم و ببینن.

کاتێك نامەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەدەستی عوسمان گەیشت، کەعبیش گەڕایەوە. کەسیان بۆ لای عوسمان کوڕی حەنیف نارد و پێیان وت بڕوات، بەڵام وتی: ئەم بابەتە تازە و جیاوازە لەوەی باسمان کرد.

تەڵحە و زوبەیر لەشەوێکی سارد و تاریك و تۆفانی خەڵکیان کۆکردەوە و بەرەو مزگەوتەکە ڕۆشتن. کاتی نوێژی خەوتنان بوو، نوێژی خەوتنانیان درەنگ دەخوێند. عوسمان کوڕی حەنیف دواکەوتبوو، عەبدولرەحمان کوڕی عەتابیان بۆ پێشنوێژی راسپارد. خەڵکانی زەت و سیابجە شمشێریان دەرهێنا و کەوتنە گیانی هاوەڵانی تەڵحە و زوبەیر. ئەوانیش بەرگرییان کرد و لەمزگەوتەکە شەڕ دەستی پێکرد. هاوەڵانی عوسمان کەچل کەس بوون، کوژران. کەسیان نارد تا عوسمان کوڕی حەنیف بباتە لای تەڵحە و زوبەیر، کاتێك گەیشتە لای ئەوان، پێشێلیان کرد و هەموو مووەکانی سەروناوچاویان تاشی. ئەم کارەیان بەگەورە زانی و دایکی باوەڕدارانیان لێ ئاگادار کردەوە و داوای بۆچوونی ئەویان کرد. عایشە پەیامی بۆ ناردن: ئازادی کەن تا بۆ هەر شوێنێك دەخوازێت بڕوات، زیندانی مەکەن.

دواتر پاسەوانەکان عوسمانیان لەکۆشکەکە کردەدەر و ڕۆشتنە ناو کۆشکەکە. هەر شەو وڕۆژێك بەنۆرە، چل کەس پاسەوانی عوسمان کوڕی حەنیفیان دەکرد. عەبدولرەحمان کوڕی عەتاب نوێژی خەوتنان و بەیانی بۆ خەڵکان دەخوێند.

دەڵێت: نێردراوی نێوان عایشە و تەڵحە و زوبەیر، عەبدولرەحمان بوو کەهەواڵەکانی بۆ دایکی باوەڕداران دەبرد و هەواڵەکانی ئەوی بەگوێی خەڵکان دەگەیاند.

باوکی میحنەف دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی حەنیفیان گرت، ئەبان کوڕی عوسمانیان بۆ لای عایشە نارد و داوای بۆچوونی ئەویان کرد.

عایشە وتی: بیکوژن.

ژنێك پێی وت: ئەی دایكی باوەڕداران، سوێندت دەدەم بەخوا لەگەڵ كەسێك كەهاوەڵی پێغەمبەر(د.خ) بووە، ئەو كارە مەكە.

دایكی باوەڕداران وتی: ئەبان بگەڕێننەوە.

كاتێك گەڕایەوە، وتی: بیهێڵنەوە، مەیكوژن.

وتی: ئەگەر دەمزانی بۆ ئەم مەبەستە منت گەڕاندەوە، نەدەگەڕامەوە.

موجاشیع كوڕی مەسعود وتی: لەعوسمان بدەن و موی ڕیشی هەڵكەنن، چل قامچییان لێدا و مووی سەر و ڕیش و بڕۆ و پێڵوەكانیان هەڵكەند.

زوهری دەڵێت: كاتێك تەڵحە و زوبەیر لەدابەزینی عەلی كوڕی ئەبی تالیب لەزیقار ئاگادار بوونەوە، ڕوویان كردە بەسرە و لەمونكەدەر گوزەریان كرد. عایشە دەنگی سەگەكانی بیست و وتی: ئێرە چ ئاوێكە؟

وتیان: ئاوی حوئەب.

وتی: اناللە و انا الیە راجعون، من ئەو كەسەم، لەپێغەمبەری خوام بیست كەبەهاوسەرەكانی دەوت: خۆزگە دەمزانی سەگەكانی حوئەب بۆ كامتان دەوەڕێت.

عایشە دەیخواست بگەڕێتەوە، بەڵام عەبدوللە كوڕی زوبەیر ڕۆشتە لای و وتی: ئەو كەسەی وتوویەتی ئێرە حوئەبە، درۆی كردووە. ئەوەندە قسەی لەگەڵ كرد تا دایكی باوەڕداران بەرێكەوت.

دەڵێت: كاتێك گەیشتنە بەسرە، عوسمان كوڕی حەنیف كارگوزاری ئەو شارە وتی: هۆكاری دژایەتی كردنی ئێوە لەگەڵ عەلی كوڕی ئەبی تالیب چییە؟

وتیان: فلأن كار و فیسارە كاری ئەنجامداوە و بۆ خەلافەت شیاوتر لەئێمە نییە.

عوسمان وتی: عەلی كوڕی ئەبی تالیب منی وەك كارگوزاری ئەم شارە دەستنیشان كردووە، نامەی بۆ دەنووسم و ئاگاداری دەكەمەوە تا بزانم بەچ مەبەستێك ڕووتان لەم شارە كردووە، پێشنوێژی بۆ خەڵكان دەكەم تا ئەو كاتەی وەڵامی نامەكەم دەگات.

دەڵێت: ئەوان رازی بوون و ئەو، نامەی نووسی. بەڵام دوو ڕۆژی نەخایاند هێرشیان كردەسەر و لەزابوقە لەنزیك مدینە الرزق لەگەڵ عوسمان جەنگان و

زاڵبوون و ئەسیریان کرد. دەیانویست بیکوژن بەڵام لەتووڕە بوونی ئەنسارییەکان ترسان و تەنیا بەتاشینی مووی سەر و جەستەی ئەو رازی بوون. تەڵحە و زوبەیر وتارێکیان پێشکەش بەخەڵکانی بەسرە کرد و وتیان: ئەی خەڵکانی بەسرە، هەموو گوناحێك پێویستی بەتۆبە هەیە، ئێمە دەمانویست عوسمان کوڕی عەفان گۆڕانکاری لەکردەوەکانی بکات، خوازیاری کوشتنی ئەو نەبووین بەڵام نەزانەکان بەسەر بیرمەندەکان زاڵبوون و ئەویان کوشت.

خەڵك بەتەڵحەیان وت: ئەی باوکی محەممەد، نامەکانی تۆ کە بەئێمە دەگەیشت، جیاواز لەمە بوو.

زوبەیر وتی: سەبارەت بەو نامەیەك لەمنەوە بەدەستی ئێوە گەیشتووە؟ دواتر سەبارەت بەکوژرانی عوسمان کوڕی عەفان و ئەو خراپەکارییانەی بەرابەر بەوئەنجامیانداوە، دوا و رەخنەی لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب گرت.

دەڵێت: یەکێك لەخەڵکانی عەبدقەیس وتی: ئەی پیاو بێدەنگ بە با ئێمە بدوێین.

عەبدوللە کوڕی زوبەیر وتی: تۆ کەی توانای قسە کردنت هەیە؟

پیاوی عەبدی وتی: ئەی موهاجیرەکان! ئێوە یەکەم کەسان بوون بانگێشتی پێغەمبەرتان وەڵام دایەوە، ئەمە لەپێشی ئێوەیە، خەڵکانیش هاوشێوەی ئێوە ئامێزیان بۆ ئیسلام کردەوە، کاتێك پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد، لەگەڵ کەسێك لەخۆتان بەیعەتتان بەست و لەم کارەدا گرنگیتان بەبۆچوونی ئێمەنەدا بەڵام رازی بووین و ملکەچی فەرمانەکانی ئێوە بووین. خواوەند لەرۆژگاری خەلافەتی ئەو، بەرەکەتی بە موسوڵمانان بەخشی، ئەوکات مرد و یەکێك لەئێوەی وەك جێگری خۆی دانا، لەم کارەیشدا راوێژتان بەئێمە نەکرد، بەڵام رازی بووین. کاتێك خەلیفە مرد ئەم کارەی بە شەش کەس سپارد کەبێ راوێژ کردن بەئێمە عوسمان کوڕی عەفانتان هەڵبژارد و دەستی بەیعەتتان بۆ درێژ کرد، بێ راوێژ کردن لەگەڵ ئێمە رەخنەتان لێگرت و خوێنتان ڕشت، بێ راوێژ کردن لەگەڵ ئێمە بەیعەتتان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەست، ئێستا چ رەخنەیەکی لێدەگرن تا دژی ئەو بجەنگین؟ ئایا تالآنییەکانی بەنارەوا دابەش کردووە یا کارێکی نارەوای ئەنجامداوە تا دژی ئەو هاوکاری ئێوە بکەین، ئەگەر بەمشێوە نییە، ئەم کۆبوونەوە بۆ چییە؟

دەڵێت: مەبەستی کوشتنی ئەویان کرد بەڵام هۆزەکەی رێگەیان نەدا، بەڵام بۆ

ڕۆژی دواتر هێرشیان کردە سەر خۆی و بنەماڵەکەی و حەفتا کەسیان لێ کوشتن.

محەممەد دەڵێت: کاتێك عوسمان کوڕی حەنیفیان گرت، بەرەبەیانان بیت المال لەگەڵ پاسەوانەکان لەبەردەستی تەڵحە و زوبەیردا بوو، خەڵکانیش هاوڕێیەتیان دەکرد و هەرکەس لەگەڵ ئەوان نەبوو، بەبەزاو و گۆشەگیر لەقەڵەم دەدرا. کەسیان بۆ لای دایکی باوەڕداران نارد کەحەکیم لەگەڵ دەستەیەك هێشتا ماوەتەوە. عایشە پەیامی بۆ ناردن تا عوسمان زیندانی نەکەن. ئەو کارەیان کرد. عوسمان ئازاد کرا و شوێن ژیانی خۆی کەوت. حەکیم کوڕی جەبەلە لەگەڵ سوارەکانی خۆی و کەسەکانی لەخەڵکی عەبدقەیس و کەسانێك لەهۆزی ڕەبیعە بەرەو دار الرزق ڕۆشتن. حەکیم دەیوت: ئەگەر هاوکاری نەکەم، برای نیم. جوێنی بەدایکی باوەڕداران دەدا.

دەڵێت: یەکێك لەژنەکانی هۆزەکەی حەکیم، وتەکانی بیست و وتی: ئەی ناپاك زادە، ئەم قسانە شیاوی تۆیە. بەشمشێر لێیدا و کوشتی. خەڵکانی عەبدقەس جگە لەنەناسراوەکان، توڕە بوون و وتیان: دوێ شەو ئەو کارەت کرد، ئەمڕۆیش کەسێکی دیکەت کوشت، سوێند بەخوا ڕێگە دەدەین خواوەند تۆڵەت لێ بستێنێتەوە. بەجێیان هێشت. کەسانێك لەنەناسراوەکانی هۆزەکان کە هاوڕێ لەگەڵ عوسمان کوڕی حەنیف بۆ جەنگی عوسمان کوڕی عەفان ڕۆشتبوون و لەگەماڕۆدانەکەی سەر سەروەری باوەڕداران بەشدار بوون و دڵنیا بوون لەوەی لەبەسرە هیچ جێگەیەکیان نییە، لەدەوری کۆبوونەوە. حەکیم کوڕی جەبەلە، ئەوانی بۆ زابوقە نزیك دارالرزق برد.

عایشە وتی: کەس مەکوژن، مەگەر ئەو کەسەی لەگەڵتان بجەنگێت، هاوار بکەن هەرکەس لەبکوژەکانی عوسمان نییە، خۆی لەئێمە بەدوور بگرێت، ئێمە تەنیا ڕووبەڕووی بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان دەبینەوە و هێرش ناکەینە سەر کەسی دیکە.

دەڵێت: بەڵام حەکیم کوڕی جەبەلە جەنگی دەسپێکرد بێ ئەوەی گرنگی بەئاگادار کردنەوەی ئەوان بدات.

تەڵحە و زوبەیر وتیان: سوپاس بۆ خوا کەتۆڵەستێنەکانی ئێمەی لەخەڵکانی بەسرە کۆکردەوە، خواوەند کەسیان بەزیندووی مەهێڵەڕەوە و تۆڵەیان لێ بستێنە.

ڕووبەڕوویان بوونەوە و شەڕێکی دژواریان دەستپێکرد، چوار سەر کردە بوون: حەکیم ڕووبەڕووی تەڵحە بوویەوە، زورەیح ڕووبەڕووی زوبەیر، کوڕی موحرەش ڕووبەڕووی عەبدولرەحمان کوڕی عەتاب و حێرقوس کوڕی زوهەیر ڕووبەڕووی عەبدولرەحمان کوڕی حارس.

تەڵحە هێرشی کردە سەر حەکیم کەسێسەد پیاو هاوڕێیەتی دەکرد، ئەو، شمشێری دەوەشاند و هۆنراوەی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((بەشمشێر دەیانکوژم
هاوشێوەی پیاوێکی گرژ و مۆن
کەلەژیان بێ هیوا بووە
و بەدوای بەهەشتا دەگەڕێت))

کەسێك بەشمشێر لەقاچیدا و قرتاندی، ئەو، قاچەکەی هەڵگرتەوە و هاویشتی بۆ ئەو کەسە کەبەری کەوت، ڕۆشتە پێش و کوشتی و پاڵی بەجەستەکەیەوەدا، هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناورەۆکە:

((ئەی ڕانی من، مەترسە
کە بازووم لەکوێیە
و بەو، سەرەوەی ئەژنۆم دەپارێزم))

هەروەها هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەمە ئەنگ نییە ئەگەر بمرم.
ئەنگ بۆ ئەو کەسەیە هەڵدێت
لەناوچوون گەورەیی بەفیڕۆ نادات.))

کەسێك ڕۆشتە لای کەسەری خستبووە سەر لاشەی کوژراوێکی دیکە، وتی: حەکیم چی بەسەر هاتووە؟

وتی: کوشتیانم.؟
وتی: کێ تۆی کوشت؟
وتی: پاڵپشتەکەم.

دەڵێت: ئەوی هەڵگرت و پەیوەستی هاوەڵانی بوو، ژمارەیان حەفتا کەس بوو.

دەڵێت: حەکیم لەسەر یەك قاچ وەستابوو، شمشێرەکان لەزیانی ئەوان

دەسووڕان، بێ زمان گیران قسەی دەکرد و دەیوت: ئەم دوو کەسەم بینی کە بەیعەتیان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد و ملکەچی فەرمانەکانی بوون، دواتر ئاڵای دژایەتی کردن و تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفانیان بەرز کردەوە و لەنێوان ئێمە و خەڵکی ئەم سەرزەمینە دوو بەرەکییان هێنایە کایەوە، مەبەستی ئەوان عوسمان کوڕی عەفان نییە.

دەڵێت: کەسێك هاواری کرد: ئەی ناپاك زادە، هەنووکە کەتۆڵەی خواوەند تۆی گرتەوە، زمانت کەوتۆتە گۆ، کێ تۆ و هاوەڵانتی ناچار کرد کەهێرشتان کردە سەر خەلیفەی ستەملێکراو و لەناو موسوڵمانان دووبەرەکی بێننە ئاراوە و خوێن بڕێژن و سەرقاڵی کۆکردنەوەی سامانەکانی دنیا بن، لەئێستادا تامی توندی تۆڵەی خواوەند بچێژە و بەمشێوەیە بمێنەرەوە.

دەڵێت: زورەیح و هاوەڵانی کوژران، حێرقوس کوڕی زوهەیر لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەڵانی دەرباز و پەنای بۆ هۆزەکەی برد. جاڕچی تەڵحە و زوبەیر جاڕیدا: لەهەرکام لەهۆزەکانی ئێوە کەسێك لەهێرشبەران هەیە، تەسلیمی بکەن. ئەوانیان هاوشێوەی سەگەکان هێنا و هەموویان کوشت. لەناو خەڵکانی بەسرە کەس لەوان نەمایەوە مەگەر حێرقوس کوڕی زوهەیر لەبەر ئەوەی منداڵەکانی سەعد پشتیوانییان لێکرد. ئەو، یەکێك بوو لەمنداڵەکانی سەعد بەڵام گرفتاری ئازار و مەینەتییەکی فراوان بوون. ماوەیەکیان بۆ دیاریکرا و منداڵەکانی سەعد کەلایەنگرانی عوسمان کوڕی عەفان بوون، بەرادەیەك پەرێشان کرد کەوتیان: ئێمە خۆمان بەدوور دەگرین.

خەڵکانی عەبدقەیس دوای جەنگەکە، کاتێك تووڕە بوونی منداڵەکانی سەعدیان بینی،سەبارەت بەکوژراوەکانی خۆیان بێزار بوون چوونکە عەبدییەکان شەیدای خەلافەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوون.

تەڵحە و زوبەیر مانگانەکەی خەڵکانیان دەدا و مانگانەی خەڵکانی ملکەچیان زیاتر کرد. خەڵکانی عەبدقەیس و ژمارەیەکی زۆر لەبەکر کوڕی وائیل کەمانگانە بەرزۆرینەیان نەکەوت، هێرشیان کردە سەر بیت المال بەڵام خەڵك رووبەروویان بوونەوە و ژمارەیەکی زۆر لەوانیان کوشت کە بەناچاری ڕۆشتن و لەسەر ڕێگەی

عەلی کوڕی ئەبی تالیب جێگیر بوون.

لەم کاتەدا لەبەسرە، جگە لەحێرقوس کەس لەبکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان نەمایەوە. تەڵحە و زوبەیر باروودۆخی خۆیان بۆ خەڵکانی شام روون کردەوە و نووسییان، هاتبووین تا رێگری لەجەنگ و کوشتار بکەین و فەرموودەکانی خواوەند زیندوو بکەینەوە و سنوورەکانی سەبارەت بەهەمووان بپارێزین مەگەر ئەوەی خواوەند ئێمە لەو کارە دوور بخاتەوە. چاکەکاران و چاکخوازانی خەڵکی بەسرە دەستی بەیعەیتان بۆ ئێمە درێژ کرد و سەرسەرییەکان و خراپەکاران دژایەتی ئێمە دەکەن و دەستیان بۆ سیلاح برد. یەکێك لەوتەکانیان ئەمە بوو: دایکی باوەڕداران بەبارمتە دەگرین لەبەر ئەوەی پێشنیاری گەڕانەوە بۆ راستییەکانی پێکردبوون. خواوەند بەبەردەوامی شێواز و رێچکەی موسوڵمانانییان نیشان دەدا و کاتێك هیچ بەڵگە و پاساوێکیان بۆ نەمایەوە، بکوژەکانی سەروەری باوەڕداران بوێرییان لەخۆیان نیشاندا و هەموویان کوژران. کەس لەوان گیانی بەدەر نەبرد جگە لەحێرقوس کوڕی زوهەیر کە ئەگەر خواوەند بخوازێت، ئەویش گرفتار دەکات. هەنووکە هەمووان بەوشێوەن کەخواوەند دەخوازێت، سوێندتان دەدەین بەخوا ئێوەیش کارەکەی ئێمە دووبارە بکەنەوە تا لەپێشگای خواوەند بەڵگەی شیاومان هەبێت.

نامەکەیان بەسەیاری عێجلی ڕەوانە کرد.

نامەیەکی هاوشێوەیان بۆ خەڵکانی کوفە نووسی و بەیەکێك لەمناڵەکانی عەمرۆ کوڕی ئەسەد بەناوی موزەفەر کوڕی موعرەز ڕەوانەیان کرد. بۆ خەڵکانی یەمامەیش کەسەبرە کوڕی عەمرۆ عەنبەری کارگوزاری ئەو دیارە بوو، نامەیان نووسی و بەحارسی سەدووسی ڕەوانەیان کرد.

نامەیەکیان بۆ خەڵکانی مەدینە نووسی و بەکوڕی قودامەی قوشیری ڕەوانەیان کرد کە بەشێوەیەکی نهێنی بەدەستی خەڵکانی مەدینەی گەیاند.

دایکی باوەڕداران بەنێردراوەکەی تەڵحە و زوبەیر نامەیەکی بۆ خەڵکانی کوفە نووسی بەم ناوەرۆکە:

بەڵام دواتر، خواوەند و ئیسلامتان بیر دێنمەوە. کتێبی خواوەند بەهۆی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خواوەند بیربێننەوە، لەخوا بترسن و هەمووان دەست

لەتەناف خواوەند گیر بکەن، هاورێی کتێبی خواوەند بن، ئێمە هاتینە بەسرە و پێشنیارمان بەخەڵکەکەی کرد تا بەزیندوو کردنەوە و پاراستنی سنوورەکانی خواوەند، فەرموودەکانی ئەنجام بدەن، بەئاشتی بەپێشنیارەکەمان رازی بوون و ئەوانەی لەخێر بێ بەش کرابوون، بەسیلاحەوە رووبەڕوومان بوونەوە و وتیان لەدوای عوسمان کوڕی عەفان ئێوەیش دەکوژین، دوژمنایەتییان کرد و ئێمەیان بەکافر لەقەڵەمدا و ناڕەوایان هێنایە سەرزمان. ئێمە، ئەم ئایەی قورئانمان بۆ خوێندنەوە:

((الم تر الى الذين اوتوا نصيبا من الكتاب يدعون الى الكتاب الله ليحكم بينهم.

واتاکەی: مەگەر ئەو کەسانەی سوودیان لەتەورات بینیوە، نابینی کەپێشنیاری کتێبی خواوەندیان پێدەکرێت تا لەنێوانیان داوەری بکات.))

دەستەیەکیان ملکەچی خۆیان نیشاندا و دووبەرەکی کەوتە نێوانیان، بەمشێوەیە مانەوە بەڵام ئەمە نەبووە ڕێگر لەبەردەم دەستەی یەکەم تا بەشمشێر هێرش نەکەنە سەر هاوەڵانی من، عوسمان کوڕی حەنیف سوێندیدان بۆ ئەوەی دژی من بجەنگن. خواوەند بەهۆی ئاشتی خوازەکانەوە، پشتیوانی لەمن کرد و فریوەکەیانی بۆ خۆیان گەڕاندەوە. بیست و شەش ڕۆژ ماینەوە و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ فەرموودەکانی ئیسلاممان پێکردن تا ببینە ڕێگە لەخوێن ڕشتن مەگەر ئەو کەسەی خوینی حەڵاڵ بێت، بەڵام رازی نەبوون و پێشنیاری ڕێگەچارەی دیکەیان کرد، لەسەر ئەو بنەمایە ڕێککەوتین، بەڵام ترسان و خیانەتیان کردە پیشە، کۆبوونەوە و خواوەند بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفانی کۆکردەوە و تۆڵەی لێسەندن. جگە لەیەک کەسیان هەموویان کوژران و بەهۆی عومەیر کوڕی مورسەد و مورسەد کوڕی قەیس و چەند کەسێك لەقەیسییەکان و چەند کەسێك لەتایەفەی ڕەباب و ئەزد پشتیوانییان لەئێمە کرد. لەبکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان چاوپۆشی نەکرد تا خواوەند تۆڵەی خۆی سەندەوە. پشتیوانی لەخیانەتکاران مەکەن و بەوکەسانەی سنوورەکانی خواوەند دەبەزێنن، دڵخۆش مەبن چوونکە دەبنە یەکێك لەستەمگەران، ناوی ئەو کەسانەی نووسیومە، خەڵکان لەپشتیوانی کردنی ئەوان دوور بخەنەوە، لەماڵەکانی خۆتان بمێننەوە. ئەم دەستەیە بەوەی لەگەڵ

عوسمان کوڕی عەفان کردیان و دووبەرەکییان لەناو خەڵکان هێنایە ئاراوە، دژایەتی کتێب و سوونەتییان کرد، ئێمەیان بەکافر لەقەڵەمدا لەبەر ئەوەی پێشنیاری گەڕانەوە بۆ خواپەرەستیمان پێکردن، جوێنبارانیان کردین. چاکەخوازران ئەمەیان پەسەند نەکرد و وتەکانی ئەوانیان بەمەترسیدار زانی، پێیان وتن، بەمە بەسەندەتان نەکرد کەپێشەواتان کوشت و هەنووکە دژی هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) یەکتان گرتووە چوونکە پێشنیاری گەڕانەوە بۆ راستیتان پێ دەکات. دەخوازن ئەو لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بکوژن، ئەوان و عوسمان کوڕی حەنیف، شوێنکەوتە نەزانەکانی خۆیان لەگەڵ زەتەکان و سیابەجە ئامادە کرد و ئێمە لەدەست ئەوان پەنامان بۆ خێوەتەکان و دەستەیەك لەخەڵکان برد. بیست و شەش رۆژ بەمشێوەیە مایەوە، پێشنیاری گەڕانەوە بۆ رێگەی راستمان پێکردن بۆ ئەوەی نەبنە لەمپەر لەنێوان ئێمە و راستییەکان، بەڵام خیانەتیان کرد و ئێمە رووبەروویان نەبوینەوە. بەیعەتی تەڵحە و زوبەیریان دەکردە بەڵگە و بیانوو، کەسێکیان نارد بۆ مەدینە و لەگەڵ هەواڵە ڕاستەکان گەڕایەوە بەڵام ئەوان راستییان نەدەناسی و بەرگەی راستییان نەگرت و لەتاریکیدا هێرشیان کردە سەرمان بەمەبەستی کوشتنی من لەکاتێکدا ئەو کەسەی دژی ئەوان دەجەنگا، من نەبووم. نەوەستان تا گەیشتنە بەردەم خێوەتەکەی من، شارەزایەکەیان لەگەڵدا بوو تا منیان نیشان بدات بەڵام دەستەیەکیان لەبەردەم ماڵەکەی مندا بینی کەعومەیر کوڕی مورسەد و مورسەد کوڕی قەیس و یەزید کوڕی عەبدوڵله کوڕی مورسەد لەناویاندا دەبینران. لەگەل چەند کەسێك لەقەیسییەکان و چەند کەسێك لەتایەفەی ئزد و رەباب. ئاشی جەنگ بەسەر ئەواندا سوڕا و موسوڵمانان دەوریان گرتن و خوێنیان ڕشتن. خواوەند خەڵکانی بەسرەی کردە شوێنکەوتەی زوبەیر و تەڵحە، ئەگەر کەسانێکمان لەتۆڵەی سەروەری باوەڕداران کوشت، بەڵگەمان لەبەردەستا بوو. ئەم پیشهاتە پێنج رۆژ بۆ کۆتایی رەبیع الاخری ساڵی سی و شەشەم روویدا.

عەبدوڵله کوڕی کەعب نووسی، لەمانگی جومادی.))

عامر کوڕی حەفس دەڵێت: یەکێك لەخەڵکانی حەدان بەناوی (مل ئەستوور) بەشمشێر لەسەری حەکیم کوڕی جەبەلەیدا کەتەنیا پێستەکەی مایەوە. سەری بەپێستەکەیەوە هەڵواسرا بوو، روخساری لەپشتەوە بوو.

موسەنا حەدانی دەڵێت: ئەو کەسەی حەکیمی کوشت، یەزید کوڕی ئەسحەمی حەدانی بوو، حەکیم لەنێوان یەزید کوڕی ئەسحەم و کەعب کوڕی ئەسحەم دۆزرایەوە کەهەردووکیان کوژرا بوون.

باوکی مەلیح دەڵێت: کاتێك حەکیم کوڕی جەبەلە کوژرا، ویستیان عوسمان کوڕی حەنیف بکوژن، وتی: هەرچۆن دڵتان دەخوازێت، بەڵام سەهل کوڕی حەنیف کارگوزاری مەدینەیە، ئەگەر بمکوژن، تۆڵە دەستێنێتەوە. ئەویان ئازاد کرد. سەبارەت بەپێشنوێژ کێشە هاتە ئاراوە، دایکی باوەڕداران بە عەبدوللە کوڕی زوبەیری وت پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات. زوبەیر دەیویست مانگانەی خەڵکان بدات و سامانی ناو بیت المال دابەش بکات، عەبدوڵلەی کوڕی وتی: ئەگەر خەڵکان مانگانە وەربگرن، بڵاوەی لێدەکەن. عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکریان وەك لێپرسراوی بیت المال هەڵبژارد.

جارود کوڕی ئەبی سەبرە دەڵێت: ئەو شەوەی عوسمان کوڕی حەنیفیان گرت، لەگۆڕەپانی مدینە الرزق، خواردنێکی لێ بوو خەڵکان دەیانخوارد. عەبدوللە مەبەستی ئەوەی کرد لەناو هاوەڵانی خۆی دابەشی بکات، حەکیم کوڕی جەبەلە لەو کردەوەی لەگەڵ عوسمان کوڕی حەنیف کردیان، ئاگادار بوویەوە، وتی: ئەگەر هاوکاری نەکەم، لەخوا ترس نیم. لەگەڵ دەستەیەك لەعەبدقەیس و بەکر کوڕی وائیل کەخەڵکانی قەیس زیاتر بوون، لەمدینە الرزق ڕۆشتنە لای کوڕی زوبەیر کەوتی: حەکیم چیت دەوێت؟

وتی: دەمەوێت لەو خواردنە بخۆم و بەپێی پەیمانی نێوانمان عوسمان ئازاد بکەن تا لەکۆشکی فەرمانڕەوایەتی بمێنێتەوە تا ئەو کاتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دێت. سوێند بەخوا ئەگەر دژی ئێوە دەمتوانی کەسانێك کۆبکەمەوە، هێرشم دەکردنەسەر، بەمە رازی نەدەبووم تا لەبەرابەر ئەو کەسانەی کوشتووتانە، پیاوتان لێ بکوژمەوە، لەئێستادا خوێنی ئێوە حەڵاڵە، مەگەر لەخواوەند ناترسن، بۆ خوێن ڕشتن بەڕەوا دەزانن.؟

وەڵامی دایەوە: لەبەرابەر خوێنی عوسمان کوڕی عەفان.

وتی: مەگەر ئەو کەسانەی کوژران بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان بوون؟

مەگەر لەدوژمنایەتی کردنی خواوەند ناترسن؟

عەبدوللە کوڕی زوبەیر وتی: تا ئەو کاتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەسەر کار لانەبرێت، لەم خواردنە بەئێوە نادەین و عوسمان کوڕی حەنیف ئازاد ناکەین.

حەکیم وتی: خواوەندا، تۆداوەر و دادپەروەریت، شایەت بە.

دواتر بەهاوەڵانی خۆی وت: من بۆ جەنگ دژی ئەوان هیچ گومانێکم نییە، هەرکەس گومانی هەیە بڕوات.

دواتر لەگەڵ ئەو دەستەیە جەنگی کرد و جەنگێکی قورس هاتە ئاراوە، کەسێك بەشمشێر لەقاچی حەکیمیدا و قرتاندی. حەکیم قاچە قرتاوەکەی بۆ ئەو کەسە هاویشت، بەر ملی کەوت و کەوت، دواتر پەلاماریدا و کوشتی، پاڵی بەجەستەکەیەوەدا، کەسێك لای تێپەڕی و وتی: کێ تۆی کوشت؟

وتی: پاڵپشتەکەم.

هوزەلی دەڵێت: کاتێك قاچی حەکیم قرتا، هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((کاتێك بڕیارمدا

بەقاچم وت: ئەی قاچەکەم، مەترسە

دەستی بەهێزم لەگەڵدایە))

عامر دەڵێت: ئەشرەف کوڕی حەکیم و براکەی ڕەعل کوڕی جەبەلە لەگەڵ حەکیمدا کوژران.

عەوف ئەعرابی دەڵێت: کەسێك لەمزگەوتی بەسرە، ڕۆشتە لای تەڵحە و زوبەیر، وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا ئایا پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەم سەفەرە هیچی پێوتوون؟

دەڵێت: تەڵحە هەستا و وەڵامی نەدایەوە، ئەو پیاوە زوبەیری سوێندداو، وتی: نا، بەڵام بیستمان لای ئێوە سامانێکی زۆر کۆبووتەوە، هاتووین تا ببینە شەریکی ئێوە.

کوڕی عامر موالی زوبەیر دەڵێت: کاتێك خەڵکانی بەسرە لەگەڵ زوبەیر و تەڵحە بەیعەتیان بەست، زوبەیر وتی: هەزار سوارم لەگەڵدا نییە تا بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەمە سەر عەلی کوڕی ئەبی تالیب، ئەگەری هەیە پێش ئەوەی دەستی بەئێمە بگات، بیکوژم.

دەڵێت: کەس وەڵامی نەدایەوە.

زوبەیر وتی: باسی فیتنەیەکەم دەکرد.

موالیەکەی وتی: ئەمە بەفیتنە ناو دەبەیت و لەبەر ئەمە دەجەنگیت؟

وتی: هاوار لەتۆ، دەڕوانین بەڵام نابینین، هیچ کارێك نییە شوێنپێکانی خۆم تیا نەبینیبێت، جگە لەم کارە کە نازانم شانسمان لەگەڵدایە یا نە.

عەلقەمە کوڕی وەقاسی لەیسی دەڵێت: کاتێك تەڵحە و زوبەیر و عایشە بەرێکەوتن، تەڵحەم بینی، ئەو تەنیایی زیاتر لەهەر شتێکی دیکە خۆشدەویست، بینیم ریشی خۆی لەسینەی دەدا، پێموت: ئەی باوکی محەممەد، دەزانم زیاتر لەهەر شتێك حەز بەتەنیایی دەکەیت و دەبینم یاری بەریشی خۆت دەکەیت، ئەگەر لەشتێك پەرێشانی، دانیشە.

وتی: ئەی عەلقەمە، ئێمە دژی کەسانی دیکە، هاودڵ بووین، هەنووکە بووینەتە دوو کێوی ئاسن کەیەکتر دەجووین، سەبارەت بە عوسمان کوڕی عەفان کارێکم ئەنجامداوە کەدەبێت لەتۆبەکەیدا، خوێنی خۆم لەرێگەی تۆڵە سەندنەوەی ئەودا بڕێژم.

وتم: تۆ سامان و خێزانت هەیە، محەممەد کوڕی تەڵحە بگەڕێنەرەوە تا ئەگەر کارەساتێك روویدا، جێگری تۆ بێت.

وتی: ناخوازم ببمە رێگە لەبەردەم هیچ کەسێك کەدەخوازێت لەم رێگەدا هەنگاوێك هەڵبگرێت.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای محەممەد کوڕی تەڵحە و وتم: باشترە بگەڕێیتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر بەلایەك بەسەر تەڵحەدا هات ببیتە جێگری ئەو لەسەر سامان و ماڵ و منداڵەکەی.

وتی: ناخوازم هەواڵی ئەو لەکەسانی دیکە بپرسم.

موجالید کوڕی سەعد دەڵێت: کاتێك دایکی باوەڕداران هاتە بەسرە، نامەیەکی بۆ زەید کوڕی سوحان نووسی بەم ناوەڕۆکە:

لەعایشە کچی ئەبوبەکر دایکی باوەڕداران و خۆشەویستی پێغەمبەر(د.خ)، بۆ منداڵە خۆشەویستەکەی زەید کوڕی سوحان. کاتێك نامەکەم بەدەستت دەگات بۆ

هاوکاری کردنی ئێمە بەرێکەوە، ئەگەر ئەو کارە ناکەیت، خەڵکان لەدەوری عەلی کوڕی ئەبی تالیب دوور بخەرەوە.

دەڵێت: زەید لەوەلامدا نووسی:

لەزەید کوڕی سوحان بۆ عایشە کچی ئەبوبەکر، خۆشەویستی پێغەمبەر(د.خ)، ئەگەر لەم کارە خۆت بەدوور بگریت وبۆ ماڵەکەت بگەڕێیتەوە، کوڕە خۆشەویستەکەی تۆم، جیاواز لەوە یەکەم کەسم پشت دەکەمەوە تۆ.

## بەرێکەوتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ بەسرە

یەزید زەخم دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمەدینە بوو، لەمەبەستەکەی عایشە و زوبەیر ئاگادار بوویەوە کە روویان کردۆتە عێراق، بەخێرایی بەرێکەوت و هیوادار بوو پێیان بگاتەوە و بیانگەڕێنێتەوە. بەلام کاتێك گەیشتە رەبزە، لەدوور کەوتنەوەی ئەوان ئاگادار بوویەوە. چەند رۆژێك لەرەبزە مایەوە، هەواڵی بۆ هات کە ئەو کەسانە مەبەستی ڕۆشتن بۆ بەسرەیان لەسەردایە، ئاسوودە بوو و وتی: زیاتر خەڵکانی کوفەم خۆشدەوێت چوونکە سەرکردەکانی عەرەب لەناو ئەواندان. نامەی بۆ نووسین: لەناو هەموو شارەکان ئێوە هەڵبژارد و هەنووکە لەرێگەدام.

عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی لەیلی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ خەڵکانی کوفەی نووسی:

بسم الله الرحمان الرحيم. ئێوەم هەڵبژارد و لای ئێوە نیشتەجێ دەبم چوونکە دەزانم خواوەند و پێغەمبەرتان خۆش دەوێت، هەرکەس پەیوەستی من بێت و هاوکاری بکات، بەبانگێشتی راستی رازی بووە و ئەرکەکانی سەرشانی ئەنجام داوە.

تەڵحە کوڕی ئەعەلەم دەڵێت: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و محەممەد کوڕی عەونی بۆ کوفە نارد.

خەڵکان بۆ راوێژ کردن سەبارەت بەبەرێکەوتن لەدەوری باوکی موسا کۆبوونەوە.

باوکی موسا وتی: هەرکەس خوازیاری ئەو دنیایە، بمێنێتەوە و هەرکەس خوازیاری ئەم دنیایە، بەرێکەوێت. خۆتان دەزانن.

دەڵێت: وتەکەی باوکی موسا بەگوێی دوو محەممەدەکە گەیشتەوە و خۆیان لەو

بەدوور گرت و بەشێوەیەکی توند پەرسڤیان دایەوە. باوکی موسا وتی: سوێند بەخوا بەیعەتی عوسمان کوڕی عەفان لەئەستۆی من و هاوڕێکەی ئێوەدایە، ئەگەر بخوازین، بجەنگین، ناجەنگین تا ئەو کاتەی هەموو بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان لەهەر شوێنێك بن، بکوژرێن.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەکۆتاییەکانی مانگی رەبیع الاولی ساڵی سی و شەشی کۆچی لەمەدینە هاتەدەر. خوشکەکەی عەلی کوڕی عودەی لەتیرەی عەبدشەمس، هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

((خواوەندا وشترەکەی عەلی لەپێ بخە

و هەڵگرتنی ئەو بۆ وشترەکەی پیرۆز مەکە

بزانن عەلی کوڕی عودەی هاوڕێیەتی ئەو ناکات.))

شەعبی دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەرەبزە دابەزی، دەستەیەك لەخەڵکانی تەی لەدەوری کۆبوونەوە، پێیان وت: دەستەیەك لەخەڵکانی تەی هاتوون، دەستەیەکیان دەخوازن پەیوەستی ئوردووەکەی تۆبن و دەستەیەك دەخوازن سلاوت لێ بکەن.

وتی: خوا پاداشتی چاکەی هەمووان بداتەوە، خواوەند کۆچکەرانی پێش خەڵکانی دیکە خستووە و پاداشتی گەورەی بۆ لەبەرچاو گرتوون.

دەڵێت: ئەوان لەدەوری کۆبوونەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: چۆن لەئێمە دەڕوانن؟

وتیان: چاکەکار و دڵخواز.

وتی: خواوەند پاداشتی چاکەتان بداتەوە چوونکە بەدڵخواز باوەڕتان بەئیسلام هێنا و شەڕتان لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان کرد و زەکاتی خۆتان بێ کەم و کوڕی گەیاندە دەستی موسوڵمانان.

دەڵێت: سەعید کوڕی عوبەیدی تایی هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، دەستەیەك دەتوانن مەبەستی دڵیان بهێنە سەرزمان، سوێند بەخوا زمانی من تواناى ئەو کارەی نییە، هەوڵ دەدەم و هیوادارم خواوەند توانایی ئەو کارەم پێبدات. من بەنهێنی و ئاشکرا چاکەخوازی تۆم و لەهەموو شوێنێك شەڕی نەیارەکانت دەکەم.

تۆ بەشیاوی مافێك دەزانم هیچ كەس شیاوی نییە بەهۆی لەپێشی و نزیكیت لە پێغەمبەر(د.خ).

عەلی كوڕی ئەبی تالیب وتی: خواوەند بتبەخشێت، خواوەند مەبەستەكەتی هێنایە سەرزمان.

دەڵێت: سەعید لەسەفین كوژرا.

محەممەد دەڵێت: كاتێك عەلی كوڕی ئەبی تالیب گەیشتە رەبزە، لەویٚ مایەوە و محەممەد كوڕی ئەبی بەكر و محەممەد كوڕی جەعفەری بۆ كوفە نارد. نامەیەكی نووسی بەم ناوەرۆكە:

((من لەناو شارەكان و خەڵكان ئێوەم هەڵبژارد، بۆ چارەسەر كردنی ئەم پێشهاتانە خوازیاری هاوكاری ئێوەم. هاوەڵانی دینی خواوەند بن و هاوكاریمان بكەن. چاكەسازی ئەوەیە،ئێمە خوازیارین هەموو ئومەتی ئیسلام ببنە برای یەك، هەركەس خوازیاری ئەمە بێت، داوای راستی دەكات و راست كردارە و هەركەس بێزارتر بێت، لەراستییەكان بێزارە.))

دەڵێت: ئەو دووانە ڕۆشتن، عەلی كوڕی ئەبی تالیب لەرەبزە مایەوە و سەرقاڵی خۆ ئامادە كردن بوو، كەسی بۆ مەدینە نارد و ئەوەی لەسیلاح و چوارپێی دەیویست، داوای كرد. فەرمانەكانی خۆی ڕەوانە كرد و وتارێكی بۆ خەڵكان خوێندەوە، وتی:

((خواوەند دوای دوژمنایەتی و نەزانی بەئیسلام رێزی لێگرتین و لەپێشی پێبەخشین، ئێمەی كردە برای یەك. خەڵكان تا ئەو كاتەی خواوەند دەیویست، بەمشێوە بوون، ئیسلام دینیان و راستی لەناو ئەواندا بڵاو بوو، قورئان پێشەوا بوو تا ئەو كاتەی ئەم پیاوە بەدەستی ئەم خەڵكە كەشەیتان هەڵیخراندن، كوژرا، دڵنیا بن ئەم خەڵكەیش بەناچاری بڵاوەی لێدەكەن بەهەمان شێوە كە ئۆمەتەكانی پێشوو بڵاوەیان لێكردووە، لەهەموو شەڕ و بەڵاكان پەنا بۆ خواوەند دەبەین.))

وتارێكی دیكەی خوێندەوە و وتی:

((بەناچاری ئەوەی دەبێت رووبدات، روودەدات، بزانن ئەم ئۆمەتە دەبنە حەفتا و سیٚ بەش، لەهەمووی خراپتر ئەو دەستەیە خۆی بۆ من دەگەڕێنێتەوە بەڵام پێبەندی كردەوەكانی من نەبێت، دەزانن و بینیوتانە، پێبەندی دینەكەی خۆتان بن،

لەرێنومایییەکانی پێغەمبەر(د.خ) کەڵك وەربگرن و شوێنکەوتەی سوونەتەکان بن، لەوەی بەنامۆ و ئاڵۆزی دەزانن پەنا بۆ قورئان ببەن، لەهەر شتێك دووری خستنەوە، دوور بکەونەوە، خواوەند بەپەروەردگاری خۆتان بزانن و ئیسلام بەدین و محەممەد بە پێغەمبەر(د.خ) و قورئان بەداوەر و پێشەوای خۆتان.))

هەروەها محەممەد دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەیخواست لەرەبزەوە بەرەو بەسرە بڕوات، کوڕی روفاعە کوڕی رافیع وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، دەخوازیت ئێمە بۆ کوێ ببەیت؟

وتی: ئەوەی دەمانەوێت و دەیخوازین، ئاشتییە، ئەگەر رازی بن و بەبانگێشتەکەی ئێمە رازی بن.

وتی: ئەگەر رازی نەبوون؟

وتی: گوێ لەبەڵگە و پاساوەکانیان دەگرین و مافەکانیان پێ دەدەین و خۆڕاگری دەکەینە پیشە.

وتی: ئەگەر رازی نەبوون؟

وتی: تا ئەو کاتەی کاریان پێمان نەبێت، کارمان پێیان نییە.

وتی: ئەگەر دەستبەردارمان نەبوون؟

وتی: بەرگری دەکەین.

وتی: پەسەندە.

دەڵێت: حەجاج کوڕی غەزییەی ئەنساری وتی: بەکرداری خۆمان تۆ رازی دەکەین بەهەمان شێوە کە بەوتارەکانت ئێمەت رازی کرد. هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((تێبگە، تێبگە

پێش ئەوەی دەرفەت لەدەست بڕوات

ئێمە بۆ لای ئەو دەنگە ببە

گیانم نەمێنێت ئەگەر لەمەرگ بترسم.))

وتی: مژدەی سەرکەوتن دەدەم چوونکە خواوەند ئێمەی بەئەنسار ناو بردووە.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرێکەوت. باوکی لەیلی کوڕی عەمرۆ کوڕی

جەراح پێشەنگی سوپاکەی ئەو بوو. ئالاّ لەدەستی محەممەد کوڕی، عەبدوللە کوڕی عەباس فەرماندەی باڵی ڕاست، عەمرۆ کوڕی ئەبی سەلمە یا عەمرۆ کوڕی سوفیان کوڕی عەبدولئەسەد فەرماندەی باڵی چەپ بوو. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ حەوتسەد و شەست کەس بەڕێکەوت. شاعیرەکەی ئەو هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((پەلە بکەن، پەلە بکەن

کاتی ڕۆشتنە

چاکە بڵێن تا بەچاکە بگەن

شەڕ لەگەڵ تەڵحە و زوبەیر بکەن.))

شاعیرەکەی لەبەردەم عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە دەڕۆشت، عەلی کوڕی ئەبی تالیب سوار وشترە سوورەکەی خۆی بوو. ئەسپێکی بەڵەکی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا.

دەڵێت: لەفید گەنجێك لەبنەماڵەی سەعد کوڕی سەعلەبە بەناوی مورە ڕووبەڕووی خەڵکان بوویەوە، وتی: ئەوان کێن؟

وتیان: سەروەری باوەڕداران.

وتی: سەفەرێکە لەناوچوون، لێوانلێو لەخوێنی خەڵکانی لەناوچوو.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەمەی بیست و بانگی کرد، وتی: ناوت چییە؟

وتی: مورە.

وتی: خواوەند دەمت بشکێنێت، جادووگەری خەڵکانیت؟

وتی: نا پێشگۆم.

کاتێك لەفید دابەزی، خەڵکانی ئەسەد و تەی لەدەوری کۆبوونەوە و خۆیان نیشاندا.

وتی: لەشوێنەکانی خۆتان بمێننەوە، تەنیا موهاجیرەکان بۆ ئەم کارە بکەن.

دەڵێت: پێش بەڕێکەوتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، یەکێك لەخەڵکانی کوفە هاتە فید کەپرسی: کێیت؟

وتی: عامر کوڕی مەتەری لەیسی شەیبانی.

وتی: باس و خواسەکان چین؟

پیاوی شەیبانی باس و خواسەکانی بۆ دەگێڕایەوە تا گەیشتە سەر باسی باوکی موسا.

وتی: ئەگەر خوازیاری ئاشتیت، باوکی موسا پیاوی ئەم کارەیە و ئەگەر خوازیاری جەنگیت، ئەو لەبیر بکە.

وتی: سوێند بەخوا دەخوازم ئاشتی سەقامگیر بێت.

وتی: چاکەخوازی تۆبووم.

دەڵێت: پیاوی شەیبانی و عەلی کوڕی ئەبی تالیب بێدەنگ بوون.

محەممەد کوڕی حەنیفە دەڵێت: عوسمان کوڕی حەنیف کەمووی سەر و ڕیش و دەم و چاویان هەڵکەندبوو، لەڕبەزە ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، منت بەریشەوە نارد، بێ ڕیش گەڕامەوە بۆ لات.

وتی: پاداشت و چاکەت دەستکەوت، پێش من دوو کەسی دیکە خەلافەتیان گرتەدەست و بەپێی فەرموودەکانی قورئان جووڵانەوە، دووای ئەوان سێیەم کەس کارەکانی لەئەستۆ گرت، دووای ئەو بەیعەتیان لەگەڵ من کرد بەهەمان شێوە تەڵحە و زوبەیریش، بەڵام بەیعەتی منیشان شکاند و خەڵکانیان دژی من هاندا. سەیرە ملکەچی فەرمانەکانی ئەبوبەکر و عومەر کوڕی خەتاب بوون، سوێند بەخوا من لەرابردووان کەمتر نیم، خواوەندا لەمەبەستەکەیان دووریان بخەرەوە و بەئەنجامی مەگەیێنە.

محەممەد دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشتە سەعلەبییە، لەچارەنووسی عوسمان کوڕی حەنیف و پاسەوانەکانی ئاگادار بوویەوە، لەناو خەڵکان وتارێکی خوێندەوە و ئەوانی لەو پێشهاتە ئاگادار کرد، وتی: خواوەند من لەزیانی کوشتنی موسوڵمانان کەتەڵحە و زوبەیر پێی گرفتار بوون، بەدوور بگرە و هەمووان لەو زیانە بپارێزە.

دەڵێت: کاتێك گەیشتە ئەساد، لەچارەنووسی حەکیم کوڕی جەبەلە و بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان ئاگادار بوویەوە، وتی: الله اکبر، تەڵحە و زوبەیر تۆڵەی خۆیان سەندەوە، کێ من لەدەستی ئەوان رزگار دەکات. ئەم ئایەی خوێندەوە:

((ما اصاب من مصیبة فی الارض و لافی انفسکم الا فی کتاب من قبل ان نبرأها ان

ذلكم على الله يسير.

واتاكەی: هەر بەلآیەك لەزەویدا بلآو ببێتەوە یا بەگیانتان بگات، پێش ئەوەی بیئافرێنین، لەنامەیەكدا بووە و ئەمە بۆ خواوەند ئاسانترە.))

كاتێك گەیشتنە زیقار، عوسمان كوڕی حەنیف ڕۆشتە لای، موو بەروخسارییەوە نەدەبینرا، كاتێك عەلی كوڕی ئەبی تالیب ئەوی بینی، سەیری هاوەلآنی خۆی كرد و وتی: ئەم پیاوە كاتێك ئێمەی بەجێهێشت، پیر بوو، هەنووكە گەنج بۆتەوە.

دەڵێت: خەڵكان لەزیقار مانەوە، چاوەڕوانی هەر دوو محەممەدەكەیان دەكرد. لەچارەنووسی خەڵكانی ڕەبیعە و ئەوەی عەبدقەیس لەسەر ڕێگە جێگیر ببوون، ئاگادار بوویەوە، وتی: عەبدقەیس باشترین تیرەی بەیعەیە و هەموو خەڵكانی ڕەبیعە چاكەكارن. هۆنراوەیەكی خوێندەوە بەم ناوەڕۆكە:

((هاوار لەرەبیعە

ڕەبیعەی ملكەچ و گوێرایەڵ

پێشهاتێك پێش من بەسەر ئەواندا باری

عەلی كوڕی ئەبی تالیب بەشێوەیەكی شیاوی بیستن بانگێشتی كردن

و بەهۆیەوە پێگەیەكی بەرزیان پێبڕا.))

دەڵێت: خەڵكانی بەكر كوڕی وایا دەیانخواست لەگەڵی بڕۆن بەلآم هاوشێوەی خەڵكانی تەی و ئەسەد وەلآمی دانەوە.

دەڵێت:

كاتێك محەممەد و محەممەد گەیشتنە كوفە و نامەی سەروەری باوەڕدارانیان بەباوكی موسادا و فەرمانەكانی ئەویان بۆ خەڵكان خوێندەوە و هیچ وەلآمێكیان دەستنەكەوت، لەشەودا دەستەیەك لەبیرمەندەكان ڕۆشتنە لای باوكی موسا و وتیان: سەبارەت بەڕۆشتن چ بۆچوونێكت هەیە؟

وتی: دەبوا دوێنێكە هەڵوێست وەربگرین، نەك ئەمڕۆ، ئەو سستی و لاوازییەی لەرابردوو لەخۆتان نیشانتاندا، ئەم بارودۆخەی هێنایە بوون. دوو شت ماوەتەوە: مانەوە ڕێگەی ئاخیرەتە و ڕۆشتن، ڕێگەی دنیایە، هەڵبژێرن.

كەس بەرێنەكەوت. دوو نێردراوەكە تووڕە بوون و بەشێوەیەكی توند لەگەڵ باوكی موسا دووان.

باوکی موسا وتی: سوێند بەخوا بەیعەتی عوسمان کوڕی عەفان لەئەستۆی من و هاوڕێکەی ئێوەدایە، ئەگەر بەناچاری دەبێت بجەنگین، ناجەنگین تا ئەو کاتەی هەموو بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان لەهەر شوێنێك بن، بکوژرێن.

دەڵێت: نێردراوەکان بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕانەوە و لەزیقار پەیوەستی بوون. دەنگ و باسەکانیان بۆ گێڕایەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب سوار لەسەر وشتر بەرێکەوت. بۆ گەیشتن پەلەی بوو.

بەئەشتەری وت: ئەی ئەشتەر، دەبێت کاروبارەکانی باوکی موسا سامان بدەیت، تۆ و عەبدوللە کوڕی عەباس بڕۆن و ئەوەی بەفیڕۆتان داوە، ڕێکیبخەنەوە.

دەڵێت: عەبدوللە کوڕی عەباس و ئەشتەر ڕۆشتن و گەیشتنە کوفە، لەگەڵ باوکی موسا پەیڤین و بۆ نەرم کردنی ئەو داوای هاوکارییان لەدەستەیەك لەخەڵکانی کوفە کرد. باوکی موسا بەخەڵکانی کوفەی وت: من لەپێشهاتی جورعە لەگەڵ ئێوەدا بووم، هەنووکەیش لەگەڵ ئێوەدام.

خەڵکانی کۆکردەوە و قسەی بۆ کردن، وتی: ئەی خەڵکینە، هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) کە لەجەنگەکاندا شان بەشانی ئەو جەنگاون، کاروبارەکانی تایبەت بەخوا و پێغەمبەر(د.خ) باشتر لەخەڵکانی دیکە دەزانن، ئێوە مافێکتان بەسەر ئێمەوە هەیە و هەنووکە مافەکەتان بۆ دەگەڕێنینەوە، بۆچوونی ڕاست ئەوەیە دەسەڵاتی خواوەند بەلاواز لەقەڵەم نەدەن، بۆچوونێکی ڕاستی دیکە ئەوەیە هەرکەس لەخەڵکانی مەدینە بۆ لای ئێوە دێت، بیگەڕن و بیگەڕێننەوە تا یەك بڕیاربدەن، خۆتان مەخەنە ناو ئەم گێژاوەوە چوونکە ئەوان باشتر دەزانن کێ بۆ خەلافەت شیاوترە، ئێستا کەبارودۆخ بەمشێوەیە، فیتنەیەکی دیکەیە، لەم فیتنەیەدا خەوتوو لەبێدار باشترە، بێدار لەدانیشتوو باتشرە، دانیشتوو لەراوەستاو باشترە، وەستاو لەسوار باشترە. هۆکارێك لەهۆکارەکانی عەرەب بن، ششمێرەکان بکەنە ناو کالاَن، سەری ڕمەکان لێبکەنەوە و زێی کەوانەکان بقرتێنن، پەنای ستەملێکراوەکان بدەن تا بارودۆخ باشتر ببێت وئەم فیتنەیە نەمێنێت.

محەممەد دەڵێت: کاتێك کوڕی عەباس بەم دەنگ و باسە بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕایەوە، حەسەنی کوڕی ڕەوانە کرد، عەمار کوڕی یاسری لەگەڵ نارد،

پێی وت: بڕۆ و ئەوەی بەفیڕۆت داوە، سامانی بدە.

دەڵێت: هەردووکیان ڕۆشتن تا گەیشتنە بەردەم مزگەوتی کوفە. یەکەم کەس ڕۆشتە لایان، مەسروق کوڕی ئەجدەع بوو، ڕووی کردە عەمار و وتی: ئەی باوکی یەقزان، بۆ عوسمان کوڕی عەفانتان کوشت؟

وتی: بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی نەشیاو مامڵەی لەگەڵ دەکردین و لێی دەداین.

وتی: سوێند بەخوا ئەو تۆڵەی سەندتانەوە هاوشێوەی ئەو ستەمە نییە لێتان کراوە، ئەگەر خۆڕاگریتان دەکردە پیشە، باشتر بوو.

باوکی موسا هات و حەسەنی بینی، لای خۆی دایینیشاند و ڕووی کردە عەمار و وتی: ئەی باوکی یەقزان، تۆیش یەکێك بووی لەو کەسانەی هێرشتان کردە سەر سەروەری باوەڕداران و خۆت تێکەڵ بەخراپەکاران کرد.

وتی: ئەو کارەم نەکرد، بەلاّم پێم ناخۆش نەبوو.

حەسەن وتووێژەکەی ئەوانی بڕی، ڕووی کردە باوکی موسا و وتی: ئەی باوکی موسا بۆ خەڵکان لەئێمە دوور دەخەیتەوە، سوێند بەخوا جگە لەئاشتی خوازیاری هیچی دیکە نین و لەکەسێکی هاوشێوەی سەروەری باوەڕداران نابێت نیگەران بین.

وتی: دایك و باوکم قوربانی تۆبن، ڕاست دەکەیت، بەلاّم ئەو کەسەی ڕاوێژی پێدەکرێت، ئەمانەتدارە، لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: فیتنەیەك ڕوودەدات و تیایدا ئەو کەسەی دانیشتووە لەوەی بەپێوە وەستاوە، باشترە، ئەوەی وەستاوە، لەوەی دەڕوات باشترە، ئەوەی دەڕوات لەوەی سوارە باشترە. خواوەند ئێمەی کردۆتە برای یەك و سامان و خوێنی ئێمەی پاراستووە، فەرموویەتی:

((یا ایها الذین آمنوا، لاتأکلوا اموالکم بینکم بالباطل الا ان تکون تجارة عن تراض منکم و لا تقتلوا انفسکم ان الله کان بکم رحیما.

واتاکەی: ئێوە کەباوەڕتان هەیە، سامانەکان بەناڕەوا مەخۆن مەگەر مامڵەیەك بەرەزامەندی ئێوە، خۆتان مەکوژن چوونکە خواوەند لەگەڵ ئێوە بەخشندەیە.))

هەروەها دەفەرمێت:

((ومن یقتل مؤمنا متعمدا فجزائه جهنم خالدا فیها و غضب الله علیه و لعنه و اعدله عذابا عظیما.

واتاکەی: هەرکەسێك باوەڕدارێك بەئەنقەست بکوژێت، سزاکەی مانەوەیی هەمیشەییە لەجەهەننەمدا و تووڕەیی و نەفرەتی خواوەندی بەسەردا دەبارێت و سزایەکی گەورەی بۆ ئامادە دەکرێت.))

عەمار تووڕە بوو، ئەم وتەی پەسەند نەکرد، هەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، ئەم فەرمودەیە تایبەتە بەو چوونکە تۆ لەکاتی فیتنەدا دانیشیت باشترە لەوەی بەپێوە بیت.

یەکێك لەخەڵکانی تەمیم بەعەماری وت: ئەی بەندە، بێدەنگ بە، دوێنێ لەگەڵ ئاژاوەچییەکان بوویت و هەنووکە نەزانانە لەگەڵ سەرکردەی ئێمە دەدوێیت؟

زەید کوڕی سوحان و دەستەیەکی دیکە پەلاماریاندا. خەڵکان کەوتنە جموجۆڵ. باوکی موسا خەڵکانی لەیەك جوێ کردەوە، ڕۆشتە سەر مینبەر، خەڵکان ئارام بوونەوە، لەم کاتەدا زەید سوار لەسەر کەرێك هاتە بەردەم دەرگای مزگەوتەکە. ئەو هەڵگری دوو نامەی دایکی باوەڕداران بۆ خەڵکانی کوفە بوو. نامەی خەڵکان بەگشتی و نامەی کەسە تایبەتەکان بەم شێوە بوو:

ئەی خەڵکینە، لەماڵەکانی خۆتان بمێننەوە مەگەر ئەو کاتەی دەخوازن شوێن بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان بکەون.

کاتێك نامەکەی خوێندەوە، وتی: فەرمانێکیان بەدایکی باوەڕداران داوە، فەرمانێکیش بەئێمە، فەرمانیان بەوداوە لەماڵەکەی بمێنێتەوە، فەرمانیان بەئێمەداوە بجەنگین تا ئەو کاتەی فیتنە نەمێنێت. ئەو فەرمانەکەی خۆی بۆ ئێمە ڕەوانە کردووە و ئەرکەکانی ئێمەی گرتۆتە ئەستۆ.

شەیس کوڕی ڕەبیعی هەستا، وتی: ئەی عەمانی، زەید لەخەڵکانی عەبدقەیس بوو نەك بەحرەین، لەجەلەولا دزیت کرد و دەستیان بڕیتەوە، پێچەوانەی دایکی باوەڕداران دەدوێیت خوا بتکوژێت، فەرمانی عایشە هەمان فەرمانی پەروەدگارە بۆ ئەوەی ئاشتی لەنێوان خەڵکان سەقامگیر بێت، بەوشێوەیە قسە دەکەیت، بەڵام سوێند بەخواوەندی کەعبە، ئاژاوە لەناو خەڵکان دروست دەکەیت.

باوکی موسا وتی: ئەی خەڵکینە گوێڕایەڵی وتەکانی من بن، ببننە یەکێك لەپشت و پەناکانی عەرەب تا ستەملێکراو پەناتان بۆ بێنێت و ترساو لەناو ئێوەدا

ئاسوودە بێت، ئێمە هاوەڵانی محەممەد لەوەی بیستوومانە باشتر ئاگادارین، فیتنە کاتێك سەرهەڵدەدات، گومان دەخولقێنێت و کاتێك کۆتایی پێدێت، ئاشکرا دەبێت، ئەم فیتنەیە، رەنجهێنەرە هاوشێوەی ژانەسك کە لەگەڵ بای شەماڵ و باشوور و سەبا و دەبوور دێت و لەناکاو ئارام دەگرێت و کەس نازانێت لەکوێوە دێت، شمشێرەکان بکەنە کالآن، رمەکان کورت بکەنەوە، تیرەکان بخەنە ناو تیردان و زێکان بقرتێنن، لەماڵەوە دانیشن، ئەگەر قورەیشییەکان پێداگری بکەن لەوەی لەماڵی کۆچ بێنەدەر و لەخەڵکانی شارەزا بۆ کاروباری خەلافەت خۆ بەدوور بگرن، خۆیان لێ بەدوور بگرن تا کەڵێنەکانی خۆیان پڕ بکەنەوە، ئەگەر ئەو کارە بکەن، لەبەرژەوەندی و سوودی خۆیانە و ئەگەر نەیکەن، زیان بەسەر خۆیاندا دەبارێنن، رۆن لەمەشکەکانی خۆیانەوە دەرژێت، داوای مۆجیاریم لێ بکەن نەك فرت و فێڵ، شوێنکەوتەی من بن تا دین و دنیاتان تەندروست بێت، هەرکەس ئاگری ئەم ئاژاوەیە خۆش بکات، خۆی دەسوتێنێت.

زەید هەستا، دەستە براوەکەی خۆی بەرز کردەوە و وتی: ئەی عەبدوللە کوڕی قەیس، فورات لەرێگەکەی خۆی بگەڕێنەرەوە، لەوێوە کەسەرچاوە دەگرێت تا بۆ سەرچاوەکەی بگەڕێتەوە، ئەگەر تواناى ئەنجامدانی ئەو کارەت بوو، توانای ئەنجامدانی ئەم کارەیشت دەبێت، لەو کارەی بۆ ئەنجامدانی بەتوانا نیت، خۆت بەدوور بگرە. ئەوسا ئەم دوو ئایەی قورئانی خوێندەوە:

((الم، احسب الناس ان يتركوا ان يقولوا آمنا و هم لا يفتنون. و لقد فتنا الذين من قبلهم فليعلمن الله الذين صدقوا و ليعلمن الكاذبين.

واتاکەی: ئەلف، لام، میم، مەگەر ئەم خەڵکە گومان دەکەن هەر ئەوەندەی بڵێن، باوەڕمان هەیە، پشتگوێ دەخرێن و گرفتاری ئەزمون نابن. کەسانی پێش ئەوانمان تاقی کردەوە تا خواوەند راستگۆیان ئاشکرا بکات و درۆزنەکانیش بەهەمان شێوە.))

وتی: بۆ لای سەروەری باوەڕداران و سەروەری موسوڵمانان بەرێکەون. هەمووان بەرێکەون تا کاری راست و دروستتان ئەنجام دابێت.

قەعقاع کوڕی عەمرۆ هەستا و وتی: من خێرخواز و دڵسۆزی ئێوەم دەخوزام رێگای چاکە بگرنە بەر، قسەیەکی ڕاستتان پێ دەڵێم، کردەوەی راست هەمان وتەی

سەرکردەیە، ئەگەر، ئەگەری بێت،بەڵام ئەوەی زەید باسی دەکات، زەید دەستی لەم کارەدا بووە و چاوەڕێی خێرخوازی لەو مەکەن، کەسێك دەستی لە ئاژاوەدا هەبێت لە ئاژاوە دوور ناکەوێتەوە. قسەی ڕاست ئەمەیە بەناچاری دەبێت خەلیفەیەك کاروباری تایبەت بەخەڵکان ڕێکبخات، هێز لەستەمکار بستێنێت و ستەملێکراو بەهێز بکات، هەنووکە عەلی کوڕی ئەبی تالیب خەلیفەی موسوڵمانانە، بانگێشتێکی دادپەروەرانە و پێشنیاری سەقامگیر بوونی ئاشتی دەکات، بەرێکەون و لەنزیکەوە ڕووداوەکان ببین و ببیستن.

سیحان وتی: ئەی خەلکینە، بۆ کاروبارەکان و ئەم خەڵکە پێویستە پێشەوایەك بوونی هەبێت کەستەم نەهێڵێت و هاوکاری ستەملێکراوەکان بکات، خەڵکان لەدەوری یەك کۆبکاتەوە، هەنووکە خەلیفەی ئێوە پێشنیار دەکات لێکۆڵینەوە لەکاری خۆی و هاورێکەی بکەن. ئەو، ئەمینە و شارەزای کاروباری دین، هەرکەس دەخوازێت، بێت، بەرێکەوێت چوونکە ئێمە بەرەو لای ئەو دەڕۆین.

عەمار دوای تووڕە بوون هاتەسەرخۆ، کاتێك سیحان کۆتایی بەوتەکانی هێنا، کەوتە گۆ، وتی: ئەم کوڕە پووری پێغەمبەر(د.خ)، ئێوە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) و تەڵحە و زوبەیر هاندەدات. شایەتی دەدەم عایشە لەم دنیا و ئەو دنیا هاوسەری پێغەمبەرە، لێکۆڵینەوە لەراستییەکان بکەن و شان بەشانی ئەو بجەنگن.

کەسێك وتی: ئەی باوکی یەقزان! ڕاستی لەگەڵ کەسێکدا کەدەڵێی یەکێکە لەبەهەشتییەکان دژی ئەو کەسەی بەهەشتیی نییە.

حەسەن کوڕی عەلی وتی: ئەی عەمار کۆتایی پێبێنە، هەرکەسێك بۆ ئەنجامدانی کارێك بەتوانایە.

حەسەن هەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، وەڵامی داواکەی خەلیفەی خۆتان بدەنەوە و بۆ پەیوەست بوون بەبراکانتان بەرێکەون. دەبێت کەسانێك قۆڵ هەڵماڵن، سوێند بەخوا ئەگەر بیرمەندەکان بەو کارەوە سەرقاڵ بن بۆ ئێستا و داهاتوو باشترە، بەبانگێشتەکەی ئێمە ڕازی بن و لەم زیانە هاوبەشەدا هاوکاریمان بکەن.

خەڵکان دڵیان نەرم و ڕازی بوون. لەم کاتەدا دەستەیەك لەخەڵکانی تەی ڕۆشتنە

لای عودەی، وتیان: بۆچوونی و فەرمانی تۆ چییە؟

وتی: بابزانم خەڵکان چی دەکەن.

کاتێك لەوتەکانی حەسەن و کەسانی دیکە ئاگاداریان کردەوە، وتی: ئێمە بەیعەتمان لەگەڵ ئەم پیاوە بەستووە، هەنووکە پێشنیاری کارێکی شیاومان پێدەکات، دەخوازێت لێکۆڵینەوە لەم کارەساتە گەورەیە بکەین.

هیند کوڕی عەمرۆ وتی: سەروەری باوەڕداران داوای ئێمەدەکات و نێردراوەکانی خۆی بۆ لای ئێمە ڕەوانە کردووە، کوڕەکەی هاتۆتە لامان، گوێ لەوتەکانی بگرن و فەرمانەکانی بەکار ببەن، پەیوەستی خەلیفەکەی خۆتان بن و شان بەشانی ئەو لێکۆڵینەوە لەم کارە و بەبۆچوونەکانی خۆتان هاوکاری بکەن.

حوجر کوڕی عودەی وتی: ئەی خەڵکینە بەبانگێشتەکەی سەروەری باوەڕداران ڕازی بین. بەرێکەون، من یەکەم کەس لەئێوەم پەیوەستی دەبم.

ئەشتەر هەستا، باسی ئیسلام و ڕۆژگاری جاهلییەتی کرد و ئاماژەی بە عوسمان کوڕی عەفاندا.

مەقتەع کوڕی هەیسەمی بوکایی وەڵامی دایەوە: بێدەنگ بە، خواوەند روخسارت قێزەون بکات، سەگێکیان بەرەڵا کردووە و دەوەڕێت. ئەویان لەجێگەی خۆی دانیشاند.

مەقتەع جارێکی دیکە هەستایە سەرپێی، وتی: سوێند بەخوا خۆڕاگری ناکەین ئەگەر دووای ئەمە کەس بەخراپە باسی پێشەواکەمان نەکات. بەبۆچوونی ئێمە عەلی کوڕی ئەبی تالیب کەسێکی شیاوە، سوێند بەخوا ئەمە شیاوی عەلی نییە کەسێك لەکۆبوونەوەکانمان زمان درێژی بکات، بەو کارەی پێشنیارتان پێدەکات، ڕازی بین.

حەسەن وتی: ئەو پیرە پیاوە ڕاست دەکات.

هەروەها وتی: ئەی خەڵکینە، من بەرێدەکەوم، هەرکەس دەخوازێت سوار لەسەر چوارپێ لەگەڵ من بێت، هەر کەس دەخوازێت لەرێگەی ئاوەوە بێت.

دەڵێت: نۆ هەزار کەس لەگەڵی بەرێکەوتن. دەستەیەکیان ڕێگەی دەشتیان گرتەبەر و دەستەیەکیان لەرێگەی ئاوەوە ڕۆشتن. خەڵکی هەر ناوچەیەك سەرکردەیەکیان بوو. شەش هەزار کەس ڕێگەی دەشتیان گرتەبەر و دوو هەزار و هەشت سەد کەس لەرێگەی ئاوەوە بەرێکەوتن.

ئەسەد کوڕی عەبدوللە دەڵێت: عەبدخەیری خیوانی ڕۆشتە لای باوکی موسا، وتی: ئەی باوکی موسا، ئایا ئەم دوو پیاوە، تەڵحە و زوبەیر، بەیعەتیان لەگەڵ عەلی بەستووە؟

وتی: بەڵێ.

وتی: ئایا عەلی کوڕی ئەبی تالیب کارێکی کردووە شیاوی شکاندنی بەیعەتەکەی بێت؟

وتی: نازانم.

وتی: هەرگیز نازانیت، ئێمە پشتگوێت دەخەین تا بزانیت، مەگەر کەس لەم فیتنەیە کەبە فیتنە ناوی دەبەیت، خۆی بەدوور گرتووە. بوون بەچوار دەستە: عەلی لەدەرەوەی کوفەیە، تەڵحە و زوبەیر لەبەسرەن، معاویە لەشامە و دەستەیەکی دیکە لەحیجازن کە تالآنی بەدەست ناهێنن و بۆ جەنگی دوژمنان ناڕۆن.

باوکی موسا وتی: ئەوان باشترن لەهەمووان، ئەمە فیتنەیە.

عەبدخەیر وتی: ئەی باوکی موسا، کەسێکی دەغەڵکاریت.

دەڵێت: ئەشتەر ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، من پێش ڕۆشتنی ئەو دوو کەسە پیاوێکم بۆ لای خەڵکانی کوفە نارد، نەیتوانی هیچ کارێك بکات و گەڕایەوە. ئەم دوو کەسە بۆ ئەو کارە شیاون و کارەکان بەدڵخوازی تۆ دەبێت. بەڵام نازانم دەرئەنجامەکەی چی دەبێت. ئەی سەروەری باوەڕداران، خواوەند پایەدارت بکات، من لەدوای ئەوان ڕەوانە بکە چوونکە خەڵکی ئەوشارە شوێنکەوتەی فەرمانەکانی منن، ئەگەر بڕۆمە ناویان هیوادارم کەس لەوان دژایەتی من نەکات.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بڕۆ.

دەڵێت: ئەشتەر بەرێکەوت و گەیشتە کوفە، خەڵك لەمزگەوتی گەورە کۆببوونەوە، ئەشتەر لای هەر هۆزێك گوزەری دەکرد و دەستەیەك لەوانی لەناو مزگەوت یا لەهەر شوێنێکی دیکە دەبینی، پێشنیاری پێدەکردن و دەیوت، هاوڕێ لەگەڵ من بۆ دەرگای کۆشك وەرن. لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکان گەیشتە بەردەرگای کۆشك، بەزۆر ڕۆشتە ناو کۆشکەی. باوکی موسا لەمزگەوت قسەی بۆ خەڵکان

دەکرد و ڕێگەی لێدەگرتن.

دەیوت: ئەی خەڵکینە، ئەمە ئاژاوەیەکە کەڕ و کوێر سەری بەرز کردۆتەوە. لەم ئاژاوەدا ئەوەی خەوتبێت، لەو کەسەی دانیشتووە، باشترە، کەسی دانیشتوو باشترە لەو کەسەی بەپێوە وەستاوە، ئەوکەسەی وەستاوە، باشترە لەوەی دەڕوات، ئەوەی دەڕوات باشترە لەوەی غار دەکات، ئەوەی غار دەکات باشترە لەوەی سوارە. ئاژاوەیەکە هاوشێوەی ژانەسك رەنجهێنەرە، لەشوێنێکی ئەمان و پارێزراوەوە هاتووە و بیرمەند هاوشێوەی منداڵ سەرگەردان دەکات. ئێمە هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) باشتر لەهەر کەسێك شارەزای ئەم ئاژاوەین. کاتێك دێت، گومان دەخولقێنێت و کاتێك کۆتایی پێدێت، ئاشکرا دەبێت.

عەمار لەگەڵ باوکی موسا پەیڤی، حەسەن دەیوت: ئەی بێ دایك! خۆت لەم کارە بەدوور بگرە و لەسەر مینبەر وەرە خوار.

عەمار پێی وت: ئەمەت لە پێغەمبەر(د.خ) بیستووە؟

باوکی موسا وتی: دەستم لەگرێوی ئەم وتەیەم دادەنێم.

عەمار وتی: پێغەمبەر(د.خ) ئەم قسانەی تایبەت بەتۆ هێناوەتە سەرزمان، فەرموویەتی تۆ لەکاتی ئاژاوە خەوتبێت باشترە لەوەی بەئاگا بێت.

عەمار وتی: خواوەند ئەو کەسە ریسوا و زەلیل بکات کەرووبەرووی ئەو دەبێتەوە.

باوکی مریەمی سەقەفی دەڵێت: سوێند بەخوا ئەو رۆژە لەمزگەوت بووم، عەمار بەمشێوەیە لەگەڵ باوکی موسا قسەی کرد. کۆیلەکانی بەڕاکردن هاتن و هاواریان دەکرد، ئەی باوکی موسا، ئەشتەر هاتە ناو کۆشکەکە و ئێمەی دەرکرد.

دەڵێت: باوکی موسا هاتەخوار و ڕۆشتە ناو کۆشکەکە. ئەشتەر بانگی کرد: ئەی بێ دایك! لەکۆشکەکە بڕۆدەر هیوادارم خواوەند گیانت بستێنێت چوونکە لەکۆنەوە ریاکار بوویت. وتی: تا شەو مۆڵەتم پێبدە.

وتی: رازیم، بەڵام ئەمشەو لەناو کۆشکدا ناخەویت.

دەڵێت: خەڵکان دەستیان بەتاڵان کردنی کەل و پەلەکانی باوکی موسا کرد، بەڵام ئەشتەر ڕێگەی ئەو کارەی لێگرتن و لەکۆشکەکە دووری خستنەوە، وتی: دەرمکرد. خەڵکان دەستیان لێ هەڵگرت.

## وەستانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەزیقار

شەعبی دەڵێت: کاتێك خەڵکانی کوفە گەیشتنە زیقار، عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ دەستەیەك و لەناویان عەباس بەخێرهێنانی کردن، وتی: ئەی خەڵکی کوفە! ئێوە شکۆی عەجەمەکان و پاشاکانی ئەوانتان لەناو برد، سوپاکەی ئەوانتان تێکشکاند و میراتی ئەوان بۆ ئێوە مایەوە و ناوچەکەی خۆتان پێ دەوڵەمەند کرد و دژی دوژمنان هاوکاری موسوڵمانانتان کرد. پێشنیارم پێکردن هاوڕێ لەگەڵ ئێمە براکانمان لەبەسرە ببینن، ئەگەر گەڕانەوە، ئەوەیە پێی خوازیارین و ئەگەر پێداگرییان کرد، رێگەی سازگاری دەگرینەبەر و خۆمان لەوان بەدوور دەگرین تا دەستدرێژی دەستپێبکەن، بەخواستی خواوەند هیچ هێزێك بەبێ خواستی خواوەند بوونی نییە.

دەڵێت: حەوت هەزار و دووسەد کەس لەزیقار کۆبوونەوە، خەڵکی عەبدقەیس لەرێگەی نێوان عەلی کوڕی ئەبی تالیب و بەسرە جێگیر ببوون. چەند هەزار کەسێك دەبوون. دوو هەزار و چوارسەد کەس لەرێگەی ئاوەکەدا بوون.

محەممەد دەڵێت: کاتێك خەڵکانی کوفە گەیشتنە زیقار، عەلی کوڕی ئەبی تالیب قەعقاعی بانگ کرد و ئەوی بۆ لای خەڵکانی بەسرە نارد. قەعقاع یەکێك بوو لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ)، پێی وت: سەردانی ئەو دوو پیاوە بکە وپێشنیاری پەیوەست بوون بەکۆمەڵانی خەڵکیان پێبکە و لەمەترسییەکانی دووبەرەکی و ئاژاوە ئاگادارییان بکەرەوە.

پێی وت: سەبارەت بەو بابەتانەی باسی دەکەن و هیچ فەرمانێکم لەو بارەیەوە نەداوە، چی دەڵێیت؟

وتی: ئەوەی فەرمانت پێداوە، ئەوانی لێ ئاگادار دەکەمەوە و ئەگەر باسی بابەتێکیان کرد و نەمانزانی بۆچوونی تۆ چییە، لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەین و بەپێی پێویست و گونجاو وەڵام دەدەینەوە.

وتی: ئەم کارە تەنیا بەئۆدەی تۆ بەردێت.

دەڵێت: قەعقاع بەرەو بەسرە بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە ئەو شارە، سەرەتا

سەردانی دایکی باوەڕدارانی کرد، سڵاوی بۆ نارد و وتی: دایکە گیان! چ هۆکارێك تۆی گەیاندۆتە ئەم ویلایەتە؟

وتی: کوڕم بۆ چاکسازی لەنێوان خەڵکان.

وتی: کەسێك بەدوای تەڵحە و زوبەیر ڕەوانە بکە تا گفتوگۆی من و ئەوان ببیستیت.

دەڵێت: عایشە کەسی نارد و هاتن.

قەعقاع وتی: لەدایکی باوەڕدارانم پرسی چ هۆکارێك ئەوی گەیاندۆتە ئێرە، وتی: کوڕم بۆ چاکسازی لەنێوان خەڵکان، بۆچوونی ئێوە چییە، ئایا ڕازین یا نارازی؟

وتیان: ڕازین.

وتی: پێم بڵێن شێوازی ئەم چاکسازییە چۆنە، سوێند بەخوا ئەگەر بزانین، ڕێگەی ئێوە دەگرینەبەر و ئەگەر نەزانین، لەم چاکسازییە بەدوور دەبین.

وتی: کوشتنی بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان چوونکە ئەگەر پشتگوێ بخرێت، قورئان پشتگوێ خراوە و ئەگەر ئەنجام بدرێت، زیندوو کردنەوەی قورئانە.

وتی: ئێوە بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفانتان لەخەڵکانی بەسرە کوشت و پێش کوشتنی ئەوان بارودۆختان لەمرۆ سەقامگیرتر بوو، شەشسەد پیاو کەسێك کەمترتان کوشت و بەهۆیەوە تووڕەیی شەش هەزار کەستان بزواندووە و خۆیان لەئێوە بەدوور گرتووە، ئێستاکە بەدوای کوشتنی ئەو کەسەوەن کەگیانی بەدەربرد (حێرقوس کوڕی زوهەیر) و شەش هەزار کەس پشتیوانی لێدەکەن، ئەگەر ئەو پشتگوێ بخەن، قورئانتان پشتگوێ خستووە و ئەگەر لەگەڵ ئەو و ئەو شەش هەزار کەسە بجەنگن، بەسەر ئێوەدا زاڵ دەبن و دەرئەنجامی کارەکەتان خراپتر لەوە دەبێت چاوەڕوانن پێی. ئێوە گرفتاریتان بۆ خەڵکانی موزێر و ڕەبیعە دروست کردە و بۆ هاوکاری ئەو دەستەیە و جەنگان لەگەڵ ئێوە کۆبوونەتەوە، بەهەمان شێوە کە ئەم دەستەیە بۆ پشتیوانی کردن لەبەشدارەکانی ئەو کارەساتە گەورەیە کۆبوونەتەوە.

دایکی باوەڕداران وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: ڕێگەچارەی ئەم کێشەیە، هێور کردنەوەیە و کاتێك هێور بوونەوە، ئەم دەستەیە بڵاوەی لێدەکەن، ئەگەر لەگەڵ ئێمە بەیعەت ببەستن، نیشانەی خێرە و

شوێنەواری ڕەحمەت و تۆڵەسەندنەوەی ئەو پیاوەیە و ئەگەر پێداگری بکەن، دەرئەنجامەکەی زیانە و شەڕ و بەفیڕۆچوونی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان و نیشانەی ئەوەیە خواوەند بەڵای بەسەر ئەم ئۆمەتەدا باراندووە. گرنگی بەتەندروستی خەڵکان بدەن تاتەندروست بمێننەوە، هۆکاری خێر و خێرخوازی بن وەك پێشوو، سوێند بەخوا ئەمە بۆچوونی منە و دەترسم ئەم کارە سامان نەدرێت تا خواوەند کاروباری ئەم خەڵکە پەرێشان و گرفتارییان بکات. ئەم ڕووداوە نابێت بەسانا وەربگرین چوونکە هاوشێوەی پێشهاتەکانی دیکە نییە، وەك ئەوە نییە بڵێن کەسێك کەسێکی کوشت یا دەستەیەك پیاوێکی هۆزێکی دیکەیان کوشتبێت.

وتیان: وتەکانت پەسەندە، بگەڕێرەوە، ئەگەر عەلی بێت و بۆچوونی هاوشێوەی تۆ بێت، ئەم کارە سامان دەدرێت.

دەڵێت:قەعقاع بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕایەوە و لەگفتوگۆکە ئاگاداری کردەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب پەسەندی کرد و خەڵکان لەئاشتی نزیك بوونەوە: کەسانێك نارازی و کەسانێك ڕازی، نێردراوانی بەسرە لەزیقار دەهاتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب، نێردراوانی هۆزی تەمیم و بەکر پێش گەڕانەوەی قەعقاع ڕۆشتبوونەی لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب تا بۆچوونی براکانی خۆیان لەکوفە بزانن و خوازیار بوونی خۆیان بۆ ئاشتی نیشان بدەن. کاتێك تەمیمییەکان و بەکرییەکانی کوفە مەبەستی هۆزەکانی خۆیان لەخەڵکانی بەسرە زانی و بۆچوونی خەڵکانی کوفەیش هاوشێوەی ئەوان بوو، ئەوانیان بردە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و ئاگاداریان کردنەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەجورەیر کوڕی شەڕش سەبارەت بەتەڵحە و زوبەیر پرسیاری کرد و ئەو، هەموو نهێنی و کارە ئاشکراکانی ئەوانی بۆ گێڕایەوە. هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((نێردراوێك بۆ لای مناڵەکانی بەکر بنێرە

چوونکە هیچ ڕێگەیەك بۆ لای مناڵەکانی کەعب بوونی نییە

بڵێ ستەمی ئێوە بۆ خۆتان دەگەڕێتەوە.))

عەلی کوڕی ئەبی تالیبیش هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((مەگەر باوکی سەمعان نازانێت ئێمە

پیری تێکۆشەری هاوشێوەی تۆ لەخۆمان دوور دەخەینەوە

کە ئاوزی لەجەنگ سەری سوربمێنێت

بەکرییەکان بەرگرییان لەخوزاعە کرد

بەڵام تۆ ئەی سوراقە هیچ بەرگریکارێت نییە))

ئەبوجەعفەر دەڵێت: زیاد کوڕی ئەیووب، کتێبێکی بۆ هێنلم، چەندین گێڕانەوەی تیا نووسرابوو لەوپیرانەی دەیوت لەوانی بیستووە، بەشێك لەگێڕانەوەکانی بۆ من خوێندەوە و بەشێکی نا. یەکێك لەو باسانەی نەیخوێندەوە و لەروویەوە نووسیمەوە، ئەمە بوو کەکەلیب کوڕی جۆ دەڵێت: لەرۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان لەخەودا بینیم پیاوێك فەرمانڕەوای خەڵکان بوو، نەخۆش و ناساغ لەسەر جێگەکەی کەوتبوو، ژنێك لەسەر سەری و خەڵکان سەردانیان دەکرد. ئەگەر ژن کەسانی دوور دەخستەوە، دوور دەکەوتنەوە بەڵام ئەو کارەی نەکرد و نەخۆشەکەیان گرت و کوشتییان. من ئەم خەوەم لەهەموو شوێنێك بۆ خەڵکان دەگێڕایەوە، سەریان سووڕدەما و نەیاندەزانی لێکدانەوەی بۆ بکەن. کاتێك عوسمان کوڕی عەفان کوژرا، لەجەنگ دەگەڕاینەوە، ئاگادار بووینەوە و هاوەڵانی ئێمە وتیان: کەلیب خەوەکەی تۆ!

دەڵێت: زۆری نەخایاند وتیان: تەڵحە و زوبەیر و دایکی باوەڕداران هاورێیەتیان دەکات. خەڵکان ترسان و سەریانسوڕما. ئەوان دەیانوت بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان ئالأی شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە و تۆبەیان دەکرد لەوەی هاوکارییان نەکردبوو.

دایکی باوەڕداران دەیوت: لەسێ کاری عوسمان کوڕی عەفان تووڕە و بێزار بووین، سپاردنی کاروبارەکان بەگەنجەکان، دەست بەسەردا گرتنی زەوییەکان و لێدانی خەڵکان بەداردەست و قامچی. دادپەروەریی نییە ئەگەر لەو سێ کارەی ئێوە تووڕە و بێزار نەبین: شکاندنی رێزی مانگ و شار و خوێن.

خەڵکان وتیان: مەگەر بەیعەتتان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نەبەست؟

وتیان: شمشێر لەسەر گەردنی ئێمە بوو.

وترا: هەنووکە عەلی کوڕی ئەبی تالیب لای ئێوەیە. خەڵکەکەی ئێمە بەمن و دووانی دیکەیان وت: بڕۆنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و هاوەڵانی، سەبارەت بەم

پێشهاتە کەدەرئەنجامەکەی نازانین، بپرسن.

دەڵێت: ڕۆشتین و لەئوردووگاکەی نزیك کەوتینەوە، پیاوێکی جوان روخسار سوار لەسەر ئێستر دەرکەوت، بەهاورێکەم وت: بیرتانە باسی ژنێکم بۆ دەکردن کە لەسەر سەری فەرمانڕەوا بوو، ئەمە خۆیەتی. سوارەکە زانی باسی ئەو دەکەین، کاتێك نزیك کەوتەوە، وتی: بێستن. کاتێك منتان بینی، باسی چیتان دەکرد؟

دەڵێت: ئێمە حاشامان کرد، وتی: تا پێم نەڵێن، ناڕۆن. ناچار بابەتەکەمان بۆ باس کرد، ڕۆشت و دەیوت: سوێند بەخوا خەوێکی سەیرت بینیوە.

بەیەکێك لەپیاوەکانی ناو ئوردووم وت: ئەمە کێیە؟

وتی: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر. زانیمان ئەو ژنەن عایشەی دایکی باوەڕدارانە، زیاتر لەکارەکەی ئەو نیگەران بووین.

دەڵێت: ڕۆشتینە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و سڵاومان بۆ نارد، سەبارەت بەبارودۆخ پرسیارمان کرد، وتی: گۆشەگیر بوون، خەڵکان هێرشیان کردە سەر ئەو پیاوە و خوێنیان ڕشت، ئەوسا منیان وەك خەلیفە دەستنیشان کرد، حەزم بەو کارە نەدەکرد و ئەگەر بۆ دینی ئیسلام نیگەران نەدەبووم، هەرگیز ئەو ئەرکەم نەدەگرتە ئەستۆ. ئەو دوو کەسە نەیاری و دژایەتی خۆیان دەستپیکرد، ئەوانمان هێنا و پەیمانمان لێ سەندن. دواتر مۆڵەتم پێدان بەمەبەستی عەمرە روو لەمەککە بکەن. ئەوان ڕۆشتنە لای دایکی باوەڕداران وئەو کارەی بۆ ژنەکانی خۆیان بەڕەوایان نەدەزانی، بۆ ئەویان بەڕەوا زانی و ڕووبەڕووی مەترسییان کردەوە. شوێنیان کەوتووم تا کەلێن لەناو ئیسلامدا دروست نەبێت و دووبەرەکی لەناو خەڵکان سەرهەڵنەدات.

دەڵێت: هاوەڵانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتیان: سوێند بەخوا مەبەستی جەنگمان لەسەردا نییە مەگەر ئەوەی هێرش بکەنە سەرمان. تەنیا بۆ چاکسازی هاتووین.

دواتر پیشنیاری بەیعەتیان پێکردین. دوو هاورێکەی من بەیعەتیان کرد، بەڵام من نەمکرد، وتم: خەڵکەکەم منیان بۆ مەبەستێکی دیکە ناردووە، بەیعەت ناکەم تا ئەو کاتەی دەگەڕێمەوە بۆ لای ئەوان.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەگەر ئەوان بەیعەت نەکەن؟

وتم: منیش بەیعەت ناکەم.

وتی: ئەگەر تۆیان بۆ گەڕان بەشوێنێکی سەرسەوز دەنارد و دەگەڕایتەوە و باسی ئاو و سەرسەوزیت دەکرد و ئەوان روویان لەشوێنە بێ ئاوە و گیاکان دەکرد، چیت دەکرد؟

وتم: بەجێم دەهێشتن و رووم لەئاو و سەوزایی دەکرد.

وتی: کەواتە دەستت بێنە.

دەڵێت: سوێند بەخوا نەمتوانی رازی نەبم، دەستم بردە پێش و بەیعەتم بەست.

دەیوت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب شارەزاترین و کارامەترین پیاوی عەرەب بوو، پێی وتم: چیت لەتەڵحە و زوبەیر بیستووە؟

وتم: زوبەیر دەڵێت: شمشێر لەسەر گەردنمان بوو ئەو کاتەی بەیعەتمان بەست بەلاّم تەڵحە ئەم هۆنراوەیە دەخوێنێتەوە و دەڵێت:

((نێردراوێك بۆ لای مناڵەکانی بەکر بنێرە

چوونکە هیچ رێگەیەك بۆ لای مناڵەکانی کەعب نییە

پێیان بڵێ ستەمەکەیان بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە))

وتی: بەوشێوەیە نییە بەڵکو:

((مەگەر باوکی سەمعان نازانێت ئێمە

پیرێکی تێکۆشەری وەك تۆ پشت گوێ دەخەین

کەئاوزی لەجەنگ سوور دەمێنێت

بەشێوەیەك بێ هۆ هەڵدەستێت و هاوار دەکات.))

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرێکەوت و لەکەنارەکانی بەسرە دابەزی. تەڵحە و زوبەیر خەندەکیان لێدابوو، هاوەڵانی ئێمە لەخەڵکانی بەسرە دەیانوت: براکانی ئێمە لەکوفە چییان دەویست و چییان دەوت؟

وتمان: دەیانوت: بۆ ئاشتی هاتووین و خوازیاری جەنگ نین.

دەڵێت: لەم کاتەدا کەجگە لەئاشتی خوازیاری هیچی دیکە نەبوون، مێردمنداڵەکانی هەر دوو سوپاکە هاتنەدەر و یەکتریان جوێنباران و تیرهاویشتنیان دەستپێکرد. ئەوسا کۆیلەکانی هەردوو سوپا هاتن و دوای ئەوان نەزانەکان و شەڕی

دەستییێکرد. روویان لەخەندەکەکە کرد و جەنگێکی دژوار سەری هەڵدا تا ئەوەی سوپاکەی تەڵحە و زوبەیر گەیشتنە ئەولای خەندەکەکە. هاوەڵانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ڕۆشتنە ناو خەندەکەکە و ئەوانیان دوور خستەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاواری دەکرد: شوێن هەڵاتووان مەکەون و بریندارەکان مەکوژن و مەڕۆنە ناو هیچ ماڵێك. کاتێك ڕێگەی لەسوپاکەی گرت، کەسی بۆ لای نەیارەکانی نارد و بۆ بەیعەت بەستن ریزیان بەست. بەیعەتی دەستەیەك کۆتایی پێهات، وتی: هەرکەس سامانەکانی خۆی دەناسێتەوە، هەڵیبگرێت. لەئوردووەکە هیچ نەمایەوە.

دەستەیەك لەگەنجەکانی هۆزی قەیس ڕۆشتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و وتارخوێنەکەیان دەستی بەقسە کردن کرد.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: سەرکردەکانی ئێوە لەکوێن؟

وتی: لەدەوری وشترەکە کوژران. لەسەر قسە کردن بەردەوام بوو.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: وتارخوێنی بەتوانا بەمشێوەیە.

کاتێك بەیعەتەکە کۆتایی پێهات، عەبدوللە کوڕی عەباسی وەك فەرمانڕەوای بەسرە دەستنیشان کرد، دەیویست لەو شارە بمێنێتەوە تا بارودۆخ سەقامگیر دەبێت.

دەڵێت: ئەشتەر پێی وتم گرانبابیترین وشتری بەسرەی بۆ بکڕم. ئەو کارەم کرد. ئەشتەر وتی: وشترەکە ببە بۆ دایکی باوەڕداران و بەنوێنەرایەتی من سڵاوی لێ بکە.

دەڵێت: وشترەکەم برد و عایشە ئەشتەری بەنەحلەت کرد، وتی: وشترەکەی بۆ بگەڕێنەرەوە.

کاتێك گەڕامەوە بۆ لای وتی: دایکی باوەڕداران لەمن ڕەنجاوە چوونکە هێرشم کردە سەر خوشکەزاکەی.

هەواڵ هات عەلی کوڕی ئەبی تالیب، کوڕی عەباسی وەك فەرمانڕەوای بەسرە دەستنیشان کردووە، تووڕە بوو، وتی: کەواتە ئێمە ئەو پیرە پیاوەمان بۆ کوشت؟ یەمەن لەعوبەیداللە و حیجاز لەقیسەم و بەسرە لە عەبدوللە و کوفە لەعەلی. سوار چوارپێکەی خۆی بوو و ڕێگەی گەڕانەوەی گرتەبەر.

دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاگادار بوویەوە، فەرمانی بەرێکەوتنیدا،

بەخێرایی رێگەی بڕی و خۆی بەئەشتەر گەیاند بەڵام نەیوت وتەکانی ئەوی بیستووە، وتی: هۆکاری ئەم خێراییە چییە؟ پێش ئێمە کەوتیتەوە؟ دەترسا ئەگەر پشتگوێی بخات، ئاژاوەیەك لەناو خەڵکاندا بنێتەوە.

محەممەد دەڵێت: کاتێك نێردراوانی بەسرە گەیشتنە کوفە و قەعقاع لای دایکی باوەڕداران و تەڵحە و زوبەیر گەڕایەوە و لەبۆچوونی ئەوان کەهاوشێوەی بۆچوونی خەڵکانی بەسرە بوو، ئاگاداری کردنەوە، عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتارێکی خوێندەوە، سەرەتا سوپاسی خوای کرد و وتی: ئەم پێشهاتە روویدا و بزوێنەرەکانی ئەو کەسانەن کەخوازیاری ئەم دنیان و رژدییان بەو کەسانە دەبرد خواوەند لەپێشی پێبەخشیبوون. دەیانویست بارودۆخ بۆ سەرەتاکان بگەڕێننەوە بەڵام خواوەند کارەکانی خۆی بەئەنجام دەگەیینێت و ئەوەی بخوازێت، ئەنجامی دەدات، ئاگاداربن بەیانی بەرێدەکەوم، ئێوەیش بەرێکەون بەڵام کەس لەوانەی لەکوشتنی عوسمان کوڕی عەفان بەشدار بووە، هاورێیەتیمان نەکات و نەزانەکان ئەرك و زەحمەتی خۆیان لەمن دوور بخەنەوە.

دەڵێت: دەستەیەك لەوان و لەناو ئەوان عەلبا کوڕی هەیسەم و عودەی کوڕی حاتەم و سالم کوڕی سەعلەبەی عەبەسی و شورەیح کوڕی ئەوف کوڕی زەبیعە و ئەشتەر کەهێرشیان کردبووە سەر عوسمان کوڕی عەفان یا بەو کارە رازی بوون، کۆبوونەوە و لەناو خەڵکانی میسر، کوڕی سەودا و خالید کوڕی مولجەم پەیوەستیان بوون. راوێژیان کرد و وتیان: بۆچوونی راست چییە؟ عەلی کوڕی ئەبی تالیب زیاتر لەخوازیارانی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان شارەزای کاروباری دینە و باشتر لەهەمووان فەرموودەکانی خواوەند ئەنجام دەدات بەمشێوەیە دەدوێت لەکاتێکدا جگە لەئێمە و دەستەیەکی کەم کەس هاورێیەتی ناکات. ئەگەر هەموو خەڵکان لەدەوری کۆببنەوە و بزانێت ئێمە بەژمارە کەمین، چی دەڵێت؟ سوێند بەخوا مەبەستی گیانی ئێوە دەکات و رزگارتان نابێت.

ئەشتەر وتی: لەبۆچوونی تەڵحە و زوبەیر ئاگاداربووین، بەڵام تا ئەمڕۆ بۆچوونی عەلی کوڕی ئەبی تالیبمان نەدەزانی، سوێند بەخوا بۆچوونی ئەو سەبارەت بەئێمە هاوشێوەی ئەوانە، ئەگەر لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئاشتی بکەن لەسەر خوێنی ئێمە ئەو کارە دەکەن، دەبێت هێرش بکەینە سەر عەلی کوڕی ئەبی تالیب و

هاوشێوەی عوسمان کوڕی عەفان بیکوژن و ئاژاوەیەك بێتە کایەوە کۆتایی هاتنەکەی تەنیا بەبەخشینی ئێمە بێت.

عەبدوللە کوڕی سودا وتی: ئەی بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان! بۆچوونەکەتان هەڵەیە، دوو هەزار و پێنسەد یا شەشسەد کەس لەخەڵکانی کوفە لەزیقارن و کوڕی حەنزەلییە لەگەڵ پێنج هەزار شەرکەر لەئەشواقە و چاوەڕوانن بۆ جەنگ دژی ئێوە بەڵگەیەکیان دەستکەوێت.

عەلبا کوڕی هەیسەم وتی: ئەم دەستەیە بەجێبێڵن و کاتێك ژمارەیان کەم ببێتەوە، دوژمنەکەیان بەهێز دەبێت و ئەگەر ژمارەیان فراوانتر بێت، ئاسانتر دژی ئێوە پەیمانی ئاشتی دەبەستن. بەجێیان بێڵن و بڕۆن، لەیەکێك لەویلایەتەکان بمێننەوە تا کەسانێك لەدەوری ئێوە کۆببنەوە و بەمشێوەیە ژیانی خۆتان بپارێزن.

کوڕی سەودا وتی: بۆچوونەکەت هەڵەیە، سوێند بەخوا خەڵکان خوازیارن لەیەك جێگە کۆببنەوە و تێکەڵ بەخەڵکە بێ تاوانەکان نەبن. ئەگەر بۆچوونەکەی تۆ بەکار ببەین، هەموو شتێك دژی ئێمە دەبێت.

عودەی کوڕی حاتەم وتی: سوێند بەخوا بەکوشتنی عوسمان کوڕی عەفان رازی نەبووم و پێم ناخۆش نەبوو، بەراستی لەو کەسانەی لەکاتێکدا باسی کوشتنی ئەو دەکەن بەڵام گومانیان لا دروست بووە، سەرم سوڕماوە، هەنووکە پێشهاتێك روویداوە و خەڵکان کەوتوونەتە گیانی یەك. ئێمە ئەسپ و سیلاح و توێشوی پێویستمان لەبەردەستایە، ئەگەر بجووڵێن، ئێمەیش شوێنتان دەکەوین، ئەگەر بکشێنەوە، ئێمەیش دەکشێینەوە.

سالم کوڕی سەعلەبە وتی: ئەگەر بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان خوازیاری ئەم دنیا بوون، من نەبووم، سوێند بەخوا ئەگەر بەیانی رووبەروویان ببمەوە، بۆماڵەکەی خۆم ناگەڕێمەوە، ئەگەر دوای رووبەروو بوونەوەی ئەوان زیندوو بم، زیاتر لەماوەی کوشتنی یەك وشتر نابێت، سوێند بەخوا بەرادەیەك لەشمشێر دەترسن دەڵێی دەرئەنجامی ژیانی هەمووتان بەشمشێر کۆتایی دێت.

کوڕی سەودا وتی: وتەکانی راستە،

شورەیح کوڕی ئەوف وتی: پێش ئەوەی بڕۆن، کاروبارەکانی خۆتان سامان

بدەن، ئەو کارەی دەبێت بەپەلە ئەنجامی بدەن، پشتگوێی مەخەن و ئەو کارەی دەبێت ماوەیەك درەنگتر ئەنجامی بدەن، پەلەی تیا مەکەن. ئێمە لای ئەم خەڵکە بارودۆخێکی خراپمان هەیەن و نازانم ئەگەر بەیانی رووبەرووی یەکببنەوە، چی روودەدات.

کوڕی سەودا وتی: سەرکەوتنی ئێوە، لەپەرێشانی و سەرگەردانی خەڵکانە، کاتێك بەیانی بۆ سەردان دێن، جەنگ دەستپێبکەن و دەرفەتی بیرکردنەوەیان پێمەدەن تا ئەو کەسەی لەگەڵ ئێوەدایە، بەناچاری بیر لەئاشتی نەکاتەوە و خواوەند عەلی کوڕی ئەبی تالیب و تەڵحە و زوبەیر و هاوەڵانی ئەوان لەمەبەستەکەیان دوور بخاتەوە.

دەڵێت: ئەم بۆچوونەیان پەسەند کرد و لەسەر ئەم بڕیارە بڵاوەیان لێکرد. کەس لە مەبەستی ئەوان ئاگادار نەبوو.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرەبەیان سوار چوارپێکەی خۆی بوو، خەڵکانیش بەرێکەوتن، لەخەڵکانی عەبدقەیس نزیك کەوتنەوە، لەوێ دابەزی. خەڵکانی کوفە لەپێش ئەوان جێگیر ببوون. بەرێکەوت و لەخەڵکانی کوفە نزیك کەوتەوە. خەڵکان بەدوای ئەودا رێگەیان دەبڕی. کاتێك خەڵکانی بەسرە لەبۆچوونی ئەوان ئاگادار بوونەوە و عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەوێ دابەزی، باوکی جەربا ڕۆشتە لای زوبەیر کوڕی عەوام و وتی: بۆچوونی پەسەند ئەوەیە هەنووکە هەزار سوار رەوانە بکەیت تا پێش ئەوەی ئەو پیاوە پەیوەستی شوێنکەوتەکانی خۆی بێت، هێرشی بکەنەسەر.

زوبەیر وتی: ئەی باوکی جەربا، شارەزای کاروباری تایبەت بەجەنگین، بەڵام ئەوانە موسوڵمانن. ئەمە بارودۆخێکی تازەیە سەبارەت بەو شتانەی پێشتر لەئارادا نەبووە، ئەمە کارێکە هەرکەس بڕواتە پێشگای خواوەند و بەڵگەی شیاوی پێنەبێت، رۆژی پەسلان، سزا دەدرێت. جیاواز لەوە نێردراوی ئەوان بەبڕیارێکی پێشوەخت گەڕایەوە. هیوادارم ئاشتی لەناو خەڵکان سەقامگیر بێت. چاوەڕوان و دڵخۆش بن.

دەڵێت: سەبرە کوڕی شەیمان هات و وتی: ئەی تەڵحە، ئەی زوبەیر، دەرفەت بەم پیاوە مەدەن چوونکە شارەزای کاروباری جەنگ و کەسێکی بوێرە.

تەڵحە وتی: ئەی سەبرە، ئێمە و ئەوان موسوڵمانین، ئەم بارودۆخە پێشتر

لەئارادا نەبووە تا ئایەی قورئانی بێتەخوار یا لە پێغەمبەر(د.خ) سوونەتێکمان بۆ مابێتەوە. دیاردەیەکی تازەیە. دەستەیەك بۆچوونیان وایە ئەمڕۆ نابێت هیچ کارێك ئەنجام بدەین، ئەوان عەلی و هاوەڵانی ئەون. ئێمە وتوومانە نابێت ئەم کارە دوابخەین. عەلی دەڵێت: ئەوەی مەبەستی ئێمەیە، یانی پشتگوێ خستنی ئەم دەستەیە، خراپەیە کەباشتر لەخراپترە، کارێکە نادیار و بەزوویی روون دەبێتەوە، کردەوەی موسوڵمانی ئەوەیە بەکاری بەسوود و وردبینانە رازی ببین.

کەعب کوڕی سوور هات و وتی: ئەی خەڵکینە، ئێوە کەیەکەم دەستەی ئەم دەستەیەتان لەناو برد، چاوەڕوانی چین، ڕەگ و ریشەی ئەوان دەربێنن.

وتیان: ئەی کەعب، ئەمە رووداوێکە لەنێوان ئێمە و براکانمان روویداوە و گومانی لێدەکرێت. سوێند بەخوا لەو کاتەوەی خواوەند پێغەمبەری ڕەوانە کردووە، هاوەڵانی محەممەد بەرێگەیەکدا نەڕۆشتوون نەزانین بەرەو کوێ دەڕۆن تا ئەم پێشهاتە روویدا کەنازانین شانس روومان تێدەکات یا بەدبەختی. هەنووکە باشترین کار لای ئێمە شتێکە و لای براکانمان قێزەون. بۆ بەیانی لای ئێمە قێزەون دەبێت و لای ئەوان چاك، ئێمە بەڵگەیەکیان بۆ دەهێنینەوە کەپێی رازی نابن و هەمان دەکەنە بەڵگە بۆ کەسانی دیکە. هیوادارم ئەگەر رازی ببن، ئاشتی لەناو خەڵکان سەقامگیر ببێت و گەرنە بەناچاری دەبێت بیر لەرێگەیەکی دیکە بکەینەوە.

کەسانێك لەخەڵکانی کوفە ڕۆشتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و سەبارەت بەکردەوەی ئەو دژی نەیارەکان ئاخاوتن. لەناو ئەوان ئەعوەر کوڕی مینقەری قسەی کرد.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: چاکسازی پێویستە و هێوەر کردنەوەی بارودۆخ. ئەگەری هەیە خواوەند بەهۆی ئێمەوە جارێکی دیکە ئەم ئۆمەتە لەدەوری یەك کۆبکاتەوە. بەبۆچوونەکەی من رازی بوون.

وتی: ئەگەر رازی نەبوون؟

وتی: تا کاریان بەئێمە نەبێت، کارمان پێیان نییە.

وتیان: ئەگەر کاریان پێمان بوو؟

وتی: بەرگری لەخۆمان دەکەین.

باوکی سەلامەی دالأنی وتی: بەبۆچوونی تۆ ئەگەر ئەم خەڵکە مەبەستی تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەففانیان هەیە و مەبەستی ڕەزامەندی خواوەندیان لەسەردایە، بەڵگەی شیاویان لەبەردەستایە.

وتی: بەڵێ.

وتی: ئایا تۆیش بەڵگەت هەیە کە ئەم کارە دوادەخەیت؟

وتی: بەڵێ. کاتێك دەرئەنجامی پێشهاتێك نادیار بێت دەبێت وردبینی لەبەرچاو بگیرێت.

وتی: ئەگەر بەیانی تەنیا ڕێگە چارە جەنگ بێت، بارودۆخی ئێمە و ئەوان چۆن دەبێت؟

وتی: هیوادرام هەرکەس لەئێمە و ئەوان بەدڵێکی پاك بکوژرێت، بەهەشت ببێتە جێگەی.

مالك کوڕی حەبیب وتی: ئەگەر ڕووبەڕووی ئەم خەڵکە بوویتەوە، چی دەکەیت؟.

وتی: دڵنیابە لەوەی باشترین ڕێگەچارە خۆپاراستن لەجەنگە، ئەگەر بەیعەتیان لەگەڵ ئێمە بەست، چ باشتر، ئەگەر جەنگ تەنیا ڕێگە چارە بوو، کەلێنێك دروست دەبێت هیچ کات یەکناگرێتەوە.

وتی: ئەگەر بەجەنگان ناچار بووین، بارودۆخی کوژراوەکانی ئێمە چۆن دەبێت؟

وتی: هەرکەس بەدوای ڕەزامەندی خواوەندەوە بێت، کوژرانەکەی دەبێتە هۆی ڕزگار بوونی.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتارێکی پێشکەش بەخەڵکان کرد، ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان، وتی: ئەی خەڵکینە، بەسەر خۆتاندا زاڵبن و چیتر سەرکۆنەی ئەو خەڵکە مەکەن چوونکە براکانی ئێوەن، بۆ کردەوەکانیان خۆڕاگری بکەنە پیشە، پێش فەرمانی ئێمە هیچ کارێك مەکەن چوونکە سبەی لێپرسراو کەسێکە لەئێستادا دوژمنایەتی دەست پێبکات.

دەڵێت: بەرێکەوت و کاتێك لەوان نزیك کەوتەوە، حەکیم کوڕی سەلامە و مالك کوڕی حەبیبی بۆ لای ئەوان ڕەوانە کرد و وتی: ئەگەر لەسەر بڕیار و پەیمانەکەی خۆیان بەردەوامن، دەست لەئێمە هەڵبگرن وڕێگە بدەن دابەزین و لێکۆڵینەوە لەم کارە بکەین.

دەڵێت: لەوکاتەی منداڵەکانی سەعد بڕیاریاندابوو پشتیوانی لەحێرقوس کوڕی سەعد بکەن و جەنگ لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان بەڕەوا نەدەزانی، ئەحنەف کوڕی قەیس ڕۆشتە لای و وتی: ئەی عەلی، خەڵکەکەی ئێمە لەبەسرە گومان دەکەن ئەگەر بەیانی سەرکەوتن بەدەست بێنیت، پیاوەکانیان دەکوژێت و ژنەکانیان ئەسیر دەکەیت.

وتی: کەسێکی وەك من ئەو کارە ناکات چوونکە ئەم کارە تەنیا لەگەڵ کافرەکان و هەڵگەڕاوەکان ڕەوایە، ئەوان، موسوڵمانن، ئایا خەڵکەکەی خۆت لەمن دوور دەخەیتەوە؟

ئەحنەف وتی: بەڵێ، یەکێك لەم دوو کارە هەڵبژێرە: یا پەیوەستی سوپاکەی تۆ دەبەم یا دەهەزار شەڕکەر لەتۆ دوور دەخەمەوە.

دەڵێت: ئەحنەف گەڕایەوە و داوای لەخەڵکەکەی کرد لەشوێنی خۆیان بمێننەوە. بەمشێوەیە دەستی پێکرد: ئەی خەندەفییەکان! دەستەیەك وەڵامیان دایەوە، وتی: ئەی تەمیمییەکان! دەستەیەك وەڵامیان دایەوە. هاواری کرد: ئەی منداڵەکانی سەعد! هەموو منداڵەکانی سەعد وەڵامیان دایەوە. پێشنیاری خۆدوور خستنەوە لەجەنگی بەهەمووان کرد، دواتر چاوەڕوان بوو تا بزانێت خەڵکان چی دەکەن و کاتێك جەنگەکە ڕوویدا و عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئاسوودە و دڵنیا پەیوەستی خەڵکان بوون.

سەبارەت بەئەحنەف گێڕانەوەیەکیان لەخۆی ئاماژە پێداوە، دەڵێت: ڕووم کردە مەدینە، مەبەستی حەج کردنم لەسەردابوو، لەمەنزڵگەکەی خۆمان بووین، بارمان خست، کەسێك هات و وتی: خەڵکان پەرێشان بوون و لەمزگەوتی گەورە کۆبوونەتەوە، ڕۆشتین و بینیمان خەڵکان لەمزگەوت لەدەوری چەند کەسێك کۆبوونەتەوە: عەلی کوڕی ئەبی تالیب و تەڵحە و زوبەیر و سەعد کوڕی ئەبی وەقاس. لەم کاتەدا عوسمان کوڕی عەفان هات، وتیان: ئەوە عوسمان کوڕی عەفان. ڕوپۆشێکی زەردی لەبەردابوو، سەری خۆی پێداپۆشیبوو، وتی: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لێرەیە؟

وتیان: بەڵێ.

وتی: زوبەیر لێرەیە؟

وتیان: بەڵێ.

وتی: تەڵحە لێرەیە؟

وتیان: بەڵێ.

وتی: سوێندتان دەدەم بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، ئایا دەزانن پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هەرکەس مەربودی مناڵەکانی فلان بکڕێت، خواوەند دەیبەخشێت و من بەبیست و پێنج هەزار درەم کڕیم و ڕۆشتمە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ) کڕیم، فەرمووی: پەیوەستی مزگەوتی بکە تا پاداشتەکەیت دەستکەوێت؟

وتیان: بەڵێ.

دەڵێت: ئاماژەی بەبابەتی لەم چەشنەدا.

دەڵێت: دواتر تەڵحە و زوبەیرم بینی، وتم: بەخەلافەتی کێ رازی دەبن تا بەیعەتی لەگەڵ ببەستم چوونکە ئەم پیاوە دەکوژرێت؟

وتیان: عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

وتم: بەخەلافەتی ئەو رازین تا بەیعەتی لەگەڵ ببەستم؟

وتیان: بەڵێ.

دەڵێت: بەرەو مەککە بەرێکەوتین، لەوێ بووین هەواڵی کوژرانی عوسمان کوڕی عەفانمان پێگەیشت، دایکی باوەڕداران لەمەککە بوو، ڕۆشتمە لای و وتم: پێشنیار دەکەیت لەگەڵ کێ بەیعەت بکەم؟

وتی: عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

وتم: دەڵێی لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەت ببەستم و بەخەلافەتی ئەو رازیت؟

وتی: بەڵێ.

دەڵێت: لەمەدینە ڕۆشتمە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و بەیعەتم بەست. دواتر گەڕامەوە بۆ لای کەسەکانم لەبەسرە و گومانم کرد کێشەی خەلافەت کۆتایی پێهاتووە.

لەناکاو کەسێك هات و وتی: دایکی باوەڕداران و تەڵحە و زوبەیر لەنزیك

خورەیبە دابەزیون.

وتم: بۆ چ مەبەستێك؟

وتیان: کەسیان بەدوای تۆدا ناردووە و بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان داوای هاوکاری دەکەن.

بابەتێکی سەرسوڕهێنەرترم نەبیستبوو، وتم: پشتگوێ خستنی ئەوان کەدایکی باوەڕداران و دووان لەهاوەڵانی پێغەمبەریان لەگەڵدایە، کارێکی دژوارە و جەنگ لەگەڵ کوڕە مامی پێغەمبەر(د.خ) کەخۆیان پێشنیاری بەیعەت بەستیان پێکردم، دژوارتر.

دەڵێت: کاتێك ڕۆشتمە لایان، وتیان: هاتووین بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان هاوکاریمان بکەیت.

وتم: ئەی دایکی باوەڕداران، سوێندت دەدەم بەخوا، مەگەر پێم نەوتیت لەگەڵ کێ بەیعەت ببەستم، وتت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب؟

وتی: بۆنا.

وتم: مەگەر نەمپرسی ئایا بەخەلافەتی ئەو ڕازیت یا نە؟ وتت: بەڵێ ڕازیم.

وتی: بەڵێ، بەڵام ئەو گۆڕانکاری دروست کرد.

وتم: ئەی زوبەیر، ئەی هاوەڵی پێغەمبەر(د.خ)! ئەی تەڵحە، سوێندتان دەدەم بەخوا مەگەر پرسم پێ نەکردن بۆ ئەوەی بەیعەت لەگەڵ کەسێك ببەستم؟ مەگەر نەتانوت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب. پرسیم ئایا بەخەلافەتی ئەو ڕازین؟ وتتان: بەڵێ.

وتیان: ڕاستە، بەڵام ئەو گۆڕانکاری دروست کرد.

وتم: سوێند بەخوا دژی ئێوە ناجەنگم چوونکە دایکی باوەڕداران و دووان لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) هاوڕێیەتیتان دەکات، لەگەڵ کوڕە مامی پێغەمبەر(د.خ) ناجەنگم کەپێشنیاری بەیعەت بەستن لەگەڵ ئەوتان پێکردم. یەکێك لەم سێ کارە هەڵبژێرن: یا پردەکە بکەنەوە تا بڕۆمە سەرزەمینی عەجەمەکان و خواوەند فەرمانەکانی خۆی ڕەوانە دەکات، یا دەڕۆمە مەککە و لەوێ دەمێنمەوە تا ئەم کێشەیە کۆتایی پێدێت، یا خۆم بەدوور دەگرم و لەم نزیکانە دەمێنمەوە.

وتیان: ڕاوێژ دەکەین و ئاگادارت دەکەینەوە.

دەڵێت: راوێژیان کرد و وتیان: ئەگەر رێگەی پردەکەی بۆ ئاوەلاَ بکەین، هەواڵەکانی ئێوە بەوان دەگات، ئەمە بۆچوونێکی پەسەند نییە، رێگەی بدەن لەم نزیکانە بمێنێتەوە تا بتوانن چاودێری بکەن.

بێژەر دەڵێت: ئەحنەف خۆی بەدوور گرت و لەجەلحا، دوو فەرسەخی بەسرە، مایەوە. زیاتر لەشەش هەزار لەگەڵ ئەو خۆیان بەدوور گرت. دووای ئەوە لەنێوان ئەو دوو دەستە جەنگ روویدا و تەڵحە یەکەم کەس بوو کوژرا. کەعب کوڕی سوور کەقورئانی بەدەستەوە بوو و هۆشداری بەخەڵکان دەدا، کوژرا. ژمارەی کوژراوەکان زیادی کرد. زوبەیر بەرەو سەفوان لەنزیك بەسرە بەرێکەوت و نەعر، یەکێك لەهۆزی موجاشیع، ئەوی بینی، وتی: ئەی هاوەڵی پێغەمبەر(د.خ)، وەرە لای من تا ئەو کاتەی لەپەنای مندا بیت کەس دەستی بەتۆ ناگات.

دەڵێت: زوبەیر لەگەڵی ڕۆشت، کەسێك ڕۆشتە لای ئەحنەف و وتی: زوبەیریان لەسەفوان بینیوە، بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: موسوڵمانانی کۆکردەوە تا بەشمشێر یەکتر کوشتار بکەن، ئەوسا دەخوازێت بۆ ماڵەکەی خۆی بگەڕێتەوە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی جەموز و فەزالە کوڕی عەباس و نەفیع ئەم قسەیان بیست و بۆ گەڕان بەدوای زوبەیر سوار ئەسپەکانیان بوون. ئەویان لەگەڵ نەعردا بینی، عەمرۆ کوڕی جەرموز سوار ئەسپێکی ناتەوان بوو، لەپشتەوە هێرشی کردەسەر وزەربەیەکی لێدا، زوبەیر سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی، زوئەلخومار، هێرشی کردسەر، عەمرۆ لەکوژرانی خۆی ترسا، دەنگی بەرز کردەوە و داوای هاوکاری لەنافع و فەزالە کرد. پێکەوە هێرشیان کردەسەر زوبەیر و خوێنیان ڕشت.

## وتار سەبارەت بە ڕەوانە کردنی حەسەن کوڕی عەلی وعەمار کوڕی یاسر بۆ هاندانی خەڵکی کوفە بەفەرمانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

باوکی لەیلی دەڵێت: هاشم کوڕی عوتەبە لەرەبزە ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب، وتی: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر هاتە کوفە، لەوتەکانی باوکی موسا ئاگاداری کردەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: دەمویست لەسەر کار لاییبەرم، بەڵام ئەشتەر ڕێگەی ئەو کارەی لێگرتم.؟

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاشمی بۆ کوفە نارد و نامەی بۆ باوکی موسا نووسی: من هاشم کوڕی عوتەبەم ڕەوانە کرد تا خەڵکانی ئەو شارە هانبدات، خەڵکان ڕەوانە بکە چوونکە ئەو ویلایەتەم بەتۆ سپاردووە تا یەکێك لەهاوەڵانی من بیت.

دەڵێت: باوکی موسا سائیب کوڕی مالکی ئەشعەری بانگ کرد و وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: بۆچوونی من ئەوەیە گوێرایەڵی فەرمانەکان بیت.

وتی: بەڵام ئەمە بۆچوونی من نییە.

هاشم نامەی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسی: من ڕۆشتوومەتە لای پیاوێکی فێڵباز و دەغەڵ، دوژمنایەتی ئەو شاراوە نییە. نامەکەی بەموحەل کوڕی خەلیفەی تایی ڕەوانە کرد، عەلی کوڕی ئەبی تالیب حەسەن و عەماری یاسری نارد تا خەڵکان بۆ بەرێکەوتن هان بدەن، قورەزە کوڕی کەعبی ئەنساری وەك فەرمانڕەوای کوفە دەستنیشان کرد و بەودا نامەیەکی بۆ باوکی موسا نووسی:

گومانم کرد ئارەزوومەندی تۆ بۆ ئەم کارە دەبێتە ڕێگر لەوەی سەرپێچی فەرمانەکانی من بکەیت، حەسەن و عەمارم ڕەوانە کرد تا خەڵکان ڕەوانە بکەن، کاروبارەکانی شارەکەم بەقورەزە کوڕی کەعب سپارد، لەم کارەی ئێمە بەریسواییەوە خۆت بەدوور بگرە، ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکان بکەیت، فەرمانمداوە، بەزۆر لەشارەکە دورت بخەنەوە، ئەگەر بەرگری بکەیت بەسەر تۆدا زاڵ دەبێت و لەت لەتت دەکات.

دەڵێت: کاتێك نامەکە بەدەستی باوکی موسا گەیشت، خۆی بەدوور گرت. حەسەن کوڕی عەلی و عەماری یاسر ڕۆشتنە ناو مزگەوتەکە و وتیان: سەروەری باوەڕداران دەڵێت: ئەگەر وەك ستەمکار یا ستەملێکراو رووم کردۆتە ئەم شارە، هەر کەس پێبەندی حەقی خواوەندە، بێت، ئەگەر ستەملێکراوم هاوکاریم بکات و ئەگەر ستەمکارم، مافەکان لەمن بستێنێتەوە. سوێند بەخوا تەڵحە و زوبەیر لەیەکەم کەسان بوون بەیعەتیان لەگەڵ بەستم و یەکەم کەسان بوون خیانەتیانە کرد. ئایا سامانی کەسێکم خواردووە یا گۆڕانکاریم لەبابەتێکدا دروست کردووە؟ کۆببنەوە و بۆ چاکسازی هان بدەن ورێگە لەخراپە بگرن.

باوکی توفەیل دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: لەکوفە دوانزە هەزار و یەك کەس پەیوەستی ئێمە دەبێت. لەسەر تەپۆڵکەی زیقار دانیشتم و خەڵکانم بژارد، کەم و زیادی نەبوو.

باوکی لەیلی دەڵێت: دوانزە هەزار کەس بۆ پەیوەست بوون بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرێکەوتن. حەوت دەستە بوون: قورەیش و کەنانە و ئەسەد و تەمیم و رەباب و موزەینە کەسەرکردەکەیان مەعقەل کوڕی یەساری ریاحی بوو. قەیسییەکان سەرکردەکەیان سەعد کوڕی مەسعودی سەقەفی بوو، بەکر کوڕی وایل و تەغلەب سەرکردەکەیان وەعلە کوڕی مەحدوجی زوهەلی، مەزحەج و ئەشعەری سەرکردەکەیان حوجر کوڕی عودەی، بوجەیلە و ئەنمار و خەسعەم و ئەزد سەرکردەکەیان موخەنەف کوڕی سەلیمی ئەزدی بوو.

## دابەزینی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەزاویەی بەسرە

قتادە دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەزاویە دابەزی، چەند ڕۆژێك لەوێ مایەوە، ئەحنەف کەسی بۆ لای ئەو نارد کە: ئەگەر بخوازیت پەیوەستی تۆ دەبم و ئەگەر بخوازیت چوار هەزار شمشێر لەتۆ دوور دەکەمەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب پەیامی بۆ نارد: مەگەر بەڵێنت بەهاوەڵانت نەداوە خۆت لەجەنگ بەدوور دەگریت؟

وەڵامی دایەوە: بەڵام شەڕ کردن لەگەڵ ئەوان، مافێکی خواییە.

پەیامی بۆ نارد: ڕێگە لەشەڕکەران بگرە تا ئەو جێگەی دەتوانیت.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەزاویەوە بەرێکەوت، تەڵحە و زوبەیر و دایکی باوەڕداران لەفورەزەوە بەرێکەوتن و لەشوێنی کۆشکی عوبەیدالله یا عەبدوللە کوڕی زیاد، ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. کاتێك دوو دەستەکە دابەزین، شەقیق کوڕی سور کەسی بۆ لای عەمرۆ کوڕی مەرحومی عەبدی نارد و پەیامیدا: بەرێکەوە و کاتێك بەرێکەوتیت، ئێمە بۆ لای ئوردووگاکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ببە. ئەوان لەگەڵ خەڵکانی عەبدقەیس و بەکر کوڕی وایل بەرێکەوتن و ڕوویان لەئوردووگاکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد. خەڵکان وتیان: ئەم دەستەیە هاوکاری هەر کەسێك بکەن، سەرکەوتن بەدەست دێنێت.

دەڵێت: شەقیق کوڕی سور ئالأی خەڵکەکەی لەسەر دەستی کۆیلەکەی بەناوی ڕەشراشە بەرز کردەوە، وەعلە کوڕی مەحدوج زوهەلی پەیامی بۆ نارد: ڕێزت نەما و هۆکاری شەرێ خەڵکەکەت بەڕەشراشە سپارد؟

شەقیق وەڵامی بۆ ناردەوە: سەرقاڵی کارەکەی خۆت بە، ئێمە سەرقاڵی ئەنجامدانی ئەرکەکانی خۆمانین.

دەڵێت: سێ ڕۆژ مانەوە بێ ئەوەی جەنگ ڕووبدات. عەلی کوڕی ئەبی تالیب کەسی بۆ لای نەیارەکان دەنارد و سەرکۆنەی دەکردن.

قتادە دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەزاویە بەرێکەوت. مەبەستی تەڵحە و زوبەیر و دایکی باوەڕدارانی لەسەردا بوو. ئەوانیش بەمەبەستی ڕووبەڕوو بوونەوەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەفورەزەوە بەرێکەوتن و لەرۆژی پێنجشەممەی نیوەی جومادی الاخری ساڵی سی و شەشەم لەشوێنی کۆشکی عوبەیدالله کوڕی زیاد جەنگ دەستی پێکرد. کاتێك دوو سوپاکە ڕووبەڕوو بوونەوە، زوبەیر سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی و تەیار، هاتە پێش. بە عەلی کوڕی ئەبی تالیبیان وت: ئەوە زوبەیرە.

وتی: ئەگەر خواوەندی بیر بێننەوە، باشتر لەتەڵحە ئاگادار دەبێتەوە.

دەڵێت: تەڵحە هات، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت و لێیان نزیك کەوتەوە بەشێوەیەك چوارپێکانیان بەریەك دەکەوتن. عەلی کوڕی ئەبی تالیب

وتی: سیلاح و شەڕکەر و ئەسپتان ئامادە کردووە، بەڵام هیچ بیرتان لەهیچ بەڵگە و پاساوێك بۆ پێشگای خواوەند نەکردۆتەوە، لەخوا بترسن و هاوشێوەی ئەو کەسە مەبن ریسەکەی خۆی دەکاتەوە بەخوری.

مەگەر من برای دینی ئێوە نیم کەخوێنی من ڕەوا دەکەن و من خوێنی ئێوە بەحەرام دەزانم، ئایا پێشهاتێك روویداوە و بۆتە هۆی ئەوەی خوێنی من بۆ ئێوە حەڵاڵ بێت؟.

تەڵحە وتی: خەڵکانت دژی عوسمان کوڕی عەفان هاندەدا.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەو رۆژە خواوەند سزای شیاوی ئەوان بداتەوە و بزانن راستی ئاشکرا، خواوەندی تاقانەیە.

ئەی تەڵحە، تۆ بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان کوڕی عەفان لێرەیت؟ خواوەند بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان بەنەحلەت بکات، ئەی زوبەیر، بیرتە ئەو رۆژەی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) لەگەڕەکی مناڵەکانی غەنەم لای من گوزەرتان کرد، پێغەمبەر(د.خ) سەیری کرد و بزەیەکی هێنایە سەرلێو، منیش بزەم گرت، وتت: کوڕی ئەبی تالیب دەست لەگەردن کێشی هەڵناگرێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: عەلی گەردنکێش نییە. تۆ بۆ جەنگی ئەو دەڕۆیت و کەسێکی ستەمکاریت.

وتی: بەڵێ،، ئەگەر بیری ئەمەم دەبوو، نەدەهاتمە ئێرە، سوێند بەخوا هەرگیز لەگەڵ تۆ ناجەنگم.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ لای هاوەڵانی خۆی گەڕایەوە و وتی: زوبەیر پەیمانی لەگەڵ خوا بەست دژی ئێوە نەجەنگێت.

دەڵێت: زوبەیر گەڕایەوە بۆ لای دایکی باوەڕداران، پێی وت: لەو کاتەوەی هەستم بەئاوزی خۆم کردووە، بەشداری هەرجەنگێکم کردبێت، لەدەرئەنجامەکەی ئاگادار بووم، جگە لەم جەنگە.

دایکی باوەڕداران وتی: دەتەوێت چی بکەیت؟

وتی: دەخوازم نەجەنگم و گۆڕەپانی جەنگ بەجێبێڵم.

عەبدوڵلەی کوڕی وتی: بوویتە هۆکاری ئەوەی ئەم خەڵکە رووبەرووی یەك ببنەوە و ئێستاکە شمشێریان لەکالان دەرهێناوە، دەتەوێت بەجێیان بێڵیت و

بڕۆیت.؟ ئالاکانی کوڕی ئەبی تالبت بینیوە و گومان دەکەیت لەدەستی گەنجە بوێرەکاندایە.

وتی: پەیمانم لەگەڵ خواوەند بەستووە دژی ئەو نەجەنگم. لەوتەکەی خۆی تووڕە بوو.

عەبدوللە وتی: کەفارەی سوێندەکەت بدە و بجەنگە.

زوبەیر یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بەناوی مەکحولی ئازاد کرد.

عەبدولرەحمان کوڕی سلێمانی تەمیمی لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەی برایان سەیرتر لەو کەفارەیەم نەبینوە کە بۆ سەرپێچی کردنی فەرمانی خواوەند بەندەیەك ئازاد بکەن))

شاعیرێکی دیکە لەخەڵکانی تەمیم دەڵێت:

((مەکحولی ئازاد کرد تا دینەکەی خۆی بپارێزێت ئەمەی کردە کەفارەی سوێندەکەی خۆی بەڵام پەیمان شکێنی بەروخسارییەوە دیار بوو.))

محەممەد دەڵێت: عیمران کوڕی حەسین کەسی بۆ ناو خەڵکان نارد تا لەهەر دوو دەستەکە دووریان بخاتەوە بەهەمان شێوە کەئەحنەف ئەو کارەی کردبوو. کەسێکی بۆ لای منداڵەکانی عودەی نارد کە لەبەردەرگای مزگەوتەکە هاواری کرد: باوکی نەجید، عیمران کوڕی حەسین سلاوتان لێدەکات و دەڵێت: سوێند بەخوا ئەگەر لەکێوێك گەمارۆم خرابێتەسەر و تەنیا چەند داڕێکی تەڕ و چەند سەر مەڕێکم بێت بۆ ئەوەی شیرەکەیان بدۆشم و بیخۆمەوە، باشترە لەوەی هاوشێوەی یەکێك لەشەڕکەرانی ئەم دوو سوپایە بجەنگم.؟

دەڵێت: منداڵەکانی عودەی یەکدەنگ وتیان: سوێند بەخوا بەهیچ شێوەیەك پاشماوەی پێغەمبەر(د.خ) بەجێناهێڵین. مەبەستیان عایشە بوو.

حەجیر کوڕی رەبیع دەڵێت: عیمران کوڕی حەسین پێی وتم: برۆ ناو خەڵکەکەی خۆت، شوێنێك کەلێی کۆدەبنەوە، بڵێ: عیمران کوڕی حەسین، هاوەڵی پێغەمبەر(د.خ) منی بۆ لای ئێوە ناردووە، سلاوتان لێدەکات و خوازیاری بەخششە خواییەکانە بۆ ئێوە، بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، سوێند دەخوات ئەگەر

کۆیلەیەکی حەبەشی لووت براو بێت و سەرقاڵی مەڕ لەوەڕاندن بێت، باشترە لەوەی تیرێك بۆ ناو ئەو دوو سوپایە بهاوێژێت.

دەڵێت: پیرەکانی خەڵك بەوتەکانی رازی نەبوون و وتیان: ئێمە بەهیچ شێوەیەك پاشماوەی پێغەمبەر(د.خ) بەتەنیا جێناهێڵین.

محەممەد دەڵێت: خەڵکی بەسرە چەندین دەستە بوون. دەستەیەك لەگەڵ تەڵحە و زوبەیر، دەستەیەك لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب و دەستەیەکی دیکە نەیاندەویست شان بەشانی هیچ کام لەو دوو سوپایە بجەنگن.

دەڵێت: دایکی باوەڕداران لەماڵەکەی خۆیەوە بەرێکەوت و لەمزگەوتی حەدان لەگەڕەکی ئەزد دابەزی. جەنگ لەو ناوچەیە بوو. لەو کاتەدا سەرکردەی ئەزد سەبرە کوڕی شەیمان بوو، کەعب کوڕی سور پێی وت: ئەگەر ئەم دوو سوپایە لەیەك نزیك بکەونەوە، کاروبارەکان لەدەست دەچێت و هاوشێوەی دەریاکان دێنە یەك، شوێنکەوتەی من بە و لەگەڵ خەڵکان مەڕۆ، هاوڕێ لەگەڵ خەڵکەکەت لەم جەنگە خۆت بەدوور بگرە. دەترسم ئاشتی لەئارادا نەبێت. لەدەرەوەی ئەم کێشەیە بمێنەرەوە و خەڵکانی موزێر و رەبیعە پشتگوێ بخە چوونکە برامانن. ئەگەر ئاشتی سەقامگیر بوو، ئەوەیە خوازیارین پێی، ئەگەر جەنگ روویدا، سبەی لەنێوان ئەوان داوەری دەکەین.

دەڵێت: کەعب لەرۆژگاری جاهلییەت مەسیحی بوو. سەبرە وتی: دەترسم هێشتا باوەڕت بەئایینی مەسیحی مابێت، پێم دەڵێی بەشداری لەئاشتی نێوان خەڵکان نەکەم و هاوکاری دایکی باوەڕداران و تەڵحە و زوبەیر نەکەم ئەگەر بەمەرجەکانی ئاشتی ئەوان رازی نەبوون. پێم دەڵێی داوای خوێنی عوسمان کوڕی عەفان نەکەم؟ سوێند بەخوا هەرگیز رازی نابم. هەموو هۆزەکانی یەمەنی بڕیاریاندا بەشدار بن.

باوکی یەعمەر دەڵێت: کاتێك ئەحنەف کوڕی قەیس لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەڕایەوە، هیلال کوڕی وەکیع ڕۆشتە لای، وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟

وتیك خۆدوور گرتن، بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: پشتیوانی دایکی باوەڕداران، تۆ سەروەری ئێمەیت، چۆن ئێمە پشتگوێ دەخەیت؟

وتی: بەیانی کاتێك کوژرایت، من دەمێنمەوە و دەبمە سەروەری ئێوە.

هیلال وتی: تۆ پیری ئێمەیت، بەمشێوەیە دەدوێیت؟

وتی: پیرێکم گوێرایەڵی فەرمانەکانم نین، تۆ گەنجێکی و ملکەچی فەرمانەکانی تۆن.

دەڵێت: منداڵەکانی سەعد بۆچوونەکەی ئەحنەفیان پەسەند کرد و ئەوانی بۆ وادی ئەلسەباع برد. منداڵەکانی حەنزەلە شوێن هیلال کەوتن و منداڵەکانی عەمرۆ شوێن باوکی جەربا و جەنگان.

باوکی عوسمان دەڵێت: کاتێك ئەحنەف هات، دەنگی بەرز کردەوە: ئەی بنەماڵەی زەید، لەم کارە خۆتان بەدوور بگرن و زرنگی و ریسوایی ئەو دوو دەستەیە بۆ خۆیان بەجێبێڵن.

منجاب کوڕی راشید هەستا و وتی: ئەی بنەماڵەی رەباب، خۆتان بەدوور مەگرن و لەم کارە بەشداری بکەن، زرنگی بگرنە ئەستۆ. ئەوان ڕۆشتن.

دەڵێت: کاتێك منجاب، بەوشێوەیە قسەی کرد، باوکی جەربا لەمنداڵەکانی عوسمان کوڕی مالك، هەستا و وتی: ئەی بنەماڵەی عومەر، خۆتان لەم کارە بەدوور مەگرن و زرنگی خۆتان بسەلمێنن.

دەڵێت: باوکی جەربا سەرکردەی منداڵەکانی عەمرۆ و منجاب سەرکردەی منداڵەکانی زەببە بوو. کاتێك ئەحنەف وتی: ئەی بنەماڵەی زەید مەنات، لەم کارە خۆتان بەدوور بگرن و زرنگی و ریسوایی ئەو دوو دەستەیە بۆخۆیان بەجێبێڵن، هیلال کوڕی وەکیع وتی: لەم کارە خۆتان بەدوور مەگرن. هاواری کرد: ئەی بنەماڵەی حەنزەلە، زرنگی خۆتان نیشان بدەن و بەمشێوەیە سەرکردایەتی حەنزەلەی گرتەدەست. بەڵام تایەفەی سەعد شوێن ئەحنەف کەوتن و ئەوانی بۆ وادی ئەلسەباع برد.

محەممەد دەڵێت: سەرکردەی هەوازین و منداڵەکانی سولەیم و شوێنکەوتەکانیان، موجاشیع کوڕی مەسعودی سولەمی بوو. سەرکردەی عامر، زەفەر کوڕی حارس بوو. سەرکردەی غەتەفان، ئەعسەر کوڕی نەعمانی باهلی و سەرکردەی بەکر کوڕی وایل، مالیك کوڕی موسەمەع بوو. عەبدئەلقەیس پەیوەستی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوون جگە لەیەك کەس کەبەجێما. لەناو منداڵەکانی بەکر کوڕی وایل کەسانێك بەشدارییان

کرد و ئەوانەی خۆیان بەدوور گرت بەئەندازەی ژمارەی ئەوکەسانە بوو کەمانەوە، سەرکردەکەیان سەنان بوو. ئەزدیەکان سێ سەرکردەیان بوو: سەبرە کوڕی شەیمان، مەسعود و زیاد کوڕی عەمرۆ. ئەوانەی بڵاوەیان لێکرد، دوو سەرکردەیان بوو: سەرکردەی موزێر، خەریت کوڕی راشید و سەرکردەی قوزاعە و شوێنکەوتەکانیان، رەعبی جورمی بوو. ئەمە نازناوی ئەو بوو. سەرکردەی یەمەنییەکانی دیکە، زولئەجەرەی حەمیری بوو.

دەڵێت: تەڵحە و زوبەیر لەگەڵ سوپاکەی خۆیان هاتن و لەزابوقە لەقەریت الارزاق جێگیر بوون. موزێرییەکان هەموویان هاتن و لەسەقامگیر بوونی ئاشتی دڵنیا بوون. رەبیعە لەسەرووی هەمووانەوە جێگەی گرت، ئەوانیش لەسەقامگیر بوونی ئاشتی دڵنیا بوون. یەمەنییەکان لەخوار هەمووانەوە جێگیر بوون و لەئاشتی دڵنیا بوون. دایکی باوەڕداران لەحەدان و خەڵکان لەگەڵ سەرکردەکانی خۆیان لەزابوقە کۆببوونەوە. ژمارەیان سی هەزارکەس بوو. لەم کاتەدا حەکیم و مالکیان بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب نارد و پەیامیاندا: پەیمانەکەمان لەگەڵ قەعقاع هێشتا لەجێگەی خۆیەتی، وەرە.

دەڵێت: ئەو دوو کەسە ڕۆشتنە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و پەیامەکەیان گەیاند. عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرێکەوت و لێیان نزیك کەوتەوە. خەڵکی هەر هۆزێك لای هۆزەکەی خۆیان دابەزین: موزێرییەکان لای موزێرییەکان، خەڵکانی رەبیعە لای رەبیعە، یەمەنییەکان لای یەمەنییەکان و هەمووان لەسەقامگیر بوونی ئاشتی دڵنیا بوون. هاتوچۆی یەکیان دەکرد و جگە لەئاشتی بیریان لەهیچی دیکە نەدەکردەوە. هاورێیانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بیست هەزار کەس بوون. سەرکردەی خەڵکانی کوفە ئەو سەرکردانە بوون لەگەڵ ئەوان هاتنە زیقار. خەڵکانی عەبدقەیس سێ سەرکردەیان بوو: سەرکردەی جەزیمە و بەکر، عەلی کوڕی جاروود، سەرکردەی عەمور، عەبدوللە کوڕی سەودا، سەرکردەی خەڵکانی هیجر، ئەشەح. سەرکردەی بەکر کوڕی وایلی بەسرە، کوڕی حارس کوڕی نەهار، سەرکردەی زەت و سەیابجە، دەنوور بوو.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ دەهەزار کەس هاتە زیقار و دە هەزار کەسی دیکە پەیوەستی بوو.

محەممەد کوڕی حەنیفە دەڵێت: لەگەڵ حەوتسەد کەس لەمەدینەوە بەرێکەوتین، لەکوفە، حەوت هەزار کەس پەیوەستمان بوو. دوو هەزار کەسیش لەخەڵکانی دیکە پەیوەستمان بوون کەزۆربەیان لەمناڵەکانی بەکر کوڕی وایل بوون. بەوتەیەك شەش هەزار کەس.

بێژەر دەڵێت: کاتێك خەڵکان دابەزین و ئارامیان گرت، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەرێکەوت. تەڵحە و زوبەیریش بەرێکەوتن. لەیەك نزیك کەوتنەوە و سەبارەت بەجیاوازییەکان ئاخاوتن. هیچ کارێکیان باشتر لەئاشتی و رێگرتن لەخوێنڕشتن پەسەند نەکرد. بەم پێیە لەیەك جیابوونەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ ئوردووگاکەی خۆی گەڕایەوە. تەڵحە و زوبەیریش بۆ ئوردووگاکەی خۆیان گەڕانەوە.

## جەنگ

بێژەر دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب شەوی یەکەم عەبدولله کوڕی عەباسی بۆ لای تەڵحە و زوبەیر نارد، ئەوانیش شەوی یەکەم محەممەد کوڕی تەڵحەیان بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب نارد تا هەرکام لەگەڵ هاوەڵانی خۆیان قسە بکەن و وەڵام، ئەرێنی بوو. لەشەودا، لەمانگی جومادی الاخر، تەڵحە و زوبەیر کەسیان بۆ لای سەرکردەکانی سوپاکەی خۆیان نارد جگە لەوانەی هێرشیان کردبووە سەر عوسمان کوڕی عەفان. شەو بەبڕیاری ئاشتی کۆتایی هات، شەوێك کەهیچ کات هاوشێوەیان نەبینی، بێ جەنگ شەویان بەسەر برد. بزوێنەرانی کارەساتی کوشتنی عوسمان کوڕی عەفان، شەوێکی خراپیان بەسەر برد چوونکە لەمردن و کوژران نزیك ببوونەوە، هەموو شەویان بەراوێژ کردن بەسەر برد و بڕیاریاندا بەشێوەیەکی نهێنی ئاگری جەنگ هەڵگیرسێنن. بەربەیان بێ ئەوەی دراوسێکانیان ئاگادار ببنەوە، بەرێکەوتن، هێشتا هەوا تاریك بوو، موزێرییەکانیان روویان لەموزێرییەکان کرد، رەبیعییەکان بۆ لای رەبیعییەکان و یەمانییەکان، بۆ لای یەمانییەکان، شەڕیان دەستپێکرد. خەڵکانی بەسرە راچەنین و هەر دەستەیەك لەبەرابەر خەڵکانی کوفەی بەرابەر خۆیان شەڕیان دەستپێکرد. تەڵحە و زوبەیر لەگەڵ سەرکردەکانی موزێر

هاتن. عەبدولرەحمان کوڕی حارس کوڕی هوشامیان بۆ باڵی ڕاست نارد کەهەموویان لەخەڵکانی رەبیعە بوون. عەبدولرەحمان کوڕی عەتاب کوڕی ئەسیدیان بۆ باڵی چەپ نارد و خۆیان لەناوەڕاستی سوپاکە جێگیر بوون، وتیان: چی ڕوویداوە؟

وترا: خەڵکانی کوفە بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان کردە سەرمان.

وتیان: دەمانزانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب تا ئەو کاتەی خوێن نەرێژێت و ڕێزمان نەشکێنێت، دەست هەڵناگرێت و ڕێگەی سازگاری لەگەڵ ئێمە ناگرێتەبەر.

لەگەڵ خەڵکانی بەسرە هاتن، خەڵکانی بەسرە ڕووبەڕووی هێرشبەران بوونەوە و بەرەو ئوردووکانیان پاشەکشێیان پێکردن. عەلی کوڕی ئەبی تالیب و خەڵکانی کوفە دەنگەدەنگەکەیان بیست. کەسێکیان لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب دانابوو تا وتەکانی ئەوانی پێ ڕابگەیێنێت. کاتێك پرسی چی ڕوویداوە؟ ئەوکەسە وتی: لەناکاو دەستەیەك لەنەیارەکان بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان کردە سەرمان و پاشەکشێمان پێکردن. دواتر دەستەیەکمان بینی کەبۆ جەنگ خۆیان ئامادە و هێرشیان کردە سەرمان. عەلی بەفەرماندەی باڵی ڕاستی خۆی وت: هێرش بکەرە سەر باڵی ڕاستی ئەوان. بەفەرماندەی باڵی چەپی وت: هێرش بکەرە سەر باڵی چەپ، دەمزانی تەڵحە و زوبەیر دەست هەڵناگرن تا خوێن برێژن و ڕێز بشکێنن و هیچ کات ڕێگەی سازگاری لەگەڵ من ناگرنەبەر.

لەم ناوەدا سەبەئییەکان بەردەوام ئاگری جەنگیان خۆش دەکرد، عەلی لەناو خەڵکان هاواری کرد: ئەی خەڵکینە دەست هەڵبگرن. لەکاتی ئاژاوەکە بۆچوونی هەمووان ئەوە بوو شەڕ نەکەن چوونکە دەیانویست هیچ بەڵگە و پاساوێك بۆ یەکتر نەهێڵنەوە هەروەها بڕیاریاندا بوو هەڵاتووان و بریندارا‌ن نەکوژن و شوێن نەیارەکانیان نەکەون. هەردوو سوپا لەناو خۆیاندا بڕیارێکی لەم چەشنەیان دابوو.

باوکی عەمرۆ دەڵێت: کەعب کوڕی سور ڕۆشتە لای دایکی باوەڕداران و وتی: وەرە چوونکە خەڵکان مەبەستی جەنگیان هەیە ئەگەری هەیە خواوەند بەهۆی تۆوە لەجەنگ دووریان بخاتەوە.

دەڵێت: دایکی باوەڕداران سوار بوو، کەژاوەکەیان بەزرێکان داپۆشی، وشترەکەیان خستە ڕێ. ناوی وشترەکەی دایکی باوەڕداران، عەسکەر و بەبەهای

دووسەد دینار لەیەعلی کوڕی ئومەییەی کڕی.

دەڵێت: کاتێك دایکی باوەڕداران لەلای ماڵەکانەوە دەرکەوت و گەیشتە ئەو جێگەی دەنگەدەنگ و قەرەباڵغی دەبیست، وەستا، زۆری نەخایاند ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند، پرسی: ئەمە چییە؟

وتیان: دەنگە دەنگی سوپاکەیە.

وتی: خێرە یا شەڕ؟

وتیان: شەڕ.؟

وتی: ئەم دەنگە هی کام سوپایە کەتێکشکاون؟ دایکی باوەڕداران وەستابوو کەسوپاکەی شکستیان خوارد. زوبەیر ڕێگەی خۆی گرتەبەر و ڕووی کردە وادی ئەلسەباع. تیرێکی نەناسراو بەر تەڵحە کەوت و سەرەوەی ئەژنۆی بەکەلەکەی ئەسپەکەیەوە دووری. کاتێك پێپۆشەکەی پڕبوو لەخوێن، بەکۆیلەکەی خۆی وت: لەپشت سەری منەوە سوار بە و بمگرە، بەدوای شوێنێکدا بگەڕێ تا دابەزم. ئەوی بەرەو بەسرە برد.

## شەڕی وشتر بە پێی گێڕانەوەیەکی دیکە

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەسەرهاتی جەنگەکە و چارەنووسی زوبەیر و ڕۆشتنی ئەو لەگۆڕەپانی جەنگ لەگێڕانەوەیەکی دیکە بەمشێوەیە هاتووە کەزوهری ئاماژەی پێدەدات: کاتێك هەواڵی کوژرانی ئەو حەفتا کەسەی هاوڕێی حەکیم لەبەسرە بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشت، لەگەڵ دوانزە هەزار کەس ڕووی کردە بەسرە و لەم زیانەی بەرخەڵکانی ڕەبیعە کەوتبوو، داخی دەخوارد و هۆنراوەیەکی لەمبارەوە خوێندەوە:

دەڵێت: کاتێك دوو سوپاکە لەیەك نزیك کەوتنەوە، عەلی کوڕی ئەبی تالیب سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی هات و زوبەیری بانگ کرد، پێکەوە وەستان. عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: زوبەیر، مەبەستت لەهاتن بۆ بەسرە چییە؟

وتی: تۆ بەشیاوی خەلافەت نازانم و لەئێمە زیاتر مافت نییە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: دوای عوسمان کوڕی عەفان خەلافەت مافی تۆ

نییە، ئێمە تۆمان بەیەکێك لەمناڵەکانی عەبدولموتەلیب دەزانی تا ئەو کاتەی کوڕەکەت بووە رێگر و دووبەرەکی لەناو ئێمەدا دروست کرد. دواتر سەرکۆنەی کرد و ئاماژەی بە بەسەرهاتێکی پێشتردا کە پێغەمبەر(د.خ) لای ئەوانەوە گوزەری کرد و بەعەلی وت: کوڕە پوورەکەت چی دەڵێت؟ بۆ جەنگی تۆ دێت و لەبەرابەر تۆ کەسێکی ستەمکارە.

دەڵێت: زوبەیر ڕۆشت و وتی: لەگەڵ تۆ ناجەنگم. بۆ لای عەبدوڵڵەی کوڕی گەڕایەوە و وتی: نازانم دەرئەنجامی ئەم جەنگە چی دەبێت.

کوڕەکەی وت: کاتێك هاتی لەدەرئەنجامەکەی ئاگادار بوویت، بەڵام ئاڵاکانی کوڕی ئەبی تالبت بینی و دڵنیابوویت مەرگ لەژێر ئاڵاکاندایە، ترساویت.

دەڵێت: بەڕادەیەك ئەوی تووڕە کرد کەدەلەرزی، وتی: هاوار لەتۆ، سوێندم خواردووە لەگەڵ ئەو نەجەنگم.

وتی: کەفارەی سوێندەکەت بەئازاد کردنی کۆیلەیەك بدە.

زوبەیر کۆیلەکەی ئازاد کرد و لەناو ریزی جەنگاوەران وەستا.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەزوبەیری وت: تۆ کەبکوژی عوسمان کوڕی عەفانیت، داوای خوێنی ئەو لەمن دەکەیت؟ خواوەند ئەو کەسە گرفتار بکات کەدژی عوسمان کوڕی عەفان ئاژاوەی نایەوە. هەروەها بەتەڵحەی وت: هاوسەری پێغەمبەرت بۆ ئەم جەنگە هێناوە و هاوسەرەکەی خۆت لەماڵەوە داناوە؟ مەگەر بەیعەتت لەگەڵ من نەبەست؟

وتی: ئەو کاتەی بەیعەتم لەگەڵ تۆ بەست، شمشێر لەسەر گەردنم بوو.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەهاوەڵانی خۆی وت: کێ قورئان و فەرموودەکانی بۆ ئەو خەڵکە دەخوێنێتەوە، ئەگەر دەستی قرتا، بەدەستەکەی دیکەی قورئانەکە بەرز بکاتەوە و ئەگەر ئەو دەستەیشی لەدەستدا، بەددان بیگرێت.

گەنجێکی تازە پێگەیشتوو، وتی: من ئەو کارە دەکەم.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەناو هاوەڵانی خۆی گەڕا و پێشنیاری ئەم کارەی پێکرد بەڵام کەس جگە لەو گەنجە رازی نەبوو، عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێی وت: فەرموودەکانی قورئانیان بیر بێنەرەوە و بڵێ: ئەم قورئانە لەنێوان ئێمە و ئێوەدا بێت، سەبارەت بەخوێنی ئێمە و خوێنی خۆتان، خواتان لەبیر بێت.

دەڵێت: سوپاکەی تەڵحە و زوبەیر هێرشیان کردە سەر ئەو گەنجە قورئان بەدەستە و هەردوو دەستی قرتا، قورئانەکەی بەددان گرت تا کوژرا.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: هەنووکە هێرش کردن ڕەوایە، جەنگ دەستپێبکەن.

دەڵێت: لەو ڕۆژەدا حەفتا کەس کوژران کەجڵەوی وشترەکەیان دەگرت. کاتێك وشترەکە لەپێخرا و خەڵکان شکستیان خوارد، تیرێك بەر تەڵحە کەوت و ئەوی کوشت. گومانیان کردووە هاوێژەری تیرەکە مەروان کوڕی حەکەمە.

کوڕی زوبەیر جڵەوی وشترەکەی گرت و دایکی باوەڕداران پرسی: کێیە؟

کاتێك ئاگاداری کردەوە، هاواری کرد: ئەی هاوار! ئەسما کوڕەکەی لەدەستدا. کوڕی زوبەیر بریندار و خۆی خستە ناو بریندارەکان. دواتر ئەویان هەڵگرتەوە و برینەکەی سارێژ بوو.

دەڵێت: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر دایکی باوەڕدارانی هەڵگرت خێوەتێکی بۆ هەڵکرد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب هات و وتی: خەڵکانت هاندا و ئالآی شۆڕشیان بەرز کردەوە، ئەوانت خستە گیانی یەك و خوێنی یەکیان ڕشت. زۆری قسە کرد.

دایکی باوەڕداران وتی: ئەی کوڕی ئەبی تالیب، هەنووکە سەرکەوتنت بەدەست هێناوە، تا ئەتوانی سەرکۆنە بکە، ئەمرۆ سوپاکەت بوێریان لەخۆیان نیشاندا.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەوی ڕەوانە کرد. دستەیەك ژن و پیاوی لەگەڵ نارد و فەرمانیدا دوانزە هەزاری پێبدەن. ئەم کارە لەئەستۆی عەبدوللە کوڕی جەعفەر بوو. سامانێکی زۆری پێبەخشی، وتی: ئەگەر سەروەری باوەڕداران کارەکەمی پشتڕاست نەکردەوە، لەسامانی خۆم دەیدەم.

دەڵێت: زوبەیر کوژرا. گومان دەکەن بکوژەکەی کوڕی جەرموز بێت چوونکە ڕۆژێك لای سەروەری باوەڕداران وەستا و وتی: بۆ بکوژەکەی زوبەیر داوای مۆڵەت بکە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: مۆڵەتی هەیە و پێی بڵێ جێگەی جەهەننەمە.

قورە کوڕی حارس دەڵێت: لەگەڵ ئەحنەف کوڕی قەیس بووم، جون کوڕی قتادەی کوڕە مام هاوڕێی زوبەیر کوڕی عەوام بوو. جون بەمنی وت: لای زوبەیر

بووم، سوارێك هات و هاوشێوەی فەرمانڕەوا سڵاویان بۆ نارد.

سوار وتی: ئەی ئەمیر، سڵاو لەتۆ بێت.

زوبەیر وتی: سڵاویش لەتۆ بێت.

وتی: ئەم دەستەیە هاتوونەتە فلأنە شوێن و فلأنە شوێن. دەستەیەكی بێ چەكتر و ترسەنۆكتر لەوانم نەبینیوە. ئەمەی وت و ڕۆشت.

دەڵێت: سوارێكی دیكە هات و وتی: ئەی فەرمانڕەوا سڵاو لەتۆ بێت.

وتی: سڵاویش لەتۆ.

وتی: ئەم دەستەیە هاتوون و گەشتوونەتە فلأنە شوێن، لەسوپاكەی ئێوە و چەكەكانی ئاگادار بوونەوە و خواوەند دڵی ئەوانی لیپاولیپ كردووە لەترس.

زوبەیر وتی: ئەم قسەیە مەكە سوێند بەخوا ئەگەر كوڕی ئەبی تالیب چوارپێی دەست نەكەوێت سوار لەسەر كەرە دارینە دێت. سوار ڕۆشت.

دەڵێت: كاتێك سوپاكەی عەلی كوڕی ئەبی تالیب لەناو تەپ وتۆز دەهاتەدەر، سوارێك هات و وتی: ئەی ئەمیر، سڵاو لەتۆ بێت.

وتی: سڵاو لەتۆ.

وتی: ئەم دەستەیە هاتوون. عەمار لەگەڵ ئەواندایە، قسەم لەگەڵ كرد و وەڵامی دامەوە.

زوبەیر وتی: عەمار لەناو ئەواندا نییە.

وتی: بۆ نا، سوێند بەخوا عەمار لەناو ئەواندایە.

وتی: خواوەند عەماری نەكردۆتە هاوڕێی ئەوان.

وتی: خواوەند عەماری كردۆتە هاوڕێی ئەوان.

دەڵێت: كاتێك بینی سوارەكە پێداگری دەكات، بەیەكێك لەكەسەكانی خۆی وت: بڕۆ بزانە ڕاست دەكات؟

دەڵێت: ئەو كەسە سەركەوت و ڕۆشت. من ئەوانم دەبینی. كەمێك لەكەنار سوپاكەدا وەستان، دواتر بۆ لای ئێمە گەرانەوە. زوبەیر بەهاوەڵەكەی خۆی وت: چیت بینی؟.

وتی: ئەو پیاوە ڕاست دەكات.

زوبەیر وتی: ئەی هاوار، گرفتاری زیان بووین! ئەی هاوار، پشتم شكا. (بۆیە ئەم

وتەی هێنایە سەرزمان چوونکە حەدیسێکیان لەپێغەمبەر دەگێڕایەوە کەفەرموو بووی: دەستەیەکی یاخی عەمار دەکوژن.

دەڵێت: زوبەیر کەوتە لەرزین بەشێوەیەك شمشێرەکەی دەلەرییەوە. بەخۆم وت: دایکم پرسەگێر بێت، ئەمە ئەو کەسە بوو دەمویست لەگەڵ ئەو بمرم و لەگەڵ ئەو بژیم. سوێند بەخوا ئەم لەرزینەی ئەو لەبەر حەدیسەکەی پێغەمبەرە(د.خ).

دەڵێت: کاتێك خەڵکان سەرقاڵ بوون، زوبەیر سوار ئەسپەکەی بوو و ڕۆشت.

کاتێك سوار ئەسپەکەی بوو، ڕۆشتە لای ئەحنەف. دوو سوار هاتنە لای ئەحنەف و هاوەڵانی. لای ئەو دانیشتن و ماوەیەك بەنهێنی قسەیان کرد و ڕۆشتن. عەمرۆ کوڕی جەرموز ڕۆشتە لای ئەحنەف و وتی: لەوادی ئەلسەبەع پێی گەیشتمەوە و خوێنم ڕشت.

جون دەیوت: سوێند بەو خوایەی گیانم لەدەستی ئەودایە، ئەحنەف بکوژی زوبەیر بوو.

عەمار کوڕی معاویە دەڵێت: لەرۆژی جەنگی جەمەل، عەلی کوڕی ئەبی تالیب قورئانێکی هەڵگرت و لەناو هاوەڵانی خۆیدا سووڕایەوە، دەیوت: کێ ئەم قورئانە هەڵدەگرێت و دەڕواتە ناو ئەو سوپایە و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ فەرموودەکانی قورئانیان پێدەکات و دەکوژرێت؟

دەڵێت: گەنجێك لەخەڵکانی کوفە کەعابایەکی سپی لەبەردا بوو، وتی: من.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەیری نەکرد، وتی: کێ ئەم قورئانە هەڵدەگرێت و پێشنیاری فەرموودەکانی بەخەڵکان دەکات و دەکوژرێت؟

ئەو گەنجە وتی: من.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب قورئانەکەی پێسپارد و دەستی بەبانگێشت کردنی خەڵکان کرد. دەستی ڕاستی ئەویان بڕی، قورئانەکەی بەدەستی چەپی گرت و لەکارەکەی بەردەوام بوو، دەستی چەپیان بڕی. لەکاتێکدا خوێن بەجەستەی دەهاتە خوار، قورئانەکەی بەسینەی ڕاگرتبوو تا ئەو کاتەی کوژرا.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: هەنووکە جەنگ لەگەڵ ئەوان ڕەوایە.

دەڵێت: دایکی ئەو گەنجە لەکاتی لاواندنەوە بۆ کوڕەکەی هۆنراوەیەکی

خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((خواوەندا، موسوڵمانێك پێشنیاری پێکرد قورئانی دەخوێند و لەوان نەدەترسا دایکی وەستابوو و دەیبینین خوازیاری گومڕایی بوون ریشیان خوێناوی بوو))

شەعبی دەڵێت: فەرماندەی باڵی راستی سوپای عەلی کوڕی ئەبی تالیب هێرشی کردە سەر باڵی چەپی خەڵکانی بەسرە و شەڕیان دەستپێکرد. خەڵکان لەدەوری دایکی باوەڕداران کۆبوونەوە. زۆربەیان لەتایەفەی ئەزد و زەببە بوون. لەکاتی هەڵاتنی هەتاو تا ئاوابوون جەنگ بەردەوام بوو. دوای ئەوە شکستیان خوارد. یەکێك لەخەڵکانی ئەزد هاواری کرد بگەڕێنەوە و محەممەد کوڕی عەلی زەرەبەیەکی لێدا و دەستی قرتاند کەهاواری کرد: ئەی ئەزدییەکان هەڵبێن. کوشتار لەناو ئەزدییەکان پەرەی سەند ودەنگیان بەرز بوویەوە: ئێمە شوێنکەوتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبین. یەکێك لەمناڵەکانی لەیس دواتر هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەو رۆژەی رووبەرووی ئەزدییەکان بووینەوە
و ئەسپە بەڵەك و قوڕاوییەکان غاریان دەدا
کاتێك کەلەکە و ئانیشکیانمان دەقرتاند
و گومان و مەبەستیان بەنەحلەت بێت))

ملك کوڕی دینار دەڵێت: لەجەنگی جەمەل، عەمار هێرشی کردە سەر زوبەیر و بەڕم لێیدا.

زوبەیر وتی: دەتەوێت من بکوژیت.

عەمار وتی: نە، بڕۆ.

عامر کوڕی حەفس دەڵێت: لەجەنگی جەمەل عەمار بەڕم هێرشی کردە سەر زوبەیر.

زوبەیر وتی: ئەی باوکی یەقزان من دەکوژیت؟

وتی: نە، ئەی باوکی عەبدوللە.

محەممەد دەڵێت: کاتێك لەنیوەی یەکەمی رۆژ سوپاکەی زوبەیر و تەڵحە شکستیان خوارد، زوبەیر هاواری کرد: من زوبەیرم، ئەی خەڵکینە لەدەورم کۆببنەوە. کۆیلەکەی لەگەڵدا بوو و هاواری دەکرد: لەهاوەڵی پێغەمبەر(د.خ)

هەڵدێن؟

دەڵێت: زوبەیر رووی کردە وادی ئەلسەباع، چەندین سوار شوێنی کەوتن و خەڵکان سەرقاڵی کوشتنی یەکتر بوون. زوبەیر کاتێك بینی شوێنی کەوتوون، هێرشی کردە سەریان و بڵاوەی پێکردن. دووبارە هێرشیان کردە سەر و کاتێك ناسییانەوە، وتیان: ئەوە زوبەیرە، وازی لێ بێنن.

دەڵێت: قەعقاع لەگەڵ دەستەیەك لای تەڵحە گوزەری کرد کەدەیوت: ئەی بەندەکانی خوا، وەرنە لای من، خۆڕاگری.... خۆڕاگری....

پێی وت: ئەی باوکی محەممەد برینداریت، بۆ ئەنجامدانی مەبەستەکەت ناتەوانیت، بگەڕێرەوە بۆ ماڵەکەت.

تەڵحە وتی: ئەی کۆیلە، هەڵمگرە و بەدوای شوێنێکدا بگەڕێ.

دەڵێت: ئەویان بردە بەسرە. کۆیلەیەك و دوو کەسی دیکە هاوڕێیەتیان دەکرد. سوپاکەیان کەشکستی خواردبوو، بەرەو بەسرە دەگەڕانەوە. کاتێك وشترەکەیان بینی کەموزێرییەکان دەوریان گرتبوو، دووبارە گەڕانەوە و جەنگ سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە. خەڵکانی رەبیعەی بەسرە خۆڕاگرییان کرد. دەستەیەك لەباڵی راست و دەستەیەك لەباڵی چەپ.

دەڵێت: دایکی باوەڕداران وتی: ئەی کەعب قورئان ببەرە ناو خەڵکان و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ فەرموودەکانی بەخەڵکان بکە. قورئانێکی پێدا. هاتنە پێش. سەبەئییەکان لەپێشەوە بوون و لەسەقامگیر بوونی ئاشتی دەترسان. کەعب قورئان بەدەست بەرەو لای ئەوان رۆشت. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەدوایانەوە بوو و رێگری لێ دەکردن بەڵام تەنیا خوازیاری پێشڕەوی بوون. کاتێك کەعب پێشنیاری پێکردن، تیر بارانیان کرد و کوشتییان. تیریان بۆ کەژاوەکەی دایکی باوەڕدارانیش هاویشت. ئەو هاواری دەکرد: کوڕەکانم، فریای ئەوانی دیکە بکەون. دواتر دەنگی بەرز کردەوە، خواوەندا، خواوەندا، بیری خواوەند و رۆژی هەستانەوەتان هەبێت. بەڵام تەنیا دەیانویست پێشڕەوی بکەن. کاتێك پێداگری ئەو دەستەی بینی، یەکەم کار کردی ئەوە بوو کەوتی: ئەی خەڵکینە نفرینی بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان و شوێنکەوتەکانی بکەن. دەستی بەنفرین کردن کرد. خەڵکانی بەسرەیش هاواری

نفرین کردنیان بەرز کردەوە. عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەنگی نفرین کردنی بیست، پرسی: ئەم هاوارە چییە؟

وتیان: عایشە بکوژەکانی عوسمان و شوێنکەوتەکانی نفرین دەکات و خەڵکانیش بەهەمان شێوە.

عەلییش نفرینی دەست پێکرد و دەیوت: خواوەندا بکوژەکانی عوسمان کوڕی عەفان و شوێنکەوتەکانی نفرین بکە.

عایشە کەسی بۆ لای عەبدولرەحمان کوڕی عەتاب و عەبدولرەحمان کوڕی حارس نارد بۆ ئەوەی لەشوێنەکانی خۆیان بمێننەوە. کاتێك بینیان ئەو دەستەیە بەرەو لای عایشە دەڕۆین و دەست لەخەڵکان هەڵناگرن، کەوتنە جمووجۆڵ. موزەرییەکانی میسر هێرشیان برد و موزەرییەکانی کوفەیان شکستدا بەشێوەیەك سوپاکەی عەلی پەرێشان بوو. عەلی لەپشتی محەممەدی دا و وتی: هێرش بەرە. بەڵام ئەو کشایەوە. عەلی ڕۆشت تا ئاڵاکەی لێ وەربگرێت بەڵام محەممەد هێرشی برد و عەلی ئاڵاکەی لەدەستی ئەودا هێشتەوە. موزەرییەکانی کوفە هێرشیان برد و لەبەردەم وشترەکە بوێریان لەخۆیان نیشاندا تا ئەو کاتەی لاواز بوون. کەنارەکان لەشوێنی خۆیاندا بوون و هیچ هەوڵێکیان نەدەدا. جگە لەموزەرییەکان کەسانی دیکەیش هاورێیەتی عەلی کوڕی ئەبی تالبیان دەکرد. یەکێك لەوان زەید کوڕی سوحان بوو کە یەکێك لەئەندامانی هۆزەکەی پێی وت: بۆ لێرە ماویتەوە مەگەر نازانی موزەرییەکان لەبەردەم تۆدان و وشترەکە لەبەرابەرت و مەرگ نزیکە؟

وتی: مەرگ لەژیان باشترە، خوازیاری مەرگم. لەگەڵ براکەی سیحان کوژرا و سەعسەعەی برایان بریندار بوو.

شەڕ گەرم بوو، کاتێك عەلی ئەمەی بینی، کەسی بۆلای یەمەنییەکان و خەڵکانی رەبیعە نارد و فەرمانی پێدان سەرقاڵی ئامادە کردنی هۆزەکانی خۆیان بن. یەکێك لەخەڵکانی عەبدقەیس وتی: پێشنیاری گەڕانەوە بۆ کتێبی خواوەندتان پێدەکەین.

وتیان: ئەو کەسەی سنوورەکانی خواوەند دەبەزێنێت وپێشنیارکەری گەڕانەوە بۆ لای خواوەند، کەعب کوڕی سور، دەکوژێت، پێشنیاری گەڕانەوە بۆ کتێبی خواوەندمان پێدەکات.

خەڵکانی رەبیعە تیربارانیان کرد و خوێنیان ڕشت. یەمەنییەکانی کوفەیش

پێشنیاری گەڕانەوەیان بەیەمەنییەکانی بەسرە کرد بەڵام تیرباران کران.

بێژەر دەڵێت: شەڕ تا نیمەڕۆ بەردەوام بوو، تەڵحە کوژرا و زوبەیر گۆڕەپانی جەنگی بەجێهێشت. کاتێك خەڵکانی بەسرە لەدەوری عایشە کۆبوونەوە و خەڵکانی کوفە بۆ جەنگ پێداگرییان دەکرد و دەیانویست عایشە بکوژن، عایشە خەڵکانی هاندا و جەنگ دەستی پێکردەوە تا ئەو کاتەی هاوار لەهەر دوو سوپا بەرز بوویەوە و دەستیان لەجەنگ هەڵگرت.

دەڵێت: دوای نیمەڕۆ دووبارە بۆ جەنگ خۆیان ئامادە کرد. نیوەی یەکەمی ڕۆژ جەنگ لەدەستی تەڵحە و زوبەیردا بوو بەڵام نیوەی دووەم لەدەستی عایشە. دوو سوپا هێرشیان برد. یەمەنییەکانی بەسرە شکستیان بەیەمەنییەکانی کوفە هێنا و ڕەبیعییەکانی بەسرە شکستیان بەرەبیعییەکانی کوفە هێنا. عەلی لەگەڵ موزەرییەکانی کوفە هێرشی کردە سەر موزەرییەکانی بەسرە و وتی: هیچ ڕێگەیەکی هەڵاتن لەمەرگ بوونی نییە، یەخەی هەڵاتوو دەگرێت و ئەو کەسەی ماوەتەوە، پشتگوێی ناخات.

زەید کوڕی حەساس دەڵێت: بیستم محەممەد کوڕی حەنیفە دەیوت: لەجەنگی (جەمەل) وشتر باوکم ئاڵاکەی دایە دەستم و وتی: پێشڕەوی بکە، پێشڕەویم کرد تا ئەو جێگەی ڕووبەڕووی ڕمەکان بوومەوە، وتی: ئەی بێ دایك پێشڕەوی بکە. دوودڵ بووم و وتم: ڕووبەڕووی ڕمەکان بوومەتەوە و چیتر ڕێگەی پێشڕەوی نییە، کەسێك کەنەمزانی کێیە ئاڵاکەی لەدەست وەرگرتم و کاتێك سەیرم کرد، بینیم باوکمە. هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( ئەی ژیان، تۆ لەچاکەی من لەخۆت بایی بوویت!

ئەم خەڵکە دوژمنانن بەڵام

ڕۆشتنە ناو جەنگ لەگەڵ منالەکان باشترە))

محەممەد دەڵێت: کاتێك هێرشمان برد، کەنارەکان هاوشێوەی دڵی سوپا بەسەختی شەڕیان دەکرد. یەمەنییەکانیش بەهەمان شێوە. دەکەس لەخەڵکانی کوفە لەژێر ئاڵای عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژران، هەرکەس ئاڵاکەی هەڵدەگرت دەکوژرا، پێنج کەس لەهۆزی هەمەدان و پێنج کەس لەیەمەنییەکانی دیکە، کاتێك یەزید کوڕی

قەیس ئەمەی بینی، ئالآکەی هەڵگرت و لەدەستی ئەودا مایەوە. ئەو، هۆنراوەیەکی دەخوێند بەم ناوەرۆکە:

((ئەی نەفسی من زۆر ژیاییت

رۆژگارێکت لەگەڵ ئاوازدا بەسەر برد ئەم تەمەنە بۆ تۆ بەسە

چوونکە تا زیندوو بیت من تەمەنی درێژم دەوێت))

ئەم هۆنراوەی وەك نمونە دەخوێندەوە کەهۆنراوەی شاعیرێکی کۆن بوو.

غەوان کوڕی باوکی غەوانی هەمەدانیش هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((شمشێرم خستۆتە ناو خەڵکانی ئەزد

پیر و گەنجەکانیان دەکوژم چوونکە جەنگاوەرن و دەستدرێژ))

رەبیعییەکان هاتن، زەید، دواتر سەعسەعە، دوای ئەوان سیحان (کوڕەکانی سوحان) دوای ئەوان عەبدوالله کوڕی رەقەبە و دواتر باوکی عوبەیدە کوڕی راشیدی سولەمی، هەموویان لەخەڵکانی کوفە، لەژێر ئالآکە، لەباڵی چەپی سوپاکەدا کوژران.

باوکی عوبەیدە دەیوت: خواوەند رێگەی راستت نیشان داین و لەگومڕایی دەرباز و لەنەزانی رزگارت کردین بەلآم گیرۆدەی فیتنە و ئاژاوەت کردین و گومانمان لا دروست بوو. کوژرا.

دوای ئەو حەسین کوڕی مەعبەد کوڕی نەعمان بوو کەئالآکە لەدەستی ئەو کەوتە دەستی کوڕەکەی و پێی وت: ئەی مەعبەد، ئالآکە لەبەردەم خۆتان بگرە و سنگت بەرە پێش. ئالآکە لەدەستی ئەودا مایەوە.

محەممەد دەڵێت: کاتێك جەنگاوەرانی موزەری کوفە و موزەری بەسرە خۆڕاگری خەڵکانیان بینی، لەناو سوپاکەی عایشە و سوپاکەی عەلی هاواریان کرد ئەی خەڵکینە! کاتێك بڕیاری خۆڕاگری درا و سەرکەوتن ئەگەری نەبوو، دەست و پێ کان بقرتێنن. بڕیاریاندا دەست و پێکان بریندار بکەن. لەهیچ جەنگێکدا چ پێشتر و چ دوای ئەوە بەو ئەندازەیە دەست و پێی بڕاوەم نەبینی و نەمبیست. کەس نەیدەزانی دەست و پێکان هی کێن. لەو رۆژەدا پێش ئەوەی عەبدوالرەحمان کوڕی ئەسید بکوژرێت، دەستی بڕا. هەر کەس لەو دوو دەستەیە کاتێك دەستی یا پێی دەقرتا، بەشێوەیەك باوەشی بۆ مەرگ دەگرتەوە تا دەکوژرا.

عەتییە کوڕی بیلال دەڵێت: ئاگری جەنگ گەرم بوو، باڵی راستی سوپاکەی کوفە رووی لەدڵی سوپاکە کرد. باڵی راستی سوپای بەسرە لەدڵی سوپاکەیان نزیک بوویەوە بەڵام رێگەیان نەدا باڵی راستی سوپای کوفە کە لەتەنیشتیانەوە بوو تێکەڵ بەدڵی سوپاکە ببێت. باڵی چەپی سوپای کوفە و باڵی راستی سوپای بەسرەیش ئەو کارەیان کرد. عایشە بەکەسانی باڵی چەپی خۆی وت: ئێوە کێن.

سەبرە کوڕی شەیمان وتی: لەرەسەنەکانی ئەزد.

عایشە وتی: ئەی بنەماڵەی غەسان، خۆراگری و بوێری خۆتان بپارێزن چوونکە بەردەوام بەوە ناسراون. هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((بەرگریکارانی غەسان بەرگرییان کرد

هەنب و ئەوس و شەبەب بوێریان لەخۆیان نیشاندا))

بەکەسانی باڵی راستی وت: ئێوە کێن؟

وتیان: بەکر کوڕی وایل.

وتی: شاعیر سەبارەت بەئێوە دەڵێت:

((زرێپۆش بەرەو لای ئێمە هاتن وەك بڵێی

بۆ هێز و خۆڕاگری خەڵکانی بەکر کوڕی وایل بوون))

هەنووکە عەبدقەیس لەبەرابەر ئێوەیە و ئەوان سەرسەختتر لەپێش جەنگیان دەست پێکردووە.

دواتر بەکەسانی رووبەرووی خۆی وت: ئێوە کێن؟

وتیان: منداڵەکانی ناجییە.

وتی: دەسخۆش بۆ شمشێرەکانی ئەبتەحی و شمشێرەکانی قورەشی.

ئەوان بوێری و خۆڕاگری کەم وێنەیان لەخۆیان نیشاندا.

دوای ئەوە منداڵەکانی زەببە لەدەوری کۆبوونەوە، وتی: ئەی خەڵکینە، هاودەنگ هەوڵ بدەن. کاتێك ژمارەی منداڵەکانی زەببە کەمتر بووەوە، منداڵەکانی عودەی تیکەڵیان بوون، پرسی: ئێوە کێن.

وتیان: منداڵەکانی عودەی کەتێکەڵ بەبراکانی خۆمان بووین.

وتی: تا ئەو کاتەی منداڵەکانی زەببە کە لەدەوری من کۆببوونەوە، نەکوژرابوون،

سەری وشترەکەم بەرز بوو. سەری وشترەکەیان بەرز کردەوە، ئەوسا بێ ئەمان هێرشیان برد و دەست و پێکانیان دەقرتاند. کاتێك قرتاندنی دەست و پێ لەناو دوو سوپاکەدا فراوان بوو، مەبەستی کوشتنی وشترەکەیان کرد و وتیان: تا ئەو کاتەی ئەم وشترە لەسەر پێ بێت ئەم دەستەیە لەناو ناچن. دوو باڵی سوپاکەی عەلی پەیوەستی دڵی سوپاکە بوو. خەڵکانی بەسرەیش ئەو کارەیان کرد، هەر دوو سوپا لەناو دڵی سوپادا رووبەرووی یەك بوونەوە. کوڕی یەسربی سەری وشترەکەی بەدەست گرتبوو، هۆنراوەی دەخوێندەوە و بانگەشەی ئەوەی دەکرد عەلبا کوڕی هەیسەم و زەید کوڕی سوحان و هیند کوڕی عەمرۆی کوشتووە. دەیوت:

((هەرکەس من ناناسێت، کوڕی یەسربیم

بکوژی عەلبا و هیند و جەمیل

و کوڕی سوحان کەشوێنکەوتەی عەلی بوو.))

عەمار هاواری کرد کە پەنات بۆ شوێنێکی ئەمن بردووە و دەستمان بەتۆ ناگات. ئەگەر راست دەکەیت، رووبەرووی من ببەوە. ئەو، جڵەوی وشترەکەی بەیەکێك لەمناڵەکانی عودەی سپارد و بەهەوڵدانێکی زۆر خۆی لەعەمار نزیك کردەوە. عەمار قەڵغانە چەرمینەکەی کردبووە لەمپەری خۆی. کوڕی یەسربی شمشێری لێدا و لەقەڵغانەکە چەقی. هەرچەندە هەوڵیدا نەیتوانی شمشێرەکە دەربێنێتەوە. عەمار هێرشی کردەسەر و هەر دوو قاچی قرتاند و لەناوقەدەوە کەوتە سەرزەوی. هاوەڵانی هەڵیانگرتەوە بەڵام دووبارە بریندار کرایەوە. ئەویان بردە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و فەرمانی کوشتنی دەرکرد.

کاتێك کوڕی یەسربی لەپێکەوت، پیاوی عەدەوی جڵەوی وشترەکەی بەرەڵا کرد و هاتە پێش و داوای شەڕکەری کرد. عەمار گەڕابوویەوە. رەبیعەی عەقیلی رووبەرووی بوویەوە. پیاوی عەدەوی ناوی عەمرە کوڕی نەجرە بوو. دەنگی بەرز و دەیوت:

((ئەی دایکی ئێمە کەزیاتر لەهەموو دایکەکان

نافەرمانی تۆیان کردووە.

دایك کەخواردن بەمناڵەکەی دەدات و خۆشەویستی پێدەبەخشێت

مەگەر نابینی چەندە لەپیاوە بوێرەکان بریندار دەبن

و دەست و پێیان لەجەستە جیا دەبێتەوە))

شەڕە شمشێریان دەستپێکرد. هەرکام ئەوی دیکەی بریندار کرد و هەردووکیان کوژران.

عەتییە کوڕی بیلال دەڵێت: کۆتاییەکانی ڕۆژ کەسێك بەناوی حارس لەمناڵەکانی زەببە هات و لەشوێنی پیاوی عەدەوی وەستا، کەسی بوێرتر لەوم نەبینیبوو، هۆنراوەیەکی بەم ناوەڕۆکە دەخوێندەوە:

((ئێمە مناڵەکانی زەببەین و هاوەڵانی وشتر

کە بەنووکی ڕمەکانمان بۆ کوڕی عەفان پرسە دەگێڕیین

پیرەکەی ئێمە بگەڕێنەوە و ئەم پێشهاتە کۆتایی پێدێت))

باوکی ڕەجای عەتاردی دەڵێت: لەشەڕی وشتر کەسێکم بینی شمشێرەکەی دەستی بەرز دەکردەوە و دەیهێنایە خوار، دەتوت بووکەڵەی مناڵانە، هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناورەۆکە:

((ئێمە مناڵەکانی زەببەین و هاوەڵانی وشتر

کاتێك مەرگ بێت، ئامێزی بۆ دەکەینەوە....

تا کۆتایی...))

مەفزەلی زەببی دەڵێت: ئەم پیاوە وەسیم کوڕی عەمرۆ کوڕی زەراری زەببی بوو.

هوزلی دەڵێت: لەشەڕی وشتر عەمرۆ کوڕی یەسربی خەڵکەکەی خۆی هاندەدا، جڵەوی وشترەکەیان دەست بەدەست دەگێڕا و هۆنراوەیەکیان دەخوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((ئێمە مناڵەکانی زەببەین و پشت ناکەینە گۆڕەپانی جەنگ

تا سەرەکان لەسەر زەوی دەبینین

و خوێنی سوور لێیانەوە فیچقە دەکات

ئەی دایکە، ئەی ژیان، مەترسە

هەموو مناڵەکانت ئازان و بوێر

ئەی دایکە، ئەی هاوسەری پێغەمبەر (د.خ)

ئەی هاوسەری پێغەمبەری ڕێنیشاندەر))

تا ئەو کاتەی چل کەس لەو کەسانەی جڵەوی وشترەکەیان بەدەستەوە گرت، کوژران.

عایشە دەیوت: تا ئەو کاتەی دەنگی منداڵەکانی زەببە کپ نەکرابوویەوە، وشترەکەی من لەشوێنەکەی خۆیدا بوو.

لەو رۆژەدا عەمرۆ کوڕی یەسربی، عەلبا کوڕی هەیسەمی سەدوسی و هیند کوڕی عەمرۆ جەمەلی و زەید کوڕی سوحانی کوشت. ئەو هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((بەشمشێر لێیان دەدەم بەلام باوکی حەسەن نابینم

ئەم خەمە لەهەموو خەمەکان بۆ من قورسترە))

بەوتەی هوزەلی ئەم هۆنراوەیە لەجەنگی سەفین خوێندرایەوە.

عەمار رووبەرووی کوڕی یەسربی بوویەوە، لەو کاتەدا تەمەنی نەوەد ساڵ بوو، پێستەیەکی لەبەردا بوو، کەمەری خۆی بەپشتێنێك لەگەلای خورما بەستبوو. عەمرۆ کوڕی یەسربی پێشدەستی کرد و عەمار، قەڵغانە چەرمینەکەی خۆی کردە لەمپەر، شمشێرەکە لەقەڵغانەکە چەقی و کەسانی دیکە تیربارانیان کرد تا لەپێکەوت. هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

ئەگەر دەمکوژن، من کوڕی یەسربیم.... تا کۆتایی))

ئەویان ئەسیر کرد و بردیان بۆ لای عەل کوڕی ئەبی تالیب، وتی: مەمکوژە.

بەلام عەلی فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد.

عەبدوڵلە کوڕی زوبەیر لەباوکی دەگێڕێتەوە: لەجەنگی وشتر بەرێگەدا دەرۆشتین، سی و چەند برینی شمشێر و ڕم و شتی دیکەمان هەڵگرتبوو، هەرگیز رۆژێکی لەوشێوەم نەبینیوە، هیچ کام لەدوو سوپاکە شکستی نەدەخوارد، هاوشێوەی کێوێکی ڕەش بووین، هەرکەس جڵەوی وشترەکەی بەدەستەوە دەگرت، دەکوژرا، عەبدوالرەحمان کوڕی عەتاب جڵەوەکەی گرت و کوژرا، ئەسوەد کوڕی باوکی بەختەری جڵەوەکەی گرت و کوژرا، من ڕۆشتم و جڵەوی وشترەکەم گرت.

عایشە وتی: کێیت؟

وتم: عەبدوڵلە کوڕی زوبەیر.

وتی: ئەی هاوار ئەسما، کوڕەکەی لەدەستدا.

دەڵێت: ئەشتەر لای من تێپەری، ناسیمەوە و پەلامارمدا، هەردووکمان کەوتینە سەرزەوی، هاوارم کرد من و مالك بکوژن، دەستەیەك لەوان و دەستەیەك لەئێمە هاتن و بۆ بەرگری کردن لەئێمە جەنگان تا ئەوەی لەیەك جیابووینەوە و جڵەوی وشترەکەمان لەدەستدا.

دەڵێت: عەلی هاواری کرد: قاچی وشترەکە ببڕنەوە چوونکە ئەگەر ئەو کارە بکەن، بلاوەی لێدەکەن.

کەسێك بەشمشێر لەوشترەکەیدا و کەوتە سەرزەوی، هیچ کاتێك دەنگێکی بەرزتر لەدەنگی ئەو وشترەم نەبیستووە.

عەلی بەمحەممەد کوڕی ئەبوبەکەری وت تا خێوەتێك بۆ عایشە هەڵبدات و وتی: بزانە بریندار بووە یا نە؟

دەڵێت: محەممەد سەری خۆی بردە ناو خێوەتەکە، عایشە پرسی: ئەی هاوار، تۆ کێیت؟

وتی: کەسێك کە لەناو بنەماڵەکەت کەس لەو بەدوژمنتر نازانیت؟

وتی: کوڕی ژنی خەسعەمی؟

وتی: بەڵێ.

وتی: سوپاس بۆ خوا کەتەندروستیت.

عەلقەمە دەڵێت: بەئەشتەرم وت: تۆ دژی کوشتنی عوسمان کوڕی عەفان بوویت بۆ هاتیتە بەسرە؟

وتی: ئەوان بەیعەتیان لەگەڵ عەلی بەست بەڵام بەیعەتەکەیان شکاند، کوڕی زوبەیر عایشەی بۆ ئەم کارە ناچار کرد. لەخوام دەویست رووبەرووی ئەوم بکاتەوە، کاتێك رووبەرووی بوومەوە، هێزی بازووم بەبەسەندە نەزانی، سوار بووم و شمشێرێکم لەسەریدا و لەپێکەوت.

وتم: ئەو بوو وتی: من و مالك بکوژن؟

وتی: نا، کاتێك ئەوم کوشت هیچم لێ نەبیست، عەبدوالرەحمان کوڕی ئەسید بوو، کاتێك منی بینی رووبەرووم بوویەوە، منی خستە سەرزەوی، منیش ئەوم خستە خوار و هاواری دەکرد: من و مالك بکوژن. نەیاندەزانی مالك کێیە، وەگەرنە

دەیانکوشتین.

بێژەر دەڵێت: بەعەلقەمم وت: هەنووکە لەتەنیشتی تۆ شایەتی ئەم رووداوە دانیشتووە.

عەبدوالله کوڕی زوبەیر دەڵێت: گەنجێك لای ئێمە وەستا، وتی: لەم دوو پیاوە خۆتان بەدوور بگرن. ناوی یەکیانی برد، نشانەی ئەشتەر ئەوە بوو یەکێك لەدوو قاچەکەی بەهۆی نەخۆشییەوە ئاوسا بوو.

ئەشتەر دەڵێت: کاتێك رووبەروو بووینەوە، یا دەڵێت: کاتێك مەبەستی کوشتنی منی کرد، بەرمەکەی، قاچمی کردە نیشانە، بەخۆم وت کەسێکی ئەحمەقە، گریمان قاچم بقرتێنێت، هیچی نەکردووە، من دەیکوژم و کاتێك نزیك کەوتەوە، رمەکەی بەرز کردەوە و روخسارمی کردە نیشانە، وتم: ئەمە شەرکەرە.

جوندەب دەڵێت: عەمرۆ کوڕی ئەشرەف جڵەوی وشترەکەی بەدەستەوە گرت و هەرکەس لێی نزیك دەکەوتەوە بەشمشێر لێیدەدا، حارس کوڕی زەیدی ئەزدی لێی نزیك کەوتەوە، عەمرۆ هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەی دایکی ئێمە، ئەی باشترین دایکی ئێمە

مەگەر نابینی چەند لەئازا بوێرەکان بریندار دەبن

و سەر و ئەنیشکیان دەقرتێت))

دەڵێت: شەرە شمشێریان دەست پێکرد، دەمبینی قاچیان لەزەوی گیر دەکرد تا ئەوەی هەردووکیان کوژران.

دەڵێت: لەمەدینە رۆشتمە لای عایشە، پێی وتم: تۆ کێیت؟

وتم: یەکێك لەخەڵکانی ئەزدی نیشتەجێی کوفە.

وتی: بەشداری شەڕی وشترت کرد؟

وتم: بەڵێ.

وتی: لەگەڵ ئێمە یا دژی ئێمە؟

وتم: دژی ئێوە.

وتی: ئەو کەسەی دەیوت: ئەی دایکی ئێمە، ئەی باشترین دایکی ئێمە، دەیناسیت؟

وتم: بەڵێ، ئەو کوڕە مامی من بوو.

دەڵێت: دەستی بەگریان کرد بەشێوەیەك گومانم کرد هیچ کات بێدەنگ نابێت.

دینار کوڕی عیزار دەڵێت: بیستم ئەشتەر دەیوت: ڕووبەڕووی عەبدولرەحمان کوڕی ئەسید بوومەوە، یەکێك بوو لەئازاترین و فێڵبازترینی خەڵکان. پێکەوە کەوتینە سەرزەوی. هاواری دەکرد من و مالك بکوژن.

هەروەها دینار کوڕی عیزار دەڵێت: بیستم ئەشتەر دەیوت: عەبدوالله کوڕی حەکیم کوڕی حوزامم بینی ئالاکەی قوڕەیشی لەدەستدا بوو، لەگەڵ عودەی کوڕی حاتەم هاوشێوەی دوو بەرانی شەڕکەر دەجەنگان، هاوکاریم کرد و خوێنمان ڕشت، چاوی عودەی بەهۆی زەربەی شمشێری عەبدوالله کوێر بوو.

محەممەد کوڕی موخەنەف دەڵێت: چەند کەسێك لەپیرەکانی تایەفە کەهەموویان لەشەری جەمەل بەشدارییان کردبوو، پێیان وتم: ئالای ئەزدییەکانی کوفە لەدەستی مەخەنەف کوڕی سالیمدا بوو، لەشەڕەکەدا کوژرا. سەعقەب یەکێك لەئەندامانی بنەماڵەکەی ئالاکەی بەدەستەوە گرت و دوای ئەوە عەبدوالله کوڕی سەلیم کە هەردووکیان کوژران. عەلا کوڕی عوروە ئالاکەی بەدەستەوە گرت و سەرکەوتن بەدەست هات. ئالاکە بەهەمان شێوە لەدەستی ئەودا مایەوە.

دەڵێت: ئالای عەبدییەکانی کوفە لەدەستی قاسم کوڕی موسلیمدا بوو، کوژرا. زەید کوڕی سوحان و سیحان کوڕی سوحانیش کوژران. چەند کەسێکی دیکە لەوانەی ئالاکەیان بەدەستەوە گرت، کوژران. عەبدوالله کوڕی روقییە و راشید لەناو ئەواندا دەبینران. دوای ئەوان مونەقەز کوڕی نوعمان ئالاکەی بەدەستەوە گرت و بەکوڕەکەی موڕە کوڕی مونقەزی سپارد. شەڕ کۆتایی پێهات و هێشتا ئالاکەی بەدەستەوە بوو.

دەڵێت: ئالای بەکرییەکانی کوفە لەدەستی حارس کوڕی حەسان کوڕی خوتی زوهەلیدا بوو.

باوکی عورفای ڕۆقاشی وتی: خۆت و تایەفەکەت ڕووبەڕووی مەترسی مەکەرەوە. بەڵام ڕۆشتە پێش و وتی: ئەی دەستەی بەکر کوڕی وایل، هیچ کەس لای پێغەمبەر (د.خ) پێگە و جێگەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی نەبوو، هاوکاری بکەن. پێشڕەوی کرد تا کوژرا. کوڕەکەی و پێنج برایشی کوژران.

دەڵێت: بیشر کوڕی حەسان کوڕی خوت لەکاتێکدا دەجەنگا، هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((من کوڕی حەسان کوڕی خوتم کە باوکم

نێردراوی هەموو بەکرییەکان بوو بۆ لای پێغەمبەر (د.خ) ))

کوڕەکەیشی هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((بنەماڵەی زوهەل و شەیبان

لەمەرگی سالار، حارس کوڕی حەسان ئاگادار دەکەمەوە.))

هەروەها یەکێك لەخەڵکانی زوهەل هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆ کە دەخوێندەوە:

((هەواڵی مەرگی باشترینی خەڵکانی عەدنان دەدەیت

کە لەکاتی جەنگ و رووبەروو بوونەوە کوژرا))

دەڵێت: کەسانێك لەمناڵەکانی مەحدوجی کوفە، کەسەرکردە بوون، کوژران. لەمناڵەکانی زوهەل سی و پێنج کەس کوژرا، یەکێك لەوان لەکاتی جەنگ، بەبراکەی خۆی وت: ئەی برام، ئەگەر لەسەر راستی دەبووین، شەڕەکەمان چەندە جوان دەبوو؟

وتی: ئێمە لەسەر راستین، خەڵکان رێگەی راست و چەپیان گرتۆتەبەر، بەلأم ئێوە پەیوەستی بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ) بووین. هەردوو برا جەنگان تا کوژران.

سالاری خەڵکانی عەبدقەیس کەهاورێیەتی عەلی کوڕی ئەبی تالبیان دەکرد، عەمرۆ کوڕی مەرحوم بوو.

سالاری بەکر کوڕی وایل شەقیق کوڕی سوور و ئالأی بەکرییەکان لەدەستی ڕەشڕاشە، کۆیلەکەیدا بوو.

سالاری ئەزدییەکانی بەسرە کەهاورێیەتی عایشەیان دەکرد بەهەمان شێوە کە لەگێڕانەوەی عامر کوڕی حەفسدا هاتووە، عەبدوالرەحمان کوڕی جەشمی حومامی بوو و بەوتەیەك سەبرە کشەیمانی حەدانی بوو. ئالأی خەڵکەکەی لەدەستی عەمرۆ کوڕی ئەشرەفی عەکیدا بوو. عەمرۆ کوژرا و سیانزە کەس لەئەندامانی بنەماڵەکەی لەگەڵ خۆیدا کوژران.

باوکی بەختەری تایی دەڵێت: لەجەنگی جەمەل خەڵکانی زەببە و ئەزد دەوری عایشەیان گرتبوو. کەسانێك لەئەزدییەکان پشقلی وشترەکەیان دەشکاند و بۆنیان دەکرد و دەیانوت: پشقلی وشتری دایکمانە، بۆنێکی خۆشی هەیە.

دەڵێت: یەکێك لەهاوەڵانی عەلی دەجەنگا و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((شمشێرم خستە ناو خەڵکانی ئەزد

پیر و گەنجەکانیانم دەکوشت))

خەڵکان کەوتبوونە گیانی یەك، کەسێك هاواری کرد قاچی وشترەکە ببڕنەوە.

بوجەیر کوڕی دەلجەی زەببی لەخەڵکانی کوفە شمشێرێکی لەقاچی وشترەکەدا.

پێیان وت: بۆ ئەو کارەت کرد؟

وتی: بینیم خەڵکی هۆزەکەم دەکوژرێن، ترسام لەناو بچن. هیوادار بووم ئەگەر ئەم کارە بکەم دەستەیەك لەوان بەزیندوویی بمێننەوە.

سەڵت کوڕی دینار دەڵێت: یەکێك لەمناڵەکانی عەقیل گەیشتە لای کەعب کوڕی سوور کەکوژرا بوو، نووکی ڕمەکەی خستە سەر چاوەکانی، تەکانی دەدا و دەیوت: هیچ کات سامانێکی نەختێنەتر لەتۆم نەبینیوە.

عەوانە دەڵێت: لەجەنگی جەمەل ڕۆژێك تا شەو شەڕیان کرد. کەسێك هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((شمشێر دڵی ئێمەی لەزید و هیند ئاسوودە کرد

هەروەها لەدووچاوی عودەی کوڕی حاتەم

ڕۆژێك تا شەو لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگریمان کرد

ڕم و شمشێرەکان بەردەوام دەسووڕان.))

کوڕی سامت هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەی خەڵکانی زەببەی بڕۆن چوونکە زەوی

لەلای چەپتان ئاوەلایە

و لەدەشت، مەرگ ئامادەیە

و دایك، هەرگۆڕەپانێکمان بەشمشێر

بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە و شمشێر وەشاندن ئامادە کردووە.))

باوکی ڕەجا دەڵێت: کەسێکم بینی گوێچکەی هەڵکەنرابوو، وتم: لەسکوماوە بەوشێوەییت یا ڕووداوێك ڕوویداوە؟

وتی: لەجەنگی جەمەل لەناو کوژراوەکاندا دەسووڕامەوە، کەسێکم بینی قاچی لەزەوی دەخشاند و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((دایکمان ئێمەی بۆ هەرێمی مەرگ هێنا

ڕۆشتین تا لەمەرگ تێر بووین

بەگومڕایی شوێن قورەیشییەکان کەوتین

چوونکە هاوکاری کردنی خەڵکانی حیجاز مەینەتی بوو.))

پێم وت: ئەی بەندەی خوا، بڵێ، ((لا الی الا الله))

وتی: لێم نزیك ببەوە و تەڵقینم بکە چوونکە گوێم گرانە و جوان نابیستم.

دەڵێت: ڕۆشتمە پێش و وتی: لەکام هۆزیت؟

وتم: لەخەڵکانی کوفەم. پەلاماریدام و گوێچکەمی لەبن دەرهێنا، وتی: ئەگەر ڕۆشتیتە لای دایکت بڵێ عومەیر کوڕی ئەهەلەبی زەببی ئەو بەڵای بەسەردا هێناویت.

عەبدولمەجیدی ئەسەدی دەڵێت: لەجەنگی جەمەل عومەیر کوڕی ئەهەلەبی زەببی بریندار کرا. کەسێك لەهاوەڵانی عەلی لای تێپەڕی، لەناو بریندارەکاندا کەوتبوو، عومەیر پێی وت: نزیك بەرەوە.

کاتێك نزیك بوویەوە، گوێچکەی دەرهێنا و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناورەۆکە:

((دایکمان ئێمەی بۆ هەرێمی مەرگ هێنا

لەوێ نەڕۆشتین تا تێراو بووین

کوڕی زەببە و هاوەڵانی ئەو

پێویستیان بەهاوکاری کردنی دایکیان نەبوو

لەبەدبەختیدا گوێڕایەڵی تیم کوڕی موڕەمان کرد

مەگەر تەمیمییەکان جگە لەبەندە هیچی دیکە بوون؟))

مقدامی حارسی دەڵێت: یەکێك لەتایەفەی ئێمە بەناوی هانی کوڕی خەتاب یەکێك بوو لەو کەسانەی بۆ جەنگی کوڕی عەفان رووی لەمەدینە کردبوو، بەڵام بەشداری جەنگی جەمەلی نەکرد و کاتێك هۆنراوەی خەڵکانی زەببی بیستبوو کەوتبوویان: ((ئێمە منداڵەکانی زەببەین و هاوەڵانی وشتر))، بۆ بەرپەرچدانەوەی

ئەوان هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((پیرانی مەزحەج و هەمەدان پێداگرییان کرد

تا نەسعەل بەشێوەی خۆی بگەرێننەوە

کە لەدوای ئافراندنی ڕەحمان دەئافرێنرێتەوە))

سەعب کوڕی عەتییە لەباوکی دەگێڕێتەوە: ئەو ڕۆژە باوکی جەربا هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((بۆ پێش ئەوەی تیژی شمشێر بچێژیت

نابیتە شوێنکەوتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب

و لەرێگەی راست، هاوسەرانی پێغەمبەر (د.خ) پشت گوێ ناخەیت))

محەممەد دەڵێت: دایکی باوەڕداران لەناو دەستەیەك لەخەڵکانی بوێر و بەئەزمون لەجەنگ لەهۆزەکانی موزێر بوو، هەرکەس جڵەوی وشترەکەی دەگرت، ئالاّکەیشی هەڵدەگرت و حەزی بەبەردانی نەدەکرد. ئەو کەسەی جڵەوەکەی بەدەستەوە دەگرت دەبوا لای کەسانی دەوروبەری وشتر ناسراو بێت و دایکی باوەڕداران لەڕەچەڵەکی خۆی ئاگادار بکاتەوە و بڵێت فلاّن کوڕی فلاّنم. سوێند بەخوا لەبەردەم وشترەکەدا ئازایانە دەجەنگان. مەرگ لەوێ بوو، تەنیا بەهەوڵ و ئازایەتی زۆر دەتوانرا لەوشترەکە نزیك ببیتەوە. هەرکەس لەهاوەڵانی عەلی مەبەستی نزیك بوونەوەی لەوشترەکە دەکرد، دەکوژرا یا هەڵدەهات و چیتر نەدەگەڕایەوە.

دەڵێت: کاتێك دوو دڵی سوپاکە ڕووبەڕووی یەك بوونەوە، عودەی کوڕی حاتەم هات، هێرشیان کردەسەر و چاوی کوێر بوو و کشایەوە. ئەشتەر هات و عەبدولرەحمان کوڕی عەتاب هێرشی کردەسەر، دەستی قرتابوو و خوێنی لێدەچۆڕا. ئەشتەر پەلاماریدا و لەسەر چوارپێکەی خستییە خوار. لەژێر دەست و پێی ئەشتەردا پەلەقاژەی دەکرد. سەرەئەنجام ڕزگاری بوو بەلاّم زۆر خەمبار بوو.

هوشام کوڕی عوروە لەباوکی دەگێڕێتەوە: هەرکەس دەیوست جڵەوی وشترەکە لەدەست بگرێت، دەبوا بڵێت: ئەی دایکی باوەڕداران، فلاّن کوڕی فلاّنم. عەبدواللە کوڕی زوبەیر هات و کاتێك هیچی نەوت، عایشە پرسی: کێیت؟

وتی: عەبدوللەی خوشکەزاتم.

وتی: هاوار لەئەسما، یانی خوشکەکەی، کوڕەکەی لەدەستدا.

دەڵێت: ئەشتەر و عودەی کوڕی حاتەم لەوشترەکە نزیك بوونەوە. عەبدوالله کوڕی حەکیم کوڕی حەزام رووبەرووی ئەشتەر بوویەوە و شەڕیان دەست پێکرد. ئەشتەر ئەوی کوشت. عەبدوالله کوڕی زوبەیر رووبەرووی ئەشتەر بوویەوە، ئەشتەر بەشمشێر لێیدا و بەقورسی عەبدوللەی بریندار کرد. عەبدوللەیش بەشمشێر لێیدا و بەسووکی بریندار بوو. دواتر پەلاماری یەکیاندا و کەوتنە سەرزەوی. عەبدوالله هاواری دەکرد: من و مالك بکوژن.

دەڵێت: کەسانێك لەهاوەڵانی عایشە و عەلی هێرشیان برد و دوو شەڕکەرەکەیان لەیەك جیا کردەوە. هەرکام لەو دوو دەستەیە هاورێکەی خۆیان رزگار کرد.

سەعب کوڕی عەتییە لەباوکی دەگێڕێتەوە: محەممەد کوڕی تەڵحە هات و جڵەوی وشترەکەی بەدەستەوە گرت و وتی: دایەگیان، فەرمانی خۆت بدە.

عایشە وتی: فەرمان دەدەم ئەگەر لەشوێنەکەی خۆت مایتەوە، پیاوێکی باش بیت.

دەڵێت: هێرشی دەست پێکرد و هەرکەس هێرشی دەکردەسەر، دەیوت: ((حم،لاینصرون)) چەند کەسێك لەدەوری کۆبوونەوە و هەرکام بانگەشەی کوشتنی ئەویان دەکرد: موکەعبەری ئەسەدی و موکەعبەری زەببی و معاویە کوڕی شەدادی عەبەسی و عەفان کوڕی ئەشقەری نەسری کەیەکیان ڕمەکەی لەجەستەی چەقاند و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((تەپوتۆزاوییەك کەئایەکانی پەروەردگاری دەخوێندەوە

تا ئەوجێگەی دەمخواست کەم ئازار بوو و موسوڵمان

کراسەکەیم بەڕم دڕاند

لەپێکەوت و بەروودا کەوت

ڕمەکەم لەجەستەی دەچەقی و ئەو

((حم))ی بیری من دەخستەوە

بۆ پێش ئەوەی بێت ((حم))ی نەخوێند

تەنیا گوناحەکەی ئەوە بوو شوێنکەوتەی عەلی نەبوو

هەرکەس شوێن راستی نەکەوێت، پەشیمان دەبێتەوە.))

سەعب کوڕی عەتییە دەڵێت: قەعقاع کوڕی عەمرۆ بەئەشتەری وت: دەخوازیت بگەڕێیتەوە؟ دەیویست هانی بدات بەڵام ئەشتەر وەڵامی نەدایەوە.

قەعقاع وتی: ئەی ئەشتەر، ئێمە جەنگان لەگەڵ یەکتر باشتر لەتۆ دەزانین. ئەوسا هێرشی برد. جڵەوی وشترەکە لەدەستی زەفەر کوڕی حارسدا بوو. دوایین کەس بوو جڵەوی وشترەکەی بەدەستەوە گرت چوونکە هەموو پیرەکانی مناڵەکانی عامر لەبەردەم وشترەکەدا کوژران. رەبیعە باوەگەورێی ئیسحاق کوڕی موسلیم یەکێك بوو لەوان.

زەفەر هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەی دایکە، ئەی ژیانی من

مەترسە چوونکە هەموو مناڵەکانت ئازان و بوێر

نەگومانیان هەیە و نەدەترسن))

قەعقاعیش هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

کاتێك دەڕۆینە لای ئاوێکی لێڵ

روونی دەکەینەوە

و کەس ناتوانێت بێتە شوێنی ئاوخواردنەوەی ئێمە))

ئەم هۆنراوەی لەشاعیرێکی دیکە دەهێنایەوە.

محەممەد دەڵێت: دووایین کەس کە لەبەردەم وشترەکە جەنگا، زەفەر کوڕی حارس بوو. قەعقاق هێرشی کردەسەر. هەموو عامرییە پیرەکان لەدەوری وشترەکە کوژران و بۆ گیان سپاردن کێبڕکێیان دەکرد. قەعقاع وتی: ئەی بوجەیر کوڕی دەلجە بەخەڵکەکەی خۆت بڵێ پێش ئەوەی هەموان بکوژرێن و دایکی باوەڕدارانیش بکوژرێت، قاچی وشترەکە ببڕنەوە.

بوجەیر وتی: ئەی خەڵکانی زەببە، ئەی عەمرۆ کوڕی دەلجە، من بۆ لای خۆت بانگ بکە و کاتێك ئەوی بانگ کرد، وتی: ئەمانم هەیە تا دەگەڕێمەوە؟

وتی: بەڵێ.،

دەڵێت: قاچی وشترەکەی قرتاند. وشترەکە کەوتە سەرلا و دەنگێکی بەرزی

لێبیسترا. قەعقاع بەکەسانی دەوری وشترەکەی وت: ئێوە ئەمانتان هەیە. بەهاودەستی یەك بەندەکانی کەژاوەکەیان بڕی و کەژاوەکەیان داگرت و خستیانە سەرزەوی. دەوریان گرت و کەسانی دیکە هەڵاتن.

سەعب کوڕی عەتییە دەڵێت: کاتێك شەو داهات، عەلی پێشڕەوی کرد و وشترەکە و هەموو کەسانی دەوری وشترەکە گەمارۆدران. بوجەیر کوڕی دەلجە قاچی وشترەکەی بڕی و وتی: ئێوە ئەمانتان هەیە. خەڵك دەستیان لەجەنگ هەڵگرت و شەو، کاتێك جەنگ کۆتایی پێهات، عەلی کوڕی ئەبی تالیب هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((خواوەندا، سکاڵای خەمی خۆم بۆ لای تۆ بەرز دەکەمەوە

لەم دەستەیە کەرێگەی دەغەڵکارییان گرتەبەر

موزەرییەکانتم بەموزەرییەکان بەکوشتدا

دڵم فێنك بوویەوە بەڵام خەڵکەکەم کوژران.))

حەکیم کوڕی جابر دەڵێت: لەرۆژی جەنگی جەمەل، تەڵحە وتی: خواوەند هەرچیت دەوێت لەعوسمان، لەمنی وەربگرە تا عوسمان رازی ببێت. تیرێکی نەناسراو هات و سەرەوەی ئەژنۆی بەزینی ئەسپەکەیەوە دووری. بەو شێوەیە مایەوە تاپێڵاوەکەی پڕ بوو لەخوێن. کاتێك جەستەی قورس بوو، بەکۆیلەکەی وت: لەپشت سەری من سوار بە و شوێنێك بۆ من بدۆزەرەوە تا وەك نەناسراوێك لەوێ بم چوونکە هیچ کات نەمبینیوە خوێنی پیرێك بەمشێوەیە بەفیڕۆ بچێت.

دەڵێت: کۆیلەکەی تەڵحە سەرکەوت و ئەوی گرت، بەردەوام دەیوت: نەیارەکان پێمان گەیشتنەوە. ئەوی گەیاندە یەکێك لەخانووەکانی بەسرە، کەلاوەیەك بوو، لەسێبەرەکەی دابەزین و لەهەمان کەلاوەدا مرد و لەگەڕەکی مناڵەکانی سەعد بەخاك سپێردرا.

بەختەری عەبدی دەڵێت: لەجەنگی جەمەل هۆزی رەبیعە هاوەڵانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوون. ئەوان یەك لەسەر سێی خەڵکانی کوفەیان پێك دەهێنا و نیوەی هەموو سوپاکە. بەمشێوەیە بوو: موزەرییەکان لەبەرابەر منوزەرییەکان و رەبیعییەکان لەبەرابەر رەبیعییەکان و یەمانییەکان لەبەرابەر یەمانییەکان. کوڕەکانی سوحان وتیان: ئەی سەرەوەری باوەڕداران مۆڵەتمان پێ بدە تا ڕووبەرووی

موزەرییەکان جێگیر ببن. مۆڵەتی پێدان و کاتێك زەید هات، پێیان وت: بۆ لەبەرابەر وشترەکە و موزەرییەکان وەستاویت چوونکە مەرگ لەتۆوە نزیك و لەبەرابەر تۆدایە، بۆ لای ئێمە وەرە.

وتی: ئێمە خوازیاری مەرگین.

دەڵێت: لەو رۆژەدا هەموویان کوژران و سەعسەعە گیانی دەرباز کرد.

سەعب کوڕی عەتییە دەڵێت: یەکێك لەئێمە بەناوی حارس کوڕی عەتییە، لەرۆژی جەنگی وشتر وتی: ئەی بنەماڵەی موزێر، بۆ یەکتر دەکوژن و پەلەتانە؟ نازانین، ئێمە گرفتاری ئەم چارەنووسە بووین و دەستی لیٚ هەڵناگرن.

باوکی جوبەیر دەڵێت: لەرۆژی جەنگی جەمەل لای کەعب کوڕی سور گوزەرم کرد. جڵەوی وشترەکەی عایشەی بەدەستەوە بوو، پێی وتم: ئەی باوکی جوبەیر، سوێند بەخوا ئێمە بەو شێوەین کەئەو ژنە دەڵێت: کوڕی خۆم، نەخۆت بەدوور بگرە، نەبجەنگە.

زوبەیر کوڕی حورەیس دەڵێت: عەلی لای جەستەی بیٚ گیانی کەعب گوزەری کرد، وەستا و وتی: سوێند بەخوا تا ئەو جێگەی دەزانین، بۆ راستییەکان هەوڵت دەدا و بەدادپەروەری داوەریت دەکرد و بەمشێوە و بەو شێوە بوویت. وەسفی کرد.

جورەیر کوڕی ئەشرەس دەڵێت: لەشەڕی وشتر، نیوەی یەکەمی رۆژ، فەرماندەیی جەنگ لەدەستی تەڵحە و زوبەیردا بوو، سوپاکەیان شکستی خوارد، عایشە چاوەڕوانی ئاشتی دەکرد کە لەناکاو خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە و خەڵکانی میسر دەوریان گرت. خەڵك بۆ شەڕ ریزیان بەست و نیوەی دووەمی رۆژ کاروباری جەنگ لەدەستی عایشەدا بوو و عەلی ...[1]

کەعب کوڕی سور قورئانەکەی عایشەی بەدەستەوە گرت و هاتە ناو دوو سوپاکە. خەڵکانی بەخواوەند سوێند دەدا تا خوێنی یەك نەرێژن. زرێکەیان پێدا تا بیپۆشێت بەڵام خستییە ژێرپیٚ، قەڵغانەکەیان بۆ برد بەڵام هەڵینەگرت. تیربارانیان کرد و کوژرا و سوپاکەی مۆڵەتیان بەتیرهاوێژەکان نەدا و هێرشیان برد و شەڕ دەستی پێکرد. کەعب یەکەم کەس بوو لەخەڵکانی بەسرە و کوفە لەبەردەم

---

[1] هیچی دیکە نەنوسراوە. ( وەرگێر)

وشترەکەی عایشەدا کوژرا.

موخەلید کوڕی کەسیر لەباوکی دەگێڕێتەوە: موسلیم کوڕی عەبدوڵڵامان نارد تا منداڵەکانی باوکمان بانگ بکات، ئەویشیان تیرباران کرد و کوشتیان بەشێوەیەك دڵی سوپاکە، کەعبیان تیرباران کرد و یەکەم کەس بوو لەبەردەم عەلی کوڕی ئەبی تالیب و عایشە کوژرا.

دەڵێت: دایکی موسلیم لەپرسەکەی ئەودا هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

((خواوەندا موسلیم بۆ لای ئەوان ڕۆشت

بەمەرگ رازی بوو

پێشنیاری گەڕانەوە بۆ فەرمانەکانی خواوەندی پێدەکردن

و نەدەترسا

کاتێك نزیکیان کەوتەوە، خوێنیان ڕشت

دایکی وەستا بوو

و سەیری دەکرن

بەگومڕایی رازی بوون))

سەعب کوڕی حەکیم کوڕی شەریك لەباوکی دەگێڕێتەوە: شەوی جەنگی جەمەل کاتێك دوو باڵی سوپاکەی کوفە شکستی خوارد، روویان لەدڵی سوپاکە کرد. عەبدوڵڵا کوڕی یەسربی کەپێش کەعب کوڕی سوور، دادوەری بەسرە بوو، هاوڕێ لەگەڵ براکەی عەمرۆ لەجەنگی جەمەل بەشدار بوون، ئەو لەبەردەم وشترەکە سوار ئەسپێك ببوو. عەلی وتی: کێ دەتوانێت هێرش بکاتە سەر وشترەکە؟

دەڵێت: هیند کوڕی عەمرۆ مورادی مەبەستی وشترەکەی کرد. کوڕی یەسربی ڕێگەی لێگرت و شەڕە شمشێریان دەست پێکرد. کوڕی یەسربی ئەوی کوشت. دوای ئەوە، سیحان کوڕی سوحان هێرشی برد و کوڕی یەسربی ڕێگەی لێگرت و ئەویشی کوشت. دواتر عەلبا کوڕی هەیسەم هێرشی برد و کوڕی یەسربی، دووبارە سەرە ڕێگەی لەویش گرت و خوێنی ڕشت. دوای ئەوان، سەعسەعە هێرشی برد و شمشێرێکی لێدا، سێ کەسی لەگۆڕەپانەکەدا کوشت: عەلبا و هیند و سیحان. سەعسەعە و زەیدیشی بریندار کرد. یەکیان مرد و ئەوی دیکەیان بەزیندووی مایەوە.

شەعبی دەڵێت: لەجەنگی جەمەل حەفتا کەس لەقوڕەیشییەکان جڵەوی وشترەکەیان بەدەستەوە گرت. هەموویان لەکاتێکدا جڵەوی وشترەکەیان بەدەستەوە بوو، دەکوژران. ئەشتەر هێرشی برد و عەبدوڵڵا ڕووبەڕووی بوویەوە. پێکەوە کەوتنە سەرزەوی و دەیوت: من و مالك بکوژن.

دەڵێت: خەڵك ئەویان بەناوی مالك نەدەناسی، ئەگەر دەیوت ئەشتەر، هەزار گیانی هەبوایە، یەکیانی بەدەر نەدەبرد. لەژێر دەست و پێی عەبدوڵڵادا پەلەقاژەی دەکرد تا ڕزگاری بوو. هەرکەس هێرشی دەبردە سەر وشترەکە و گیانی دەرباز دەکرد، چیتر نەدەگەڕایەوە. لەو ڕۆژەدا مەروان و عەبدوڵڵا کوڕی زوبەیر بریندار بوون.

داوود کوڕی باوکی هیند دەڵێت: لەجەنگی جەمەل کوڕی یەسربی هۆنراوەی دەخوێندەوە و داوای شەڕکەری دەکرد. کەسێك ڕووبەڕووی بوویەوە و کوژرا. کەسێکی دیکە ڕووبەڕووی بوویەوە و ئەویش کوژرا. دواتر هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( عەلی دەبینم و خوێنی دەڕێژم

ئەگەر بخوازم بەشمشێر لەویش دەدەم))

عەمار کوڕی یاسر ڕووبەڕووی بوویەوە. ئەو لەهەموو ئەو کەسانەی پێشتر ڕووبەڕووی ببوونەوە، لاوازتر بوو. خەڵکان کاتێك عەماریان بینی، انالله یان هێنایە سەرزمان و من بەهۆی لاوازیی عەمارەوە دەموت، سوێند بەخوا ئەمیش پەیوەستی کوژراوەکانی دیکە دەبێت. ئەو، لاغر بوو، شمشێرەکەی بەکەمەریەوە هەڵواسیبوو، دەسکی شمشێرەکەی لەنزیك بازوویدا بوو. کوڕی یەسربی بەشمشێر لێیدەدا و شمشێرەکە لەقەڵغانە چەرمینەکەی دەچەقی. عەمار شمشێری دەوەشاند تا ئەوەی کوڕی یەسربی هیلاك و شەکەت کرد. هاوەڵانی عەلی کوڕی یەسربیان بەردباران کرد تا ئەوەی بریندار و لەپێ کەوت.

خارجە کوڕی سەڵت دەڵێت: لەڕۆژی جەنگی جەمەل کاتی زەببی هۆنراوەی دەخوێندەوە کە:

((ئێمە مناڵەکانی زەببە، هاوەڵانی وشترین

پیرەکەی ئێمە بگەرێننەوە))

عومەیر کوڕی باوکی حارس لەوەلاَمدا وتی:

((چۆن پیرەکەتان بۆ بگێرینەوە لەکاتێکدا نەماوە

ئەوەندە لەسینەیماندا تا لەناوچوو))

سەعب کوڕی حەکیم دەڵێت: یەکێك لەمناڵەکانی زەببە وشترەکەی لەپێ خست بەناوی عەمرۆ یا بوجەیر کوڕی دەلجە. حارس کوڕی قەیس یەکێك لەهاوەلاَنی عایشە لەمبارەوە وتی:

ئێمە ئەژنۆی وشترەکەمان شکاند و کەوتە سەرزەوی

یەك زەربەی شمشێر کۆتایی بەکارەکە هێنا

ئەگەر هاوڕێ لەگەڵ پاشماوەی حەرەمی پێغەمبەر (د.خ) نەدەبووین

بەخێرایی ئێمەیان دابەش کردبوو))

ئەم هۆنراوە بۆ موسەنا کوڕی مەخریمە دەگێرنەوە کەلەهاوەلاَنی عەلی بوو.

## قورسایی شەڕ لەجەنگی جەمەل

و بەسەرهاتی ئەعیەن کوڕی زەبیعە کەسەیری کەژاوەکەی کرد

قەعقاع دەڵێت: هیچ جەنگێکم هاوشێوەی جەنگی دڵی سوپاکان لەجەنگی جەمەل و سەفین نەبینیوە. بەڕم پاشەکشێمان بەڕکەبەرەکان دەکرد و پشتمان بەڕمەکان دەبەست، ئەوانیش بەهەمان شێوە، بەشێوەیەك ئەگەر کەسێك بیویستایە بەسەر ڕمەکانەوە بڕوات، دەیتوانی.

عەبدوالله کوڕی سەنانی کاهلی دەڵێت: لەجەنگی جەمەل تیرمان هاویشت تا ئەوەی تیرەکان کۆتاییان پێهات. دواتر بەڕم شەڕمان کرد. ڕمەکان لەنێوان ئێمە و سوپای بەرابەر پەیوەست بوو بەشێوەیەك ئەسپێك دەیتوانی بەسەریدا بڕوات. عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەی منالی موهاجیرەکان، شمشێرەکانتان هەڵگرن.

بێژەر دەڵێت: هەرکات دەڕۆشتمە مالی وەلید، ئەو ڕۆژەم بیر دەکەوتەوە.

باوکی بوشر دەڵێت: لەجەنگی جەمەل لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بووم. هەرکات لای مالی وەلید کوزەرم دەکرد و دەنگی گازەران دەبیست کەدەیانکوتا،

جەنگی خەڵکانم بیر دەکەوتەوە.

عیسا کوڕی حەتان دەڵێت: باسی جەنگی جەمەلیان کرد، باوکی رەجا وتی:، هێشتا پەردەکەی عایشە دەبینم کەهاوشێوەی ژیشکێك بوو، لەبەر ئەوەی ئەوەندە تیری بەرکەوتبوو.

دەڵێت: لەباوکی رەجام پرسی: ئایا لەو رۆژەدا جەنگایت؟

وتی: سوێند بەخوا تیرم دەهاویشت و نەمدەزانی بەرچی دەکەوێت.

باوکی جەمیلە دەڵێت: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر و عەمار کوڕی یاسر رۆشتنە لای عایشە، وشترەکەی لەپێ کەوتبوو، تەناف کەژاوەکەیان بڕی و کەژاوەیەکەیان داگرت تا ئەو کاتەی عەلی فەرمانی خۆی دەرکرد و وتی: عایشە ببەن بۆ بەسرە. ئەویان بردە ماڵی عەبدوڵڵە کوڕی خەلەف خوزاعی.

محەممەد دەڵێت: عەلی فەرمانی بەچەند کەسێکدا کەژاوەکەیان لەناو کوژراوەکان لابرد. قەعقاع و زەفەر کوڕی حارس کەژاوکەیان لەپشتی وشترەکە هێنایە خوار و لەسوچێکدا دایاننا. دواتر محەممەد کوڕی ئەبوبەکەر هاتە پێش، چەند کەسێك هاورێیەتیان دەکرد. دەستی خۆی بردە ناو کەژاوەکە.

عایشە پرسی: کێیت؟

وتی: برا چاکەکارەکەت.

وتی: ناسپاس.

عەمار کوڕی یاسر وتی: دایەگیان، شمشێر وەشاندنی کوڕەکانی خۆتت چۆن بینی؟

وتی: تۆ کێیت؟

وتی: عەمار کوڕە چاکەکارەکەی تۆ.

وتی: من دایکی تۆ نیم.

وتی: بۆنا دایکی منیت، تەنانەت ئەگەر خۆیشت نەخوازیت.

عایشە وتی: شانازی دەکەن بەوەی سەرکەوتنتان بەدەست هێناوە، هاوشێوەی ئەو شمشێرانەی وەشاندووتانە، شمشێرتان بەرکەوتووە، سوێند بەخوا کەسێك بەمشێوەیە بێت، هیچ کات سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت.

دەڵێت: ئەویان بەکەژاوەکەیەوە لەناو کوژراوەکان بردەدەر وکەسێکیان لەنزیك کەژاوەکەدانا، کەژاوکە هاوشێوەی جووچکی تازە سەر دەرهێناو بوو، لەبەر ئەوەی تیری زۆری بەرکەوتبوو.

دەڵێت: ئەعیەن کوڕی زەبیعەی موجاشعی هات و سەیری کەژاوەکەی کرد.

عایشە وتی: دوور کەوەرەوە خوا بەنەحلەتت بکات.

وتی: سوێند بەخوا جگە لەسەرەخۆرەیەك هیچی دیکە نابینم.

وتی: خواوەند پەردەت بدرێت و دەستت بڕێت و شەرمی تۆ ئاشکرا بکات.

دەڵێت: ئەو لەبەسرە کوژراوە و جلەکانیان لەبەر داکەند و دەستیان بڕی و رووت و قووت فڕیاندایە یەکێك لەکەلاوەکانی خەڵکەکەی لەهۆزی ئەزد.

دەڵێت: عەلی هاتە لای عایشە و وتی: دایەگیان، خواوەند تۆ و ئێمە ببەخشێت.

وتی: خواوەند ئێمە و ئێوە ببەخشێت.

سەعب کوڕی حەکیم کوڕی شەریك لەباوەگەوریی دەگێڕێتەوە: محەممەد کوڕی ئەبی بەکر هات، عەماری لەگەڵدا بوو، تەنافەکانی کەژاوەکەیان بڕییەوە و هەڵیان گرت و کاتێك خستیانە سەرزەوی، محەممەد دەستی خۆی بردە ناو کەژاوەکە و وتی: محەممەدی برانم.

وتی: پەشیمان؟

وتی: خوشکە، هیچت لێ نەهاتووە؟

وتی: بەتۆچی؟

وتی: گومڕاکان چییان بەسەرهات؟

وتی: رزگار بووان.

دەڵێت: عەلی هات و وتی: دایە گیان چۆنیت؟

وتی: باشم.

وتی: خواوەند بتبەخشێت.

وتی: تۆیش ببەخشێت.

محەممەد دەڵێت: کۆتاییەکانی شەو محەممەد کوڕی ئەبی بەکر عایشەی بردە بەسرە و لەماڵی عەبدوالله کوڕی خەلەفی خوزاعی جێگیری کرد، ئەو دایکی تەڵحە کوڕی عەبدوالله کوڕی خەلەف بوو.

## کوژرانی زوبەیر کوڕی عەوام

وەلید کوڕی عەبدوالله لەباوکی دەگێڕێتەوە: لەڕۆژی جەنگی جەمەل، کاتێك سوپاکەی تەڵحە و زوبەیر شکستیان خوارد، زوبەیر ڕۆشت و لای ئوردووەکەی ئەحنەف گوزەری کرد. کاتێك ئەحنەف زانی و لەمەبەستەکەی ئاگادار بوویەوە، وتی: سوێند بەخوا ئەمە خۆ دوورخستنەوە نییە لەجەنگ.

ئەوسا ئەحنەف بە کەسەکانی خۆی وت: کێ هەواڵی زوبەیرمان بۆ دێنێت؟

عەمرۆ کوڕی جەرموز بەهاوەڵانی خۆی وت: من.؟

دەڵێت: شوێنی کەوت و کاتێك پێی گەیشتەوە، زوبەیر سەیری کرد، تووڕە بوو، پرسی: دەنگ و باس چییە؟

عەمرۆ وتی: دەمویست لەتۆ بپرسم.

کۆیلەکەی زوبەیر بەناوی عەتییە وتی: ئەم پیاوە هێرشمان دەکاتەسەر.

زوبەیر وتی: لەیەك پیاو دەترسیت؟

دەڵێت: کاتی نوێژ هات، کوڕی جەرموز وتی: نوێژ بخوێنین.

زوبەیر وتی: نوێژ بخوێنین.

دابەزین. کوڕی جەرموز لەپشت سەری ئەو وەستا و لەپشتی سەرەوە، لەکەلێنی زرێکەیەوە، بەڕم لێیدا و کوشتی، ئەسپ و ئەنگوستیلە و سیلاحەکەی هەڵگرت و کۆیلەکەی بەرەڵا کرد تا لەوادی ئەلسەباع بەخاکی بسپێرێت. کوڕی جەرموز لەگەڵ هەواڵی کوژرانی زوبەیر بۆ ناو هاوەڵانیَ گەڕایەوە.

ئەحنەف وتی: نازانم کارێکی باشت کردووە یا نە.

دەڵێت: ئەحنەف لەگەڵ کوڕی جەرموز ڕۆشتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب و لەبەسەرهاتەکە ئاگاداری کردەوە. عەلی داوای شمشێرەکەی کرد و وتی: ئەمە شمشێرێکە بۆ ماوەیەکی زۆر پێغەمبەری لەڕەنج و مەینەتییەکان ڕزگار دەکرد. شمشێرەکەی بۆ عایشە نارد. دواتر رووی کردە ئەحنەف و وتی: چاوەڕوان بوویت؟

ئەحنەف وتی: پێم وایە کارێکی باشم کردووە، ئەوەی ڕوویداوە، لەسەر فەرمانی تۆ بووە ئەی سەروەری باوەڕداران، ڕێگەی سازان بگرە بەر چوونکە ڕێگەیەکی دوور

و درێژت لەبەردەمدایە و سبەی زیاتر لەدوێنێ پێویستت بەمن دەبێت. ڕێز لەکردەوەکەی من بگرە و من بۆ سبەی بهێڵەرەوە، بەمشێوەیە مەدوێ چوونکە بەردەوام چاکەخوازی تۆ بووم.

## ئەو کەسانەی لەجەنگی جەمەل شکستیان خوارد و روویان لەشارەکان کرد

محەممەد دەڵێت: زوبەیر لەسەرەتای ڕۆژی شکست، پیادە ڕێگەی مەدینەی گرتەبەر و کوڕی جەرموز، کوشتی.

دەڵێت: عوتەبە کوڕی ئەبی سوفیان و عەبدوالرەحمان و یەحیا، کوڕەکانی حەکەم، لەڕۆژی شکست بریندار ببون. سەرگەردان ملی ڕێگەیان گرتەبەر، چاویان بە عیشمە کوڕی ئەبیری تەمیمی کەوت کەوتی: بەدوای پەناگەدا دەگەڕێن؟

وتیان: تۆ کێیت؟

وتی: عیسمە کوڕی ئەبیر.

وتیان: بەڵێ. وتی: بۆ ماوەی یەك ساڵ لەپەنای مندان.

دەڵێت: ئەوانی برد و پارێزگاری لێکرد، قۆڵی بۆ خزمەت کردنی ئەوان هەڵماڵی تا برینەکانیان سارێژ بوو، ئەوسا وتی: هەر شوێنێك دەخوازن دیاری بکەن تا بۆ ئەوێ بتانبەم..

وتیان: شام.

دەڵێت: ئەوانی لەگەڵ چوارسەد سوار لەهۆزی تیم ئەلرباب برد و کاتێك گەیشتنە دوومە، سەرزەمینی تایەفەی کەلب، وتیان: بەڵێنەکەی خۆت سەبارەت بەم دەستەیە بردەسەر، هەنووکە بگەرێرەوە. ئەو گەڕایەوە. شاعیر لەمبارەوە دەڵێت:

((کوڕی ئەبیر بەڕمە هەڵکراوەکان

پەیمانەکەی لەگەڵ بنەماڵەی عاس بردەسەر))

دەڵێت: کوڕی عامریش بریندار بوو. ملی ڕێگەی گرتەبەر و یەکێك لەمناڵەکانی حێرقوس بەناوی موری ئەوی بینی و داوای لێکرد تا پەنای بدات. کوڕی عامر رازی بوو. پیاوی حێرقوسی پەنایدا و سەرقاڵی سارێژ کردنی برینەکانی بوو. دوای ئەوە وتی: ئارەزوو دەکەیت بەرەو کوێ برۆیت؟

وتی: دیمەشق.

دەڵێت: پیاوی حێرقوسی، کوڕی عامری لەگەڵ دەستەیەك لەمناڵەکانی حێرقوس گەیاندە دیمەشق و حارسە کوڕی بەدر کەکوڕەکەی یابراکەی، زەراع یەکێك لەشوێنکەوتەکانی عایشە و لەجەنگەکەدا کوژرا بوو، هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((هەواڵ هات کەکوڕی عامر

لەدیمەشق نیشتەجێ بوو و لەنگەری گرت)).

مەروان کوڕی حەکەمیش لەرۆژی شکستەکە پەنای بۆ بنەماڵەیەك لەتایەفەی عەنزە برد و وتی: مالك کوڕی مەسمەع لەبوونی من لێرە ئاگادار بکەنەوە. ئەوان ڕۆشتنە لای مالك و لەبوونی مەروان ئاگاداریان کردەوە.

مالك بەموقاتیلی برای خۆی وت: لەگەڵ ئەم پیاوە کەکەسی ناردووە و ئێمەی لەبوونی خۆی ئاگادار کردۆتەوە، چی بکەین؟

موقاتیل وتی: برازاکەی من بنێرە و پەنای پێ بدە و لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەمانی بۆ وەربگرە. ئەگەر ئەمانی دا بەوشێوەیە کەدەمانەوێت و ئەگەر ئەمانی نەدا، شمشێر بەدەست دەڕۆین و لەگەڵ خۆمان دەیبەین. ئەگەر دژایەتییان کرد، بۆ پارێزگاری کردن لەو شمشێر دەکێشین، یا تەندروست دەمێنینەوە یارێزدارانە دەجەنگین.

مالك پێش ئەوە سەبارەت بەم کارە راوێژی لەگەڵ کەسانی دیکەی بنەماڵەکەی کرد بەڵام لەو کارە دووریان خستەوە بەڵام بۆچوونی براکەی بەکار برد و بۆچوونی ئەوانی پشتگوێ خست. کەسی بۆ لای مەروان نارد و ئەوی بردە ناو ماڵەکەی خۆی، مەبەستی ئەوەی کرد لەکاتی پێویست پشتیوانی و پارێزگاری لێ بکات، وتی: مەرگ لەکاتی پەنادان، نیشانەی ئەمەکدارییە.

دەڵێت: دواتر مناڵەکانی مەروان ئەم چاکەیان لەبیر مایەوە و بنەماڵەی مالك لەم کارەی، کەڵکیان وەرگرت و رێز و پێگەیان بەرز بوویەوە.

دەڵێت: عەبدوالله کوڕی زوبەیر ڕۆشتە ماڵی پیاوێك بەناوی وەزیر لەبنەماڵەی ئەزد، وتی: بڕۆ لای دایکی باوەڕداران و لەبوونی من لێرە ئاگاداری بکەرەوە، بەڵام

ئاگاداریە محەممەد کوڕی ئەبی بەکر ئاگادار نەبێت.

پیاوی ئەزدی ڕۆشتە لای عایشە و ئاگاداری کردەوە.

عایشە وتی: محەممەد بێننە لای من.

ئەزدی وتی: ئەی دایکی باوەڕداران، پێی وتووم محەممەد ئاگادار نەبێتەوە.

بەڵام عایشە محەممەدی بانگ کرد و وتی: لەگەڵ ئەم پیاوە بڕۆ و خوشکەزاکەت بێنەرە لای من.

محەممەد لەگەڵ پیاوی ئەزدی ڕۆشتە لای کوڕی زوبەیر و وتی: سوێند بەخوا نابەدڵ هاتمە لای تۆ چوونکە دایکی باوەڕداران پێداگری کرد.

دەڵێت: عەبدوالله لەگەڵ محەممەد بەرێکەوت و یەکتریان جوێنباران دەکرد. محەممەد باسی عوسمانی کرد و جوێنی پێدا، عەبدواللەیش جوێنی بە محەممەد دەدا تا ئەوەی لەماڵی عەبدوالله کوڕی خەلەف گەیشتە لای عایشە. عەبدوالله کوڕی خەلەف پێش جەنگی جەمەل شوێنکەوتەی عایشە بوو و عوسمانی برای لەناو شەڕکەرانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا. عایشە کەسی بۆ لای بریندارەکان نارد و چەند کەسێك لەوانی بردە لای خۆی بۆ ئەوەی تیماریان بکات. مەروانیش پەیوەستی ئەوان بوو. لەناو ژوورەکانی ماڵەکەدا بوون.

محەممەد دەڵێت: سەرکردەکانی خەڵك دەوری عایشەیان گرت، عەلی لەئوردووگاکەی خۆی بوو. قەعقاع یەکێك بوو لەیەکەمین کەسەکان ڕۆشتە لای عایشە، پێی وت: ئەمڕۆ دوو پیاوم بینی لەبەردەم من دەجەنگان، هۆنراوەکانیان بەوشێوە بوو، دەزانی کامیان خەڵکی کوفە بوو؟

وتی: بەڵێ، ئەو کەسەی دەیوت خراپترین دایکێکی کەتائێستا ناسیومانە بەڵام درۆی کرد تۆ باشترین دایکیت کەناسیومانە بەڵام شوێنکەوتەی تۆ نەبوون.

عایشە وتی: خۆزگە بیست ساڵ پێش ئێستا مردبووم.

دەڵێت: قەعقاع ڕۆشتە لای عەلی و پێی وت: عایشە سەبارەت بەو پیاوەی خەڵکی کوفە بووە، پرسیاری لێکردووە؟

عەلی وتی: ئەو دوو پیاوە کێ بوون؟

وتی: باوکی هالە بووە کەدەیوت بۆ ئەوەی عەلی نەبینم.

عەلی وتی: خۆزگە بیست ساڵ پێش ئێستا مردبووم. هەردووکیان قسەیان

یەکێك بوو.

محەممەد دەڵێت: لەناو بریندارەکان ئەوانەی توانای هەستانەوەیان بووو، شەوانە ڕۆشتنە بەسرە. عایشە بەدوای ئەو کەسانەدا دەگەڕا کەهەندێکیان بۆچوونیان لەگەڵ ئەو یەك بوو و هەندێکیان نەیاری بوون. لەماڵی عەبدوالله کوڕی خەلەف، خەڵکان دەوریان گرتبوو و کاتێك لەمەرگی یەکێك لەوان ئاگاداریان دەکردەوە، دەیوت: خوا لێی خۆش بێت.

یەکێك لەهاوەڵانی عایشە وتی: چۆن بەمشێوەیە بێت؟

وتی: پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی: فلاّن کەس جێگەی بەهەشتە و فلاّنەکەسیش جێگەی بەهەشتە.

دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: هیوادارم هەر کەس لەم دوو سوپایە دڵێکی پاکی هەبووە، بڕواتە بەهەشت.

باوکی ئەیووب لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر (د.خ) لەهیچ کام لەئایەکانی قورئان کەهاتە خوار، بەئەندازەی ئەم ئایەی خۆشحاڵ نەبوو کەدەفەرمێت:

((و ما اصابکم من مصیبة فبما کسبت ایدیکم و یعفو عن کثیر))

واتاکەی: هەر بەلاّیەك بەسەر ئێوەدا بێت بۆ ئەو کارانەیە دەستەکانتان ئەنجامی داوە و ژمارەیەکی زۆرتان دەبەخشرێن))

هەروەها پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمێت: هەر بەلاّیەك لەم دنیا بۆ باوەڕدار ڕوویدات، بەهۆی گوناحەوەیە و خواوەند لێی خۆش دەبێت و ئەو بەلاّیەی بەسەر کەسی باوەڕدار دێت، کەفارەی گوناحەکەیەتی و بەخشێشێکە بۆی و بەم پێیە لەڕۆژی هەستانەوە بۆ ئەو گوناحەی سزا نادرێت و ئەو گوناحانەی خواوەند لەم دنیایە چاوی لێ پۆشیوە و خواوەند گەورەتر لەوەیە بەخششەکانی خۆی لەبەرچاو نەگرێت.

## خەمخواردنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ کوژراوەکانی جەنگ و ئەسپەردە کردنیان و کۆکردنەوەی کەرەستەکانی ناو ئوردوو و ڕەوانە کردنی ئەوان بۆ بەسرە

محەممەد دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەئوردووگاکەی خۆی مایەوە و نەڕۆشتە ناو شاری بەسرە. کەسانی بۆ لای مردووەکانیان نارد کە ڕۆشتن و مردووەکانیان بەخاك سپارد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ ئەوان بەناو کوژراوەکاندا دەگەڕا، کاتێك گەیشتە لای جەنازەی کەعب کوڕی سور، وتی: ئێوە وتتان نەزانەکانی خەڵك لەگەڵ ئەوان هاتوون بەلاّم ئەمەی دەیبینن کەسێکی زانایە. کاتێك لای عەبدولرەحمان کوڕی عەتاب گوزەری کرد، وتی: ئەمە سەروەری خەڵکەکەی بوو و لەدەوری کۆدەبوونەوە. مەبەستی ئەوە بوو خەڵکان ئەویان وەك پێشنوێژی خۆیان هەڵبژاردبوو.

دەڵێت: بەمشێوەیە عەلی لای هەر پیاوێکی شیاو گوزەری دەکرد، دەیوت: گومانیان کردووە تەنیا ئاژاوەچییەکان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئێمە هاتوون بەلاّم ئەمە خواپەرەستێکی تێکۆشەر بوو.

دەڵێت: عەلی لەسەر کوژراوەکانی جەنگ لەکوفە و بەسرە، نوێژی خوێند و هەموو کوژراوەکان بەکوژراوی نەیارەکانیشیەوە، نوێژی لەسەرخوێندن و هەموویانی لەگۆڕێکی گەورەدا بەخاکی سپارد. دواتر ئەوەی لەئوردووگاکەدا بوو کۆی کردەوە و ڕەوانەی مزگەوتی بەسرەی کرد و وتی: هەر کەسێك شتەکانی خۆی دەناسێتەوە هەڵیگرێت مەگەر ئەو سیلاحانەی لەخەزێنەکانەوە هاتوون و مۆری حکومەتیان پێوەیە کەدەبێت هاوشێوەی شتەنەناسراوەکان بمێنێتەوە. ئەوەی لەسامانی خواوەند دژی ئێوە بەکاریان بردووە، هەڵیبگرن، ئەوەی لەماڵی موسوڵمانان بەجێ ماوە بۆ موسوڵمانان ڕەوا و حەلاڵ نییە، ئەم سیلاحانە بێ مۆڵەتی حکومەت لەدەستی ئەواندا بووە.

## ژمارەی کوژراوەکانی جەنگی جەمەل

محەممەد دەڵێت: لەجەنگی جەمەل لەدەوروبەری وشترەکە دەهەزار کەس کوژرا کەنیوەی لەهاوەڵانی عەلی بوون و نیوەی لەهاوەڵانی عایشە، دوو هەزار کەس لەهۆزی ئەزد و پێنسەد کەس لەهۆزە یەمەنییەکانی دیکە، دوو هەزار کەس لەهۆزی موزێر و پێنسەد کەس لەقەیس و پێنسەد کەس لەتەمیم و هەزار کەس لەهۆزی مناڵەکانی زەببە و پێنسەد کەس لەبەکر کوڕی وایل.

بەوتەیەك لەجەنگی یەکەم پێنج هەزار کەس لەخەڵکانی بەسرە کوژران و لەجەنگی دووەمیش بەم ژمارەیان لێ کوژرا. ژمارەی کوژراوەکانی بەسرە دەهەزار کەس بوو. لەخەڵکانی کوفەیش پێنج هەزار کەس کوژرا.

محەممەد دەڵێت: لەو رۆژەدا حەفتا کەس لەپیرەکانی مناڵەکانی عودەی کوژران کەهەموویان خوێنەرانی قورئان بوون، جگە لەگەنجەکان و ئەو کەسانەی خوێنەری قورئان نەبوون، عایشە وتبووی تا ئەو کاتەی دەنگی مناڵەکانی عودەی کپ نەکرا، هیوای سەرکەوتنم بوو.

## رۆشتنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ لای عایشە و فەرمانی سزادانی ئەو کەسانەی جوێنیان بەعایشەدابوو

محەممەد دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەرۆژی دووشەممە رووی کردە بەسرە و رۆشتە ناو مزگەوتەکە و نوێژی خوێند و رۆشتە ناو شارەکە و خەڵك لەدەوری کۆبوونەوە. دوتار سوار لەسەر ئێسترەکەی خۆی بەرەو ماڵەکەی عایشە بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە ماڵی عەبدوالله کوڕی خەلەف، کەگەورەترین ماڵی بەسرە بوو، ژنانی بینی لەگەڵ عایشە بۆ عەبدوالله و عوسمان کوڕەکانی خەلەف دەگریان. سەفیە کچی حارسیش رووسەری بەسەرەوە بوو و دەگریا و کاتێك عەلی بینی، وتی: ئەی عەلی، ئەی بکوژی هاورێیان، ئەی بلاوەپێکەری موسوڵمانان، خواوەند مناڵەکانت هەتیو بکات بەهەمان شێوە کەمناڵەکانی عەبدوواللەت هەتیو کرد.

دەڵێت: عەلی وەلامی نەدایەوە و بەئارامی بۆ لای عایشە بەرێکەوت، سلاوی

لێکرد و لای ئەو دانیشت و وتی: سەفییە بەشێوەیەکی توند قسەی لەگەڵ کردم، سوێند بەو خوایەی لەو کاتەوەی کچ بووە، چیتر نەمبینیوە.

دەڵێت: کاتێك عەلی هاتەدەر، سەفییە ڕۆشتە بەردەمی و قسەکانی دووبارە کردەوە، عەلی ئێسترەکەی وەستاند، ئاماژەی بۆ دەرگاکە کرد و وتی: مەبەستی ئەوەم هەیە ئەو دەرگایە بشکێنم و کەسانی ناو ماڵەکە بکوژم، دواتر ئەم دەرگایە بشکێنم و کەسانی ناو ماڵەکە بکوژم.

بەو شێوەیە بوو دەستەیەك لەبریندارەکان پەنایان بۆ عایشە برد و عەلی لەبوونی ئەوان ئاگادار ببوویەوە بەڵام گرنگی پێنەدا. سەفییە لەقسەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بێدەنگ بوو ئەوسا عەلی ڕۆشتەدەر.

دەڵێت: یەکێك لەخەڵکانی ئەزد وتی: سوێند بەخوا نابێت ئەم ژنە گیان بەدەرببات.

بەڵام عەلی کوڕی ئەبی تالیب تووڕە بوو، وتی: بێدەنگ بە. هیچ پەردەیەك مەدرێنە و مەڕۆرە ناو هیچ ماڵێك و ئازاری هیچ ژنێك مەدە هەرچەند بەردەوام خراپەی ئێوە بڵێن و سەرکردە و زاناکانتان بەنەزان لەقەڵەم بدەن چوونکە ژنان زەعیفن. (زەعیفەن). ئێمە فەرمانمان پێدرابوو ژنانی ناباوەڕیش ئازار نەدەین، ئەو پیاوەی ئازاری ژنێك بدات و سزای بدات، دەبێتە هۆکاری نەنگ بۆ کەسانی دووای خۆی. نامەوێت ببیستم کەسێك سەرەڕێگەی لەژنێك گرتووە چوونکە بەخراپترین شێوە سزای دەدەم.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب درێژەی بەرێگەکەیدا، پیاوێکی بینی، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، دوو کەسم لەبەر دەرگا بینی زۆر خراپتر لەسەفییە کەجوێنی بەتۆ دەدا، جوێنیان بەو ژنە دەدا.

وتی: هاوار لەتۆ، ئەگەری هەیە ئەوە عایشە بێت؟

وتی: بەڵێ، دوو کەس لەبەردەرگای ماڵەکە بوون و یەکیان وتی: ئەی دایکە، سزای تۆ نافەرمانی کردنە.

و ئەوی دیکە وتی: دایکە، کارێکی هەڵەت کرد، تۆبە بکە.

عەلی، قەعقاعی بۆ دەرگای ماڵەکەی عایشە نارد و ئەو دوو کەسەیان هێنا، وتی: دەیانکوژم. دواتر وتی: سزایان دەدەم. جلەکانی داکەندن و یەکی سەد قامچی

لێدان.

کوڕی ئەلکەنوود دەڵێت: ئەم دوو کەسە لەهۆزی ئەزد بوون: عیجل و سەعد کوڕانی عەبدوالله .

## بەیعەتی خەڵکانی بەسرە لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب و دابەش کردنی دارایی

بیت المال لەناو ئەوان

محەممەد دەڵێت: هەمان شەو ئەحنەف بەیعەتی کرد. ئەو و هۆزی مناڵەکانی سەعد لەدەرەوەی بەسرە بوون و هەموویان هاتنە ناو بەسرە. خەڵکانی بەسرەیش دەستە دەستە بەیعەتیان کرد، تەنانەت بریندارەکان و ئەو کەسانەی ئەمانیان پێ بەخشرا بوو. کاتێك مەروان گەڕایەوە، پەیوەستی معاویە بوو و بەوتەیەك تا کۆتایی جەنگی سەفین لەمەدینە نەڕۆشتەدەر.

دەڵێت: ئەو کاتەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەبەیعەت وەرگرتن لەخەڵکانی بەسرە تەواو بوو، سامانی بیت المالی خەملاند کەشەشسەد هەزار درەمی زیاتر تیا بوو. هەمووی بەسەر ئەوکەسانەی بەشداری جەنگەکەیان کردبوو، دابەش کرد و هەر شەڕکەرێك پێنسەدی بەرکەوت، وتی: ئەگەر خواوەند لەشام سەرکەوتنی پێبەخشین، بەم ئەندازەیەتان پێدەبڕێت جگە لەتالآنییەکانی دیکە. سەبەئییەکان دواتر ئەم وتەی عەلی کوڕی ئەبی تالبیان دووبارە دەکردەوە و ڕەخنەیان لێ دەگرت.

## هەڵس و کەوتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەگەڵ شەڕکەرانی جەنگی جەمەل

محەممەد کوڕی راشد لەباوکی دەگێڕێتەوە: شێوازی عەلی بەوشێوە بوو کەهەلآتووان نەکوژێت و بریندارەکان بێ گیان نەکات و هیچ پەردەیەك نەدرێت و سامانێك تالآن نەکەن. خەڵکان وتیان: چۆن خوێنیان حەلآڵە و سامانیان حەرام؟

وتی: ئەوانیش هاوشێوەی ئێوە بوون، هەرکەس ڕووبەڕووی ئێمە نەبێتەوە لەئێمەیە و ئێمە لەوین و هەرکەس پێداگری بکات تا بکوژرێت جەنگ لەگەڵ ئەو ڕەوایە و پێنج یەکی ئەو بۆ ئێوە بەسە.

دەڵێت: لەم کاتەوە خەواریج وتە و قسەکانی خۆیان دەست پێکرد.

## ڕەوانە كردنی ئەشتەر و ئەو وشتەرەی بۆ عایشەی كڕییوو بەڕێكەوتنی عایشە لەبەسرەوە بۆ مەككە

عاسم كوڕی كەلیب لەباوكی دەگێڕێتەوە: كاتێك كاروباری جەنگ كۆتایی پێهات، ئەشتەر منی نارد و لەیەكێك لەخەڵكانی موهرە وشترێكم بەحەوتسەد درەم كڕی و وتی: وشترەكە ببە بۆلای عایشە و بڵێ، ئەشتەر، مالك كوڕی حارس، ئەم وشترەی لەجیاتی وشترەكەی خۆت ناردووە.

دەڵێت: وشترەكەم بردە لای عایشە و وتم: ئەشتەر سڵاوت لێدەكات و دەڵێت: ئەم وشترە لەجیاتی وشترەكەت.

وتی: خواوەند سڵاوی لێنەكات چوونكە سەروەری عەرەب، یانی كوڕی تەڵحەی كوشت و ئەو بەڵای بەسەر خوشكەزاكەی مندا هێنا.

دەڵێت: وشترەكەم بردەوە بۆ ئەشتەر و ئاگادارم كردەوە. ئەو دەستە تووكنەكانی خۆی بەرز كردەوە و وتی: دەیانویست بمكوژن، جگە لەكوشتنی ئەوان دەمتوانی چی بكەم.

محەممەد دەڵێت: عایشە لەبەسرەوە بەڕێكەوت. مەبەستی گەڕانەوە بۆ مەككەی لەسەردا بوو. مەروان و ئەسوەد كوڕی ئەبی بەختەری لەڕێگەی مەدینەوە ڕۆشتن و عایشە تا كاتی حەج لەمەككە مایەوە و دواتر ڕێگەی مەدینەی گرتەبەر.

### ئەوەی عەلی كوڕی ئەبی تالیب سەبارەت بەسەركەوتنەكەی بۆ كارگوزاری كوفەی نووسی

محەممەد دەڵێت: عەلی كوڕی ئەبی تالیب هەواڵی سەركەوتنی بۆ كارگوزاری كوفە نووسی كە لەو كاتەدا لەمەككە بوو، ناوەڕۆكی نامەكە بەمشێوە بوو:

((لەبەندەی خوا، عەلی كوڕی ئەبی تالیب، سەروەری باوەڕداران

بەڵام دواتر، لەنیوەی جومادی الاخر لەخورەیبە یەكێك لەناوچەكانی دەرەوەی بەسرە ڕووبەڕووی یەك بووینەوە و خواوەند شێوازی موسوڵمانانی بەسەر ئەواندا سەپاند و ژمارەیەكی زۆر لەئێمە و ئەوان كوژران. یەكێك لەكوژراوەكانی ئێمە سەمامە كوڕی موسەنا بوو، لەگەڵ هیند كوڕی عەمرۆ و عەلبا كوڕی هەیسەم و سیحان و زەید كوڕەكانی سوحان و مەحدوج.))

عەبدوالله كوڕی ڕافیع نامەكەی نووسی و زەفەر كوڕی قەیس لەمانگی جومادی الاخر هەواڵی سەركەوتنی بۆ كوفە برد.